# ئەزموون و یاد

پشکۆ نەجمەدین

## ئاڵای شۆڕش و حیکایەتەکانی زیندان
## بەرگی یەکەم و دووەم

چاپی سێیەم

٢٠١١

ناوی کتێب: ئەزموون و یاد
نوسەر: پشکۆ نەجمەدین
چاپی: سێهەم
ساڵ: ٢٠١١
تیراژ: ١٠٠٠
بەرگ و دیزاین: ئەردەڵان هەڵەبجەیی

***ئەزموون و یاد لە ڤیستیڤاڵی گەلاوێژ ٢٠١٠ خەڵاتی پڕفرۆشترین کتێبی ساڵی وەرگرتوە.***

# پەنجەرەیەک بە ڕووی «ئەزموون و یاد»دا

ئەم کتێبەی دەیخوێننیەوە، نووسینەوەی مێژوو نییە و هیچ میتۆدێکی زانستیانەی مێژوونووسینی تێدا ڕەچاونەکراوە. من کە مێژوونووس نەبم و سەر لە ڕێوشوێنی ئەکادیمییانەی ئەم زانستە دەر نەبەم، مافی دەستتێوەردان و نازوکوێزکردنی دیاردە و دەرکەوتەکانی مێژووی بزووتنەوەی سیاسیی هاوچەرخی کورد، بەخۆم ڕەوا نابینم.

ئەزموون و یاد، نووسینەوەی کتومت و سەرلەبەری یادەوەرییەکانی من، لە شۆڕشی نوێ، خەبات و تێکۆشانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا نییە، وردینەی ئەو یادەوەرییانە، کار و ماندووبوونێکی زۆر گەورەتری لەمەی ئێستا گەرەکە.

ئەزموون و یاد، بەوشەنەخشاندن و زیندووکردنەوەی ئەو وێنانەی سەردەمێکی ژیانی منن کە لە سەختترین ڕۆژگاری خەباتی شاخ و تێکۆشانی سیاسیدا، لە هزرمدا نەخشاون و زەمەن تۆزی لەسەر خستوون.

نووسینەوەی دەساڵان، بە هەموو شەووڕۆژ، هەفتە و مانگ و چرکەساتەکانییەوە، لە ئاڵۆزترین پرۆسەی ژیان و هەڵسوکەوتی خەباتی پێشمەرگانە، شەڕی شاخ، شەڕی نێوخۆ، کاری سیاسی و ڕێکخراوەیی، گوزەرانی بن ئەشکەوتان، ڕێکردنی هەوراز و نشێوان، برسێتی و هەڵەرزینی بەرباران و کەرەسیسە و باوبۆران، هەڵڕژانی خوێنەکان و شاردنەوەی تەرمی ئازیزان، ناکۆکی و ململانێ و جێگۆڕکێیان، پاش پێچانەوەی نزیکەی بیست و پێنج ساڵان لە تەمەنی ڕوودانیان، کارێکی سەرپێیی و ئاسان نییە.

ئەزموون یاد، نووسینەوەی مێژووی شەڕەکان، ژمارەی قوربانییەکان، گەورەیی دەستکەوتەکان و پەسندانی ئازایەتی و جوامێرییەکان نییە. لە «ئەزموون و یاد»دا، وردینەی شەڕ و پێکدادانەکانی نێوان هێزی پێشمەرگە و هێزەکانی دەوڵەتی بەعسم وێنە نەگرتوون و قسە و باسم لەسەر نەکردوون. وەهاکارێک، نە بە ئەرکی خۆمی دەزانم و نە نووسینیش بۆ من وەها ئامانجێکی هەیە. زۆرن ئەوانەی یادەوەرییەکانی خۆیان، لە شۆڕشی کوردستاندا گێڕاوەتەوە و باسی چۆنییەتی بەڕێوەچوونی شەڕەکان، سەرکەوتنەکان، نوشەستییەکان، ژمارەی شەهیدەکان و وردەکارییەکانیان کردووە و هی دیکەش زۆرن، درێژە بەم کارانە بدەن. کامێرای یادەوەرییەکانی من، زیاتر لەسەر ئازار، دڵەڕاوکێ، خەم و پەژارە و چرکە دەروونییە ئازاراوییەکانی ئینسانی کورد«پێشمەرگە، سیڤیل»، هەڵوەستە دەکەن و هەوڵ دەدەن، وردینەی بارە ناهەموارەکانی ناخی ئینسانەکان وێنە بگرن کە جەنگ

بەرهەمی هێنابوون. من، بە مەبەست و لە ئاگاییدا، لەسەر تراژیدییاکانی شەڕی نێوخۆ ورد دەبمەوە و زەق و زۆپیان دەکەمەوە. من، کە لە بەشێکی زۆری ئەو شەڕانەدا بەشداریم کردووە، ئێستاش، پاش بیست و سێ ساڵان، لە ئاگایی و نائاگاییمدا، ئازارم دەدەن و لە ناخەوە دەمسووتێنن! شەڕی نێوخۆ و کەلتووری یەکترکوشتن، فاکتەری کاربڕی خولقاندنی ئەم بارە شێواوەن کە کوردی تێدا دەژی. وێنەگرتنی شەپۆلەکانی رووباری لە خوێن سەرڕێژی شەڕی دەسەلات، لە ئامادەیی دەوڵەت و قەوارەی سیاسیی کوردیدا و نشیاندانیان بە نەوەکانی ئێستا و داهاتوو، بە ئەرکێکی گرنگی پرۆسەی «نووسینی سیاسی» دەزانم.

ئەزموون و یاد، لە ماوەی دووردا، وێنەگرتنەوەی ژیان و ئازارەکانی تاکی کوردی لە دۆزەخی جەنگ هاوێژراوە و جەخت لەسەر دووبارەخولقاندنەوەی ژان و دڵەڕاوکێکانی کۆمەڵێک مرۆڤ دەکات کە هەلومەرجی نائاسایی و زوڵم و ستەمی بەعس، لە سۆنگەی کوردبوونیاندا، دەیخستنە دەرەوەی زەمەن و لە شوێندا گۆڕەوشاری رۆح و جەستەی دەدان.

من، لە گێڕانەوەی «ئەزموون و یاد»دا و لە زۆر شوێندا، هەوڵی بەکاربردنی زمانی وێنە، کامێرا و فلاشباکم داوە و تەکنیکی رۆماننووسین و وێنەی شیعریم بەکارهێناون. بەداخەوە، لە هەندێک شوێندا، نەمتوانیوە بە هەمان زمان و نەفەس، درێژە بە گێڕانەوەکانم بدەم و ناچار، هانام بۆ زمانی نووسینەوەی فیکر و سیاسەت بردووە و کۆڵینەوە و توێژینەوەی دیاردە سیاسییەکان و کێشە و گرفتە فیکریەکانم، بەو زمانە داوە کردوون.

لە درێژایی نووسینەوەی «ئەزموون و یاد»دا، ناوی کۆمەڵێک کەس هاتوون کە هەندێکیان ئەو رۆژگارە و ئێستاش، رۆڵی گرنگیان لە هەڵسووڕانی کاری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا گێڕاوە و دەگێڕن. دەربڕینەکانی من، لەمەڕ ئەوان کەسان، پەیوەندییان لەگەڵ تێگەیشتنەکانی مندا هەیە بۆ خەسڵەت و کەسایەتیی ئەوێ رۆژێی ئەوان و لەگەڵ رۆڵ و پێگەی ئێستایاندا، پەیوەندییەکیان نییە.

من، ناوی کەسەکانم وەکو خۆیان و بێ هیچ پێشگرێکی ناتەبا بە هونەری نووسین، نووسیون. واتە پێشگری (کاک، بەڕێز، مامۆستا و...هتد)م بۆ هیچ سەرکردە و کەسێک بەکارنەهێناوە و ئەمەش لە شکۆیی و حورمەتی چ کەسێکی بەرووەمەت، کەمناکاتەوە.

لە کۆتایی کتێبەکەدا، فەرهەنگێکم بۆ ناساندنی هەندەک لە کەسەکان کردووە و هەوڵی زیندووکردنەوەی ئەوانەم داوە، کە کوژراون و بوونەتە سەربازی ون، یاخود زیندوون و رۆژگار تۆزی فەرامۆشی لەسەر خستوون.

ئەزموون و یاد، لە مانگەشەوێکی نیسانی ساڵی ١٩٧٨ کە من لە شاری هەڵەبجەوە، بۆ چیای شنروێ بە رێگاوەم، دەستپێ دەکات و لە یەکێک لە رۆژەکانی پاییزی ساڵی ١٩٨٣دا و لە دەستپێکی

مفاوەزاتی نێوان یەکێتی و بەعسدا، پشوو دەدات.

لە نووسینەوەی ئەزموون و یادا. دەشێت ناوی زۆر هاوڕێ و برادەرم لەبیر کردبن و یادگارییەکم لێ نەگێڕابنەوە، داوای لێبوردنیان لێ دەکەم و دڵنیایان دەکەم کە بێ مەبەست بووە، توانستی بیرکردنەوەم لە کورتیی داوە و بە هانامەوە نەهاتووە.

پشکۆنەجمەدین

نۆڤەمبەری ٢٠٠٧ سوێد

# ئەزموون و یاد.. ئاوڕدانەوەیەک لە دۆزەخ

نووسینی: ڕێبین هەردی
((هەفتەنامەی ئاوێنە))

((ئێمە و ئەوان چ تاوانێکمان نەبوو! ئێمە هەموومان لەو دۆزەخی کورکوشتنەدا گوناه بووین))
((ئەو ڕۆژانە بەعس لە هەوڵی سڕینەوەی ئێمەدا و ئێمەش لە هەوڵی بڕینەوەی یەکتردا بووین))
جارێک ڕۆلان بارت لە پێناسەکردنی تازەگەریدا گوتبووی:((تازەگەری بریتییە لە ناسینی ئەو دیاردانەی کە نابێت دووبارە ببنەوە)) دەتوانین ئەم ڕاستییە تەنانەت بۆ بواری مۆدێرنەکردنی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیش بە کار بێنین. مۆدێرنەکردنی کۆمەڵگا پەیوەندییەکی تەنگاوتەنگی بە ناسینی ئەو دیاردانەوە هەیە کە نابێت دووبارە ببنەوە. هیچ پرۆژەیەکی تازەکردنەوە ڕوو نادات گەر پێشتر ئەو دیاردانەی جیهانی کولتووری و سیاسی و کۆمەڵایەتیمان نە ناسیبێت کە لەئارادا بوون و لە ئارادان، تاکو دووبارەیان نەکەینەوە.
لێرەوە دەبینین هەمیشە هەموو پرۆژەیەکی تازەگەری هاوکاتی لێشاوێک لە لێکۆڵینەوە و نووسینە دەربارەی ڕەهەندە کلتووری و سیاسییەکانی کۆمەڵگا و قسەکردن لەسەر لایەنە دیار و نادیارەکانی کۆی لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگایەک. گەر تەماشای دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرنیش بکەین، ئەو ڕاستییە دەبینین کە بە بێ سەرهەڵدان و دروستبوونی چەندان لایەنی لێکۆڵینەوە مومکین نەبوو ئەو دەوڵەتە دروست ببێت. دەوڵەتی مۆدێرن لەسەر شانی لێشاوێک لێکۆڵینەوە و نووسین لە بارەی زیاد لە بوارێکی ژیانەوە ڕاوەستاوە. لە ڕاستیدا مۆدێرنەکردن هەمیشە هاوکاتی کۆمەڵێک لێکۆڵینەوەی جیاوازە لە بارەی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی ژیانی هەنووکە و ڕابردووی کۆمەڵگاوە.
بە ڕاستییش، بێ ناسینی ڕابردوو، ئەستەمە بتوانین بیر لە ئایندەیەکی جیاواز لە ڕابردوو بکەینەوە.
هیگڵ جارێک گوتبووی((ئەو کۆمەڵگایانەی ڕابردوویان بیر دەچێتەوە، مەحکومن بەوەی دووبارەی بکەنەوە)). هەر ئەم مەترسیی دووبارەکردنەوەیەشە وا دەکات هەموو پرۆژەیەکی تازەکردنەوە بە ناچاری پێویستی بە زانیارییەکی زیاتر و فرەلایەنتر لەسەر ڕابردوو هەبێت. بەختیارعەلی ڕاست دەکات هەمیشە زانیارییەکانی سەردەمی تازە لەسەر ڕابردوو، دەبێت گەورەتر و فراوانتر بن لە زانیارییەکانی ڕابردوو لەسەر خۆی.
یەکێک لە کێشە گەورەکانی ژیانی سیاسیی ئێمە، نەبوونی زانیارییە دەربارەی ڕابردوو و مێژووی بزووتنەوەکانی کورد و بەسەرهاتی ئەو ڕووداو و بڕیارانەی کە سەرکردایێتیی بزووتنەوەکانی کورد

دەستی سەرەکییان لە داڕشتن و ڕوودانیاندا هەبووە.
چەند دەیەیەک بەسەر بزووتنەوەی کوردیدا تێدەپەڕێت و تا هەنووکەش ئەو نووسین و لێکۆڵینەوانەمان لە بەردەستدا نین کە ڕووە ڕووناک و تاریکەکانی ئەو قۆناغانەمان بۆ ئاشکرا بکەن و لە سەریان ڕابوەستن. بەشێکی زۆریش لەو زانیارییانەی لەو قۆناغەوە تۆمار کراون. یەکلایەنانە نووسراون و بە شێوەیەکی ورد ئامانگەیەننە هەقیقەتی ئەو شتانەی کە ڕوویانداوە. ڕەنگە هۆیەکی سەرەکیی ئەم دیاردەیەش ئەوە بێت کە برێکی زۆر لە بەشدارانی بزووتنەوەی هاوچەخی کوردی، تا هەنووکەش لە گەمە سەرەکییەکانی بواری سیاسەتی کوردستانن و ناتوانن تەحەمولی ئەو وێنە ڕاستەقینانەی ڕابردوو بکەن کە دەشێ زیان بە سەرمایەی سیاسی و ڕەمزییان لە هەنووکەدا بگەیەنێت. بگرە ڕەنگە ئەم ئامادەبوونەی سیاسییەکانی دوێنێ لە هەنووکەدا، ڕێگری سەرەکی بووبێت لەوەی کەسانی پسپۆڕ یان ئاگاداری ئەو مێژووە، شتی لەبارەوە بنووسن ولایەنە تاریک و ڕووناکەکانی ئاشکرا بکەن. بەڵام گەر ئەم ئاوڕدانەوەیە بە قازانجی گەمەکەرە سیاسییەکانی هەنووکە بووبێت، ئەوا لە دیدێکی دیەوە گەورەترین زیانی بە ئەزموونی هەرێمی کوردستان و ئەگەری پێکەوە ژیانی ئاشتییانەی هێزەکانی داوە. ئاوڕنەدانەوە و تەماشانەکردنی ڕابردوو وەک خۆی، هۆی سەرەکیی دووبارەکردنەوەی ئەو هەڵە و کەموکوڕییانەیە کە پێشتر ڕوویان داوە. بێهودە نییە پاش ئەو هەموو ئەزموونە تاڵەی کورد لەگەڵ شەڕی ناخۆدا و ئەو زیانە گەورانەی ئەم شەڕە لە تێکۆشانی شاخدا لە بزووتنەوەی کوردی داوە، لە دوای ڕاپەڕینیشەوە بە شێوەیەکی دی دووبارە دەبێتەوە. ((بۆ ئەوەی بە ڕووناکی بگەین، دەبێت هەمیشە چاومان لەسەر تاریکی بێت)). ئەمە ڕستەی یەکێکە لە ڕۆشنبیرانی ئێران کە دەبێت ڕێنمایی سەرەکیی هەموو ئەو کۆمەڵگایانە بێت کە دەیانەوێت ئایندەیەکی باشتر لە ڕابردوو بژین.
تاکە شتێک هەنووکە لە بەردەستماندایە. ئەو یادەوەرییانەیە کە بەشدارانی بزووتنەوەکە بە شێوەی جیاواز لەبارەی ئەو سەردەمەوە نووسیویانن. خۆشبەختانە ژمارەی ئەو کتێبانە ڕوو لە زیادبوون دەکەن کە لێپرسراوان و بەشدارانی شۆڕشی هاوچەرخی کوردستانی ئێراق لە بارەی ئەو ڕووداو و بەسەرهاتانەوە دەیاننووسن کە برێکی زۆر لە ژیانی سیاسیی شۆڕش و بزووتنەوەی سیاسیی کوردستانی ئێراق پێک دەهێنن. لە بیرەوەرییەکانی ئەوشیروان مستەفاوە بۆ بیرەوەرییەکانی شەهید ڕێباز و حەمەی حاجی مەحمود و کەسانی دی، بەڵام لە ناو ئەو بیرەوەرییانەدا کتێبی (ئەزموون و یاد) ی پشکۆنەجمەدین کە بەم دواییە و پاش بگرە بێنەیەکی زۆر چاپ کرا، بێوێنە و تاکانەیە. بێوێنەیە چونکە لە دەمی شاهێدێکەوە دەگێڕدرێتەوە کە هەنوکە بەشێک نییە لە بەڕێوەبەران و بەرپرسیارانی هەنوکەیی کوردستان و ئەمەش شانسی بێلایەنیی نووسینی کتێبەکەی گەورەتر کردووە، تاکانەشە چونکە لە گێڕانەوەی مێژووییەوە دەپەڕێتەوە بۆ هەڵسەنگاندن و تاوتوێکردنی لە دیدی کەسێکەوە کە هەنوکە باشتر و ڕاستگۆیانەتر هەڵە و کەموکوڕییەکانی ئەو سەردەمە دەبینێت. کتێبی «ئەزموون

و یاد» ناوڕبانەوەیەكە لە دۆزەخی ئەو ڕووداوە تراژیدیانەی هێزە جیاوازەكانی كوردی خستبووە شەڕێكی بەرامبەر بە یەك كە قوربانییەكانی سەدان پێشمەرگەی بێگوناهی لایەنە جیاوازەكان بوون. گێڕانەوەی چیرۆكە تاڵ و ناخۆشەكانی سەردەمێكە كە ئەقڵییەتی پاوانخوازیی هێزەكان، هاوڕێ و خزمەكانی دوێنێی لە سەنگەری بەرامبەر یەكدا ڕادەگرێت. چیرۆكی گێڕانەوەی بەدگومانی و خیانەت و ئەو هەڵە و بڕیارە سیاسییە ناوردبینانەیە كە بزوتنەوەی كوردی بە شێوەیەك كەرت كردووە تا هەنووكەش بەردەوامە. كتێبەكە پتر لە پرسەنامەیەك دەچێت كە قەڵەمێكی خەمناك و ئەدیب لە ناوڕبانەوەیدا بۆ ڕابردوو، بەر لە هەڵە و كوموكوڕییەكانی خەڵكی دی، قسە لەسەر وێنا هەڵەكانی خۆی بۆ ژیانی سیاسیی كوردستان دەكات. باسی ئەو دۆخەی ڕۆشنبیر دەكات كە لە وێنا جوان و فەنتازییەكانی ناو كتێبەوە، بەر لە واقیعێكی تاڵ و دوور لە جیهانی كتێب دەكەوێت. جیهانێك كە واقیع دوور لە هەموو ئەو خەیاڵ و ڕۆمانسییانە جووڵە دەكات كە ڕۆشنبیر لە كتێبەوە بۆ جووڵەی واقیعی وێنا كردووە. واقیعێك كە زۆرجار ئەزموونی گوندییە نەخوێندەوارەكانی، لە تێزی ڕۆشنبیرەكانی وردتر و دووربینترە ((وام هەست دەكرد كە ئەوان لەو قسانەی من كە بۆنی خوێنی براكانی لێ دەهات، قەڵس و بێتاقەت بوون. ئەوانی نەخوێندەوار بەڵام پڕئەزموون و شاهیدی چەندین شۆڕشی شكستخواردووی كورد، ترووسكەی هیوا لە چاویاندا كز و كزتر دەبوو)).((منێكی خوێندەواری مێشك بە گیاكەڵەی ئایدۆلۆژیا تەنراو. پاش پێنج ساڵان بەو قەناعەتە گەیشتم كە ڕەشەخەڵكەكە لەمێژ بوو پێی گەیشتبوون)).

«ئەزموون و یاد» كتێبێكە ناوڕ لەو ڕووە تاریك و ڕوونانەی بزووتنەوەی كورد دەداتەوە و ڕەهەندی تراژیدیی ئەو ڕووداوانە بە شێوەیەك دەگێڕێتەوە كە خاڵی نییە لە پەند و عیبرەت بۆ نەوەكانی داهاتوو. ڕەنگە ئەمە یەكەم كتێبی یادەوەری بێت كە ئەمەندە بە ڕۆحێكی مرۆییانە نووسرابێت و هەوڵی دابێت ڕووە تراژیدییەكانی ئەو كارەساتانەی بوونە هۆی قوربانیبوونی براكان لە شەڕی یەكتیدا دەربخات. «ئەزموون و یاد» بیرهێنانەوەی ئەو ڕووە تاریكانەی ژیانی سیاسیی كوردستانە كە دەبێت دووبارە نەبنەوە. كتێبەكە یارمەتیمان دەدات باشتر و قووڵتر لەو پارچەبوون و كەرتبوونە ناوەكییەی هێزەكانی كوردستان تێبگەین كە تا هەنووكە وەك هەڕەشەیەك خەیاڵی سیاسیی مرۆڤی ئێمەی بەجێ نەهێشتووە.

# فڕین لە شەودا!

گیاڕەشەی بەهارە، گیاوگوڵ تا چۆکان هاتووە، مانگ دەسبازی لەگەڵ پەڵەهەورە مەستەکان دەکا کە بە نازەوە لە دەوری سەمادەکەن. لە نێوانی دەستبەردان و چوونەدەستی پەڵەهەورەکاندا، گورزەتیشکێ هەڵدەخلیسکێ و خۆی بە برژانگەکانی ئێمە دەگرێتەوە. ئێمە نەرم و لەسەرخۆ، بە نێو پەڵەگەنمی وەکەروێشکەکەوتوودا ڕێ دەکەین. بۆن وبەرامەی گوڵان، خانەخانەی قوڵاییەکانی هەست لێواولێو دەکەن. سەراپام شیلەی خۆشییەکی لێ دەچکێ.. شادییەک وەک ئەوەی بەرەو لەدایکبوونێکی دیکە بزووێم، هەست بە قورسایی جەستەم ناکەم، مینا زیندانییەک کە دەرکەی زیندانی لێ دەکرێتەوە و پێی دەڵێن: فەرموو تۆ ئازادیت، چۆن بە پێیان نا، بەڵکە بە دوو باڵان بەرەو فەزای ئازادی دەفڕێت، منیش هەست دەکەم زیندانی شار بەجێ دێڵم و بەرەو دنیایەک کە لە خەیاڵمدا دروستم کردووە، هەڵدەفڕم! من لە دنیای خۆمدا دەفڕم و شێخەعلیی هاوڕێ و ئامۆزا و هاوزام لە پێشمەوە بە کاوەخۆ هەنگاو دەنێ. چارەکەسەعاتێک دەبێت بە ڕێگاوەین و هێشتا دیواری بێدەنگیمان نە بەزاندووە!
بە بێدەنگی لە نێو بێدەنگیی شەودا، بەرەو بنار سەردەکەوین. لە یەکەم گوندی بناردا وچانی بۆ دەگرین و لەگەڵ کازیوەدا نیتر ماڵئاوایی لە شێخەعلی دەکەم و بەبیدارێکی چاوەڕوانکراوی دەسپێرم.
گوندی تایەن، زێدی خۆمانە، گوندی عەبابەیلێ کە دەکەوێتە پێنج کیلۆمەتریی ڕۆژهەڵاتی هەڵەبجەوە و لە پایینی «شنرۆێ»دا شانی داداوە، دەبێتە مەنزڵی ئەم شەومان و پاشتر من دەبێ بە چیادا هەڵگەڕێم و شێخەعلیش بگەڕێتەوە شار.
هەرچی لە گوند نزیکتر دەبینەوە، کانیی یادەوەرییەکانم زێتر ئاوەزێ دەبێت و وێنە باڵدارەکانی دەورانی منداڵی، باڵای بینینەکانم لەخۆ دەپێچن و لەژێر تریفەی مانگدا چاوشارکێ دەکەن.
منداڵیی و خەونە ڕەنگاڵەییەکانی، تەنیا ئەنوایەکی پڕ ئارامیی و هێلانەیەکی هەڵفڕینن کە لە سەردەمەکانی دواتری ژیاندا، پەنایان بۆ دەبەینەوە.
درەختەکانی «قەتارەتووان» لە بنەوە ڕا، وەک دەستەیەک سەرباز لە حوزووری فەرماندەدا بێجووڵە و سەروپۆپیان وەک دەروێشانی ئەڵقەی زیکر بە دەم شنەبای شەوگارەوە بە یەکدا دێن...
هەر یەکە و توتکەسەگێکمان سنگ کردووە و بە دوی خۆماندا ڕایاندەکێشین.. توتکەکەی حەمەتۆفیق پەتەکەی لە ملدا توند دەبێت و وەختە بخنکێت.. ئەرێوەڵا خنکا.. خنکا! ئەو بە خێرایی پەتەکە شل دەکاتەوە.. توتکەسەگ ئاهێکی پێدا دێتەوە. ئێمە لە حەمەتۆفیق ناگەڕێین و دەڵێین: خوا هەردوو

چاوت کوێر دەکات. چونکە تۆ ئازاری توتکەکەت داوە! چی بکەم تا خوا بمبوورێت؟! ئەو بە نیگای پڕ ترسەوە دەڵێ. ئێمە بە یەکدەنگ: دەبێ ماچی بکەیت! ئەو دووجاران ئەملاولای توتکەسەگ رادەموسێ! ئێمە دەیکەینە هەلاّ و بە چەپڵەوە هاوار دەکەین: گلاّو گلاّو گلاّو بوو، توتکەماچکەر گلاّو بوو! حەمەتۆفیق دەست دەکاتە گریان و ئێمەش دەڵێین: دەبێت دەمولێوت بە قوڕەسوورە بشۆیت و گلاّویی خۆت دەربکەیت.

قەتارەتووان، پەرژینەدرەختی نێوان باخی حاجی شێخەلی و ئەو رێگایەیە کە لە گوندەوە بۆ شار دادەگەڕێ. حاجی شێخەلی، مێردی «پووره کافەم» بوو. کوڕێکی هەبوو بە ناوی ئەکرەم کە هاوتەمەنی من بوو. هەر لەم باخەدا هاوینی ساڵی ١٩٥٨ کچێکیان بوو، ناوی «حوریەت»یان لێ نا... بۆ وەزارەت بۆ وەزارەت حیزبی شیوعی بۆ وەزارەت! ئەوە حاجی شێخەلییە«کە جارێ نەبووتە حاجی»، لە پێش داپوورەی خەڵکی گوندەوە هاوار دەکا و بەرەو هەڵەبجە مل دەنێ! ساڵانی زێڕینی تەمەنی «حشع»ـە. هەموو خەڵکی گوند بە ئۆمی و شێخەوە، هەندێ خێزانی لێ وەدەرنێی، مەست و بەنگی درووشمەکانی ئەو حیزبەن. دانیشتوانی عەبابەیلێ، بوونەتە دوو بەرەی داوەکوشتە. بەرەی زۆرینە کە جوتیار، وەرزێر، سەپان و دارکێشی گوندن و هەندەک لە ماڵە شێخانیشیان ڕەگەڵ کەوتوون، بەرەی دیموکرات و دژە دەرەبەگ و ئاغان و کەمینەش، ماڵەشێخان و ژمارەیەکی ریزپەڕ لە رەشەخەڵکەکە، داکۆکی لە پارتی و بنەماڵەی شێخان دەکەن.

چەند هەنگاوێک ژوورتر، ئێمە لە نێوانی مەرقەدی ئیمامقاسم و ئەبوعوبەیدەدا وەستاوین. بۆچی وەستاوی؟!

من دەڵێم: پێم خۆشە کەمێک لە ماڵی مردووان رامێنم!

ــ دایکە! ئیمامقاسم و عەبابەیلێ کامیان گەورەن؟!

ــ کوڕم هەردووکیان ئەسحابەی پێغەمبەر و وەلیی خودان و وەک یەک گەورەن!

ــ ئەی بۆچی مەزاری ئیمامقاسم تەنیا دیواری هەیە و گومەزی بۆ درووست نەکراوە؟

ــ ئیمامقاسم سەر و سایێتە لەخۆی ناگرێت و سەرپۆشکردنی پێ خۆش نییە. دەڵێن دەیانجار سەقف و گومەزیان بۆ درووست کردووە و بەیانی کە هەستاون، نە سایێتە ماوە و نە گومەز!

ــ دایکە! ئەوان کەی مردوون؟

ــ ئەوان هەرگیز نامرن، ئەوان شەهیدی دەستی کافرن و ئێستاش زیندوون! باوکم چەندین شەو ئیمامقاسمی بە چرایەکەوە دیوە کە چووتە سەردانی عەبابەیلێ... باوکم لەرزی لێ هاتووە و لە هۆش خۆی چووە!

لەژێر داربەڕووە گەورەکەی نێوشەخسدا، لە نێوان ئیمام و عەبابەیلێدا وچانێکی بۆ دەگرین. ڕوو

لە مەرقەدی ئیمام دەکەم. ئەو کونە پیرۆزەی کە لە بەشی خوارەوەی حەسارەکەدایە و هێندەی دەمی کولانەقەلێک دەبێ سەرنجم بەند دەکات... سەرت دانەوێنە! بەردەکەی بنەوە ماچ بکە! تۆ جوانکەیت و دوعای تۆ گیرایە! لە ئیمام بپاڕێوە و دوعا بۆ خۆت و بۆ منیش بکە. خۆت بیی بە موعەلیم و مرازی منیش حاسڵ بێت. ئەمە قسەی گەورەکچێکی نارەزوو لێتکاو بوو.

مەرقەدی عەبابەیلێ! عەبابەیلێ هاوار! بۆ خاتری ئەو سەرە پیرۆزەت کە لە «جەلیلە» بە شمشێری کافران ژێ کرا و هەتا ئێرە بە ئاسماندا فڕی، بمانپارێزە! خێراکەن! بۆ ناو مەرقەد.. دەرگاکەمان کردەوە، شێخ جەلال لە پێشەوە و ئێمەش کە ژمارەمان پازدەکەسێک دەبوو بە دوای ئەودا، خۆمان خستە حەرەمی مەرقەدەوە! دەنگی گوللەتۆپەکان بێشکەی مەرقەدەکەیان دەلەرزاند. کەسێک لە دەلاقەی مەرقەدەوە سەیری ناو گوندی کرد و گوتی: ئاوایی وێران بوو، ماڵبەماڵی بێژرا! ژنەکان بەدەم نزا و بەچاوی پڕ ترس و فرمێسکەوە، باوەشیان بە بێشکەی مەرقەدەکەدا دەکرد و دەپاڕانەوە. خۆرئاوا، گرمەی تۆپان بڕا. گەورەکان بە ڕاکردن و ئێمەی منداڵیش بە شوێن ئەواندا، بەرەو گوند ڕۆشتین.. ژن و پیاو بەیەکدا دەهاتن. مزگەوت بۆنی خوێنی گرتبوو. شێخ جەلال بانگوسەلای هەڵدا! ئازادی تەنیا کوڕی، پارچەیەکی وێ کەوتبوو و دەستبەجێ گیانی سپاردبوو. ئازاد، بە مەزەندەی من، ئەوێ ڕۆژێ ١٦ ساڵان بوو. پورەکافەم، گوللەتۆپێکی بە تەواوی بەر کەوتبوو و جەستەی کردبووە چەند پارچەوە. ئەکرەم و کاریم و حورییەت بێدایک کەوتن. ڕەشەی بابەی دوکاندار کە من زۆرم خۆشدەویست، تەرمەکەی لەسەر تاتەشۆری مزگەوت ڕاکشێنرابوو.

وێنەیەکی خوێناویتر کە تا ئێستاش لە ڕۆژنەی بیناییمدا کاڵ نەبووەتەوە، کوڕێکی هاوتەمەن و هاوپۆلی خۆم بوو بە ناوی «حەمەی ئەولەخوێل»، پارچەیەک لە ئەستوورایی ڕانی دابوو، لاقە براوەکەی کەسێک هەڵیگرتبوو و خۆیشی نیوەزیندوو، وەکو جوانەگای سەربڕاو خوێنی لێ دەڕژا و پەلی دەکوتا، بە باوەشی پیاوێکەوە بەرەو مزگەوتیان دەهێنا. ئیتر من نە لەسەر کورسیی قوتابخانە و نە لە کۆڕی سێباز و چاوشارکێ و مزرەحێندا، ئەو هاوڕێیەی خۆمم بینییەوە.

بە نێو کێلی گۆڕەکاندا هەنگاو دەنێین. کێل بە کێلیان دەناسمەوە... ئەمە گۆڕی شێخ ئەنوەرە.. شەوێکی هاوینی ساڵی ٥٨ یان ٥٩ بوو کە هەموو خەڵکی گوند بەرەو ئاوشەخس ڕایان دەکرد. تیشکی چرای ئۆتۆمبێلەکان لە هەڵەبجەوە هەتا بەرپێی ئاوایی پاڵپاڵێنیان دەکرد و تەرمی خوێناویی شێخ ئەنوەریان لە دەربەندیخانەوە هێنابووەوە. ترس و سامی وشەی کوشتن وەکو مردن نەبوو. ئاخر ئەوێ دەمێ لە سەردەمی پاشایەتیدا، چەندساڵ جارێک کەسێک نەدەکوژرا. ئەو ڕووداوە نەک بۆ ئێمەی منداڵ، بگرە بۆ گەورانیش جێگای ترس و تۆقاندن بوو. شێخ ئەنوەر، لە دەڤەری ئێمەدا، یەکەمین قوربانیی ململانێی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعی عێراق بوو.

ئەو، وەک گەورەکان دەیانگێڕایەوە، گەنجێکی هەتا بڵێی جوانخاس و بەهێز و ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە کە لە بارێکی نادیاردا، چەند کەس بە نێزە لە دەربەندیخان کوشتبوویان. کارەساتی ئەو کوشتنە تا چەند ساڵ دواتریش دەماودەم دەگێڕدرایەوە و چەندین بەیت و باڵۆرەی بۆ هەڵبەسترابوون. چەند کێلێک ئەولاتر، ئەمە وریای شێخ عەزیزە.. وریا، هاوڕێ و هاوتەمەنی ئێمە بوو. ساڵی ١٩٦٢ بۆ یەکەمجار ئەفسەرێکی پۆلیس، لە نێو شاری هەڵەبجەدا تیرۆر کرا. وریا، بەر گوللەی وێڵ کەوت و تەرمەکەیان هێنایەوە بۆ عەبابەیلێ. ئێستاش وێنەی جەستەی دابێژراوی وریا کە لەسەر تەختەی مردووشۆری مزگەوت ڕاکشێنرابوو و ئێمە لەسەربانی چاخانەکەی گوندەوە لێمان دەڕووانی، لە هزرمدا کاڵ نەبووەتەوە.

ئێمە، ئەوەیەک بووین، لەنێو بۆنی خوێن و هەواڵی مەرگەساتی هاوتەمەنەکانی خۆمان و کەسانی لە خۆمان گەورەتردا هەڵکشاین. ئێمە کە ژیان ساتەوەختێک بۆمان نەخەنیبێت، دەستەمە لە ئێستا و داهاتووشدا کەمێک بۆ ژیان پێبکەنین.

لەژێر فشاری زەمەندا و بە ناچاری گۆڕستان جێ دەهێڵین و لە کۆڵانی باخانەوە، سەرەوژوور بەرەو ماڵی «مامە شێخ کەماڵ» سەردەکەوین.

تەلاری مامەشێخ کەماڵ، دوو نهۆم و لە دواخاڵی بەرزی ئاواییدا جێ کەوتووە. کە منداڵ بووم، پێم وابوو، تەلاری هێندە گەورە لە هیچ شوێنێکی ئەم دنیایەدا نییە. خانوویەکی بە بەرد و قسڵ دروستکراوی لە چەندین ژوور و دوو تارمە پێکهاتوو کە ژمارەی هۆدەکانی هەرگیز بۆ من دیار نەبوون. ژوورەکانی نهۆمی خوارەوە و کادان و کیلەر و ئەنبار و ئاغڵ و تەویلەکانی دەورووپشتی تەلار، جێگای چاوشارکێ و ڕاکەڕاکە و گەنمگرد و جۆبڵاو و یارییەکانی دیکەی سەردەمی منداڵیی ئێمە بوون. تارمەی نهۆمی سەرەوە، ڕوو لە باکوور و تارمەی نهۆمی خوارەوە ڕوو لە خۆراوا و بەسەر گونددا دەڕوانێ و واوەتریش شاری هەڵەبجە و هەموو تەختایی شارەزوور، دەنێتە بەر ئاسۆی بینینت.

کانییەبەهارێ، چەندسەد مەترێک ژوورتر لە تەلار، ئاشکێرێ ئاوی بە لوورەوی لێ هەڵدەقوڵێ و بە جۆگایەکدا کە تازە چیمەنتۆڕێژ کراوە، دەڕژێتە ئەستێلێک کە بە بەرد و چیمەنتۆ لەبەردەم تەلاردا دروست کراوە، پاشتریش لە گەرووی ئاشێکی چکۆلانە ڕۆ دەبێت کە ئێستا لەکار کەوتووە و تا ساڵانی شەستەکانیش ئەو ئاشە، شەو و ڕۆژ دەگەڕا و باراشی گوندی دەهاڕی.

لەسەر ئەستێلەکە، سەکۆیەکی گەورەی چیمەنتۆڕێژ دروست کراوە کە هاوینەشەوان جێگای دیوەخانی زستانان دەگرێتەوە. لێرەدا، مامە شێخ کەماڵ لەسەر کورسییەک دادەنیشێ و میوانی دیوەخان و کوڕانیشی لەسەر دۆشەکی نیسفەنجی لاکێشەیی چوارمشقی یان لەسەر چۆک دادەنیشن و کۆڕی

دیوان بە باسوخواسی رۆژگار گەرم دەبێ. من لە تەمەنی مێردمنداڵیمدا، هەمیشە خەونم بە دانیشتنی نێو دیوەخانەوە دەبینی. بەڵام هەتا هەژدە ساڵانم پڕنەکردەوە و خوێندنی زانکۆم دەست پێ نەکرد، ئەو متمانەیەم نەبوو، ئەو خەونەم نەهاتە دی. لە تەمەنی منداڵیدا، دەشیا لە پایینی دیوەخاندا جێگایەکت هەبێت و گوێ لەفەرمایشت و گێڕانەوەکانی گەورەساڵان بگریت، وەلێ قسەکردن بۆ منداڵان نەشیاو بوو.

بۆ ئێمەی منداڵ، خۆشترین کاتی دیوەخان، پاش کاتژمێری نۆی ئێوارە بوو کە مامەشێخ کەمالم دیوەخانی چۆڵ دەکرد و دەچوویە نهۆمی سەرێ بۆ خەوتن. ئیتر مەیدان بۆ «رەحیم» چۆڵ دەبوو.

رەحیم، خەڵکی گوندی دەڵەمەڕ بوو کە دەکەوێتە تەنیشتی عەبابەیلێ و مەودای نێوانیان تەنیا سێ کیلۆمەترێک دەبێت. رەحیم هەر لە تەمەنی مێردمنداڵییەوە هاتبووە ماڵی مامە شێخ کەمال و لەوێ دەژیا. ئەو نە وەرزێر، نە سەپان، نە گاوان و باخەوانیش، کەچی لە کاری هەموواندا، گەر ئارەزووی هەبایە بەشداری دەکرد و لە هەموو بابەتێک دەدوا و قسانی دەکرد. رەحیم نەخوێندەوار بوو، شتێک لە زمانی عەربی دەگەیشت و بە کەیفی خۆی دەنگوباسی رادیۆکانی راڤە دەکردن. رەحیم کە باسی جەنگی ئیسرائیل و عەرەبانی دەگێڕاوە، جۆرێک بوو، وەک ئەوەی خۆی لەوێ بوو بێت. ئەو کە لە گێڕانەوەدا نوقم دەبوو، بە شێوەیەک لەزەتی لێ وەردەگرت، بە دەستجوڵاندن هێمای بۆ جۆنییەتی بزووتنی لەشکرە جیاوازەکان و بە دەمیش لاسایی دەنگی رێژنەی گوللە و تەقینەوەی گوللەتۆپەکانی دەکردەوە.

من و شێخعەلی لەسەر ئەستێلەکە وەستاوین. کات لە دوانزەی ئێوارەی رۆژی ٦ی نیسانی ١٩٧٨ نزیک دەبێتەوە. چرای دیوەخان خامۆشە. گلۆپێکی نیۆنی سپی، لە تارمەکەی خوارەوەدا دەگرێ و تیشکەکەی لە ناوی ئەستێلەکەدا بەرەواژ دەبێتەوە. شێخعەلی، بە پلیکانەکاندا سەردەکەوێت و منیش بە دوایدا....

تەق تەق.. تەق

دەرگا دەکرێتەوە. بەرودوا ئاودیوی دیوەخان دەبین. «نەبی»بوو دەرکەی کردەوە. کوڕەکان لە خەو رادەبن و بەخێرمان دێنن. نیشانەی حەپەسان لە رووخساریاندا دیارە.

ـ چۆنە وا بەم نیوەشەوە؟

ـ من کەمێک کارم هەیە و بەیانی زوو دەڕۆم.

ـ بۆ کوێ؟

ـ بۆ لای جەماعەت، دەبێ لە کوێ بن؟

_ کوا ئەوان شوێنیان هەیە، هەر سەعاتە و لە شوێنێکن.
_ کەسێک دەتوانێ شێخ عەبدوڵا ئاگادار بکاتەوە؟
ئەبێ، هەستا رۆیشت و زۆری پێ نەچوو لە گەڵ شێخ عەبدوڵادا هاتنەوە. لەگەڵ شێخی ئامۆزا و هاورێمدا یەکترمان ماچ کرد. ئەو بە هاتنەکەی ئێمەی دەزانی. شێخ عەبدوڵا، ئەو سەردەمە و پاشتریش کە من لە شاخ بووم، دەستێکی برواپێکراوی گەیاندنی هەواڵی نێوان شاخ و شار بوو. مانگێک پێشتر، حەمە ئاوات و حەمەی حەمەسەعید « کە پاشتر بوویە مامۆستا شاهۆ»، هەر لەم دیوەخانەوە بە هاوکاری شێخ فەتاحی کورەگەورەی مامەشێخ کەمال، لە بەهارەشەوێکی بە لێزمە و تۆفاندا، رەوانەی شاخ کرابوون. شاهۆ، کارمەندی دائیرەی کشتوکاڵ بوو. ئەو، نزیکەی ٣٠٠٠دیناری هەرەوەزیی جوتیارانیشی لەگەڵ خۆی بردبوو کە بۆ ئەو کاتەی شۆڕش چەرەدەپارەیەکی زێدەپێویست بوو.
_ ئەمشەو دەرۆی یان سبەینێ زوو؟
_ تۆ باشتری دەزانی... لە کوێ دەیانبینم؟
_ دەتوانی بچیتە گوندی هاوار و لای کەریمی سەی مراو سۆراخیان بکەیت! ئەگەر پێویست بکات خۆم لەگەڵت دێم!
_ پێویستم بە کەس نییە، منیش وەکو تۆ شارەزام!
_ کەواتە ئەمشەو لێی بخەوە و بەیانی لەگەڵ سپێدەدا، ملی رێگای شنروێ بگرە. لە ملەی هەڵوژە، کەمێ وریای خۆت بە. نەکا سەربازی رەبایەکانی شنروێ، بێنە سەر رێگاکە.
من، شێخ عەبدوڵا دڵنیا دەکەمەوە. ئەو هەڵدەستێ و ئەملاولام ماچ دەکات و ماڵئاوایی دەکات. ئەبێ، تێشووی سەفەرم بۆ دەپێچێتەوە و لە ژوورسەرمی دادەنێ... چرای دیوەخان دەکوژێتەوە و ئەوان لێی دەخەونەوە و منیش بە هیوای دووسێ سەعات خەوتن رادەکشێم.
دەستم دەگوشرێت.. چاو هەڵدەبرم.. شێخعەلی دەڵێ: سەعات پێنج و نیوە و وەختییەتی. توێشەبەرە لە پشتم دەبەستم و بێسرتە هەردووکمان لە دیوەخان وەدەر دەکەوین و لەسەر ئەستێلەکە یەکدوو شڵپ ئاو لە دەموچاومان وەردەدەین. بەلای راستدا لەسەربانی تەویلەکانەوە، سەرەوژوور وەرێ دەکەوین. بە بەر ماڵی داودبەگدا تێدەپەرین و چەند هەنگاو ژوورتر لەسەر بەرزاییەک روو لە شار دەوەستین.
_ چاوەروانی نامە و هەواڵت دەکەم. هەرکات پێت باش بوو منیش دێم.
_ هەواڵم دەبێ، وەلێ بۆ هاتن پەلە مەکە!
لەگەڵ شێخعەلیدا ئاوێزان دەبین و دواماچی ماڵئاوایی بە یەک دەبەخشین. ئەو سەرەوخوار، روو لە هەڵەبجە دادەگەرێت و منیش ئامبازی هەورازی شنروێ دەبم.

بستەبستی ئەم رێگایەی مارئاسا لە قەدوبالآی شنرویّ ئاڵاوە، شارەزام و هێدی هێدی سەردەکەوم. کەسانێک کە لە گوندنا لە دایک دەبن و گەورە دەبن، باخ و باخچە، گرد و قەدپاڵ، بنکاچ و نواڵ، ملە و زەنوێر و زنار، ئەشکەوت و کونەبەردی دەڤەرەکەیان دەبنە بەشێکی نامێتەبووی یادەوەرییەکانی ژیانیان.

منداڵانی گوندی، پێچەوانەی منداڵانی شار، سرووشت و رەگەزەکانی بە هەموو جوانی و دلۆڤانی و هەندێک جاریش درێوی و دلڕەقییانەوە، دەبنە بەشێک لە پێکهاتەی رۆحیان و هەرجۆرە جێگۆڕکێیەکی جوگرافیش لە سەردەمەکانی دواتری ژیانیاندا، توانای سڕینەوە و پاکتاوکردنی یەکجارەکیی کارکردی ئەو رەگەزانەیان لە بینای رۆحی و ئەقلیی ئەواندا نییە.

بە دەم رێگاوە ئاوڕێک دەدەمەوە... تەمێکی سپی وەک برنجۆک لەژێر یەکەمین تیرۆژی ئەم بەیانییەدا، زیوئاسا دەبریسکیّ و سەرتاسەری شاری تەنیوە. لەژێر تارای ئەو تەمەدا، شەقام و کۆڵان و ماڵبەماڵی شار دەبینم... دایکم لە تەنیشت قۆرییەچای دەمکراودا، دانیشتووە و تەسبیحە سەدویەک دەنکییەکەی بە دەستەوەیە و لێم دەڕوانیّ...

_ رۆڵە، ئەمجارە ئیجازەکەت کەی تەواو دەبیّ؟!

_ نازانم.. رەنگە هەرگیز تەواو نەبیّ!

_ چۆن شتی وا دەبیّ؟، مەگەر ناچیتەوە بۆ عەسکەری؟

_ نا... دایکە گیان ئیتر سەربازی تەواو؟

_ چۆن ؟ تەسریح بووی؟

_ نا پەلە مەکە با بچینە ماڵی ئاواز و هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم. لەم سەرجادەیە ناتوانم هیچ بڵێم.

ئەم گفتوگۆیەی نێوان دایکم و من، لەسەر شۆستەی یەکێک لە شەقامەکانی شاری سلێمانیدا بوو. رووخساری دایکم زەرد هەڵگەڕابوو، لێوانی دەلەرزین و بە ئاستەم هەنگاوی دەبزوا.. دایکم ئەوسات، بە مەزەندەی من، ٦٢ ساڵیّ دەبوو. لە ماڵی ئاوازی خوشکەزام گوتم:

_ دایکە! من مەترسیی گرتنم لەسەرە و دەبیّ لە سبەینێوە خۆم وەشێرم.

_ خۆشاردنەوەی چی؟ ئەی دوایی چی دەکەیت؟

_ دەبیّ بچمە شاخ!

_ یەعنی دەبیتە پێشمەرگە؟!

_ ناچارم... دەنا دەمگرن و گرتنیش لەسەر سیاسەت، بۆ کەسێک کە سەرباز بێت، بیّ هیچ دادگاییکردنێک گوللەباران دەکرێت!

_ ئەی نابێ ئەم سیاسەتە نەکەیت و رەنجی چەند ساڵەی من و خۆیشت بەفیڕۆ نەدەیت و هەناسەساردم نەکەیت؟
_ نا. تازە کردوومە و پاشگەزبوونەوەی نییە.
_ بیست و چوار ساڵە من چاوەڕوانی تۆم و شانزە ساڵە تۆ دەخوێنیت. من بەتەما بووم لە سایەی تۆدا ئەم چەند ساڵەی ژیانم بەسەر بەرم.
_ دایێڵێ... دایکە گیان دایێڵێ! هەموو ئەو کەسانەی دەگیرێن و لەژێر لێدان و ئەشکەنجەدا دەیانکوژن، هەموو ئەوانەی لە شاخن و رۆژانە شەهید دەبن، ئەوانە هەر هەموویان دایک و باوکێکیان هەیە، ژن و منداڵیان هەیە.. زۆربەیان مامۆستا و خوێندکاری زانکۆکان بوون... هەموویان کەسێک و کەسانێکی خۆشەویستی خۆیان چاوەڕوانیان بوون، بەڵام...
_ بەڵام چی؟ من ئەزانم ئیتر تۆ نابینمەوە!
_ نازانم دەمبینیتەوە یان نا... من بڕیاری خۆمم داوە و هاوڕێکانیشم چاوەڕێم دەکەن.
_ ئاخر من دەزانم کە هیچتان بە هیچ نابێ و ئێوە دەرەقەتی ئەم دەوڵەتە نایەن... مەلامستەفا بەو هەموو هێزەوە، پاشی ئەو هەموو کوشتوبڕ وماڵوێرانییە، سەرئەنجام هەرەسی هێنا و وەکو بەفرەکەی پار توایەوە!
_ ئێمە و بارزانی دووشتی جیاوازین. ئەو پشتی بە بێگانە بەستبوو، ئێمە بە خۆمان و بە خەڵک. ئەو کارێکی کرد و ئێمە کارێکی دیکە دەکەین. شۆڕشی ئەو کۆن بوو، ئێمە شۆڕشی نوێمان هەڵگیرساندووە!
ئەو شەوە، تا بەرەبەیان لەگەڵ دایکم قسانمان کرد. من گوتم و ئەو نەیبیست. ئەو شەوە، دایکم بارتەقای هەموو چرکەکانی تەمەنی فرمێسکی بەسەردا باراندم. ئەگەر بارانی فرمێسکی دایکم تێزابیش بایە، تۆزقاڵێک لە کێوی وردی منێکی خوێنگەرم و بێئەزموونی نە دڕووشاند و دڵی نەرم نەدەکردم.
بەیانی، ماڵئاواییم لە دایکم کرد و ئێستاش پاش بیست و چوار ساڵ لەو چرکەساتە، وێنەی دایکم لە هزردا کاڵ نەبووەتەوە. کە لەوێ وەدەرکەوتم، یەکسەر چوومە ماڵی سەباحی حەمەچاوەش. سەباح، هەم هاوڕێی منداڵی و هەمیش هاوڕێی زانکۆم بوو. ئەو ئەندامێکی چالاکی یەکێک لە کۆمیتەکانی کۆمەڵەی مارکسی _ لینینی کوردستان بوو لە شاری سلێمانی و ڕێکخەری من بوو.
سەباح لە ماڵەوە بوو و چاوەڕێی دەکردم. ئەو ئاگاداری کردم کە ئاگاداری کۆمیتەی هەرێمەکانی کردووە و نامەیەکیشی وەرگرتووە کە من لەگەڵ خۆم، بۆ خۆناساندن بیبەم.
پاشنیوەڕۆ، لەگەڵ سەباح رۆشتینە ماڵێک لە گەڕەکی سەرشەقام. خاوەنماڵ، کوڕێکی گەنج بوو، بە

ناوی هاوڕێ جەمال، پاشان بە جەمال دیموکرات ناسرا. جەمال، کرێکاری کارگەی جگەرە بوو. ئەو هاوڕێی کۆمەڵە بوو و لە ماڵێکی کۆن و پەرپووتدا دەژیا. من بە بینینی جەمال گەلێک دڵخۆش بووم و دڵنیا بووم کە کاری ڕێکخستنی کۆمەڵە لە شاردا، کەسانێک جێبەجێی دەکەن، لە چینی کرێکارن. سەباح، منی بە هاوڕێ جەمال سپارد و خۆی ڕۆشت. من دوو ڕۆژ لە ماڵی جەمال مامەوە و شەو و ڕۆژێکیش لە ماڵی باوکی، تا بتوانێت لە ڕێگایەکی باشەوە بمگەیەنێتە مەفرەزەکانی ناوچەی قەرەداغ.

جەمال، لە ماوەی چوار ڕۆژدا کارەکەی بۆ مەیسەر نەکرا. ئاخر ئەو دەمە، دۆزینەوە و پەیداکردنی مەفرەزەکان کارێکی ئاسان نەبوو. من کە لە هەوڵەکانی جەمال نائومێد بووم، ئاگاداری سەباحم کردەوە کە مۆڵەتم بدەن تا من خۆم مشووری کاری خۆم بخۆم.

ڕۆژی دوایی، ماڵی جەمالم جێ هێشت و چومە لای قادری حاجی حەمەشەریف کە ئەوسات لە خەستەخانەی سەربازیی سلێمانی سەرباز بوو. قادر، هەم ئەندامی کۆمەڵە و هەمیش هاوڕێی خۆم بوو. ئەو کە لە دەرمانخانەی خەستەخانەی سەربازی کاری دەکرد، سەرچاوەیەکی باشی پەیداکردنی هەواڵی ئەو پێشمەرگانە بوو کە بە برینداری دەست ڕژێم دەکەوتن یان شەهید دەبوون و تەرمەکانیان دەست دوژمن دەکەوتن. دابینکردنی دەرمان و پێویستییەکانی کاری پزیشکی بۆ مەفرەزەکانی شاخ، بەشێکی تر بوو لە ئەرکەکانی قادر و هاوکارەکانی.

دوو شەو لای قادر مامەوە و پاشان بە پشتیوانی پێناسەیەکی سەندیکای ئەندازیارانی کشتوکاڵ کە ساڵی پێشوو وەرمگرتبوو، خۆم گەیاندە هەڵەبجە. ئێستاش وا تەمومژی بەهاریی لە ڕووخساری هەڵەبجە ئالاوە و لەژێر تینی هەتاودا دەدرەوشێتەوە. منیش هەورازی شنرویم لەبەردەممدا تخێڵ کردووە و لە پاییی ملەی هەڵۆژەدا وەستاوم، گا لە شار و گا لە بەهەشتی هەورامان دەڕوانم.

# چاڵەبەفرەکان دەسووتان!

لێرەدا، لە هەمواری نێوشانی ملەی هەڵووژەدا، گەر ڕوو لە هەورامان ڕاوەستیت، ئەوا دەستی ڕاستت هاوچمکی تووڵەڕێگایەکە پێچاوپێچ بۆ لوتکەیەک سەردەکەوێت کە بەسەر هەردوو هاوینەهەواری «قەمان» و «وەزگێڵ»دا دەڕوانێت و دەستی چەپیشت باسکەوباسک بەرەو دوندی «ملەی تاوێرە»سەردەکەوێت.

لوتکەی پشتی «قەمان»، بەرزترین ترۆپکی چیای شنرۆیە و پێی دەڵێن «بەفری میری». ئێستا سەربازگەیەکی لەسەر هەڵتۆقیوە.

لە بەرزایی بەفری میرییەوە راوەستە و بە هەردوو ئاقاردا هەڵڕوانە، تا چاو هەتەر بکا، ناوچەکانی کوردستانی هەردوو دیوت لێوە دیارن.

شنرۆێ، دەستێکی بە دەستی زنجیرە چیای «باڵانبۆ»وەیە و دەستەکەی دیکەشی شانبەشان و ملبەملە، شۆڕدەبێتەوە تا لە بناری شارەزووردا قووڵ ڕۆدەچێ و بە چەندین کەرتەشاخی گا ڕژد و گا هەموار، دەگاتەوە دامێنی چیاکانی هەورامان.

تۆ لێرەدا، بە گەردنی شنرۆێوە، وەکو پنتێکی نەبینراو هەڵواسرابیت، ئەگەر کەمێک سەرت لە مێژووی نێوچەکە دەربچێت، یاوەکو هێندەت تەمەن هەبێت کە بەشێکی ڕووداوەکانی مێژووی نزیکت لە یادەوەریی خۆتدا هەڵگرتبێت، ئیدی وێنە خوێناوییەکانی جەنگ و پێکدادانی نێوان کورد و داگیرکاران، کورد و کورد، سەراپای بینینت دەتەنن...

«عاشوور» و «بابل»، کیلۆمەترێک دوور لە هەڵەبجە، لوولەی تۆپەکانیان ڕوو لە شنرۆیە. پرچی خورماییی زەردەپەڕ لە گەردنی چیا ئاڵاوە و لەگەڵ دەنگی هەر گوللەتۆپێکدا، ئێمەی مێردمنداڵ، توند هەردوو گوێمان بە لەپی دەستانمان دەگرین و چاو لە باڵای بەمەرگ حوکمدراوی شنرۆێ دەبڕین.. لە پێشدا چەخماخەیەک و پاشان دووکەڵێکی ڕەش خۆیان لە بیناییمان دەسوون.. دەستمان هەڵدەگرین و گرمەی تەقینەوەی گوللەکە دەگاتە بیساییمان.. گرمەیەک، دووان، سیان، دە و ئیتر لە ژماردن نایەن...

_ با گرەو بکەین!

_ چۆن؟

_ ئەم تۆپەیان لە کوێ ئەدات؟

ـ باشه، بەڵام لەسەر چی؟
ـ قاپێک موحەلەبی!
ـ قەبوڵمە... ڕێک ناوەڕاستی چاڵەبەفرەکان.
ـ من دەڵێم قوتەی مللەی تاوێرە!
ـ دۆڕاندت، چاڵەبەفرەکانی گرتا.
ـ دۆڕام، بەڵام بەفر ناسووتێ!
ـ دەبینی کە دەسووتێ و ئەمشەو هێرشیان بۆ دەکەن و تەوێڵە و بیارەش دەگرن و تا ئێران ڕاویان دەنێن!
ـ ئێوە بە پشتی حکومەت و دەبابەکانی هێرش دەبەن!
ـ ئێوەش بە پشتی چریک و تۆپی ئێران!
ـ درۆیە، کەس چریکی ئێرانی نەبینیوە!
ـ نەیبینیوە، بەڵام دەیبینن!
ـ ئەگەر هەموو دنیاش بگرن، دەیدەنە دەست حکومەت و لەشکرەکەی.
ـ دا بێئەقڵ! کاکەم دەڵێ: مامجەلال خۆی لێرەیە و هێزی گەرمیان و قەراخیشی هێناوە، کە هەورامان گیرا، ئەوسا بارەگای حیزب و مامجەلال دەچێتە تەوێڵە و لەوێوە شەڕ لەگەڵ حکومەتدا دەکەین!
ـ ئێوە جاشن... جاش! جاش ناتوانێت شەڕ لەگەڵ حکومەتدا بکات!
ـ خۆتان هەم جاشی ئێرانن و هەم بە تۆپی ئەوان خەڵکی هەڵەبجە دەکوژن... دوێنێ، شەش کەس لە ماڵێکدا بە تۆپی ئێوە کوژران.. ئەمشەو تۆپەکەشتان دەگرن!
لەگەڵ «حەمەبچکۆل»دا لێمان دەبێتە دەمەقاڵە و گرەوەکەمان لە بیر دەچێتەوە. لەژێر باڵی تاریکایی شەودا، لەشکری حیزب لە چەندین لاوە لە شنرۆێ و هەورامان وەردەبن.
ـ شەڕ تەواو بوو! مزگەوتی پاشا پڕیەتی لە لاشەی «مەلایی، تەرمی «عەزیز ئەتروشی» لەوێ کەوتووە! ئەو بوو کە هەموو ڕۆژێک تۆپبارانی شاری ئەکرد، ئیتر شار بێخەم دەبێ! وەرە با بڕۆین! حوسەینی هاوڕێمە کە بە عەشرەتەوە لە هەڵەبجەن و زۆر نییە باوکی بە دەستی ژنێکی ڕۆڵەکوژراوی مەلایی، لەنێو شاردا تیرۆر کراوە! لەگەڵ حوسێندا بەرەو مزگەوت غار دەدەین. خەڵکوخوا خەریکی شۆردن و کفنکردنی تەرمەکانن. لە جەستەی خوێناوی و جلوبەرگی دڕاویان ڕادەمێنین. ئێمە، بەم سەرکەوتنەی پێشمەرگەکانی حیزب دڵخۆشین. حوسەین، دڵخۆشترە و وا هەست دەکا تۆڵەی باوک و کەسوکارەکەی کە بە دەستی مەلاییەکان تیرۆر کراون یان لە شەڕدا کوژراون، کراوەتەوە.
(یا عەبابەیلێ گێسکێک و شەکێ

حیزبی و مەلایی بکەیتۆ وە یەکێ!)
ئەمە نزوولەی ژنێک بوو کە وەک تیسکەی تفەنگ بە لاماندا تێپەڕی و کوڕەگەورەکەی ئەو شەوە لە شنرویێ کوژرابوو.
ئێستا من، بە نێو ئەم دۆڵەدا و سەرەوخوار بەرەو «دەربەندی ئەشکەوەڵ»، شۆڕ دەبمەوە، کە لەزاری دەربەندیش ناودیو بووم، ئیتر گوندی «هاوار» و باخەکانی، ئامێزم بۆ دەگرنەوە.
دۆڵی ئەشکەوەڵ، لە دەستپێکدا فراوان و وردە وردە تەنگ و تەنگتر، تا بە تەنگایی دەربەند دەگات و ئیتر لێرەدا، هەردوو بەر، تا چاو بڕ بکات، زەردەمای بەرز و سەخت و رژدە و نێوانیان دەریچەیەکی تەسک کە تاکەسوار بە زەحمەت لێی دەرباز دەبێ...
پێچی دووکەڵ لە قولایی ئاسمان گیربووە. ماڵبەماڵی هاوار داگیرساوە، غەڵبەغەڵێکم دێتە گوێ.. تەقەی سم و پرمەی کوڕژنی ئەسپان لەودیوی دەربەندەوە... لە هەردوو بەری دەربەند دەڕوانم.. چاوم رەشکەوپێشکە دەکات.. لەبن هەر تاوێرێک و لە پەنای هەر دارەوەنێکی ئەستوورەوە، ملەقوتەی کەسێک و بریسکەی لوولەی تفەنگێک دەبینم... دەربەند بەسەر یەکدا دەڕووخێت.. بەرایی لەشکری ئینگلیز دەگاتە نێو دەربەند و تەرزەگوللەیان بەسەردا دەبارێ.. گوێم لە ئەعرەتەی «شێخ رەشید و شێخ کەریم»ی کوڕانی شێخ مەحمودن کە سەرکردایەتی لەشکری عەبابەیلێ و هەندێ لە پیاوانی هۆزەکانی ئەیاری «عادیلەخانم»، دژ بە سوپای ئینگلیز دەکەن.. لە پێناوی خودا و نیشتمان و پاراستنی ماڵ و موڵک و ژن و منداڵانماندا، غەزای کافران واجبە! لە قۆڵی ئەوبەرەوە، سەی موراد و خالۆ تۆفیقی هاواری سەنگەریان گرتووە و داکۆکی لە دین نا (چونکە ئەوان کاکەیی و ناموسڵمانن)، بەڵکو لە نیشتمانی هاوارییان دەکەن...
گوێم لە دەنگی شێخ ئەولایە و دەنەڕینێ: بکوژن غەزایە! ئێمە تەنیا نین، وا لە قۆڵی خورماڵەوە لەشکری مەحمودخانی دزڵی و جافرسانی لهۆنیش هێرشیان کرد. سوارەی «سیخ»، یەک لە دوای یەک دەگلێن و جەنگاوەران بە خەنجەری رووتەوە پەلاماریان دەدەن. لاشەی ئینگلیزان، لە دەرکەی دەربەنددا کەڵەکە دەبن و من خەمی دەربازبوون دامدەگرێت... پۆلێ سوێسکە لە تیخەشانی ئەوبەری دەربەندەوە فجوق دەکەن و بێئاگا لە من، دوو مەتر ئەولاتر دەنیشنەوە. بە چواردەوردا هەڵدەڕوانم. جگە لە قاسپەی کەوان و وپتەوپتی سوێسکەکان، دەنگێ نایەت... چاوەدووربینەکانی یادەوەریم، وێنە تۆزلێنیشتووەکانی مێژووی ساڵانی یەکەم جەنگی جیهانییان دەخوێنندەوە!
لە گەرووی دەربەند دەرباز دەبم و «هاوار»، مینا کیژۆڵەیەکی شەرمن، لەژێر تارای تەمێکی سپیدا، چاوەکانی دەدرەوشێن.

# هەر دەڕوا و ناکا پێچی شاخ تەواو!

زەویەسوور، وەکو ئەو فەرشە مەخمەڵییانەی لە فڕگەی وڵاتاندا بۆ پێشوازیی گەورەپیاوان و سەرەکدەوڵەتان رادەخرێن، بە رەنگی یاقووتییەوە، لە دامێنی دەربەندەوە دەڕژێتە بەرایی ئاوایی.
چەندسەد مەترێکم مابوو تا سڵاو لە یەکەم ماڵی «هاوار» بکەم، لەپڕ بە دەستی چەپدا بۆ نێو ئەو چەمە چرگەنەی بە بەردەم ئاوایيدا درێژ دەبێتەوە و دواتر تێکەڵ بە بەردەوامیی چەمی «تەوێڵە» دەبێت و پێچاوپێچ بەرەو گوندی «گریانە» و پاشتریش لە دەراوێکی بە لرفە و هاژەدا، لە هەناوی وەچەپۆکانکەوتووی «سیروان»دا ون دەبێ.
بامدایەوە.
باخێکی بەهاری... باخێک لە دارگوێز، دارهەنار، دارچواڵە و هەڵوژە و هەموو دارەکانی تری باخچەی خوا! باخێک بە رەنگ و بۆن و تامی «نیسان»ەوە.
لەسەر کانییەبەهارەیەک وچانم بۆ گرت و توێشووم لێ کردەوە.
لەوێوە، هێندەی چڵوپۆپی تێکچڕژاوی درەختان بواری دەدا، جموجوڵی نێو ئاواییم وەبەر سەرەنج دا. نە ئەوێ و نە هیچ گوندێکی دیکەی ئەو دەڤەرە، بۆ کەسانی لاپرسەن و نەناسراو نەدەکرا شوێنی دڵنیایی بن. مەفرەزەی جاشان، گوند بە گوند، لە شوێن پێشمەرگە دەگەڕان و ڕاویان دەکردن!
پاڵم بە کەڵەکەبەردێکەوە دا و چاوم لە قەدی ئەستووری سوورەچنارێک بڕی و وەک ئەوەی لەوێدا کتێبێک بخوێنمەوە، لەژێر لێوانەوە قسانم دەکرد...
مەملەکەتی شێخ مەحمود و شۆڕشی بارزانییەکان، کۆماری کوردستان و شۆڕشی ئەیلوول... ئەیلوول و ئاشبەتاڵ و شکست و خۆوەدەستەوەدان... خەبات، خوێن، هەستان و گلان و دیسانیش هەستانێکی تر... شەن وکەوکردنی خەرمانی ئەم ئەزموونە شکستخواردووانە و گەڕان لە دوی بەرسڤێکی قەناعەتهێنەر، بۆ من نە کارێکی زێدە سەخت بوو و نە پێویستیشم بە خۆماندووکردن و خۆسەغڵەت کردن هەبوو! کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینی کوردستان، لە دەستوور و بڵاوکراوە نهێنییەکانی خۆیدا و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیش لە بلاَڤۆکی (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆچی)دا، هەموو مەسەلەکانیان وەکو هێلکەی پاککراو، دەرخواردی من و هەزاران گەنجی خوێنگەرمی وەکو من دابوو! واتە ئێمە کە لەژێر کارکردی ئایدۆلۆژیی «م.ل» و لە چوارچێوەی ڕێکخستنی پۆڵایینی کۆمەڵەدا قاڵکرابوین و خاراودرابوین، جێگای هیچ جۆرە گومان و دڵەڕاوکێیەکی فیکری و سیاسی لە هزرماندا نەدەبوویەوە!

تەواوی شۆڕشەکانی کورد، بە شۆڕشی ئەیلوولیشەوە: سرووشتی چینایەتییان، شێوە و سترەکتۆری ڕێبەرایەتییەکەیان، ئایدیا و ئامانج و ڕێبازیان، بازنەی پەیوەندییە سیاسییەکانیان، هۆی شکست و هەرەسەکانیان، لە تیۆر و فیکری کۆمەڵەدا، بە موتڵەقی و کۆنکرێتی ڕاڤەکرابون و ئەڵتەرناتیڤی شۆڕشگێڕانەشیان بۆ دانرابوون!

* ڕێبەر و سەرکردەی شۆڕشەکان؛ سەرەکخێڵ و پیاوانی ئایینی، دەرەبەگ و کۆنەپەرست و بەشێک لە بورژوای نیشتمانی، کە ویست و ئامانجەکانیان چ وەک کەس و چ وەک چین، لەگەڵ نێوەرۆکی شۆڕشی کورددا یەک ناگرنەوە و بەیەک ناتەبان. واتە ئەوان هیچیان شاسواری ئەو مەیدانە نەبوون و پێداویستییە فیکری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی سەرکەوتنی شۆڕشیان درک نەدەکرد. ئەوان هەمیشە کەسانی نەفەسکورت و ڕاڕا و سازشکار بوونە. ئەوان، بەرژەوەندی خۆیان و چینەکەیان پێش بەرژەوەندییەکانی شۆڕش داناوە و لە بارودۆخە نالەبار و دژوارەکاندا، چۆکیان داداوە و پشتیان لە میللەت و دۆزەکەی کردووە!

* درککردن بە نێوەرۆکی چینایەتیی شۆڕش و دیاریکردنی هێزی بنچینە و بزوێنەر، چینی سەرکردە و ڕێبەر، هێزە هاوپەیمانە کۆمەڵایەتییەکان لە فاکتەرە گرنگەکانی سەرکەوتنن کە لە شۆڕشەکانی پێشوودا بایەخیان پێ نەدراوە، یاوەکو پێچەوانە مامەڵەیان لەتەکدا کراوە.

* پشتنەبەستن بە خۆ و بە جەماوەر، خۆگرێدان بە هێز و دەوڵەتە ناوچەییەکان و متمانەپێکردنیان، وایان کردووە کە شۆڕشەکانی کورد، ببنە کارتی گەمەی سیاسیی نێوان ئەو دەوڵەتانە و ئەنجامیش بە هەرەس و ناشبەتاڵ بشکێتەوە.

* دروانەبوون بە تیۆری خەباتی پارتیزانی، نەبوونی تیۆری زانستی شۆڕش، بەهەند نەگرتنی «چاوگی شۆڕشگێڕی» و قەبوڵ نەکردنی تێزەکانی شۆڕشی جەماوەریی درێژخایەن و پراکتیزەنەکردنی پرانسیپەکانی «ماوتسی تۆنغ» لەمەڕ شۆڕشی ڕزگاریی نیشتمانی، لە خەسڵەتە دیارەکانی شۆڕشەکانی کورد بوون.

نووسینەوەی ئەم سەرخەتە فیکری و سیاسییە گشتییانەی کۆمەڵە و یەکێتی، لە بەرپاکردنەوەی شۆڕشی «نوێ»دا، دەشێ یارمەتی خوێنەرانێک بدات کە ئەو سات لەبەر هەر هۆیەک لێیان بێئاگا بوونە و ئێستا پاشی چارەکە سەدەیەک، بیرهێنانەوەیان بۆ گەیشتن لە شۆڕش و وەهمی شۆڕش، دەشێ یارمەتیدەر بن و مرۆڤ بکارێت بەراوردێک لە نێوان تیۆری دێوجامەناسای شۆڕش و ئەو دەرئەنجامە پراکتیکییانەی کە لە پرۆسەی «شۆڕش» دەکەونەوە، بکات.

من ئەوێ دەمێ، پاشی دووساڵان خەباتی ژێرزەمینی لە نێو ڕیزەکانی «کۆمەڵەدا»، هەندێک لە دانراوەکانی لینین و دوو کتێبی جیڤارا و «چەپکێک لە وتەکانی ماو»م خوێندبوونەوە و ئیدی خۆم

بە «رامبۆ»یەکی لە شکاننەهاتوو دەزانی و چەندسەد پێشمەرگەیەکی کۆمەڵەشم بە کرۆکی لەشکری رزگاریی گەل دەبینی کە لە ماوەیەکی درێژخایەندا، جەنگی پارتیزانی لە شاخەوە بۆ شار پەرە پێ دەدەن و ئەنجام، کۆماری «کوردستانی سوور» دادەمەزرێنن!

بە کورتی، مەودای ئەقڵ و تێڕامان و بیرکردنەوەی سیاسیی من، وەکو خوێندەوارێکی سەرچڵی تازەوەخۆکەوتووی دەرویشسیفەت، سنووری بەرنامەی کاڵ و کرچی کۆمەڵە و بەرکوڵی هەندێ کتێبی سیاسی و ئایدۆلۆژیی چەپێکی جیا لە گشت چەپە باوەکانی دیکە، تێنەدەپەڕی.

من باس لە ئەقڵ و ئاوەز و کەمئەزموونیی خۆم دەکەم و بە پەیژەی ئاستی تێگەیشتن و درکی کەسی دیکەدا هەڵناژنێم. دڵنیاشم زۆربەی زۆری ئەو خوێندەوارانەی کە جێگایان لە ریزەکانی کۆمەڵەدا گرتبوو و لەو رۆژگارە سەختانەدا داینەمۆی ئەو بزووتنەوە فیکری و سیاسی و چەکدارییەیان هەڵدەسووڕان و ئاڵاهەڵگرانی شۆڕشی «نوێ» بوون، لە هەندێ کات و شوێنیشدا موعجیزەیان دەخولقاند، رادەی ئاستی دڵسۆزیی لێ وەدەرنێی، بازنەی تێگەیشتنی تیوری و سیاسییان لە مەودایەکی دیارکراودا هاتوچۆی دەکرد!

_ کلکی ئەم بزنەڕێیە بگرە و دەست لە دەستی چۆمەکە بەرمەدە، پاشی سەعات و نیوێکی تر، خۆش بڕۆیت، لە گوندی «گریانە»یت.

پیاوێکی بەساڵاچووی ریشسپیی سمێڵزلی بە دووکەڵی جگەرە زەردهەڵاتوو، رێگای دواقۆناغی وەها نیشان دام. لالۆی هاواری، کە لەناکاو لە ژێڵاوە هەڵتۆقی، پاشی چۆنی و خۆشی و ماندوونەویکردن، لێکۆڵینەوەیەکی وردی لە تەکدا کردم... خەڵکی کوێی؟ کوڕی کێی؟ بۆچی دەچیتە گریانە؟ کێ دەناسی و دەچیتە ماڵی کێ؟ من دەمویست بە کورتەوەڵام لە کۆڵی کەمەوە، کەچی ئەو زیاتری لەگەڵ ورد دەکردمەوە و لە قسەکانم وەگومان بوو...

_ برا، وەخوا حیچی لەوە ناچێت تۆ خزم و کەسوکارت لە گریانە وێ. ئەگەر بۆ لای جەماحەت ئەچی، بۆچی راس نایەژی! دوێشەو لەگرە وێ و مەعلوم ئێسا وان لە گریانە.

پاشتر بۆم دەرکەوت، کابرا دەیویست تەم و مژی هەر گومانێک کە لەسەر کەسێکی نەناسراو، لە شوێنێکی وەهادا درووست دەبێت، لای خۆی بیرەوێنێتەوە. هاوار، تەنیا گوندی کاکەییانە لەو ناوچەیەدا، کە کەمتر کەسانی ئەفسنزم و گزگلیان تێدا هەڵدەکەوت و بە گشتی خەڵکێکی نیشتمانپەرە و دڵسۆز و وەفادار بوون.

لەسەر پشتی پرەوراز و نشێوی بزنەڕێ و هاوسەفەری چۆمەکە، ئەو چۆمەی لە شارەگوندی تەوێڵەوە، گۆران گوتەنی(هەر دەڕوا و پێچی شاخ ناکا تەواو...)، بەرەو گریانە وەڕێ کەوتم.

ساتێ دواپێچی شاخمان پێچایەوە، لەگەڵ یەکەم خانووی کەلوکۆمی بەرایی ئاواییدا رووبەڕوو

وەستاین. چۆمەکە دەستی لە دەستی من کردەوە و خێراتر لە هەناوی هەڵچووی «سیروان»دا ون بوو. من ئێستێکم بۆ کرد و چاوێکم بە سەرتاپای گوندە چکۆلانەکەدا گێڕا. چەند چەکدارێک، لە سەربانی ماڵێکی ئەوبەری چۆم، سەرنجیان بەندکردم. ئەوانیش هەر هەموو لە منیان دەڕوانی. دیار بوو ئەوان وریاتر بوون و دەمێک بوو منیان وەبەر چاوی دووربینەکانیان نابوو. ئەوان دەستیان بۆ من ڕادا.. من لە جێی خۆم ڕووام! تێفی گومانێک هزری دووکەرت کردم.. نەکا ئەمانە مەفرەزەی جاشان بن!

+ پوری! ئەو چەکدارانە پێشمەرگەن... یان؟

ژنێک کە سەتڵەشیری بە دەستەوە بوو، دەهات بە پەیژەکەدا بۆ بەرهەیوانەکە سەرکەوێت. ئاوڕێکی لەسەرخۆی دایەوە و گوتی:

بەڵێ پێشمەرگەن! بۆ لای ئەوان دەچیت؟

هەناسەیەکی پڕ لە خۆشی و بەخۆنازینم هەڵکێشا و گوتم: بەڵێ!

بەسەر پردەدارینەکەدا پەڕیمەوە و بە چەند شەقاوان گەیشتمە لایان. سلاوم لێ کردن. دەستم گوشین. ئەملاولام راموسین. بەلام... بەلام بۆ من نامۆ و نەناسراو بوون.. ‌چ کەسێکیان بەمن ئاشنا نەبوو! دیسانەوە گومان و ترس!.. باشە پێشمەرگەن. ئەی کێ دەڵێ پێشمەرگەی «قیادەی موەقەت»*نین؟!

_ مامۆستا شێرز دیاریت. ماندوویت یان؟!

_ ڕاستە زۆر ماندووم.. بەلام کەسیشتان ناناسم؟

_ من شەوکەتم! شەوکەتی حاجی موشیر! خۆ ئێمە خزمین و چەند ڕۆژێکیشە چاوەڕێتین!

*ئەو سەردەمە پارتی دیموکراتی کوردستان، لە ژێر ناوی (سەرکردایەتی کاتی)دا کاری دەکرد و وشە عەرەبییەکەی لەسەر زمانان بوو.

# تیشک لە چاوانیان دەباری!

وێنەیەک کە یانزە ساڵێ پێش ئەو سات لەماڵی خۆماندا لە «شەوکەت»م هەڵگرتبوو، لە هزرمدا سەوز بوویەوە و شەوکەتی لەبەرانبەرمدا وەستاوی، پێ ناساندمەوە.

_ ئەمە کاک ئەحمەد گریانەییە/ فەرماندەی مەفرەزە... کاک عەلی شامار/ لێپرسراوی سیاسی... عومەرچاوجوان، حەمەی حەمەسەعیدی سۆسەکان، سدیق، فەتاح، عەبدولکەریم، سەلاحی حاجی عەلیی عەبابەیلێ، دکتۆر ئاوات و مامۆستا شاهۆ، چوونەتە جەولەی ناوچەی شەمێران و ئێمەش دوو ڕۆژی تر دەچین... باش بوو فریا کەوتیت. شەوکەت بوو کە هەندێ لە پێشمەرگەکانی پێ ناساندم.

شەوکەت، ئێستا بزۆزەکانی بەند کردم... دەستێ جلی مەرەزی شینکی، پووزەوانەی تا بەرئەژنۆ هەڵکێشراو، جامەدانیی نوێی تازەشۆراو، ریش جوانتاشراوی پەرداخکراو، چەک و تفاقی پێشمەرگایەتیی تەواو... بە مەسئول دەچوو، مەسئولێکی شۆڕشی کۆن، نەک کۆنی بە نوێ نێوئاخنکراو. شێوەی یەکەم مەسئولێک کە من دیتم، لە رواڵەتدا هیچ جیاوازییەکی نیشان نەدام و بۆ فیکر و نێوەڕۆک و هەڵسوکەوتیش، پاشتر تێی گەیشتم!

پێشمەرگەکان، زۆربەیان ڕیشنەهاتوو، شرۆڵە و چڵکن و پڵکن، رووخساریان ماندوویێتیی لێ دەتکا، کەچی تیشکێک لە چاوانیاندا بڵاچەی دەدا.

بۆ شیوخواردن، لەگەڵ ئەحمەد گریانەیی و شەوکەت و دوو پێشمەرگەی دیکە چووینە ماڵی ئەحمەد. منیان بە دایک و باوکی ئەحمەد ناساند... پێشمەرگەی نوێ و لە هاوڕێیانی شارا من کەمێ بەخۆدا شکامەوە. چۆن مرۆڤ لە چەند ساتێکدا دەبێتە پێشمەرگە؟! منێک نە چەکم پێیە و نە هەورازێکم بڕیوە و نە شتێک لە هونەری سەختی شەڕی پارتیزانی دەزانم... (فێر دەبم! فێردەبم و کەسانی دیکەش فێر دەکەم.. ئەگەر مەرگ مەودام بدات، پەیامی خۆم، پەیامی شار و فەنتازیای نێو کتێبەکان دەکەمە کردەی شۆڕشگێڕانەی خەباتی شاخ.. پەیامی شۆڕشی نوێ.. نوێ بە فیکر و تیور، بە شێواز و ڕێباز و هەڵسوکەوت.. هەڵسوکەوت لەگەڵ خۆمان و خەڵکدا پەیامی شۆڕشێ لەخەڵکەوە بۆ خەڵک، دەبمە بورغویەکی گچکەی دانەمۆی خەباتی لەدایکبوونی حیزبی پێشڕەو لە بۆتەی خەباتی چەکداری و سازدان و جۆشدانی جەماوەردا خەباتی هۆشیارکردنەوەی خەڵکی زەحمەتکێش و لەگۆڕنانی مۆتەکەی ترس و ورەبەردان و خۆوەدەستەوەدانی پاش هەرەس، لەنوێ ڕا تۆوکردنەوەی گەشبینی و هیوا و بڕوابەخۆبوون....). من بە دەم نانخواردنەوە، ئاوا لەگەڵ خۆم دەدوام!

بۆ خەوتن، رۆشتینە مزگەوت و ئەوانی دیکەش هاتنەوە. لەو ئێوارەوە و هەتا ئەمساڵان، ئیدی جگە لە مزگەوت و بن ئەشکەوت و کۆنەکەلاوان، من ماڵێکی دیکەم نەبوو... ئاوا بە درێژایی شۆڕشی درێژخایەن، دەستمان بەسەر ماڵی خواد گرت و کردمانە ماڵی خۆمان!

ئەو شەوە، من میوانی خۆشەویستی کۆڕی مزگەوت بووم. ئەوان پرسیان دەکرد و منیش بەرسڤم دەدان.. کە دەهاتە باسی خەباتی شار و کۆبوونەوە نهێنییەکان و بابەتە تیۆرییەکانی شۆڕش، من وەکو مامۆستایەکی لەخۆڕازی قسەم دەکرد... لە چاوانی هەندێکیاندا پەرۆشییەکی زۆرم بۆ وەرگرتنی بابەتەکان دەبینی. عەلی شامار، نزیک بوویەوە و گوتی: دەبێ لە قسەکردندا ئاگات لە خۆ بێت، هەموو ئەوانەی لە دەورتن و چەکیان پێیە، رەنگە تاسەر نەتوانن پێشمەرگەیتی بکەن. هەروەها شتی دیکەش زۆرن کە سبەینێ بۆتیان باس دەکەم.

پاشتر، من سەری گلۆڵەی پرسیارم بە دەمەوە گرت و ئیدی باسەکە بۆ سەختی و دژواریی خەبات و ژیانی پێشمەرگەیتی و کێشەکانی نێوان یەکێتی و مەفرەزەکانی «ق.م» گۆڕدرا.

شەوکەت، بە توندی دژی رەفتار و هەڵسوکەوتی شەڕفرۆشانە و شۆڕشتێکدەرانەی «ق.م» دەدوا. قسە و بۆچوونەکان، هەمان بوون کە لە شار دەکران و ئەندامانی کۆمەڵە و یەکێتییان پێ گۆش دەکران... جیاوازی نێوان شار و شاخ ئەوە بوو کە لە شاردا، سرووشتی ملانێکان تەنیا لە پەیڤدا خۆی دەنواند. واتە لەوێ ملانێ فیکری و سیاسییەکان، باجەکەی زۆر قورس نەبوو. کەچی لە شاخدا، هەڵوێستەکان پردی جەستەیان لەسەر رووباری خوێن دروست دەکرد و دواڵ و کەندەڵانی وڵاتیان لە تەرمی براکان سەرڕێژ دەکرد!

ئەو لافاوی خوێنەی کە لە ساڵی ١٩٧٠دا، بە بڕیارێکی «بارزانی» بەربەست کرا، دوو ساڵێک بوو خوێنی تێ زابووەوە.

هاوینی ١٩٧٦، ئیبراهیم عەزۆ و هاوڕێکانی، لە ناوچە کوێستانییەکانی کوردستانی تورکیا، بە دەستی هێزەکانی «ق.م» کوژرابوون و بەهاری ١٩٧٧یش، ملازم حەسەن خۆشناو و مەفرەزەکەی لە رێگای گەڕانەوەیاندا لە سوریاوە بۆ کوردستان، لە کوردستانی تورکیا کوژرابوون. واتە شۆڕشی «نوێ» و شەڕی خوێناویی براکان، پێکەوە لەدایک بوونەوە!

چ ئەو سات و چ پاشتریش کە هەندێ لە سیاسەتمەدار و بەرپرسانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، بیرەوەرییەکانی خۆیان نووسییەوە، بۆ گەڕان لە دوی ماکی تەقینەوەی ناکۆکییە خوێناوییەکان و هەوڵدان بۆ رێگەلێگرتنیان، باسیان لە هەوڵی لێبڕاوانەی «یەکێتی» کردووە بۆ بەرگرتن لە ئەگەری هەر دووکەرتبوونێک لە ریزەکانی بزووتنەوەی سیاسی ــ چەکداریی لە نوێژەن هەستاوەی کوردیدا:

* پاشی دامەزراندنی (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان)، خودی مامجەلال نامەی بۆ مەلامستەفای

رەحمەتی نووسیوە و لە بەرپاکردنەوەی شۆڕش ئاگاداری کردووە و داوای هاوکاری و ڕێنمایی لێ کردووە.

* ساڵی ١٩٧٦ لەسوریا، کۆبوونەوە لەگەڵ ئیدریس بارزانی کراوە و ڕێککەوتنێکی لەمەڕ هاوکاری و هاوخەباتی لەگەڵدا ئیمزا کراوە کە بە «ڕێککەوتنی شام» ناو دەبرێ.

پاشتر لە هەموو بۆنە و دانیشتنەکاندا، ئەوە چەندپات دەکرایەوە کە ئیدریس بارزانی گوتوویەتی:(ئێمە شۆڕشیشمان پێ نەکرێت، ئەوا شۆڕشمان پێ تێک دەدرێتەوە!)

ئەو دوو پەرەگرافەی سەرێ، دەشێ شوێنێکیان لە هەر کۆڵینەوە و توێژینەوەیەکی شەڕی براکاندا هەبێت. هەر بۆیە، دەشیا ڕوونووسی ئەو نامەیەی مامجەلال بۆ بارزانی و دەقی ئەو کۆبوونەوەیەی نێوان سەرکردایەتیی تازەدامەزراوی یەکێتی و ئیدریس بەرزانی بڵاوکرابانەوە، بەداخەوە، نە لە گۆڤار و بڵاوکراوە سیاسییەکانی یەکێتی و نە لە بیرەوەرییەکانی چ کەسێکدا، (بە تایبەت نەوشیروان مستەفا)، بوونیان هەیە.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، ئەگەر لە رووی سیاسی و مەیدانیشەوە هەوڵی ئەتەقینەوەی ناکۆکییەکانی دابێت، ئەوا لە رووی فیکر و تیور و سایکۆلۆژییەوە، رەوایی دامەزراندنی خۆی و دەستپێکردنەوەی خەباتی سیاسی و چەکداریی پاش هەرەسی، لە شکست و داڕووخانی شۆڕشی ئەیلوول و ئەفیکردنەوەی تەلاری فیکری و رێکخراوەیی پارتی و بنەماڵەی بارزانیدا دەبینی. دیارە کۆمەڵەی مارکسی _ لینینی کوردستانیش کە داینەمۆی هەڵسووڕێنەری فیکر و سیاسەت و دنیابینیی ئەوێ رۆژێی «یەکێتی» بوو، رۆڵی گرنگی لە تویرڕێژەکردنی خەتە فیکری و سیاسییەکاندا دەبینی.

من لە دید و تێفکرینی ئێستامەوە، بۆ رووداوەکانی ئەو سەردەمە و رۆژگاری ئەمڕۆش، ناتوانم یەکلایەنە کێشە و دەرکەوتەکان ببینم. ئەو درەختی خوێنە گوڵگرتووەی لە دۆزەخی شەڕی براکاندا شین بووە، ریشەکەی لە زەوینەی مێژوو، فەرهەنگ، هەلومەرجی کۆمەڵایەتیی میللەتی ئێمەدا چەقیوە، بەڵام کەس و سەرکردەکان، رێبەر و توێریستەکان، ئاستی دید و تێگەیشتنیان بۆ شیکردنەوە و تەفسیرکردنی بارودۆخی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی، سیاسی، سرووشت و خەسڵەتەکانی کۆمەڵگە، رۆڵی گرنگ لە دەرکەوتنی رووداوەکان و چارەنووسی رەوتە سیاسییەکاندا دەبینن.

ئەو سەردەمە، ئەشتەری کینە و تۆڵەسەندنەوەی دێرین، لێزانانە ساودەدران و هێزەکان بۆ پاوانکردنی جوگرافیای دەسەڵات( لوتکە و گرد و دۆڵە خوێناوییەکان!)، وەگەڕ دەخران. شمشێرە سیاسییەکانی نێو میحرابەکانی فیکری دۆگما و سندوقی «ئەشتەرخان»ی خێڵ، لەسەرەوە ئاگایانە هەسان دەدرانەوە و ئێمە و ئەوانی بێئاگا و خوێنگەرم، لە خوارەوە دەمانوەشاندن!

رۆژی دوایی، هەواڵی نزیکبوونەوەی مەفرەزەیەکی «ق.م» گەیشت. وەسەر شاخ کەوتین و سەنگەرمان گرت. لەگەڵ «عەلی شامار»دا گابەردێکمان کردە هەواری یەکترناسین. عەلی خەڵکی خانەقین بوو. ئەو ساڵێک بوو هاتبووە شاخ و لە کادرەکانی سەرەتای کۆمەڵە بوو. عەلی، لە ماوەی ئەو ساڵەدا، ناوچەیەکی فراوانی کوردستانی پێوا بوو.

عەلی شامار، باسی کێشەکانی شۆڕش و گرفتەکانی نێوان کۆمەڵە و بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستانی بۆ کردم. ناکۆکییەکان، تا رادەی رکلێبوونەوە و دان لە یەکدی جیرکردنەوە و لە هەندێ ناوچەش (وەکو دەشتی هەولێر)، رێگەگرتن لە کادرانی کۆمەڵە و بە کافر نێودێرکردنیان لە نێو جووتیاراندا. عەلی، لە سەعاتێکدا، وێنەکانی هزری منی دەرهەق بە شۆڕشی سوور، بنکەی سوور، پارتی پێشڕەو، بەرەی نیشتمانیی بە «کۆمەڵە» رێبەریکراو، کاڵ کردنەوە!

## بەو جلوبەرگەوە، لە هەمووشتێک دەچووم، پێشمەرگە نەبێ!

_ کار و لێپرسراوێتی شەوکەت چییە؟
_ ئەندامی لیژنەی هەرێمە
_ لیژنەی هەرێم چییە؟
_ هەموو کوردستان لە رووی ئیداری، سیاسی، هەڵسووڕانی کار و چالاکیی پێشمەرگانەوە، دابەش کراوەتە چەند هەرێمێک و هەر هەرێمێکیش فەرماندەیەکی هەیە... ئێمە سەر بە هەرێمی یەکین کە ناوچەکانی هەورامان، شارەزوور، شارباژێر ، شەمێران و بناری «بەمۆ» دەگرێتەوە
_ ئێ؟ ئەی شەوکەت چۆن لێپرسراوێکە؟
_ ئەو، زیاتر بە مەبەستی تێکدانی ریزەکانی کۆمەڵە، ئێتە ئێرە!
_ چۆن؟
_ لە هەورامان پێشمەرگەی بزووتنەوەی لێ نین... لە قەرەداخیش.. ئێمە هەموومان «کۆمەڵە»ین.
_ ئەی شارەزوور و شارباژێر؟
_ لەوێ تێکلاوین و هێزی هەردوولامان هەن.
_ کێ سەرۆکی لیژنەی هەرێمە؟
_ مەلابەختیار!
_ ئەو ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵەیە... وانییە؟
_ بەڵێ وایە!
_ کەواتە کۆمەڵە سەرکردایەتیی هەرێم دەکات؟
_ دەیکات! بەڵام ئەوە هەموو شت نییە.
_ چۆن؟
_ جارێ زۆرت ماوە... دواتر حاڵیی دەبیت.
سێ شەو و رۆژان جەولەی گوندناوگوند، بەرۆژ خۆحەشاردان و بەشەو هەورازبڕین و دولاودۆڵ پشکنین، گەیاندینیە گوندەکانی «چنار» و «مۆڕبین»ی بناری ئەودیوی چیای «بالآنبۆ»، لەوێدا کە رووباری سیروان و بەنداوی «دەربەندیخان»، ناوچەی «ئەورۆڵی» لە ناوچەکانی لاوران، شەمێران، چیا سەخت و رژدەکانی زمناکۆ و بەمۆ جیا دەکەنەوە.
شەو تا بەیان رێکردن، بۆ منێکی شارنشینی دەستوپێ سپی، ئەزموونێکی سەخت و تاقەتپڕوکێن

بوو. چۆخە و شەروالێکی دوورەنگ و چاکەتێکی کاوبۆی لەبەردا، رەختێک فیشەکدان و برنەوێکی درێژ کە بۆ قەد و باڵای مامناوەندیی من زۆر زیاد و قونداخی لە زەوی دەخشا. وێنەیەک بوو. لە هەمووشت دەچوو لە پێشمەرگە نەبێت... بەم وێنە دەمەرەییەوە، لەگەڵ مەفرەزەکەدا خۆمان کرد بە گوندی «سەرشانە»ی تاوگۆزیدا و لەوێ لەگەڵ مەفرەزەیەکی دیکە کە «حەمەی حەمەسەعید ـ شاهۆ» و «حەمەناوت»یان لەگەڵ بوو، یەکمان گرتەوە.

ئێمە، ئەم سێ کەسە، سێ ئەندامی کۆمەڵە بووین کە بە فەرمانی «کۆمیتەی هەرێمەکان»ی کۆمەڵەی «مارکسی ـ لینینی کوردستانی عێراق»، دەبوو پێکەوە روو لە شاخ بکەین. بەڵام من لێیان دابڕا بووم.

ئەوان هەر زوو کەوتنە هەڵڕژتنی زووخاوی گرفت و کێشەی نێوان پێشمەرگەکان. فەرماندەی مەفرەزەکان، ئەقڵییەتی عەشایری و بوونی مەفرەزەکانی ق م لە نێوچەکەدا.

لە ماوەی هەفتەیەکدا، تێگەیشتم کە من لە دنیایەکەوە بۆ دنیایەکی دیکە هاتووم. لە دنیای تیور و وێنای رەنگاورەنگی شۆڕشی نێو کتێبان، کۆبوونەوە و قسەوباسی سەرمێزی خواردنەوە، پسکەپسکی نێو چاخانەکانی شار و خەباتی نهێنی نێو کوچە و شەقامانەوە، بۆ دنیای واقیعی ناڵەباری خەباتی نێو جووتیاران و ملانێی نێوان ئەقڵییەتی عەشایر و تێڕوانینی رۆمانسییانەی خوێندەوارانی شار بۆ شۆڕشی سوور! جیاوازییەکان بینراو و هەستپێکراو بوون.

کادر و ئەندامانی کۆمەڵە، هەم لە رووی چەک و تەقەمەنییەوە و هەم بەرگ و پۆشاکیان، هەژار و شڕۆڵ دیار بوون. کەچی ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵ «شەوکەت» بوون و لە لە شارەزوور و بناری «سوورێن»ەوە سەرکەوتبوون، تا بڵێی تەسەل و پۆشتە بوون. من دواتر تێگەیشتم کە لێپرسراوانی کۆمەڵە، لەمەڕ هەڵسوکەوت لەگەڵ جەماوەر و چۆنییەتی پەیداکردنی بژێویدا، پابەندی فەرمایشتەکانی ماوتسی تۆنگن. کەچی لە شاربازێڕ و شارەزووردا، لەمێژ بوو ئەڵقەی هەڵسوکەوت و مامەڵەی شۆڕشی کۆن و نوێ لێک گرێدرابوونەوە... باج و سەرانە و گومرگ و مەڕومالاّتی دەوڵەت فرۆشتن و پاشتریش کۆکردنەوەی رێژەیەک لە پارەی «قەرەبووکردنەوە»ی دێهاتە راگوێزراوەکان. سەرچاوەیەکی مشەی داهات بوون کە زۆر نامەشروع دابەش دەکران و دەبوونە ئامرازێک بۆ کڕینی چەک و کۆکردنەوەی چەکدار. لەو رۆژگارەدا، پارەی زۆر لای کام لێپرسراو بووایە، دەسەڵات و هێزیش لای ئەو چڕ دەبوونەوە! هەر زوو جیاوازیی دەسەڵاتی کادری سیاسی و عەسکەری لە لایەک و لێپرسراوی بزووتنەوە و کۆمەڵە لە لایەکی دیکەوە دەرکەوتبوون. هەر زوو ئەندامانی لیژنەی هەرێم(لە سۆنگەی جیاوازی رێکخراوەییانەوە)، ئامادە نەبوون فەرمانی سەرۆکی لیژنەی هەرێم و لێپرسراوی لقی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، وەکو خۆی جێبەجێ بکەن! کڕینی چەک، کۆکردنەوەی پارە و

دابەشکردنی، ڕێژەی دابەشاندنی  پۆستەکان و بەخشینەوەی دەسەڵات، ئەو کێشە ئەبڕاوانە بوون، کە ملانێی نێوان (کۆمەڵە _ بزووتنەوە _ خەتی گشتی)*یان قووڵ دەکردەوە.

# ڕووبەڕوو لەگەڵ جوتیاراندا

_ هەموو خەڵکی ئاوایی کۆدەکەینەوە. تۆ وەکو کادرێکی سیاسی، لەمەڕ شۆڕشی نوێ، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و خیانەتەکانی «ق م»، قسەیان بۆ بکە! ئەمە پێشنیازی «شەوکەت» بوو بۆ من، کە لە پەناوە پێی گوتم.
لەو سەروبەندەدا، کۆبوونەوە لەگەڵ جوتیاران و دانیشتووانی گوندەکاندا، تەنیا ئامرازێکی خەباتی سیاسی بوو کە لە ئامادەنەبوونی ڕادیۆ، تەلەفزیۆن و دەگمەنیی بڵاوکراوە و ڕۆژنامەدا، دەیتوانی کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەبێ. ئەمە شێوازێک بوو، زادەی میتۆدی خەباتی یەکێتیی نیشتمانی، لە ڕۆژگاری سەختی پاش هەرەسدا.
کێ مافی هەیە کۆبونەوە بە گوندییان بکات؟! ئەم پرسە هەمیشە مایەی ملانێی نێوان کادرانی سیاسی و عەسکەری بوو. ئەوی لە کۆبوونەوەکاندا قسان دەکا، وەکو دەمڕاست و لێپرسراوی شۆڕش لە ناوچەکەدا دەردەکەوێت و لە لای جەماوەریش جێگای جۆرێک ڕێزلێنان یان لێترسان دەبێ!
من، بێ سێودوو، بێ ئەوەی ئەقڵم پێ بشکێت و پرسێک بە عەلی شاماری لێپرسراوی سیاسیی کۆمەڵە بکەم، پێشنیازەکەی «شەوکەت»م قەبوڵ کرد. پاشتر هەستم کرد عەلی، لەو کارەی من دڵگران بوو. وەلێ چوون تەمەنی خەباتی شاخم هێندە نەبوو، زۆری بە ڕوودا نەدامەوە. ئەو پاشتر گوتی: ئەوە یەکێکە لە سیاسەتەکانی «شەوکەت» کە دەیەوێت ناکۆکی لە نێوانماندا درووست بکات.
گەورە و بچوکی گوندی «کانیکەوە»ی شەمێران کۆبوونەوە و من دەستم بە قسان کرد. من لە هەوڵی ئەوەدا بووم کە هەموو هزر و هۆشی خۆم بکوشم و ئەو بابەتانەی لە کتێبانا لەمەڕ شۆڕشی ڕزگاریی نیشتمانی ئەزبەرم کردبوون، لەگەڵ واقیعی شۆڕشی لەنوێژەن بەرپاکراوی کوردستاندا تێکهەڵکێشیان بکەم... خەباتی درێژخایەنی لە گوندەوە بۆشار و ڕۆڵی گرنگ و بنچینەیی جوتیاران، وەکو چینی بزووێنەر و داینەمۆی هەڵسوڕێنەری شۆڕش، هاوپەیمانییەتی کرێکاران و جووتیاران وەکو بنچینەی سەرکەوتنی بزووتنەوەی ڕزگاریی نیشتمانی، سیاسەتی فاشیستانەی بەعس و پلانەکانی بۆ بە عەرەبکردنی کوردستان و ڕاگوێزانی زۆرەملێی گوندەکانی کوردستان و کۆکردنەوەی خەڵکەکەی لە ئۆردووگای زۆرەملێی تەلبەندکراودا، پشتبەخۆبەستن و پشت لە داگیرکارانکردن، بەشی سەرەکیی قسەکانی من بوون کە لە سەرەتاوە پچڕ پچڕ و ناڕوون دەکەوتنە بەرگوێ و خۆشم هەستم پێ کردبوون. ئاخر ئەوە یەکەم جارم بوو لە بەردەم ئاپووڕەی خەڵکدا قسان بکەم، جا با ئەو خەڵکەش نەخوێندەوار و لادێی بن! ئێمەی ڕۆژهەڵاتی، لە سۆنگەی داب و نەریتی پەروەردەوە، ئەو گرفتەمان

هەیە و بە ئاسانی ناتوانین دەربڕی ڕا و بۆچوونی خۆمان بین... دڕاندنی پەردەی شەرم و کەمدوویی لەو بوارانەدا، کارێکی ئاسان نییە. ئەو کارە، هەرچەندە ئەستەم بوو، سەد هێندەش خۆشی و بەخۆوەنازینی تێدا بوو. کە باس هاتە سەر شۆڕشی ئەیلول، ئاشبەتاڵ و دەوری سەرکردایەتی پارتی و ماڵباتی بارزانی، لەو کۆستە گەورەیە و ئەو مەینەتییەی کوردی تێکەوتبوو، وەکو دەروێشێکی تەکییەی ئایدۆلۆژیی «م ل» قسەم دەکرد و بە موتڵەقی ددانم لەسەر وشەکان دادەگرت و جەختم لەسەر دەکردن. من لە هەوڵی ئەوەدا بووم کە ئاوێنەی باڵانومای سەرکەوتنی شۆڕش و دامەزراندنی کۆمەڵگای سۆسیالیزمی پاشی ڕادانی دەسەڵاتی ڕژێم و سەرکەوتنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، بدەمە دەستی ئەو گوندییە هەژارانەی کە هێشتا سیما و ڕەنگی باوکی ڕۆحیی کورد «بارزانی»یان لە هزردا مابوو!

وام هەست دەکرد، ئەوان لەو قسانەی من کە بۆنی خوێنی براکانیان لێ دەهات، تەواو قەڵس و بێتاقەت بوون. ئەوانی نەخوێندەوار، وەلێ بەئەزموون و شاهێدی چارەنووسی چەندین شۆڕشی شکستخواردووی کورد، ترووسکەی هیوا لە چاوانیاندا کز و کزتر دەبوو. من لە ماوەی دەساڵی پێشمەرگەیەتیی خۆمدا، تەنیا یەک جووتیارم نەبینی (بە لایەنگرانی یەکێتیشەوە)، کە لە دڵەوە شەڕی «ق.م» و پاشتریش لایەنەکانی دیکەی نێو بزووتنەوە چەکدارییەکەیان پێ خۆش بێت. مێنێکی خوێندەواری مێشک بە گیاکەڵەی ئایدۆلۆژیا تەنراو، پاش پێنج ساڵان بەو قەناعەتە گەیشتم کە ڕەشەخەڵکەکە لەمێژ بوو پێی گەیشتبوون. ئەوان ڕۆژگار لەو بوارەدا زەینی ڕۆشن کردبوون و ئێمەش، جاڵجاڵۆکەی «م ل»ی بە سەقەت وەرگیراوی بە هەڵە پراکتیزەکراو، مێشکی شەتەک دابووین!

*بزووتنەوەی سوسیالیستی دیموکراتیی کوردستان، بیرۆکەی دامەزراندنی لە ساڵی ١٩٧٥دا و پاش هەرەسی ئەیلول، لەلایەن هەندێ کادر و سەرکردەوە، لە شاری ورمێ لە کوردستانی ئێران، باسی لێوە کرابوو و پاشان لە ساڵی ١٩٧٦دا بوونی خۆی ئاشکرا کرد و لەگەڵ کۆمەڵەدا بوونە دوو لاباڵی نێو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان. ئەم ڕێکخراوە، کۆمەڵێک کادر و سەرکردەی ناهاوئاهەنگی نێو شۆڕشی ئەیلولی لە خۆ گرتبوو کە ڕەگ و ڕیشەی سیاسییان لە کانیی هەردوو باڵی ( جەلالی ـ مەلایی)دا ئاویان دەخواردەوە. ئەم ڕێکخراوە، هەر لەگەڵ لەدایکبوونیدا ماکی چەندکەرتبوونی خۆی هەڵگرتبوو.

* خەتی گشتی: مەودای نێوان کۆمەڵە و بزووتنەوە بوو. ئەو پانتاییە بوو کە کەسانی کۆنەجەلالیی لەخۆی دەگرت و ڕاستەوخۆ لای مامجەلالەوە سەرپەرشتی دەکرا... پاشتر باڵێکی بزووتنەوە و خەتی گشتی یەک دەگرن و یەکێتیی شۆڕشگێڕانی کوردستان، درووست دەکەن.

# بەرایی خوێن

سووریێن، کە لە دوورەوەڕا لێی دەڕوانیت، لە شوورەیەکی بەردینی کون و کەلەبەر تێنەکەوتووی لە تەهی ئاسمان چەقیو دەچێت. تۆ ئەگەر جارێک لە سلێمانییەوە بۆ هەڵەبجە سەفەر بکەیت و لە تەختی شارەزوورەوە بە دەستی چەپدا سەیری ئەو زنجیرەچیایە بکەیت کە لە پشتی «ئەحمەدئاوا»وە هەتا سنووری پێنجوێن درێژ دەبێتەوە، وەهات دێتە پێش چاوان کە دیوارێکی لە بەرد و چیمەنتۆ هەڵچنراوی زێدە سەختی بێگیان بێت. وەلێ کە نیازی سەفەر و وەسەرچیادا هەڵگەڕانت هەبێت و جورئەتی کەشفکردنی ئەو دنیا پڕ ئەفسوونەی «سووریێن» وەبەر خۆت نێی، ئەوجا تێ دەگەیت کە ئەمە جیهانێکی پڕ مێرگ، نواڵ، مێرگوزار، زەنوێر، لێڕەوار، کەند و کەندڕ و دەرە، ئەشکەوتی زێدەناسی و پڕ پێچ و پەنای کانیلە تێدا هەڵقوڵاوە.

«دەرەی مەڕ»، لە ئامێزی دەرەیەکی تەنگ و ڕژد و هەڵەموتدا خەوتووە. شەو لەو گوندەدا خەوتین و لەگەڵ سپێدەدا ڕابووین. بەنێو دەرەدا سەرەوژور قەیتوولەمان بەست. سی و یەک چەکدار و سێ پێشمەرگەی بێچەک، هاوڕای سێ پێشمەرگەی ڕێنیشاندەری ناشارەزای لیژنەی هەریم کە سێ ڕۆژ پێشتر لە بناری سورێنەوە، بە نامەی مەلابختیار و شەوکەتی حاجی موشیر و بەکری حاجی سەفەرەوە، بەنیازی گەیاندنی هێزەکەی ئێمە کە لە سێ مەفرەزە پێک هاتبووین، بۆ ڕۆژاوای بناری سوورێن و پاشتر سازدانی هێرشێکی فراوان بۆ سەر بنکەکانی «ق.م» لە «کانی خەیاران» و دەوروبەری گوندی «دزڵی». ئەم بنکانە دەکەوتنە دیوی ئەودیوی بناری سورێن و هەورامانی کوردستانی ڕۆژهەلات. ئەو سێ پێشمەرگەیە، ئەگەر یادەوەرییم یارمەتیم بدات، ئەمانە بوون:

_ هۆشیار حاجی مامەندی

_ ئازاد تۆفیق

_ حەمەی حاجی ئەحمەدی تازەدێ

لەگەڵ ئەو نامە ڕەسمییەی کە بۆ لێپرسراوی مەفەرەزەکان هاتبوو، دوو نامەی منیشیان لەگەڵ بوو کە لە بەکری حاجی سەفەر و مەلابەختیارەوە نێردرابوون. من تا ئەو کات ناوی بەکرم نەبیستبوو، وەلێ بە ناوی مەلابەختیار ئاشنابووم. نامەکان، وێرای بەخێرهێنان، جۆرێک هاندان و ورەوەبەرنانیشیان تێدابوون.

نامەکەی بەکری حاجی سەفەر سەرنجی ڕاکێشام، بە تایبەت کە لە کۆتاییدا نووسیبووی (براتان... پ.م بەکەری حاجی سەفەر).

بەکر. ئەوسات ئەندامی سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە و لێپرسراوی لقی سلێمانیی یەکێتی بوو. هەر لەو نامەیەوە و دواتریش بە درێژایی ساڵانی خەباتی شاخ، بەکری حاجی سەفەر بۆ من جێگای ڕێزی تایبەت و خۆشویستن بوو. ئیمزای نامەکەی مەلابەختیار(هاوڕێتان... مەلابەختیار)، ئیمزای نامەیەکی دیکەی وەبیرهێنامەوە کە لە ٢١ی نۆڤەمبەری ١٩٧٧دا و بە بۆنەی ساڵوەگەڕی لە سێدارەدانی سێ ڕێبەرەکەی کۆمەڵە (شەهاب و جەعفەر و ئەنوەر)، بە ناوی کۆمیتەی هەرێمەکانەوە، بۆ کۆمیتەی ڕێکخستنی هەڵەبجەی نووسیبوو. من ئەگەرچی ئەندامی کۆمیتەی ڕێکستنی هەڵەبجە نەبووم و لە ڕێکخستنەکانی سلێمانیدا کارم دەکرد، وەلێ نامەکە، شەهید ئەنوەر حەمەئەمینی هاوڕێم نیشانی دام.

ئێستا بەیانیی ڕۆژێک لە ڕۆژانی مانگی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٨)ە و چوارسەعاتانە ئێمە بەرەو لوتکەی «مڵەخورد»ی سووریێن سەردەکەوین. دوندی بەرزی مڵەخورد لە بەرزایی ئاسمان تێپەڕیوە، یان من وای دەبینم! لە دەستپێکی ڕێکردنەوە، مێرگ و نواڵی بنار چرگەن و گیاوگوڵ تا چۆکان هاتوون. بۆنی بەیان، (ئاخر بەیانیش بۆنی تایبەت بەخۆی هەیە!) هەڵژەنراو لە بۆنی بەیبوون و چنور و لۆ، ئێوناخن بە ویتەی سوێسکان و قاسپەی کەو، جیهانێک لە فەنتازیات بۆ دەخولقێنێت کە هەموو شتێکی تێدا دەبینی، تەنیا وێنەی جەنگ و خوێنڕژتن نەبێ.

هەتا پتر بە بەژنی سوریێندا هەڵدەزنێی، ئەو پارچەپارچە پۆشاک لە خۆی دەکاتەوە و سنگ و مەمک و گەردنی، ڕووتوقووت، لەبەر تیشکی نیگات دەنێت!

ئێمە لەبەرگەردنی لوتکەدا وچانمان بۆ گرتووە و لە ناکاودا ڕێژنەی گوللەمان بەسەردا دەبارێ، ئێمەش ئاگا لە بۆسەی «ق م». بەوپەڕی شڵەژاوییەوە، بنەبردیان لێ دەکەینە سەنگەر و سەنگەر دژ بە سەنگەر دەوەستێ!

بارێکی دەروونیی شپرز و ناناسا... یەکەم جارمە خۆم لە سەنگەردا ببینمەوە و لە ڕووی دێوەزمەی مەرگدا بوەستم. ئەم ڕێگایەی ئێمە، بەو شێوەیەی لە نامەکەدا، «شەوکەت» ئەخەشەی بۆ کێشابووین، دەبوو بێ هیچ گرفتێک بمانگەیەنێتە شوێنی مەبەست، کەچی بۆ نێو جەرگەی هێزەکانی «ق م»ی هێناوین.

بنەبردەوبنەبرد هەڵدەکشێین.. چەند کەپک و قوتەیەک دەگرین و لێیان دادەمزرێین. سی و یەک چەکدار و چوار بێچەکی ئەشارەزا، لەسەر بەرزاییەکی دوورەدەست و دوورەئاوەدانیی پشت بە هێزەکانی دەوڵەت ئەنراو، بەرانبەر هێزێکی شارەزای تێروتەسەلی پشت بە بنکە و بارەگای خۆی بەستوو لە خاکی ئێراندا، لە جەنگدان!

بە درێژایی بەهارەڕۆژێک، شەڕ بەردەوامە. شەڕی نێوان دوو برا، لەو ترۆپکە بەرزانەدا کە لە

ماڵی خوداوە نزیکترن تا هەوارگەی شەیتان، وەک ئەوە وایە کە بستێکمان لە نزمایی بۆ شەرگە دەست نەکەوێت. ئێمە لە حەوشەی خوادا، لە قوڵە بەرزەکانی خوادا، لە کەوشەنی حەرەمی خوادا، یەکتر دەکوژین و خوداش دەستێکمان لێ هەڵناهێنێ.. پەیڤێکی رەحمەتمان بەگوێدا ناچرپێنێ.. نەعرەتەیەک ناکێشێ و نافەرموێ: لە ولاّتی وێران و داگیرکراوتان بڕوانن. ئاوڕێک لە مێژووی دوور نا، نزیکتان بدەنەوە و خەجاڵەت بکێشن!

ئەحمەدگریانەیی، عەلی شامار، هۆشیارحاجی مامەندی و من. لەبن رکەبەرێکدا دانیشتووین و بە دووربین لە سەنگەرەکانی پێشەوە دەڕوانین!

_ پێکرام!

هۆشیارە. ئەژنۆی راستی لە ئامێز گرتووە و خوێن لە بەشی خوارەوەی پووزی فیچقە دەکات! دەرلنگی شەرواڵەکەی هەڵدەکێشین. گوللەکە، پووزی ئەنگاوتووە، کەچی خوێن بە لوزەو لە بنڕانی هەڵدەقوڵێ. وردتر لێی دەڕوانین و تێدەگەین کە گوللەی ئەفرەتی لە بەشی سەرەوەی پوزییەوە دەرچووە و شاخوێنبەری رانی دڕیوە. برین دەپێچین و تەوژمی خوێن سەر دەکا....

_ ئەمانەتی ئێوە و ئەم کاسیتە. ئەم کاسیتە، وەکو دوادیاری بە کوڕەکەم بگەیەنن.. ئەو تەنیا دوو مانگی تەمەنە.. ئەگەر دەتوانن لاشەکەم بەرنە خوارێ و لەم چیایەم جێ مەهێڵن!

سەری هۆشیار لەسەر ئەژنۆی خۆم دادەنێم. دەست بە کاکۆڵە زەردەکەیدا دێنم و دەڵێم:

برینەکەت سووکە و لە خۆڕا خۆت بێهیوا دەکەیت!

_ مامۆستا! ئەو هەموو خۆێنە دەبینیت چۆن لرفە دەکات؟ مرۆڤێک چەند هێندە خوێنی تێدایە؟!

ئەو هۆشیارەی چەند ساتێک پێش ئێستا هێزی جوانەگایەکی تێدا بوو، وا لە پەلوپۆ دەکەوێت و بە ئاستەم لێوانی پێ دەبزووێن.. رەنگی دێت زەرد و زەردتر دەبێت.. هەموو هێزی خۆی کۆدەکاتەوە و گەرەکییە تەکان بدات. کەچی سەری دەکەوێتەوە ئامێزی من. نەرم نەرم چاوی بە چواردەوردا دەگێڕێ.. لە قوڵایی ئاسمان رادەمێنێ.. لە چاوانیدا دەیان پرسیاری نامەفهوم و ڕاڤەنەکراو دەبینم.. کێ لە نهێنی پرسە قوڵەکانی مرۆڤێکی لە لێواری مەرگدا وەستاو دەگات؟.. ئەرێ دەشێ مرۆڤ لەو ئان و ساتەدا بیر لە چی بکاتەوە و حەسرەت بۆ چی بخوات؟! پەیپێبردنیان ئەستەمە .دەست لەسەر دڵی دادەنێم، هەست بە ترپەی لێدانی ناکەم.. ئێستا چاوەکانی مۆڵەق وەستاون ئیدی زەمەن بۆ ئەو کۆتایی هات! ئیدی کۆمەڵە، کورد و شۆڕشی نوێ، بۆ ئەو هیچ مانایەکیان نەما!

تاقم و مەخزەنەکانی لێ دەکەینەوە. بە جامەدانییەکەی دایدەپۆشین. لە یەکدی دەڕوانین و پەیڤێک بۆ گوتن نییە. پشت لە تەرمی وشیار دەکەم و لە دەشتی گوڵڕەنگی شارەزوور رادەمێنم کە وەک مافوورێکی رەنگینی تا چاوبڕبکات پانوپۆڕ لە بەرپێی سوورێندا ڕاخراوە. ڕەبایەکانی بەعس

کە وەک قارچک لەسەر گردۆڵکەکانی بنار هەڵتۆقیون، ناوناوە بە دەستڕێژێک پیرۆزبایییمان لێ دەکەن.
+ دەبێ بیر لە پاشەکشە و داکشان بکەینەوە! ئەحمەدگریانەیە پێشنیاز دەکات.
_ مامۆستا، تۆ لەگەڵ پێشمەرگەیەکدا برۆ و هاوڕێیانی سەنگەرەکانی پێشەوە ئاگادار بکەرەوە.. ئێمە چاوەڕوانی گەڕانەوەتان دەکەین.
بە ئەنیویدا ملەبەملە سەردەکەوین و دەگەینە یەکەم سەنگەری پێشەوە.
_ شەڕکردن لێرەدا کەڵکێکی نییە.. بڕیارە داگەڕێین!
_ ئێوە لە شوێنی ئێمەدا بەرگری بکەن، کە ئێمە دوورکەوتینەوە، ئەوجا ئێوەش سەنگەرەکە چۆڵ بکەن.. گەر وا نەکەین، سواری سەرمان دەبن! غەفور دەرەشیشی وەهام پێ دەڵێ.
لە بوولێڵی ئێوارەدا، ملەخورد لەژێر بارانی ئاگردا دادەگیرسێ.. سەنگەر چۆڵ دەکەین. دەگەینەوە شوێنی مەبەست و کەسێک نەماوە. هاوڕێیانمان دابەزیون و ئێمەش پێنج کەس بە ترۆپکی ملەخوردەوە بەجێ ماوین! چەکدارەکانی «ق م» سەردەکەون. ئێمە خۆمان حەشار دەدەین. ئەوان تەواو نزیکن و ئێمە بێدەنگ و چرپە! ئەوان گۆرانیی سەرکەوتن دەچڕن! ئێمە لە بیری دەربازبووندایین. ئەوان بەرەو بارەگاکانیان دەکشێنەوە و ئێمەش لە تووڵەڕێی دابەزین دەگەڕێین.
ئەمە تەرمەکەی هۆشیارە! پێشمەرگەیەک وا دەڵێ!
لە دەوری تەرمی بەجێماوی هوشیار چیچکەمان کردووە.. بیر لە ئەو ناکەینەوە، بەڵکو لە خۆمان و چارەنووسمان.
تەنیا یەک ڕێگای دابەزین هەیە.. هەمان ڕێگای بەیانی کە لێیەوە سەرکەوتین! پێشمەرگەیەکی دیکە وا دەڵێ.
بزنەڕێ دەبینینەوە، دەست بە پشتوێنی یەکترەوە دەگرین و بەرەو بنار خلۆر دەبینەوە.. هەمیشە دابەزین لە سەرکەوتن سەختترە!
کاتژمێر سێی بەیانییە و شوێن هەمان گوندی دوێنێبەیانییە. کەس دەرگامان لێ ناکاتەوە.. بە نێو ئێدا دەسووڕێینەوە و سووسەی هاوڕێیانمان ناکەین! بە تۆبزی خۆمان بەماڵێکدا دەکەین.
+ ئەگەر لێرە بمێننەوە، بەیانی جاش و سەرباز دەتانگرن!
_ تەنیا چەند نانێک و هیچی تر.
نان وەردەگرین و مەتارەکانمان پڕئاو دەکەین و لە گوند دەردەکەوین.
لە نێو ئەم پەڵەچنارەدا خۆمان حەشار دەدەین. من وا دەڵێم.
ئێوارەیە.. لە نێوان چنارانەوە ملەقوتێ دەکەین.. باخچەیەک بەرانبەرمانە و جمەی دێ لە چەکدار..

هاوڕێیانی خۆمانن.. پێک دەگەینەوە.
بڕیارمان داوە کە عەلی شامار، پێشمەرگەکانی هەرێم و تۆ، لە شارەزوورەوە بڕۆن بۆ لای لیژنەی هەرێم و ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆ هەورامان! (دیسان ئەحمەدگریانەیە، پاشی راوێژکردن لەگەڵ هاوڕێیانی دیکە، ئەم بڕیارەیان داوە).
ـ من ڕازیم و زۆریشم پێ خۆشە!
دوعاخوازی دەکەین. هێزەکە بەرەو هەورامان دەگەڕێتەوە و ئێمەش لەژێر باڵی شەودا، ڕووەو تەختایی شارەزوور، بە هیوای گەیشتن بە بنکەکانی هەرێم لە بناری سوورێن، دادەکشێین!

# پیاوێکی بەویقار، دڵی لە گوڵ سەرڕێژ کردم

کە لە بناری هەورامانەوە بەرەو پانتایی شارەزوور شۆڕبووینەوە، وردەتاڵی ڕووداوەکانی ڕۆژی پێشوو تانوپۆی بیر و هزریان تەنیبووم. لاشەی ڕاکشاوی بێنەوای هوشیار، ماڵەکانی بینینمی ناگیر کردبوو. ڕەنگە کەسێک بێژێ: چما کوژرانی کەسێک هێندە تێفکرین و لێرامانی پێ دەوێ؟ چما ئەو یەکەم کوردێکە کە لە سەنگەری کوردکوشتندا گلابێت و قەل و داڵان لە جەستەی وەربووبن؟ بەڵێ، بۆ من ئەو یەکەم کەسێک بوو کە لە ئامێزمدا چاوەکانی بارانی پاڕانەوەم بەسەردا بیارێنن و منیش لەو بێدەسەلاتتر بم. من وەهام بیر دەکردەوە کە ئەو خوێنەی لە برینی ئەو ڕا دەچۆڕا و گوڵیلکەبەهارەی «سوورێن»ی تێرخوێن دەکرد، ساڵی پاشتر چیایەکی لە نەفرەت و دنیایەک لە ڕک و کینەی لێ شین ببێ!

چ ڕۆژگارێکی سەخت بوو!

بەعس، گوندبەگوند و گردبەگردی وڵاتی بە ڕەبایە تەنی بوو.. لەو ڕۆژەدا، خۆدەرخستن و ئاشکرابوون قەستی مەرگ بوون، بە تایبەت لە شاروورزردا، مەرگێکی بێ ئەملاوئەولا و مسەوگەر بوو. مەفرەزەیەک لە هەر گوندێک، لە نێو هەر دۆڵ و دەقەرێکدا ئاشکرابایە، دەیان کۆپتەر و هەزاران سەرباز و جاشی بۆ دەبارین.

لەگەڵ دووکەرتبوونی شەوگاردا، گەیشتینە گوندی مەبەست، بێ چرپە و دزناسا خۆمان لە ماڵی «حەمەی حاجی ئەحمەد» کوتا. ئەو شەوەمان لەوێ ڕۆژ کردەوە و ڕۆژەکەیشی تا ئێوارێ، لەوێ خۆمان حەشار دا.

بەیانیی ڕۆژی دواتر، لە گوندی «میری سوور»ەوە بەنێو دۆڵێکی سەخت و تەنگدا هەڵکشاین و پاش نیوسەعاتێک، دووکەڵی بە ئاسماندا هەڵچووی هاوڕێیانمان بینی.

کانی و ئاوێکی روون، لە دەوری پێشمەرگە چایان دەم کردبوو. کەمێک ژوورتر چەند ئەشکەوت و بنڕەمەنێک کە لە یەکێکیاندا کانیلەیەک هەڵدەقوڵا و پلووسکی ئاوەکە لەو بەرزەوە بازرە دەبوویە نێو چۆمەکە. مەلابەختیار ئەم ئەشکەوتەی کردبوویە بنکەی خۆی.

مەلابەختیار و بەکری حاجی سەفەر، دوو وێنەی تەواو جیاواز بوون لەوەی من لە هزری خۆمدا وێنام کردبوون. یەکەمیان لای من، پیاوێکی ٤٠_ ٥٠ساڵەی سەروریش بۆزی کورتەباڵای تێکسمراو بوو، کەچی لە ڕاستیدا، گەنجێکی ٢٥ _ ٢٧ساڵەی باڵابەرزی سمێڵڕەشی ڕووخۆش و پیاکەوتوو بوو. وێنەی بەکر لای من، گەنجێکی باڵابەرزی ڕەقەڵەی ٣٠ساڵە بوو، کەچی پیاوێکی میانەباڵا و

میانەتەمەن، سەر و ڕیش ماش و برنج، ڕووخسار سووروسپیی بە ویقار و حورمەت بوو. بینینی ئەو، زۆری دڵخۆش کردم.
نامەی هاوڕێیانی هەورامان و چەک و کۆڵەپشتەکەی هوشیارمان تەسلیم کردن. بە وردی باسی شەڕ و ڕووداوەکەمان بۆ گێڕانەوە.
_ ئەدەبوو بەو ڕێگایەدا هاتبان. بۆچی بە شارەزووردا نەهاتن؟
_ ئێوە ئەو ڕێگایەتان دیاری کردبوو!
_ شتی وا نابێ! ئێوە هێرشتان بۆ سەر بنکەکانی «ق م» کردووە و هەموو نەخشەکەتان لە ئێمە تێک داوە!
_ لە نامەکەی کاک شەوکەتدا نەخشەکە وەها کێشرابوو.
بە هەرحاڵ، کارەکە هی شەوکەت بوو. ئەویش وەک هەموو جارێک خۆی لێ دەرباز کرد!
من کە ئەو هێزە سەدکەسییەی یەکێتیم دیت کە زۆربەی لێپرسراو و کادیر و پێشمەرگەکانی کۆمەڵە بوون، ئیدی زانیم خەبات و تێکۆشانی کۆمەڵە و سەرکردە و کادرەکانی، قارەمانێتیی ڕێبەرانی لە سێدارەدراو و مەرگبەزێنەرانی، چ بەرهەمێکیان داوە و پاشتریش لە گوندەکاندا بەو ڕاستییە گەیشتم کە ڕەووشت و ئاکاری جوامێرانە و ڕەفتاری شۆڕشگێڕانەی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە و گیانی لەخۆبوردنیان لە ئاست یەکتر و لە ئاست جوتیارانی هەژاری ناوچەکە، چ مانایەکی قووڵ و پیرۆزیان بە چەمک و مانای «پێشمەرگە» داوە و چلۆنیان لە بەرچاوی خەڵک خۆشەویست کردوون.
ماوەی دوو هەفتەیەک لەگەڵ ئەو هێزەدا مامەوە و گوندبەگوندی شارباژێر گەڕاین کە بۆ من، هەم ناوچەیەکی نوێ و هەمیش ئەزموونێکی نوێ بوو لە دنیای واقیعی ژیانی پێشمەرگانەدا.
ئەو هێزە، تەنیا هێزێک بوو کە لە ناوچەکانی سووریێن، شارەزوور، شلێر و شارباژێردا مابوویەوە، تەواوی هێزەکانی دیکە، ڕەوانەی ناوچەی سەرکردایەتی کرابوون و لەوێڕا بەرەو سەفەری «مەرگ» بۆ بادینان و هەکاری نێردرابوون کە پاشتر کارەساتی «هەکاری»ی لێ کەوتەوە.
لە ماوەی ئەو دووسێ هەفتەیەدا، گەلێک کادری وشیار و دلسۆز و خوێنگەرمی کۆمەڵەم دیتن و پێیان ئاشنا بووم کە داخەکەم زۆربەی زۆریان شەهید بوون و کەمێکیان لەو گەردەلوولی خوێنەی خەباتی شاخ دەربازیان بوو و بوونە شاهیدی ڕۆژگاری پاشاگەردانیی گەندەڵستانی پاش ڕاپەڕین!

کاکڵەی هێزی کۆمەڵە، خوێندەوار و نیمچەخوێندەواری شارەکان بوون کە لە نێو سیستەمی پەروەردە و ڕاهێنانێکی تیوریانەی بە دیسپلندا، بووبوونە داهێنەری ڕەوشێکی نوێ لە خەباتی چەکدارانەی نێو جووتیاران و هێزێکی بە تەنسیری ئەوتۆ کە هەم جەماوەر و هەم هێزەکانی دیکەی نێو جوڵانەوەکە

و هەمیش دەوڵەت، حیسابیان لەسەر دەکرد و بایەخیان پێ دەدا. من، لە سەرەتای دەستپێکدا، هەستم بە جیاوازیی بەرچاوی نێوان کادر و پێشمەرگەی کۆمەڵە لە لایەک و خەتی گشتی و بزووتنەوەی سۆسیالست لە لایەکی دیکەوە دەکرد. ناکۆکی و ملانێکان دیار بوون. ڕەفتار و ناکارەکان جیاواز بوون. تێگەیشتن و بۆچوونەکان لەمەڕ شۆڕش و هیواکانی ئاینده، لێک دوور بوون.
ڕیزەکانی کۆمەڵە خورت و یەکگرتوو بوون و جۆرە پەیوەندییەکی ڕۆحی و فیکری پێکەوەی گرێ دابوون. لە هەڵسووڕانی کاری سیاسی و پێشمەرگانەدا، جۆرێک لە هاودەنگی و ڕاوەرگرتنی دیموکراسیانە هەبوو. سەرپێچی و کەڵەوەکێشییەکان کەمتر بوون. متمانە و ڕێز لە نێوان لێپرسراو و کادران و ئەندامانی کۆمەڵەدا، لە ئاستێکدا بوون کە بە نامەی لێپرسراوێکی کۆمەڵە بۆ مەفرەزە یان کادرێک، نێوەرۆکەکەی وەکو خۆی جێبەجێ دەکرا و گەر پێویستیشی کردبا، چەند شەووڕۆژێک بەرەو مەبەست، ڕێگەی بۆ دەبڕدرا.
ئەم کاکڵەیە، لە ژینگەیەکی تەنراو بەهێزی زۆروبۆری عەشایەریدا هەڵسوکەوتی دەکرد کە بەشێکی زۆریان کۆنەلێپرسراو و کادری شۆڕشی ئەیلوول و ڕیشەیان لە باڵی جەلالیەتدا ئاوی دەخواردەوە. ملانێی نێوان کۆمەڵە و بزووتنەوەی سۆسیالیست، کۆمەڵە و خەتی گشتی، لە شێوەگشتییەکەیدا و سووربوون و جەختکردنی دەروێشەکادرانی خوێنگەرم و مێشک بە تیور و ئاخ بە دڵسوزی ئاخنراوی کۆمەڵە و هەوڵدانیان بۆ خورتکردنی بزووتنەوەیەکی فیکری ـ سیاسی ـ چەکداری لە نێو جوڵانەوەی نیشتمانیی کوردستاندا کە کەشێکی شۆڕشگێڕانەی ئەنتی مەلایی/ جەلالی بخولقێنێت، مانایەکی نوێ لە پراکتیکدا بە «شۆڕشی نوێ» ببەخشێت، هەلومەرجی خەبات و تێکۆشانی ئەوێ ڕۆژێیان سەخت و دژوارتر کردبوو.
بەهێزیی و بالادەستیی ڕژێم و لاوازیی هێزەکانی بزووتنەوەکە لە سەرەتادا، بواری چڕکردنەوەی هێز و دەسەڵاتی نەدەدا و ئەمەش بە ناچاری و بە پێی پێداویستییەکانی دۆخەکە، کار و هەڵسووڕانی پەراگەندە و نیمچەسەربەخۆی لە کەرت و مەفرەزەکان دەخواست. ئەم زەوینە نالەبار و ناستەنگە، دەرهاوێژتەی چەندین دەسەڵاتی ناوچەیی و هەڵسوکەوتی خۆبەخۆیی مەفرەزە چکۆلەکانی یەکێتی بوو کە هەر کادر و مەفرەزەیەک چۆنی ویستبا و چۆنی پێ باش با، وەهای دەکرد و هەر گروپ و مەفرەزەیەک، حکومەتێکی نەبینراوی چکۆلە بوو. ئەمەش زۆرجاران کاری زیانبەخشی لێ دەکەوتەوە، بە تایبەت مەسەلەی گرتن و سزادان و کوشتنی بێ هیچ دادگاییکردنێکی کەسانی گومانلێکراو. تیرۆر و کوشتن، ببوونە کاری شۆڕشگێڕانە و جگە لە تیرۆرکردنی کەسانی سەربەڕژێم، ئەوا دەیان کەسی بێتاوانیش دەکوژران. بەرداوەبوونی ئەم پرۆسێسە لە چوار تا پێنج ساڵی سەرەتای بزووتنەوەکەدا، دەیان قارەمانی پیاوکوژی بەرهەم هێنا کە لەزەتیان لە کوشتن و خوێنڕژتن دەبردا

بڕوابوون بە زەبری شۆڕشگێڕانە و ڕەشەکوژی، وەک میتۆدێک بۆ خۆسەپاندن و سەلماندنی «خود»ی شۆڕشگێڕ لە ئاست «ئەو»ی دیدا، ئەوێک کە بە زەبر تۆ دەسڕێتەوە و تۆش لە ڕێگای بەکاربردنی (هەموو ئامرازەکان)ەوە دەسەلاتی شۆڕشگێڕانەی شۆڕش دەسەلمێنی و دەسەپێنی. بوونە ماک و هەوێنی خولقاندنی دیاردەیەکی کوشندە کە پاشان ڕەوتی بزووتنەوە چەکدارییەکەی بە ئاقارێکی دیدا گۆڕی!

یاخود بە بارێکی دیکەدا، ڕەنگە ئەوە خودی ڕێباز و ڕەگەزە فیکرییەکانی بزووتنەوەی چەکداری بن کە لەچوارچێوەی ئەو یاسایانەی حوکمیان دەکەن و دەیانبزووێنن، ببنە دایەنەۆی بەرهەمهێنانی زەبر و بەرەو سەرهەڵدانی ئەو «ئەگەر»ەمان ببەن کە ژیان و بەردەوامبوونی هەر بزووتنەوەیەکی چەکدارانە، لەسەر کوچکەکانی خوێن و زەبر و تۆقاندن وەساتبێت... ئەمە بابەتێکە کە کۆڵینەوەیەکی قوڵتری تیوری و مەیدانی گەرەکە.

## کڵۆڵترین کەسانێک ئەو پارتیزانانەن، دەمەوبەیان لێیان دەقەومێ!

شارەزوور، سەرتاپای لە زەردەپەڕ گرتووە. چەند پەڵەهەورێکی شاقەل نارنجی، دامێنیان لە «تانجەرۆ» هەڵژەنیوە. «زەڵم»، بە لرفە و گوژمی بەهاریی خۆیەوە، دەست لە دامێنی «سووروێن» بەردەدات و بە هۆرە و سۆزێکی دەروێشانەوە، لە «دووئاوان»دا ئامبازی تانجەرۆ دەبێت و لە جەستە و رۆحی یەکتیدا دەتوێنەوە. کە کەوانەی ئەرخەوانیی ئاسمان لە ئاست «گڵەزەردە»دا رەنگی تێر و تۆختر دەبێت، پلەی ورەی ئێمە زیاتر سەردەکەوێت. لەشمان سووکتر و هەنگاوەکانمان، گورجوگۆڵترمان هەڵدەگرن.

هێزێکی پەنجاکەسی، بە نیازی پەڕینەوە بۆ هەورامان، لە بناری سوورێنەوە سەرەوژێر دەبینەوە و یەکبین لە پانتایی شارەزووردا رێگا دەبڕین.

رووباری زەڵم، لە گەرمەی بەهارێکی تەڕوبڕدا، لە بواریشدا، جوانەگا تل دەدات. دۆزینەوەی بوار، ماوەیەکی باش ماندووی کردین. لەوبەری زەڵم، بەشی زۆری هێزەکە ماڵئاواییان لە ئێمە کرد و لە شارەزووردا بڵاوەیان لێ کرد و بزر بوون. مەلابەختیار و مەفرەزەکەی، چەند شارەزا و چاوساغێک، عەلی شامار و من، گوندبەگوندی شارەزوور، بەرەو بناری هەورامان سەرکەوتین. تاریکوڕوونی بەیانی، گەیشتینە گوندی «خەرپانی» و بە پەلە و بێ پشوودان، نانمان کۆکردەوە و روومان لە دۆڵێکی چڕگەن نا.

جێهێشتنی دۆڵەکە و هەوڵدان بۆ دوورکەوتنەوە لە سەربازگە و رەبایەکانی دەوڵەت، کارێکی نەشیاو بوو. بە کەڵکوەرگرتن لە چڕ و پڕیی دار و دەوەنی دۆڵەکە، تا پاش نیوەڕۆمان لەوێ گوزەراند.

هونەری خۆحەشاردان یان ئەوەی پێشمەرگە پێی دەگوت «ئیختیفا»، یەکێکە لە هونەرە هەرە گرنگەکانی شەڕی پارتیزانی و ئەمەش ئەرکێکی زێدەگرنگی فەرماندەی پارتیزانەکانە کە لەسەر وردبینی و بیرتیژی و شارەزایی وەستاوە. فەرماندەی زرنگ و لێهاتوو، ئەوەیە کە ئەم هونەرە باش بەکاربێنێت و بتوانێت شەوانە لە زۆرترین جێگای جیاوازدا دەربکەوێت و بە رۆژیش شوێنونکێ لە دوژمن بکات. کڵۆڵترین کەسانێک، ئەو پارتیزانانەن کە دەمەوبەیان لێیان دەقەومێ و دەرگیر دەبن.

بۆ ئەوسەردەمەی دەسەڵاتی پرتوانای بەعس و لاوازیی هێزی پارتیزانی کورد، تەنیا سووکەهەواڵی گوندییەک کە لە پێناوی چەند دینارێکدا، بە هێزەکانی دەوڵەتی بدایە، بەس بوو بۆ ئەوەی دووچەندانی ژمارەی پارتیزانەکان، کۆپتەر و سەدان ئەوەندەش سەرباز و جاش بهاتبان و لە گەمارۆی مەرگیان خستبان! من، هەرگیز دیمەنی ئەو حەوت پارتیزانەی کۆمەڵەم لە هزردا کاڵ نابێتەوە، کە گزنگی

بەیانیی رۆژێکی هاوینی ساڵی ١٩٧٧ ، لە گوندی «بێسەڵمێن»ی بناری شارەزوور و لە کەناری دەریاچەی دەربەندیخاندا، بە هۆی خیانەتی یەکێک لە هاورێکانی خۆیانەوە، لە تەپکەی هێزەکانی دەوڵەت کەوتن. ئەو مەفرەزەیە «عومەری حەمەساڵەح» سەرکرایەتی دەکرد و چەند پێشمەرگەیەکی رێکخراوی «رەنجدەران»یشی تێدا بوون کە تازە لە «کۆمەڵە» جیابووبوونەوە، پاش چەند سەعات شەڕ و بەرگری، ئەنجام هەموویان شەهید بوون..

چ بەیانییەکی خویناوی بوو! من، لە نێوبازاڕی شاری هەڵەبجەدا و لەگەڵ چەند هاورێیەک، چاوەڕێی بەلاداکەوتنی شەڕەکەمان دەکرد. شەڕ و بەرگری تا چێشتنگاو درێژەی هەبوو. بناری شارەزوور دووکەڵی لێ هەڵدەستا. کۆپتەرەکان ئاسمانی شارەزووریان تەنی بوو. لە نیوەڕۆدا، هێزەکانی دەوڵەت بە سەرکەوتوویی گەڕانەوە...

تانکێک لە پێشەوە و دەیان ئۆتۆمبێلی پڕ لەسەرباز کە هەلهەلەی سەرکەوتنیان دەکێشا، خۆیان بەنێو شاردا کرد. لە ئیڤایەکدا، سێدارەیەکیان دانابوو و لاشەی «هیدایەت»*یان پێوە ئاوێزان کردبوو! ئیڤایەکی دیکە، سیخناخ بوو لە لاشەی شەهیدەکانی تر. ئۆتۆمبێلەکان بە نێو شاردا دەگەڕان و لاشەی لەخوێنشەلاڵی پێشمەرگەکانیان نیشانی خەڵکی شار دەدا و چاوشکێنیان دەکردن! من، تا ئەو ساتە دیمەنی وەهام، تەنیا لە فیلمی «گیڤارا»دا دیتبوو.

رەفتاری فاشیستانەی بەعس و سیاسەتی زەبر و تۆقاندنی لە شارەکاندا، ئاگری رک و تۆڵەی لە ناخی ئینسانی کورددا خۆش دەکرد و بە ناچاری لە کەمەندی مقاوەمەتی چەکدارانەی دەخست و ملی رێگای شاخی پێ دەگرتەبەر.

مرۆڤی کورد، لە ئەنجامی زوڵم و ستەمی بێوێنە، سووکایەتیپێکردن، گرتن و ئیعدامکردنی، تەنیا و تەنیا لە سۆنگەی کوردبوونیدا، بە ناچاری دەکەوتە نێو سەنگەری موقاوەمەتی سیاسی و چەکداری، بێ ئەوەی بواری لە سیاسەتگەیشتنی هەبێت، بێ ئەوەی مەودای بیرکردنەوەی لە شۆڕش و خەبات و سەرئەنجامەکانیانی بۆ برەخسێت... مرۆڤی کورد، بێ ویستی خۆی، فڕێ دەدرایە نێو ئاگری یاخیبوون و کەڵەوەکێشی و تۆڵەسەندنەوە... لەو باروودۆخ و هەلومەرجانەدا، ئەقڵ و تێفکرین حوکم ناکەن، بەڵکو ئەوە هەست، سۆز، ویژدان و کبریان کە هێزی بزوێنەرن و پەرچەکرداری ئینسانەکان دەخولقێنن.

زۆرجاران، حیزب و رێکخراوەکان، سیاسەتی داپڵۆسین و زەبرنامێزی دەسەڵاتی نێوەندی ئێراق، بە فاکتەرێکی ئیجابی لەقەڵەم دەدەن و پێیان وایە، ئەم جۆرە سیاسەتەی دەوڵەت لە ئاست ئۆپۆزسیۆندا، ژمارەی لەشکرەکەیان فرەتر و هێزەکەیان پڕ و خوڕتر دەکات. زۆر لە حیزبەکان، پێیان وایە، هەتا ژمارەی شەهیدەکان پتر بێت، لایەنگر و دۆستانی حیزب و بزووتنەوەکە زیاتر دەبن. ئەوان وای بۆ

دەچن کە ئەوە ژمارەی شەهیدەکانە رەوایی بە تێکۆشانی سیاسی و چەکدارییان دەدات و پاشتر هەر ئەو خوێنە، یان راستتر بنەماڵەی خاوەنخوێنەکان، دەبنە پردی پەرینەوەی بزووتنەوەکە بۆ هەواری سەرکەوتن. هەر ئەمەشە کە رێگای گەیشتن بە دەسەلآت هەموار دەکات و شەرعیەیت بە شێوازی میکانیزمی حوکمرانیی حیزب دەدات. لەخۆڕا نییە کە ئێستاش پاشی دەساڵان لە سەرکەوتن/شکستی راپەرین، حیزب خۆی بە (سەرچاوەی دریژترین رووباری خوێنی شەهیدان) دەناسێنێ و رەوایی دەسەلآتی خۆی لەو خوێنەوە وەردەگرێت! ئەو حیزبەی دەیانهەزار قوربانیی لە نێو بزووتنەوەیەکی خوێناویدا دابێت، هەرگیز ئامادە نییە کورسیی دەسەلآت بۆ حیزبێکی دیکە چۆڵ بکات، کە ژمارەی قوربانییەکانی کەمتر بن! بە کورتی: ئەو دەسەلآتەی بە خوێن دەسێنرێت، لەچێوە و مەودایەکی دووردا، تەنیا بە خوێن جێگۆرکێ دەکات!

* * *

لە گەڵ زەردەی ئێوارەدا، لە دۆڵ وەدەرکەوتین و بەرەو گوندی هاوار هەڵکشاین. خەڵکی هاوار، پێشوازییەکی گەرمیان لێ کردین. پاش پشوویەکی کورت، مەلابەختیار کۆبوونەوەیەکی بە خەڵکی گوند کرد و سیاسەتی ئەوێ دەمێی شۆڕش و یەکێتیی نیشتمانی بۆ باس کردن. نانی ئێوارەمان لەوێ خوارد و پاشان بەرەو «گریانە» وەرێ کەوتین و لەگەڵ مەفرەزەکەی هەوراماندا یەکمان گرتەوە.

هەفتەی یەکەم، مەلابەختیار سەرگەرمی کۆبوونەوەی سیاسی و فیکری و کاری رێکخراوەیی کۆمەڵە و یەکێتی بوو. لیژنەی ناوچەی هەڵەبجەی یەکێتیی رێکخستەوە کە دکتۆر رەزا «حەمەسەعیدە سوور»* لێپرسراوی بوو. شانەیەکی سەرەکیی بۆ رێکخستنەکانی کۆمەڵە رێکخست، کە ئەرکی هەڵسوورانی کاری رێکخراوەیی کۆمەڵە بوو لە نێو ریزەکانی پێشمەرگە و جەماوەری ناوچەی هەڵبجە و هەورامان و شارەزووردا.

ئێمە، ئەو رۆژانە پەرۆشی هەواڵێکی باوەرپێکراوی ئەو هێزە گەورەیەی یەکێتی بووین کە بەرەو هەکاری، بە نیازی گەیشتن بە ناوچەی سێسنووری نێوان ئێراق، تورکیا و سوریا رۆشتبوو. هەواڵی ناڕاستەکانی نێوچەکە، کەم و زۆر باسیان لە شەڕە خوێناوییەکانی نێوان هێزەکەی یەکێتی و هێزی «ق. م» لە سەر سنوور و لە قوڵایی خاکی کوردستانی تورکیادا کردبوو، بەڵام نامە یان هەواڵێکی دروست لە سەرکردایەتیی یەکێتییەوە کە ئەوکات لە بناری قەندیل بوو، نەگەیشتبوو.

نیوەڕۆیەک، لە سەر کانییەکەی «کوێخاعەلی»، لە گوندی گریانە، وەک هەموو نیوەڕۆیەکی دیکە خەریکی خواردنی نان و چا بووین، کەسێکی خۆشڕەو لە دوور را دەرکەوت. ساتێ بە دووربین

سەیریان کرد، هەرزوو ناسییانەوە و مەلابەختیار گوتی: ئەوە «حاجی چاوشین»ە*
حاجی، لە قەندیلەوە هاتبوو. ئەو نامەی مامجەلال و سەرکردایەتی و ڕێکخستنی شاری بۆ مەلابەختیار هێنابوون.
مەلا، یەک لە دوای یەک نامەکانی دەخوێندەوە و لەگەڵ خوێندنەوەی هەر یەکێکدا، وێنەی کارەسات و پێشهاتی چاوەڕواننەکراو لە سیمایدا دەردەکەوتن. پاش دانخواردن، مەلابەختیار بە کورتی ناوەڕۆکی نامەکانی بۆ باسکردین و بە ناڕاستەوخۆ لە شکستەکە دوا. بەڵام لە نامەکەی مامجەلالدا کە پاش چەند ڕۆژێک مەلابەختیار نیشانی دام، نووسرابوو کە وێڕای پیلانی «ق م» و عەشیرەتەکانی سەر بەو حیزبە لە ناوچەی هەکاری، دیسان بەشێک لە هێزەکەی یەکێتی، بە سەرکردایەتیی عەلی عەسکەری، خۆیان دەرباز کردووە و گەیشتوونەتە شوێنی مەبەست! دیارە ڕاستیی مەسەلەکە بەو شێوەیە نەبوو.
هێزێک کە لە ۱۲۰۰ پێشمەرگەی چەکدار و بێچەک پێک هاتبوو و باشترین سەرکردە و کادرە سیاسی و عەسکەرییەکانی یەکێتی ڕێبەرایەتییان دەکرد، تەنیا ۸ کەسیان بە سەلامەتی دەربازبووبوون و گەیشتبوونەوە بارەگاکانی سەرکردایەتی لە قەندیل. سەرجەمی هێزەکە، یان بە دەستی «قم» دیل کرابوون یان بە ناچاری تەسلیم بە دەوڵەتی ئێراق بووبوونەوە.
پاشان دەرکەوت تەنیا سێ پێشمەرگە کە هەر سێکیان خەڵکی هەڵەبجە بوون، گەیشتبوونە شوێنی مەبەست و سنووری نێوان تورکیا و «سوریا»یان بەزاندبوو، ئەوانیش:
حوسێن مەجید کۆکۆیی، دارا عەبدولقادر و حەمەهاواری بوون.
ئەدەکرا حەقیقەتی ئەو شکستە بۆ هەموو پێشمەرگەکان باس بکرێت.. دەبوو ڕاستیی چۆنییەتی ڕووداوەکە لە بازنەیەکی تەنگدا بمێنێتەوە.
کارەساتی هەکاری، بەو شێوەیەی کە ڕووی دا، چەندین نامیلکە و نووسراوی لەسەر نووسراوە. ئەوشیروان مستەفا، هەر ساڵی ۱۹۷۹ لە ئەنجامی گوێگرتنی لە گێڕانەوەی ئەو کەسانەی کە لە کارەساتەکە دەرباز بووبوون، نامیلکەیەکی تایبەتی سەبارەت بە کارەساتی هەکاری نووسی. حەمەی حاجی مەحمود، لە بەرگی یەکەمی (ڕۆژژمێری پێشمەرگەیەک)دا، بە دوورودرێژی حیکایەتی ئەو مەرگەساتەی گێڕاوەتەوە. ئەوسا، ئەو ڕووداوە قسە و باسێکی زۆری لە سەر بوو، بۆچوونی فرەچەشن و جیاوازی لە خۆ گرتبوو. زۆر لەو سەرکردە و لێپرسراوانە، بە وردی سەرنج و تێبینییەکانی خۆیان لەسەر وردینەی ڕووداوەکان تۆمار کردبوون، هەرگیز جورئەتی بڵاوکردنەوەیانیان نەکرد! ئەو کارەساتە، دەرهاوێژتەی زەمینەیەک بوو کە بڕیارێکی سیاسیی هەڵە و نابەجێی سەرکردایەتیی یەکێتی خولقاندی و ئەوسات و پاشتریش باجەکەی گران لەسەر یەکێتی کەوت.

## شەڕی کانیژەنان ( گورزی تۆڵە!)

مەلابەختیار بەیانێک دەنووسێت و دەیداتە دەست من و حەمەناوت.

_ دەبێ ئەم بەیانە تایپ بکرێت و بگاتە شاری سلێمانی. تا بەسەر ڕێکخستنی شارەکاندا دابەش بکرێت! تایپ، دەست دەکەوێت؟!

مەلابەختیار دەپرسێت.

_ تایپێکی «شێخعەلی»* هەیە کە لە ئەشکەوتێکدا شاردوومانەتەوە و لێرەوە دوور نییە! ئەحمەد گریانەیی وەڵام دەداتەوە.

حەمەناوات و من، شوێن ئەحمەدگریانەیی دەکەوین و بە چیاکەدا هەڵدەگەڕێین. دارهەنجیرەکێویلەیەک، لەوپەڕی شەنگیی خۆیدا، پەلک و گەڵاکانی پەخش کردوون. چڵوپۆپی دارهەنجیرەکە لا دەدەین و ئەشکەوتێکی چکۆلە زاری واڵا دەکات. ئەحمەد، سندوقێکی کۆنی تەختە دەکاتەوە و تایپەکە دەردێنێ.. سندوقێکی دیکە دەکاتەوە، هەندێ کتێب و کاغەز دەردەکەون.

_ ئەمە تایپ و کاغەز و پێویستییەکان. من هیچی لێ نازانم و دەگەڕێمەوە لای برادەران.

هەتا دەمەوئێوارە، بە چرکەچرک، لەگەڵ تایپکردنی بەیانەکە خەریک بووین. هەرچۆن بوو، چەند نوسخەیەکمان جێبەجێ کرد و گەڕاینەوە.

هەواڵی کارەساتی هەکاری، بوویە پریشکی ئاگر و گڕی لە پووشی هەر چیا و نواڵێک بەردا کە مەفرەزەکانی «ق م»ی تێدا بوون. ئیدی بۆ ئەوەی ناکۆکییەکە خوێناویتر و گورزەکانی تۆڵە کوشندە و کاریگەرتر بن، دەبوو هەموو کەناڵەکان بۆ ڕەوابیپێدانی شەڕەکە وەگەڕ بخرێن و پاساوی ئایدۆلۆژی و سیاسیشی بۆ بدۆزرێتەوە. دەبوو ئەو مەسەلەیە لای هەموو پێشمەرگەیەک و لای خەڵکی کوردیش بکرێتە قەناعەتێکی گومانهەڵنەگر کە:

بێ پاکتاوکردنی فیکر و جەستەی «ق م» و بنەماڵەی بارزانی، هیچ دەرفەتێک بۆ ڕزگارکردنی کوردستان و سەرکەوتنی شۆڕشی نوێ نییە.

لەو سەروبەندەدا، تێرمەکانی شۆڕش، دژەشۆڕش و شۆڕشی چەواشە کەوتنە سەرزاری کادران و ئەندامانی کۆمەڵە و یەکێتی و برەویان پەیدا کرد.

دەبێ ئەوەش بگوترێ کە کادران و لێپرسراوانی کۆمەڵە و یەکێتی تا بڵێی لێزان و بەدەسەڵات بوون لەو بوارەدا و لە ماوەیەکی کورتدا، توانرا کاکڵەی هێزێک بنیات بنرێ کە لەوپەڕی قەناعەتەوە و بێ هیچ گومان و دوودڵییەک لە سەنگەری «شۆڕشی نوێ»دا، دژ بە «دژەشۆڕش»، لە بەرەکانی

کورتکوژیدا بجەنگن.
چەسپاندنی ئەم قەناعەتە فیکری و سیاسییە لای پێشمەرگە و هاوڕێیانی کۆمەڵە، بەشێکی ریشەکەی لە کانیلەی فیکری چەپ و مائۆیستیدا ناوی دەخواردەوە و بەشەکەی دیکەی هەندەک فاکتەری بەرچاوی سیاسی دەیانبزرواند و جێگیرکردنی کۆڵەکە فیکرییەکانیان لە زەمینەی پراکتیکی کاری سیاسی و چەکداریدا، پتەوتر دەکردن. وەک:
_ تەفروتوناکردنی هێزێکی هەزارکەسیی یەکێتی لە سەفەرێکدا کە ئامانجە گشتییەکانی لە روواڵەت و راگەیاندندا، دامەزراندنی بنکەی شۆڕش لە بادینان و هێنانی چەک و پارە و پێداویستییە لۆجستیکییەکانی شۆڕش بوون لە وڵاتی سوریا و بەو مەبەستە روویان لە دەڤەری هەکاری کردبوو.
_ پاکتاوکردنی دوو مەفرەزەی یەکێتی لە ساڵی ۱۹۷۷دا لە دەڤەری بادینان و بە دەستی هێزەکانی ق م، کە لەنێو ئەواندا، ئیبراهیم عەزۆ و ملازم حەسەن خۆشناو، دوو کادر و لێپرسراوی دیاری یەکێتی بوون.
_ بوونی بنکەکانی «ق م» لە نێو خاکی ئێرانی «شا»دا، لە کاتێکدا هەر پێشمەرگەیەکی یەکێتی پێی لەسەر خاکی ئێران دا با، دەگیرا و بەپێی رێککەوتنامەی «ئەلجەزایر»ی نێوان ئێراق و ئێران، تەسلیم بە دەوڵەتی ئێراق دەکرایەوە و ئیعدام دەکرا!
_ هەرەسی شۆڕشی ئەیلوول، کە بە هەرەس و شکستی سەرکردایەتیی پارتی و ماڵباتی بارزانی دەخوێندرایەوە و راڤە دەکرا.
ئەم هۆکار و فاکتەرانە، پاڵپشت بوون بۆ تێڕوانینی مارکسیستانەی ئەندامانی کۆمەڵە، بۆ خەباتی چینایەتی و لەقەڵەمدانی چینی فیوداڵ و بورژوای کۆمپرادۆر بە دژەشۆڕش (دیارە کە سەرکردایەتی پارتی و ماڵباتی بارزانی لەم خانەدا پۆلێن دەکران و وەکو هەڵگری خەسڵەتەکانی فیودالیزم دەخوێندرانەوە).
گوندی «کانیژەنان»، دەکەوێتە ناوچەی شەمێران و لە بن شاخێکی بەرز و چڕکەندا هەڵکورماوە. لەو گوندەدا مەفرەزەیەکی ق.م بە لێپرسراوێتیی «عەزیزی حەمەساڵەح» بۆ بینینی ئێمە و بە هەڤڕا دانخواردنی ئێوارە چاوەڕێمان دەکەن! هێزەکەی ئێمە، دوو رۆژ رێگای لە هەورامانەوە بۆ ناوچەی شەمێران بڕیوە و دوو رۆژیشە لە گوندەکانی «لاوران» و «کانی سالار»، چاوەڕێی هەڵکەوتنی ئەم دەرفەتەیە..
عەزیز، لە عەشرەتی «تاوەگۆزی» بوو. ئەم لەگەڵ قادری براکەورەی، پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بوون. پاش هەرەس و شکستی شۆڕش، ئەمانیش هاوڕێی سەدان و بگرە هەزاران پێشمەرگەی دی، لە ئێران مابوونەوە. پاشی سەرهەڵدانەوەی بزووتنەوە چەکدارییەکە و وەچیاکەوتنی مەفرەزەی چەکدار،

ئەمانیش وەکو مەفرەزەی « ق  م» هاتبوونەوە ناوچەکانی سەرسنوور و لە هەوڵی کۆکردنەوەی هێزدا بوون. ئەم دوو برایە بەپێی خەسڵەت و دابی عەشیرەتیی خۆیان و عەشیرەتەکانی دیکەی ناوچەکە، پەیوەندیی دۆستانەیان لەگەڵ هەندێ لە مەفرەزە و پێشمەرگەکانی کۆمەڵەدا هەبوو. ساتێ لە هەموو کوردستاندا، خەنجەری تۆڵە لە رووی یەکدیدا هەڵکێشرابوو، هێشتا لەم ناوچەیەدا، هەودای دۆستایەتییە عەشیرەتییەکە نە پسا بوو.

ئەم ئێوارەیە،٢٧ / ٧ / ٩٧٨، دەبێ تاڵەمووی «موعاویە» بپسێت. چما دەشێ بانێک و دوو هەوا بێت؟! لە راستیشدا نە دەشیا.

پێش چوونمان بۆ دێی کانیژەنان، نەخشەکە لە گوندی «کانی سالار» ساز کرابوو. کارەکان دابەش کرابوون.. بڕیارەکە وابوو کە هەوڵ بدرێت خوێنی تێدا نەڕژێت و هەموو چەکدارەکانیان دەستگیر بکرێن! بەڵام کەی چەکداری کورد وا بەئاسانی مل بە تەسلیمبوون و خۆوەدەستەوەدان دەدات؟! لای کورد، چەکدانان و خۆتەسلیمکردن، لەدەستدانی پیاوەتی و حەیاچوونە و زۆرجاران لە نێوان مەرگ و سەرشۆڕیدا، یەکەمیان هەڵدەبژێرێت!

لەنێو گونددا پێک گەیشتین. ماچوموچ و دەستگووشین بەڕێوەچوون.

بۆ نانخواردنی ئێوارە، مەلا بەختیار، فەرەج تریفەیی، غەفور دەرەشیشی و چەند پێشمەرگەیەک چوونە ماڵێک و ئێمەش بەسەر ماڵەکانی دیکەدا دابەشێنراین.

پاش ناخواردن، جگە لە لێپرسراوەکان کە لە شوێنی خۆیان مانەوە، ئێمە لەگەڵ پێشمەرگەکانی»ق، م»دا بۆ خەوتن و بۆ دڵنیاکردنی ئەوان چووینە سەربانێک.

ئەوان، سووکەهەستێکیان لە نیازی خراپی ئێمە کردبوو! هەندێکیان لەسەر بانەکە راکشابوون، هەندێکیان دانیشتبوون و چەند کەسێکیشیان بە وریاییەوە لە لێواری بانەکەدا لەگەڵ ئێمە دەدوان.

پەرلەی نێوان ئێمە و مەلابەختیار بۆ ساتەوەختی چەککردنی عەزیز، هاوارێک بوو بە ناوی «کاک ئارام»! هاوار بیسترا.. گڕکانی چەکی پێشوەخت ئامادەکراو، گڕی لە سەربانەکە بەردا! پێشمەرگەکانی ئێمە کە لەوێ بوون، لە چاوتروکانێکدا دەرباز بوون، جگە لە «حەمەئاوات» کە فریا نەکەوت و گوللەی چەکەکانی خۆمان هەردوو لاقی بێژا.

کارەکە بۆ ئێمە بە سەرکەوتوویی کۆتایی هات! عەزیز دیل کرا. چەکدارەکانیان، حەوتیان کوژران، دوانیان هەڵاتن و ئەوانی دیش بە بریندار یان بە ساغی دەستگیر کران.

گوندێک لە ئێوارەیەکدا، لە دووکەڵی چەکی براکاندا رەش هەڵگەڕا. لە خوێنی براکاندا، سوور داگیرسا. هاوار و ناڵەی ئەنگاوتەکان، تووک و نزای ژنان، زووڕە و قریشکەی منداڵانی هەترەشچوو، بارە و قارەی مەڕ و بزن، ئاسمانیان سەرڕێژ کرد.

گوندمان بەجێ هێشت. عەزیز و دیلەکانی هاورێی و جەستەی ئەنگێوراوی حەمەئاواتمان لەگەڵ خۆ هەڵگرت و گەڕاینەوە گوندی کانی سالار.
لە و شەڕەدا، هیچ دیلێک نەکوژرا، بەڵکو پێچەوانەی بۆچوونی هەندێ کەس (بەتایبەت موحەمەدی حاجی مەحمود، بڕوانە رۆژمێری پێشمەرگەیەک!) کە ئەو، ئەوکات لە سەفەری «هەکاری» بووە و رووداوەکەی لە دەمی خەڵک وەرگرتووەتەوە و بە هەڵە دایڕشتوەتەوە. دیلەکان، بێجگە لە عەزیز، هەموویان رۆژی دواتر ئازاد کران و برینداڕەکانیشیان تەسلیم بە کەسوکاریان کرانەوە.
ساتێ بەیان گزنگی دا، رووخساری عەزیزم دیت. عەزیز، لە ئەنجامی موقاوەمەت و خۆبەدەستەوەنەدانی دوێنێ شەودا، دوو ددانی لە دەست دابوون. من و عەزیز، ١٤ ساڵ پێش ئەو کات، قوتابیی سەر یەک مێزی قوتابخانە بووین.
ئەو هەستە پاک و بێگەردەی هاورێیەتیی تەمەنی مێردمنداڵیمان، تۆێژاڵەرقێکی ئەستوری لەسەر کەوتبوو، بەلاّم بە مانەوەی عەزیز وەکو دیلێک بۆ ماوەی سێ مانگان لای ئێمە، ئەو هەستە ورده ورده چرۆی دەرکردەوە و من لەو ماوەیەدا هەرگیز نەمتوانی بۆ چرکەیەکیش عەزیز دڵگران بکەم.
چارەنووسی عەزیز و من، گێڕانەوەیەکی درێژتری هەیە کە پاشتر و لە کاتی خۆیدا دەینووسمەوە.
حەمەئاوات، بە کەساسی لە بەردەستماندا دەینالاّند و کارێکمان پێ نەدەکرا. ئەو هەردوو لاقی بە خەستی بریندابووبوون و چ هیوایەکەی چاکبونەوەیان لەو چیا و کێوانەدا و لەو هەلومەرجەی ئەوسادا، نەبوو.
مەلا بەختیار، بۆ تەگبیرکردن لە حاڵی حەمەئاوات لە گەڵ فەرماندەی مەفرەزەکان و لێپرسراوە سیاسییەکان و مندا کۆبوویەوە..
حەمەئاوات بۆ من، هەم خوشکەزا و هەم هاورێی تەمەنم بوو. ئازارەکانی حەمەئاوات، بۆ من سەختتر بوون! پاش ڕاوەرگرتن و تەگبیرکردن، جگە لە هەوڵدان بۆ ناردنەوەی بۆ شار، شتێکی دیکەمان شک نەدەبرد! دەبوو بە نهێنی و بەنێو هێزی دەوڵەتدا کە سەرگەرمی ڕاگوێزانی گوندەکان بوو، بیگەیەنینە گوندێکی نزیکی شاری هەڵەبجە. حاڵەتی حەمە ئاوات وەها نەبوو کە لە شاری هەڵەبجەدا و بە نهێنی چارەسەر بکرێت.. ئەو پێویستی بە نەشتەرگەریی زۆر ورد و قورس هەبوو کە تەنیا لە شارێکی وەکو سلێمانی یان بەغدا، جێبەجێ دەبوو. لەسەر پێشنیاری هەموو لایەک و ڕازی بوونی خودی حەمەئاوات، من نامەیەکم بە ناوی حەمەئاواتەوە، بۆ «تۆفیق رەحیم»* فەرماندەی مەفرەزەی تایبەتی جاشان و هاورێی خۆمان نووسی!
لە نامەکەدا، وا نووسرابوو کە حەمەئاوات هەوڵی تەسلیمبوونەوە دەدات و لە شۆڕش ماندوو و بێهیوایە. نامەکە بە مێژوویەکی زۆر پێشتر لە ڕۆژی ڕوودانی شەڕەکە نووسرابوو. ئەم نامەیە لە

گیرفانی حەمەئاوات ئاخنرا، تا وەکو دواچەک، لە ئەگەری گرتنیدا لەلایەن دەوڵەتەوە، بە کاری بێنێت و تۆفیق بتوانێ داکۆکی لێ بکات. دیارە مەسەلەکەش هەر وا شکایەوە.
هاوڕێیانی ڕێکخراوی شار نەیانتوانیبوو حەمە ئاوات بۆ سلێمانی بگوازنەوە. حەمەئاوات، چوار ڕۆژان لە کادانێکی ماڵی «موحسین سەید قادر»دا کە هاوڕێی کۆمەڵە و برینپێچ بوو لە گوندی «گونە»، مابوویەوە و مەرگ تەنگی پێ هەڵچنیبوو.
نامەکە فریای کەوت. تۆفیق هەوڵێکی جدی بۆ ڕزگارکردنی گیانی حەمەئاوات دا و پاش دووساڵان جارێکی تر گەڕایەوە نێو هێزی پێشمەرگە.

## ڕاگوێزانی گوندەکان/ چۆڕبڕکردنی زەریاکە!

ڕاگوێزانی گوندەکانی سەرسنوور بە قوڵایی ٢٠ کیلۆمەتر و بە زۆرەملێ کۆکردنەوەی جوتیاران لە ئۆردووگا زۆرەملێکاندا، سیاسەتێکی وردپلانرێژی بەعس بوو کە ئاسەوار و ئەنجامی گەلێک ترسانکیان لێ کەوتنەوە.

ڕاگوێزان، جگە لە هەوڵدان بۆ دابڕکردنی هێزی پێشمەرگە و ئابڵوقەدانی بزووتنەوە چەکدارییەکە و چۆڕبڕکردنی ئەو زەریایەی کە ماسییە بزێوەکانی تێدا دەژیان، ئەوا پلانێکی سیستەماتیک بوو بۆ:

_ وێرانکردنی کوردستان و داوەشاندنی بنچینەی ئابووریی کشتوکاڵ و بەرهەمهێنان لە کوردستاندا.

_ کۆنتڕۆڵکردنی هێزێکی زۆری جووتیاران کە بزوێنەر و داینەمۆی خەباتی چەکداری بوون.

_ گوازتنەوەی هێزێکی ئاکتیڤی بەرهەمهێن، بۆ هێزێکی بێکاری مشەخۆر لە ئۆردووگا و شارەکاندا.

_ جووتیارانی لە هێزی شۆڕشەوە کردە هێزێکی گەورەی پاڵپشت بۆ دەوڵەت و فراوانکردنی ڕەهەندەکانی دیاردەی جاشایەتی لە کوردستاندا.

_ زیندووکردنەوەی دیاردەی دەرەبەگایەتی و خێڵەکی، لە بەرگێکی جیا و نوێتر دا.

ژیانی ئۆردووگاکان و بەزۆرەملێ «مۆدێرنەکردن»ی کۆمەڵگای لادێ، پەیوەندییە کۆمەڵایەتی، ڕۆحی و ئەخلاقییەکانی لە ڕەگەوە هەڵکێشان و بە جۆرێکی وەها شێواو ڕۆی نانەوە کە کارکردە نەگێتیڤەکانی تا ئێستاش لەسەر جەستەی کۆمەڵگای کوردی کار دەکەن.

ئەو پرۆسەیە، بۆ ئێمە رووداوێکی چاوەڕوواننەکراو نەبوو، بگرە تا ڕادەیەکیش خۆمان بۆ ئامادە کردبوو. دیارە کە خۆئامادەکردنەکە بە مانای بەرگری و موقاوەمەت نەبوو. ئاخر لەو سەردەمەی دەسەلاتی بەعسدا، موقاوەمەت و ڕێگرتن لەو پرۆسە زەبرئامێزە، کارێکی نەک هەر ئاسان نەبوو، بگرە مەحاڵیش بوو.

ئێمە لە رووی دەروونییەوە، خۆمان بۆ چۆنییەتی ژیان و گوزەرانی بێ خەڵک و ئاوەدانی ئامادە کردبوو. لە بارەی لۆجستیکییەوە، خواردن و ئازوقەی پێویستمان لە کونەبەرد و ئەشەکەوتاندا ئەنبار کردبوون. شاردنەوەی ئەو پێویستییانەش، دەبوو زۆر نهێنی با و هەموو پێشمەرگەیەک پێی نەزانیبان!

ئەو ڕۆژگارە، هەلومەرجی خەباتی پارتیزانی هێند سەخت و دژوار بوون، هەمیشە ژمارەی ئەو

پێشمەرگانەی بە دزی یان بە ئاشکرا ماڵئاواییان لێ دەکردین و دەچوونەوە لای ڕژێم. لە ژمارەی ئەو کەسانە زیاتر بوون کە پەیوەندییان پێوە دەکردین و دەبوونە پێشمەرگە.
لە سەرەتای مانگی ئابی ١٩٧٨دا، ڕژێم هێرشێکی بەربڵاوی بۆ هەموو گوندەکانی ناوچەکە کرد و گوند بە گوند و ماڵبەماڵی تەقاندنەوە و ئاگری لێ بەردان.
ئێمە، لە سەر لوتکەی چیاکانەوە، لە بن ئەشکەوتاندا شاهێدی تراژیدیای ئەو وێرانکارییە بووین و شتێکی ئەوتۆشمان لە دەست نەدەهات.
خەڵکی گوندەکان، بێ ئەوەی بەرگرییەک نیشان بدەن، مێگەلئاسا دەخزێنرانە نێو زیلی سەربازییەوە و بۆ ئۆردووگاکان دەبران.
دوژمن، نە هەر گوندەکان، بگرە تەواوی باخ و بێستان، پاوان و مەزراکانیشی گڕ لێ بەردان و زنار و بەندەنان لە دووکەڵدا خنکان.
ئەو ڕۆژانە، هەموو شت تام و بۆنی دووکەڵی گرتبوو.. کوردستان، تام و بۆنی ترس و مەرگی گرتبوو.
لەگەڵ تەقینەوەی هەر دینامیتێک و بەهەواداچوونی هەر خانوویەکدا، بەردێک لە کێوی ورەی ئێمە هەرەسی دەهێنا و بۆ نێو دۆڵی بێهیوایی گلۆر دەبوویەوە!
لەگەڵ قریشکەی سووتانی هەر درختێک، کانییەک، بەردێک، ڕووبارێک، ئاسمانێک، سەگێک، پشیلەیەک، مەڕێک، مانگایەک، گوێدرێژێکدا، زریکە لە ناخی ئێمە هەڵدەستا! ئێمە سەمەندەر بووین لە دۆزەخی بەعسدا، دەسووتاین و دەژیاینەوە!
ئەو ڕۆژانە، بەعس لە هەوڵی سڕینەوەی ئێمەدا و ئێمەش لە هەوڵی بڕینەوەی یەکتردا بووین.
شەوێک، بە «عەزیز»ی دیل و دەستکەوتەوە لە ڕووباری سیروان پەڕینەوە و بە بناری باڵانبۆدا، پێچەوانەی ئاوەڕۆی سیروان، بەرەو هەورامان گەڕاینەوە.
ڕێگاکان بە سەرباز تەنرابوون و دەبوو بە ژێر لوولەی چەکی ئەواندا و بە نهێنی دەرباز ببین. ئەو ڕێگایەی کە جاران ماوەی شەوێکی گەرەک بوو، ئەمجار بە سێ شەو چاوەڕوانی، لێی دەرباز بووین..
برسییەتی و تینوێتی هەراسانیان کردین.. لە سێهەمین ڕۆژدا، تەنیا کۆڵێک وردەنانمان پێ مابوو کە دەبوو بە «پیاڵە» بەسەر هێزێکی پەنجا کەسیدا دابەش بکرێت. لەو گەڕانەوەیەدا، سێ پێشمەرگە بە نهێنی ماڵئاواییان لێ کردین و بۆ شار گەڕانەوە.
گەیشتینەوە «گریانە»ی بنکەی سەرەکیمان... بەسەر هەواری خاڵییدا کەوتین! خانووەکان هێشتا دەسووتان... ئاسەوارێک لە ژیان نەبوو! نە دەنگی مرۆڤێ، نە حەپەی سەگێ، نە بارەی بەرخێک. بەعس، هەموو شتێکی لووش دابوو! هیچ نەمابوو.. هەر هیچ!

## هەزارپەز...ماڵیک بۆ دەروێشانی شۆڕش!

لە نێو باخەکانی گوندی «گریانە»دا بنەمان خست. ئازووقەی تەقەتکراوی نێو کونەبەردانمان دەرهێنا. مەفرەزەیەک رەوانەی چەمی تەوێڵە کرا، تا لەوێوە پەیوەندی بە شارەوە بکات و هەندێ کاروبار جێبەجێ بکات.

رۆژی پاشتر، دەوڵەت بە هێزێکی زۆری سەرباز و جاش و کۆپتەرەوە هێرشی بۆ هێناین. شەڕ گەرم بوو. کۆپتەر گاڵەی پێ کردین. ئەو بستۆکە باخ و مەزرایەی پێشتر دەسووتابوون، ئەو ڕۆژە رەش داگەڕان. شەڕەکە تا دەمەوئێوارەی خایاند. ئێمە چ زیانێکمان پێ نەکەوت. هەندێک قاچاخچی، قاترەکانیان لە دەست دان. خوێنی ئێسترەکان تێکەڵ بە ئارد و برنجی ئێمە بوو.

پاش ئەو هێرشە، بە ناچاری بنکەمان بۆ ئەشکەوتی «هەزارپەز» گوازتەوە.

هەزارپەز، ئەشکەوتێکی زێدەگەورەی زاردپچڕاو، هەزار ساڵە هاژە و هاواری «سیروان» دەخواتەوە، کەچی نە ئەم ئۆخژن دەکات و نە سیروانیش بۆ ساتێک بێدەنگ دەبێت. سیروان، رێک لە بەردەمی ئەم ئەشکەوتەدا دەبێتە تێغی دووکەرتکردنی ولاتێک! ئەمبەر، کوردستانی ئێراق و ئەوبەریش کوردستانی ئێران! ئەشکەوتەکە، لە بن شاخێکی هەزاربەهەزاردا هەڵکەوتووە... لەسەرێ را، زەردەمایەکی ئەستەم و رژد کە هیچ رێگا و بزنەرێیەکی لەخۆ نەگرتووە. تۆ، روو لە ئەشکەوت و پشت لە سیروان بوەستە، تولەرێیەک بە دەستی راستدا بە دە دەقیقان دەتباتەوە گوندی «شێخان»ی کوردستانی ئێران و بە لای چەپیشدا، باریکەرێیەکی پێچاوپێچ و پرمەترسی بە کەناری سیرواندا، دەتگەیەنێتە دەراوی گریانە. هەزارپەز، دوو ژووری پانوپۆڕە کە لەسەر حەوشەیەک وەستاون و حەوشەکەش بە گابەردی فرەگەورە دەوری گیراوە. لەوێدا و لە سەختترین رۆژگارەکانی خەباتی شاخ و درندەیی بەعسدا، تۆ هەست بە ئارامی و جۆرێک لە بەختەوەری دەکەیت و پێت وایە، جگە لە هێزی خودی کورد، هیچ هێزێک زەفەرت پێ نابات.

هەزارپەز، نهێنەماڵی گوزەرانی هاوینی ساڵی ۱۹۷۸مان بوو.

لەوێ را، مەفرەزەکان بۆ تەوێڵە، بیارە، هەڵەبجە، شارەزوور و ناوچەی ئەوروڵی دەبزووان. ئامانجی هەڵسووڕانی مەفرەزە و دەستە بچووکەکانی پێشمەرگە لەو هەلومەرجەدا، زیاتر بۆ راپەڕاندنی کاروباری رێکخراوەیی کۆمەڵە و یەکێتی، راگەیاندن و پروپاگەندە، دابینکردنی خۆراک و پێویستییەکانی ژیان و کۆکردنەوەی پارە لەو جوتیار و خاوەن موڵکە راگوێزراوانەی گوندەکان بوو کە بەعس لە ئۆردووگا زۆرەملێکاندا بەندی کردبوون.

بەعس، پاشی راگوێزانی گوندەکان و کۆکردنەوەی دانیشتووانیان لە ئۆردووگاکاندا، بە پارە ژێڵ «قەرەبوو»ی مەزرا، باخ، کانییاو و موڵکەکانی بۆ دەکردنەوە. ئەم سیاسەتەی بەعس، جگە لە ئامانجە سەرەکییەکەی کە دابڵۆقەدانی بزووتنەوەی سیاسی ـ چەکداری کورد و هەڵوەشاندنی ژێرخانی ئابووریی کوردستان بوو، ئەوە کارکردێکی ئێجگار خراپی لەسەر هەڵوەشاندنەوە و شێواندنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەی کوردستان دانا و ئاسەوارەکانی تا هەنووکەش ماون و رۆڵی نەگێتیڤیان لە گۆڕانکارە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەکاندا هەیە.

ئێمە، وەکو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، رێژەی ٪٥مان لەو پارەیە وەردەگرت. وەدەستخستنی ئەو پارەیە کارێکی ئاسان نەبوو. هەندێک جار مەفرەزەکان دەکەوتنە بۆسەی سەرباز و جاشان و قوربانیشیان بۆ دەدا. هەندێک لە جوتیار و خاوەن موڵکەکان، بۆ خۆیان و بێ هیچ زۆرلێکردنێک، پارەکەیان دەنارد و هەشبوو ئامادە نەبوو ١٠٠دیناریش بە خواستی خۆی بدات، بەناچاری مەفرەزەکان دەچوون و دەیانهێنان! کۆکردنەوەی ئەو پارەیە سەرچاوەیەکی باشی داهاتی ئەو قۆناغەی بزووتنەوەکە بوو. یاخود تەنیا سەرچاوەیەک بوو بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیانی پارتیزانی، لە چەک و تەقەمەنی، خۆراک و پۆشاک و پێداویستییەکانی دیکەی پارتیزانەکان. لە سنووری کارکردنی ئێمەدا، پارەکە بە لیژنە کۆدەکرایەوە و خەرج دەکرا. رەنگە ئێمە تەنیا هێزێک بووبێتین کە لەو چەرخە پارەیەی دەستمان کەوتبوو، بڕی٢٠٠٠ دینارێکمان بە مەلابەختیاردا، بۆ سەرکردایەتیی یەکێتی ناردبێت! لە ناوچەکانی تردا، ئەو پارەیە، وتی وتی و قسەوباسێکی زۆری لەسەر بوو! هێڵی سیاسیی جیاواز و نێوەندی دەسەڵاتی جیاواز لە بەشەکانی تری هەرێمی یەکدا، بواری بۆ کاری هەرکەس بۆخۆی و لاخستن و قاچاندن رەخساندبوو.

مەلابەختیار، وەکو ئەندامی سەرکردایەتی و لێپرسراوی لیژنەی هەرێم، پاش ئەوەی هێزەکەی هەورامانی لە رووی سەربازی و سیاسییەوە رێکخستەوە، لەگەڵ مەفرەزەکەی خۆیدا گەڕایەوە بناری سوورێن و لەوێشەوە بەرەو بنکەکانی سەرکردایەتی یەکێتی رۆیشتبوو.

هێزەکە لە رووی سەربازییەوە، کرایە دوو کەرت و هەڵبژاردنی فەرمانەکانیشیان بە دەنگدان بوو!

* فەرەج تریفەیی فەرمانەدەی کەرتی یەک و (غەفور دەرەشیشی)یش جێگرەکەی.
* کەرتی دووی هەورامان، ئەحمەدگریانەیی فەرماندە و حەمەی حەمەسەعید «شاهۆ» جێگرەکەی.

فەرماندەی مەفرەزەکان، ئەگەر یادەوەرییم بە هانامەوە بێت

١ـ مەحمودی حاجی فەرەج

٢ـ مەلابرایم

٣ـ سدیق گریانەیی

٤_ دڵسۆزی حەمەی سان ئەحمەد.
ئەرکی هەڵسووڕانی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.پاش ئەوەی تاهیر عوسمان «سەرکەوت» و عەلی شامار، وەکو دوو کادری سەرەکی کۆمەڵە لە نێوچەکەدا، لەگەڵ مەلابەختیار ڕۆیشتن، لە ئەستۆی بەندە دران. بەو پێیە، من کرامە لێپرسراوی ڕێکخستنی کۆمەڵە لە نێو هێزی پێشمەرگە و جەماوەری ناوچەی هەڵەبجەدا، هەروەها ڕاپەڕاندنی کارەکانی ڕێکخستنی یەکێتیش بە من سپێردرا. حەمەسەعیدە سوور «دکتۆر ڕەزا»، لێپرسراوی نێوچەی هەڵەبجە و حەمەی حاجی سابیر و من ئەندامانی لیژنەی نێوچە بووین. دیارە بەکری حاجی سەفەر ئەندامی سەرکردایەتی و لێپرسراوی لقی سلێمانیی یەکێتی بوو کە ناوچەکانی هەڵەبجە و پێنجوێن و شارباژێڕی دەگرتەوە. وێڕای کورتیی تەمەنی خەباتی من لە شاخدا، ( ئێستا مانگی ئاگۆستی ساڵی ١٩٧٨ەو تەمەنی پێشمەرگەیەتیی من تەنیا ٤مانگە)، ئەرکەکانم گران و فرەلایەن بوون.
ڕێکخستنی پێشمەرگەکان لە ئەڵقەی ڕێکخستن و ڕۆشنبیریدا ،لە سۆنگەی بوونی ژمارەیەک پێشمەرگەی خوێندەوار و ئەندامی کۆمەڵە، کارێکی دژوار نەبوو. هەر کەرتێک رابەرێکی سیاسیمان بۆ دانا و هەر مەفرەزەیەکیش هەروەها. بۆ خۆشم سەرپەرشتیم دەکردن و لە نێوان هەورامان و ناوچەی شارەزوور و ئەورۆڵیدا هاتوچۆم دەکرد.
کاری زێدەگران، دروستکردنی ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان شار و شاخ بوو. پرۆسەی ڕاگوێزان، دەریایەک سووتماک و بێدەنگیی لە نێوان ئێمە و شاردا ڕژتبوو! تەوێڵە، باشترین خاڵی پەیوەندی بوو. لەوێ دوو شانەی سەرەکیی یەکێتی و ئەڵقەیەکی بەرتەسکی کۆمەڵە هەبوو کە ئەوانی بە هەڵەبجە و سلێمانییەوە دەبەستەوە و دەبوو ببێتە خاڵی پێکەوەگرێدانی ئێمەش لەگەڵ سەرکردایەتیی نێوخۆ. ئەم کارە زۆر بە ئاستەم جێبەجێ دەکرا و هەتا کۆتایی ساڵ، بەرهەمێکی وەهای بە دەستەوە نەدا! پاراستنی ئەو قەوارە ڕێکخراوەییە بۆ ئێمە لە هەموو شت گرنگتر بوو. پەیوەندییەکان زنجیرەیی بوون. پاش وەبەرگورزکەوتنی ڕێکخراوی «شنروێ»ی کۆمەڵە لە هەڵەبجە، ئیدی شیرازەی ڕێکخستنەکان وا تێکچووبوون کە پەیداکردنی متمانە و گرتنەوەیان ئاسان نەبوون. ساڵی ١٩٧٧، گورزی بەعس بەر تەلاری سەرەکیی کۆمەڵە لە هەموو کوردستاندا کەوت و هەڵەبجەش زیانی زۆری پێ کەوت! ئەو ساڵە، سەرجەمی ئەندامانی ڕێکخراوی هەڵەبجە دەستگیر کران و وەستا ئەنوەر و ئەنوەر حەمەئەمین «هیوا»، لە زینداندا شەهید کران. ڕێکخراوی قوتابیانی هەڵەبجە، بەشی هەرە زۆریان گیران و حوکم دران.
بە درێژایی چوار مانگان، ئێمە نامەیەکی سەرکردایەتیی نێوخۆی کۆمەڵەمان پێ نەگەیشت و هیچ ئاگایەکیشمان لە سەرکردایەتیی کۆمەڵە و «م.س»ی یەکێتی نەبوو. ئەو ماوەیە، ئێمە لە مەملەکەتێکی

دابڕاودا دەژیاین! لە دنیایەکدا هەڵسوکەوتمان دەکرد، کە تەنیا خۆمان
دەماننناسی و بۆخۆمان یاساکانیمان دادەڕێژان.
وێڕای دژواری و سەختیی ئەو باروبۆخەی ئەوێ ڕۆژێ، من ئێستاش هەست بە لەززەت و خۆشییەکانی
دەکەم.

## چا لە دەمارەکانماندا دەگەڕا

پارە و داهات لە نەبوونی بازاڕ و گیرخواردن لە گەمەیەکی تەنگی دابڕاودا، هیچ نرخێکیان نییە! پەیداکردنی برنج و رۆن و بۆنکردنی گۆشت، کارێکی زێدە سەخت بوون کە خەونمان پێوە دەدیتن. ئەو رۆژگارە، کاری قاچاخچییەتی نێوانی کوردستانی ئێران و ئێراق، لە سۆنگەی ترسی هەردوو رژێمدا، کارێکی بەرمێن و باو نەبوو. سیاسەتی بەسووتماککردنی خاک و قەدەغەکردنی هاتوچۆ لە نێوچە راگوێزراوەکاندا، پەیداکردنی خۆراکیان زێدەسەخت کردبوون. ئەو ئازووقەیەی پێش راگوێزانی گوندەکان، لە کونەبەرد و ئەشکەوتاندا ئەنبارمان کردبوو، دەمەت تەواو دەبوو! تەنیا سەرچاوەی وزەی لەشی هەرگیز دانەساکاوی پێشمەرگە، نان و چا بوو! بەیانی: نان و چا، نیوەڕۆ: چا و نان ، ئێوارە: هەردووکیان!

سالەح دەرەشیشیی قسەخۆش دەیگوت: هەر کەسێکمان شەهید ببین، (چا)مان بەسەر خاکی کوردستاندا دەرژێ نەک خوێن!

هاوینی کوردستان، ئەگەرچی بۆ خۆپارستنی پێشمەرگە پڕ مەترسییە، وەلێ بۆ ژیان و گوزەران لەبارترین وەرزە.

هاوینان، تۆ پێویستت بە پێخەف و پێخۆر نییە، بیر لە لانە و بنەڕەمەن ناکەیتەوە، شەو و رۆژ وەکو یەک دەتوانیت بە رێگادا بڕۆیت و بیرت لای پۆشاکی ئەستوور نەبێت، خۆشتن و خۆپاککردنەوە باشتر مەیسەر دەبن و لەشکری «ئەسپێ» لەبەردەم سێلاوی ئارەقەدا، دەبەزێ!

لە نێوان هەزارپەز و سیرواندا، مەودایەکی پڕ لە گابەرد هەیە. لە نێوانی ئەم گابەردانەدا، تا چۆکان لم کەوتووە. ئێواران، سێبەری چیا بەرز و چڕگەنەکەی ئەوبەری سیروان، ئەم مەودایە دادەپۆشێ. ئێمە لە نێوان ئەو بەردانەدا، لە لم و تەنکەبەرد جێگای خەوتنمان چێ دەکردن و خەونمان بە کوردستانی ئازادەوە دەبینی!

کازیوەی بەیانێک کە لە خەو رابووین، وەکو پیشەی پارتیزانان دەوروبەر و چیاکەی ئەوبەرمان لەژێر نیگای دووربین نا.

ئەها! ئەوە دوو بزنەکێوین.. ئەوەتان بە لوتکەی «ما»کەوە و لە ئێمە دەڕوانن! دەنگی فەتاح ئێناخییە کە دووربینەکە بە ملیدا شۆڕ دەکاتەوە و دەست بۆ چەکەکەی دەبا.

چا ئەوە کوشتیشت، کێ ئەتوانێ لە سیروان بدا و بیکاتە ئەمبەر؟! پێشمەرگەیەک لەولاوە وای گوت.

_ مامۆستا تەقەی لێ بکەم!

_ لێی بكە! ئەگەر گۆشتەكەیمان بە نسیب ببێت.
من ئەتوانم ئەمبەری بكەم! ئەمیربۆیینی وا ئەڵێ.
فەتاح سێڕەی لە یەكێكیان گرت. ئەم دەستی لەسەر پەلەپیتكە داگرت و ئەو لەسەر زەرنەماكەوە بە تەپاوتل تا رۆخی ئەوبەری سیروان خلۆر بوویەوە! ئەمیر، گوریسێكی لەگەڵ خۆی برد و وەكو ماسی، شەتاوی سیروانی شەق كرد. ئەمیر، گوریسەكەی لە ملی بزنەكێویی نیوەزیندوو بەست و بە مەلە، كرنییەوە ئەمبەر. ئەوجا لەمبەرەوە ، سێ و چوار كەسێك سەری گوریسەكەیان راكێشا و قوربانییەكەیان بۆ مەملەكەتی برسییەكان، كێش كرد.
لە كەمتر لە نیو سەعاتدا، بزن گوورا، پارچە كرا، كرایە بیست پشك و هەر پشكی بۆ دوو پێشمەرگە! گۆشت... گۆشت! دوو مانگ زیاتر دەبوو كە هیچ كەسێك تام و بۆنی گۆشتی نەكردبووحەبیب، سەروپێكەیشی پاك كرد و لە تەنەكەیەكی نیوەژەنگاویدا، كەللە و پاچەشیان لێ نا!

# ڕووخساری فریشتەیی دایکم

دەبوو کارێک بۆ پێوەندگرتن لەگەڵ ڕێکخراوی شاردا بکەم.
بەیانیی ڕۆژێکی هاوین لەگەڵ سپێدەدا، هاوڕێی پێشمەرگەیەک لە هەزارپەزەوە و بە مەبەستی گوندی عەبابەیلێ کە ٥ کیلۆمەترێک لە شاری هەڵەبجەوە دوورە و نزیکترین گوندی ژیانزیندووی نێوچەکە بوو، بەڕێ کەوتین. نانی نیوەڕۆژمان گەیاندە سەر کانییەکەی گوندی هاوار. کەلاوەکان، لە زەمینەدا ڕاست دەبوونەوە و دەچوونەوە دۆخی جارانیان. چاخانەی بن دارگوێزەکان جمەی دەهات و تەقەی داکوتانی پوولی دۆمینە، تەلی خەیاڵمی دەپساند... کانیی ژنان و کچۆلانی سەتڵەداو لەسەرشان، بە ناز و حیلکە، کارمامز ئاسا، بە سڵەوە بەرەو ماڵ دەبوونەوە و لە کوڕانی جوانخاسی سەر گوێسەبانەیان دەڕوانی.. قاڕە و بارەی بزن و مەڕ و بۆڕەی مانگای تازەزاو، بۆ کەسانێک لەززەت لە ژیانی گوند ببەن، جوانترین تابلۆ و شاکارترین مۆزیک بوون!
کە توێشوومان کردەوە و نانەڕەقەمان لە ئاوی سازگاری کانییەکە وەردا و بە کاوەخۆ کەوتینە خواردنی ئەوجا بە خودا هاتمەوە و هەستم بە کارەساتی ڕاگوێزان کرد! لەگەڵ بینینی هەر دارگوێزێکی لە تێنوان زەردەهەڵگەڕاودا، گوریسی ڕقی ئێمە، لە ئاست بەعسدا ئەستوور و ئەستوورتر دەبوو.
کە ئێمە گەیشتینە ترۆپکی شنرۆێ، خۆرەکە سەرگەرمی کۆکردنەوەی کەزی و پرچی زێڕینی بوو! زەردەی نێوارە هەڵدەکشا و ئێمە ئەرم ئەرم شۆڕدەبووینەوە. ساتێ گەیشتینە سەر «کانییەبەهارە»ی ژوورئاوایی، تاڵی ڕەش و سپی لێک هاوێر نەدەکران. هاوڕێکەم ناردە ماڵی خزمێکی خۆی و بۆ خۆشم بە چەند شەقاوان خۆم کردە میوانی ماڵی شێخ عەبدولا.
پاشی پشوودان و نانخواردن، وەڵامم بۆ کەماڵ شاکیر نارد کە هاوڕێی کۆمەڵە و بریندێچی گوند بوو، تا بێت و یەکتر ببینین و نامەیەکمان بۆ شار بگەیەنێت. کە قاسید هاتەوە، تێگەیشتم کە بۆی دەلواوە یان نەیوێراوە بێت! لە کەماڵ ناهومێد بووم. نامەکەم دایە شێخ و ناونیشانی کەسێکم لە شار پێ دا. ئەو نامەکەی گەیاندبوو، وەلێ من وەڵامەکەم هەرگیز وەرنەگرتەوە!

_ دایکت لێرەیە!
_ چۆن؟ لەکوێیە؟!
_ دوو ڕۆژە لە ماڵی ئێمەیە و ئەم ئێوارەیە چووەتە ماڵی بابەگەورەت.

نەبوو چاوەڕێ بم. چوون بەنیاز بووم ڕۆژی دواییش هەر لەو ناوە وەمێنم، نەدەکرا کەسێکی دیکە بە هاتنمان بزانێت.
کاتژمێر ١٠ی ئێوارە، گوند کڕ و بێدەنگ! لە ماڵی شێخ وەدەرکەوتم. لەوێڕا کە بۆ ناو گوند شۆڕدەبێتەوە، هەر دەڵێی بە «ڕێپلیکانەی دێو»دا دادەبەزیت! چەکی ئەمنترازاو لە دەستدا و پلە پلە بە کۆڵانی تەسک و پێچاوپێچدا گەیشتمە «سەرحەوز» و لەبن چنارەگەورەدا کورکەم کرد! دەنگی «تاقتاقەکەرە»یەک سامێکی تایبەتی بە شەوەکە دەبەخشی! بە کۆڵانی پشتەوەدا، بە پێدزکە و پێشمەرگەئاسا، چوومە سەربانی ماڵی بابەگەورە..... چڵوپۆپی چنارەگەورە، سەرپاکی سەربانەکەی تەنیوە. دوو جێگا ڕاخراون و دوو ژن خەوتوون. لێیان دەڕوانم. بەتانییان بە خودا داوە و سەر و گەردنیان داپۆشیوە. دایە زەینەب و دایکمن! لە ڕووخساری دایکم رادەمێنم.. لە نێوانی گەڵای وەشنەکەوتووی دارچنارەکەوە، گورزەتیشکێک، تێکەڵ بە پرچ و سیمای دایکم دەبێت. دایکم لەسەرخۆ، وەک فریشتە هەناسە دەدات، توێژاڵێک خەم لەسەر لێوانی کەوتووە... سەرم نزیک دەکەمەوە و بۆنی هەناسەی دەکەم... ماندوویێتیی ڕێگا، هەواری جەستەم جێ دەهێڵێ و هەست بە فڕین دەکەم... بە ئاستەم دەست لە نێو دەستی دایکم دەنێم.. دەستی گەرم گەرمە.. دایکم چاوانی هەڵدێنێ.. نیگاکانی لە چاوانمدا بەند دەبن و لێوانی پێ دابزووێن.
_ دایکە گیان!
_ کێ... تۆ کێیت؟
_ من... منم دایکە! ئاهەقی نییە... جلی خاکی، جامەدانی، بستێک ریشی چڵکن.. چۆنم بناسێتەوە؟
وەک شێتان پەلامارم دەدات، ڕووخسارم دەلێستەوە... ئەو ماچم ناکات، دەیەوێت هەڵممژێت و بۆ یەکجاری لە زگیدا زیندانیم بکاتەوە!
سەعاتێک، تەنیا سەعاتێک پێکەوە دەمێنینەوە و ئیدی ماڵئاوایی لێ دەکەم. لە یەک کاتژمێردا، دایکم یەک وشەی لەگەڵ نەوتم. ئەو، تەنیا لێمی دەڕوانی و ماچی دەکردم.
بە ڕێگایەکی دیکەدا، گەیشتمەوە ماڵی شێخ.. نان و شەکر و چام پێچایەوە و شوێنی خۆشاردنەوەمم بە شێخ گوت و هاوڕێکەم لە شوێنی دیاریکراودا چاوەڕێ بوو. دەمەوبەیان لە باخچەیەکی بناری شنرۆێدا، کۆڵێتێکمان چێ کرد.. زەویمان ڕاخست و هەوامان بە خۆماندا دا و دەمەونیوەڕۆ لە ترپەی پێی «کاوە« بە ئاگا هاتین. کاوە خواردنێکی ئێجگار خۆش و دەبەیەک بەفراوی بۆ هێنابووین.
ئێوارە، چنگمان لە بالای شنرۆێ گیرکرد و بە چەند سەعاتان سەرکەوتین. لەو بەرزی بەرزەوە، پێش ئەوەی بە دۆڵی «ئەشکەوەڵ»دا ڕۆ بچین، ئاوڕێکم لە شار دایەوە.. هەندێک لە هاوڕێکانی خۆمم

دەبینین کە پاشی خواردنەوەیەکی خۆیان ئاسایی، لە نێو پێخەفی نەرمدا، لەسەربان خەوتبوون!
پاشتر و بە درێژایی رێگاکە، هەر بیرم لە رووخساری فریشتەیی دایکم و هەناسە گەرمەکانی دەکردەوە! نازانم لە چاوی خەڵکانی دیکەدا، چەندە دایکم جوان بوو؟! بەڵام بۆ من، جوانترین ژنی دنیا بوو.. دیارە هەموو کەسیش دایکی خۆی هەروا دەبینێ... دایکێک بوو لە فریشتە!

## لە هەزارپەزەوە بۆ پەروینی

پەروینی، کانی و ئەستێرکێکە بە نێوقەدی چیایەکی زێدە زەبەند و چڕگەنەوە کە بە چەندسەد مەترێک، مەرزی نێوان هەردوو بەشی کوردستان دەبەزێنێ و لە نێو خاکی هەورامانی بەشی ئێراندا. ئۆقرەی گرتووە! بەشی سەرەوەی چیاکە، بە داربەڕوو، دارەوەن، قەزوان و بەلاڵوک بە چڕی داپۆشراوە. لە پەروینی بۆ خوارەوە، تا دەگاتە «قەلاّگا»، «شیخان» و پایینی شارۆچکەی «نەوسود»، بە باخی هەنار و ڕەز رازاوەتەوە. کێڵەباخێکمان لە پەروینی کردە بارەگای خۆمان و هەندەک پێویستیی ژیانمان بۆ دابین کرد. پەروینی، لەو هەلومەرجەدا بۆ ئێمە جێگایەکی لەبار بوو. چونکە:

* دەکەوتە نێو خاکی ئێران و مەترسیی هێرشی دەوڵەتی ئێراقی کەم دەکردەوە.
* ئێران لەسەر گرگانی شۆڕش ڕۆنیشتبوو و ئەگەری پەلاماری چریک و سەربازی ئێرانی کەمتر بوو..
* لەوێڕا، بە سەعاتەڕێیەک دەگەیشتینە نێو باخەکانی تەوێڵە.
* پەیوەندیی لەگەڵ خەڵکی گوندەکانی کوردستانی ئێرانی لەو ناوچەیەدا بۆ مەیسەر دەکرین.
* شەوانە، ژمارەیەک لە خوێندەواران و ڕۆشنبیرانی چەپ و کوردپەروەری نێوچەکە دەهاتنە لامان و باس و خواستمان لەمەڕ داهاتووی شۆڕشی ئێران و بزووتنەوەی کورد، لەگەڵ دەکردن.
* دۆستان و هاوڕێیانی خۆمان لە شارۆچکەی تەوێڵەوە، شەودزیان دەکرد و هەواڵ و نامەیان بۆ دەهێناین.

لە پەروینیدا، کەمێک گوڕ و هێزمان تێکەوتەوە و بواری خۆڕێکخستن و جموجوڵمان زیاتر بوو. لەو ماوەیەدا، ژمارەی پێشمەرگە و پەیوەندیکردنی کەسانی نوێ بە بنکەکەوە لە زیادبووندا بوون. تێکۆشەرانێک هاتنە ڕیزەوە کە پاشتر یان شەهید بوون یاخود بە درێژایی تەمەنی بزووتنەوەکە مانەوە و ڕۆڵی بەرچاویان لە کاری ڕێکخراوەیی و پێشمەرگانەدا گێڕا. دیارە کەسانێکیش دەهاتن و پاش چەند ڕۆژان، لە سۆنگەی سەختیی بارۆدۆخەکەدا، جێیان دەهێشتین و بۆ شارەکان دەگەڕانەوە.

لە سەرەتای سێپتەمبەری ئەو ساڵەدا، نەخۆش کەوتم و پاشان هەردوو گوێم توانای بیستنیان لە دەست دا. نەبیستن یەکێکە لە گرفتە هەرە جددییەکان کە تووشی کەسێکی پارتیزان دێت. قسە و باسی نێوان ئێمە، واتە ئەحمەدگریانەیی و شاهۆ و من، لە نێو پێشمەرگەکاندا دەبوو بە چپە بێت. لە ژیانی پێشمەرگەدا، بڕیاری هاتوچۆ و جمانی مەفرەزەکان، تەنیا لێپرسراوانی سیاسی و سەربازی دەیدەن و پێشمەرگە چ مافێکی پرسینی نییە: کەی دەڕۆین؟، بۆ کوێ دەڕۆین؟، چەند کەس دەڕوا و

بۆ چی و چۆن؟. من کە بیسایم نەیدەبیست، ئیدی دەبوو لەسەر پارچەکاغەزێک بۆم بنووسن، یان مەودایەکی باش دوور بکەوینەوە و بە دەنگی بەرز قسەم لەگەڵ بکەن! لە تەوێڵەوە هەندەک دەرمانیان بۆ ناردم، ئازارەکەم سرەوت، وەلێ گوێکانم هەر کپ بوون.

لەو سەروبەندەدا ، مەحمودی حاجی فەرەج و مەفرەزەکەی هاتنە لامان و لە گەڕانەوەیاندا بۆ ناوچەی ئەورۆڵی و پشت بالآنبۆ، دەبوو رەگەڵیان کەوم. ئەحمەد و شاهۆ پێیان وابوو، بەو حاڵەوە، بۆ من زەحمەتە و تووشی کێشە و گرفت دێم، بەڵام من جەختم لەسەر رۆیشتن کرد.

من، دەبوو هەم مەفەرزەکانی ئەو دەڤەرە بەسەر بکەمەوە و هەمیش هەوڵێکی پەیوەندگرتن لەگەڵ کۆمیتەی شاری سلێمانی بدەم.

بەیانییەک زوو، لە پەروێنییەوە بەڕێ کەوتین.. سەرەتا بۆ هەزار پەز و لەوێوە، هاوڕەوتی سەفەری سیروان، بۆ دەراوی گریانە و پاشان بەرەو «بۆیین». ئەو رێگایە، نە رێگای ئاساییە، بگرە بزنەڕێ و شوێنڕەوتی ئاژەڵی کێوییە. رێگاکە بە کەمەری چیایەکی سەختەوە، هەر دەڵێی بە تەشوێ تاشراوە. ترۆپکی چیاکان، دەیان ڕەبایەی دەوڵەتیان لەسەر هەڵتۆقیبوون. شەو، لە نێوان رەبایەکانەوە رۆشتینە سەر کانییەکەی «سەروەزەن»ی نزیک گوندی سازان. لە کاتی ئاوخواردنەوەدا، وەبەر رێژنەی گوللە دراین. من، دەنگی چەکەکانم نە دەبیستن، تەنیا گڕی گوللەکانم دەدیتن. تێرئاو نەبووین و بە چیاکەدا هەڵزناین. لەگەڵ بەیاندا ، گەیشتینە گوندەکانی «چنار»، «مۆرِین»،«تەوەنەوەل» و پاشان بۆ رۆخی سیروان دابەزین. پەڕینەوە لە رووباری سیروان، کارێکی ترسناک بوو. دەبوو بە «کونگە» بپەڕینەوە..

دوو کونگەی فووتێکراو، لە پێشەوە بە دارێک پێکەوە بەستراون. تۆ، خۆت ڕووت دەکەیتەوە. چەکەکەت لە مل دەکەیت، جلەکانت بە شان و ملتەوە دەبەستیت و دەچیتە نێوان دوو کونگەکە، کابرای مەلەوان لە دواوە تۆ و کونگەکان لە باوەش دەگرێت و بە مەلە پاڵتان پێوە دەنێت و دەتانگەیەنێتە رۆخی ئەو بەر. چەند رۆژێکمان لەگەڵ مەفرەزەکانی کەرتی یەک، لە کونەئەشکەوتەکانی رۆخی سیروان بەسەر برد. لەو رۆژانەدا، کاری رێکخراوەیی پێشمەرگەکانمان ئەنجام دا و پاشان لەگەڵ یەکێک لەمەفرەزەکان، دووبارە پەڕینەوە بۆ نێوچەی ئەورۆڵی و گوندەکانی «کەوتە»، «هانەسوورە»، «گونە«، «سەراو»، «پریس» و «تریفە»مان بەسەر کردنەوە. هەر لەوێ ڕاپۆرتێکی هەمەلایەنم نووسی و بە هۆی سەیدموحسینی سەید قادرەوە کە هاوڕێی کۆمەڵە و برینپێچ بوو لە گوندی گونە، بۆ کۆمیتەی کۆمەڵەم لە شاری سلێمانی نارد. مەفرەزەکان لە سۆنگەی ئیش و کار و بۆ خۆپاراستن و شوێنونکێ، بلآوەیان کرد. ئێمە کە ٥ پێشمەرگە بووین، شەو لە گوندی تریفە ماینەوە. گوندی تریفە، تەنیا دەدەقیقە رێگا لە شاری هەڵەبجەوە دوورە. ماڵی باوکی فەرەج تریفەیی و هەموو ئەو

ئۆستانەشی کە شەو هاتنە لامان، تکایان لێ کردین کە لەوێ نەمێنینەوە، چونکە دڵنیابوون کە مەسەلەی ڕاگوێزانی گوندەکە لە سات و کاتدایە و ئەگەر سبەینێ جاش و سەرباز بێن و خەڵکەکە ڕاگوێزن، ئیدی دەربازبوونی ئێمە مەحاڵ دەبێت. من کە بیسابیم نەبیس بوو. لە قسەکانیان نەدەگەیشتم و پاش چەند ڕۆژێک هاوڕێکانم بۆیان گێرامەوە. شەو، کاتژمێری دووانزە، فەرەج تریفەیی کە فەرماندەی کەرت بوو، تێی گەیاندم کە وا نیازە شەو لەوێ بمێنینەوە و بۆ ڕۆژەکەشی هەر لە نێو باخە چکۆلەکەی بەردەم ئاواییدا خۆمان بشارینەوە. من گوتم: تۆ شارەزایت و ئەگەر پێت باشە وا دەکەین، تا چاوەڕێی وەڵامی سلێمانیش بکەین.

باخەکە، هەر چەندسەد مەتر چوارگۆشە دەبوو. ئەگەر لە دوورەوە لێت ڕوانیبا، تەنیا پەڵەیەکی سەوز بوو بە دامێنی شاخێکی ڕووتەنەوە و ڕێگایەکی ئۆتۆمبێلیش، لە دامێنییەوە. شاری هەڵەبجەی بە گوندەکانی دیکەی ناوچەی ئەورۆڵییەوە دەبەستەوە.

هەر یەکە و پەتوویەکمان لەگەڵ خۆمان برد و لە ژێر دارگوێزێکدا خۆمان لێ بە زەویدا دا و لێی خەوتین.

چەند بوو خەوتبووم؟، نازانم! لەپڕ کەسێک دەستی گووشیم. فەرەج بوو. بە دەست تێی گەیاندم کە چواردەوری باخ و گوند گیراوە! سەیری کاتژمێرم کرد، پێنج و نیوی بەیانی بوو.. بە نیاز بووین بەرەوە گوند و پاشان ڕووەو باڵانبۆ هەڵکشێین، کەچی گردەکانی پشت ئاوایی، دوژمنی لێ دامەزرابوو. لە ژێر پەڵەتوترکێکدا خۆمان پەنا دا.

+ مانەوەمان لێرە بێ سوودە! جاش و سەربازان بۆ هەنجیرخواردنیش بێنە ئێرە، ئیدی کار لە کار دەترازێ و دەبێ تا شەهیدبوون شەڕ بکەین.. فەرەج وای وت و بە دەستیش هەوڵی دەدا، ئۆخەکە بۆ من ڕوون بکاتەوە!

_ تۆ بڕیار بدە... چت پێ باشە، وا دەکەین!

ئەو بە سکەخشێ پێش کەوت و ئێمەش هەر چوارمان بە دوی ئەودا.

لەو شوێنەدا، سنووری باخەکە کۆتایی دەهات، گونجێک بۆ ئاوەڕۆی باخەکە بە ژێر جادەکەدا هەڵکەنرا بوو.

+ جامەدانییەکانتان لە ئێوقەدتان بپێچن، کڵاوەکانتان لە گیرفانتان نێن.. من لە پێشەوە دەڕۆم و بە گونجەکەدا دەرباز دەبم، کە گەیشتمە ئەودیوی ڕێگاکە و لە چاو ون بووم، ئەوجا یەکێکی دیکەتان... گوێ هەڵخەن! ئەگەر گرمەی ئۆتۆمبیلەکان نزیک بوون، دەبێ چاوەڕێ بن.. ئەگەر بە منیان زانی و تەقەیان لێ کردم، ئێوە لە شوێنی خۆتان بمێننەوە... فەرەج قسەی دەکرد و لەپڕ تانکێک و دوو ئیڤای پڕ لە سەرباز گەیشتنە ئاستی ئێمە... ئەوەستان و بەرەو گوندی پریس ڕۆشتن! فەرەج، لەسەر زگ،

خۆی لە گونجەکە هاوێشت. ئەو جاریێ لە ژێر جادەکەدا بوو. تانکێکی دیکە پەیدابوو! تانکەکە، بۆ چەند دەقیقەیەک لەسەر جادەکە وەستا و پاشان بزووا.. ئەو چەند دەقیقەیە هێندەی ڕۆژگارێک درێژ بوون! کە فەرەج لە ئەدیویدا ون بوو، مەلارەسوڵ شوێنی کەوت. من، ڕۆستەم، عومەرچاوجوان، یەک لە دوای یەک لە گونجەوە ئاودیوی جادەکە بووین. لە کەناری ئەوبەری جادەکەوە، جۆگایەک نە زۆر قووڵ، بەرەو خوار دادەکشا. لە کاتێکدا ئێمە لە نێو جۆگاکەدا ڕاکشابووین و لەسەر زک دەخشاین، دوو ئێڤای پڕ لە سەرباز، بە لاماندا تێپەڕین. سەربازەکان، کە بۆ ڕاگوێزانی جووتیارانی ئەو گوندانە دەچوون، وەک ئەوەی بۆ شایی بچن، گۆرانییان دەگوت و هەلهەلەیان دەکێشا! ئەوان هێند مەست بوون، ئاوڕێکیان بۆ تەنیشتی خۆیان نەدایەوە، تا پاش چەند سەعاتێک جەنگی دەستەویەخە، لاشەی لە خوێنشەلاڵی ئەم پێنج پێشمەرگەیە بە دیاری بۆ شار بەرنەوە! لەگەڵ هەلاهاتنی هەتاودا، ئێمە دەهاتین لە جادەی مەرگ دوور تر دەکەوتینەوە و هەر چەند مەترێک سەرکەوتن بە کەندرێکی دەستی چەپدا و پاشان سەدمەترێک دابەزین، ئیدی لە چەمی زێدەشەخەڵی نێوانی هەردوو گوندی پریسی سەر و خواردا، ون دەبووین.

کە گەیشتینە شوێنی مەبەست، سەرتاپامان لە قوڕ و لیتە هەڵژەنرابوو. لەوێ بڵاوەمان لێ کرد و هەر یەک و لەژێر پەڵەتووترکێکدا جێگای گرت. دووکەڵی گوندەکان، بەری ئاسمانیان گرت.. ناڵەی دینامێت، گوێی پیاوی کەڕ دەکرد! کاروانی گوندییە بێدەسەڵاتەکان، بەرەو ئۆردووگا زۆرەملێکان ڕێچکەی بەست.

ئەو ڕۆژە بەشێکی زۆری گوندەکانی ناوچەی ئەورۆڵییان ڕاپێچ کرد، وەخت بوو ئێمەشیان لەگەڵدا ڕاگوێزن.

لەگەڵ زەردەی خۆراوادا، ڕووخساری ئێمە دەهات خوێنی تێ دەزا و کانیی ورە لە دڵماندا دەتەقی. ئێوارە کە ئێمە خۆمان بە گوندی پریسدا کرد، جاریێ جاش و سەربازان چەند سەد مەترێک لە ئاوایی دوور نەکەوتبوونەوە.

هەر ئەو شەوە خۆمان گەیاندەوە «سیروان» و لە ئەشکەوتەکاندا وچانمان بۆ گرت. ڕۆژی دواتر، من لەگەڵ مەفرەزەیەکدا بەرەو هەورامان گەڕامەوە.

# چراوگێک لە ئاسۆدا دەگڕا!

پاییز بەجارێک هات و بنەی لێ خست! کەزی و پرچی دار و دەوەنان زەرددەڵگەڕان.. زەردێکی ئاڵتوونیی بە یاقوت نەخشێنراو. سەرما و سۆڵە، دەهات کوێستانی دنیای ئێمە داگیر بکات. بەرگی پێشمەرگە و سێوییان، کورد وتەنی شەپڕێو بوو. لەژێر تیشکی هەڵەرزیوی خۆری پاییزدا، گوڵێک دەهات دەپشکوت.. گوڵێک کە ڕۆژانە جۆباریّ خوێنی گەلانی ئێرانی لە بن ڕۆ دەکرا! ئەوە شۆڕشی گەلانی ئێران بوو دژ بە سیستەمی پاشایەتی کە تا دەهات لە هەڵچووندا بوو و وەخت بوو سەرتاسەری ئێران بگرێتەوە. لە تاریکایی ئەو ڕۆژگارەی دنیای ئێمەدا، تەنیا چراوگێک کە لە دوور ڕا دەگڕا و جێگای هومێدی ئێمە و سەرجەمی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی نێوچەکە بوو، مەشخەڵی بزووتنەوەی جەماوەریی گەلانی ئێران بوو.

ئەگەرچی تا کۆتایی پاییزی ئەو ساڵەش، لە کوردستان جووڵە و دەنگێکی جەماوەریی بەرچاو نەبوو، دیسانیش خەڵک دەهاتن گەوەی ترسیان دەپساند، لە خۆسازاندنا بوون و بە نهێنی لە هەموو سنوورەکانەوە. سەرگەرمی پەیوەندگرتن بوون لەگەڵ هێزەکانی کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و ئێمەش بەشی ئێجگار زۆری هیوای خۆمان لەسەر ئەوان دانابوو، شەو و ڕۆژان کارمان بۆدەکردن و لە هەموو ئاستێکدا هاوکاریمان دەکردن.

شەوانە، لە کێڵەباخەکەدا، لە دەوری ڕادیۆکە کۆڕمان دەبەست و گوێمان بۆ ئێستەگەکانی لەندەن و مۆنتی کارلۆ ڕادەدێرا. ئێران، گڕکانێکی گڕگرتوو بوو، تا دەهات کڵپەی بەنێڵەتر دەبوو. ئێمە کە ژمارەمان ٢٠ تا ٣٠ پێشمەرگە دەبوو، بە کەمەری ئەو چیا بەرزەوە، هەموو هۆش و هزرمان لای ئەو شۆڕشە بوو. سەرکەوتنی شۆڕش، هەروەک پێشبینیمان دەکرد و لەسەر پشکۆ چاوەنۆڕی بووین، نەک هەر باروبۆخی شۆڕشی کوردستانی ئێمەی دەگۆڕی، بگرە لە مردن و تیاچوونیش، ڕزگاری دەکرد!

من، ئێستاش پێم وایە: ئەگەر ئەو بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەی ئێران شکستی خواردبا، بزووتنەوەی چەکداری لە کوردستانی ئێراقدا، وێڕای ئەو جەربەزەیی و خۆڕاگرییەی هێزەکانی کۆمەڵە و یەکێتیش لەو سات و سەردەمەدا، لە ئاست دوژمنێکی دڕندەی وەکو بەعسدا دەیاننواند، دیسانیش بە تراژیدیایەکی خوێناوی کۆتایی دەهات!

## هەناسەیەک لە نێوان هەرەس و شۆڕشدا!

کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینی کوردستانی ئێراق، کە لە ساڵی ١٩٧٦دا و راستەوخۆ پاشی کارەساتی هەرەس، بڕیاری لە نوژەن دەستپێکردنەوەی شۆڕش و ناردنەشاخی دەستەی چەکداری دا. نە بار و دۆخی بابەتی ئامادە بوو و نە دۆخی خۆیی کۆمەڵەش لە ئاست هەڵگرتنی وەها ئەرکێکی گراندا بوو. کۆمەڵە، تەنیا لە رووی تیورەوە مەسەلەی شۆڕشی دەرس کردبوو. لە بواری پراکتیکدا، کۆمەڵە دەیویست نموونەی شۆڕشی چین یان کۆبا، لە واقیعی کوردستانی پاش هەرەسدا پراکتیزە بکات. کۆمەڵە، بەبێ دەرسکردن و بەراوردکردنی باری ئابووری، کۆمەلآیەتی و جیوپۆلیتیکی ئەو ولآتانە و کوردستان لە لایەک و لەبەرچاوگرتنی قۆناغ و سەردەمە جیاوازەکان لە لایەکی دیکەوە، بە کردەوە بڕیارێکی جێبەجێ کرد، کە وێڕای جەسووری و چاوقایمیی رێکخراوێکی ئەناسراوی وەک کۆمەڵەی ئەو سەردەمەی دەنواندەوە، ئەوا لە سەرچڵیی شۆڕشگێڕانەش بە دوور نەبوو! هەر بۆیە دەشێ بگوترێ: رووخاندنی رژێمی پاشایەتیی ئێران بە پلەی یەکەم و هەڵگیرسانی جەنگی «ئێراق ـ ئێران» بە پلەی دووەم، دوو فاکەتری زێدەگرنگی بەردەوامبوونی شۆڕشی «نوێ» بوون! بەردەوامبوونێک کە تەنیا جەنگی دووەمی کەنداو بە ناکامێکی گەیاند! دەنا ئەمیش دەبوویە ئەڵقەیەکی دیکەی زنجیرە تێکشکاندنەکانی بزووتنەوەی چەکداریی میللەتەکەمان! لێرەدا، دەشێ ئاماژە بەوە بکرێت کە ئەم بڕیارە زێدەگرنگەی کۆمەڵە، ئاشێ بڕیارێکی تەواو سەربەخۆی نێوخۆی نێو ریزەکانی کۆمەڵە یان سەرکردایەتییەکەی بوویێت! مەبەستم ئەوەیە بڵێم: سەرکردایەتیی کۆمەڵە لە ئەنجامی هەڵسەنگاندن و دەرسکردنی دۆخی ئەوێ رۆژێی کوردستانی پاش هەرەسدا، سەربەخۆیانە و بێ کارکردی را و بۆچوونی دەرەوەی خۆی، ئەو بڕیارە مێژووییەی ئەکردووەتە چاوگی خەبات و تێکۆشانی کۆمەڵە و بە ئەرکی پلەیەکی ئەرکە رێکخراوەیی، فیکری، سیاسییەکانی خۆی دانەناوە!

بەرپاکردنی شۆڕش، بە گەڕانەوە بۆ چاوگی شۆڕشگێڕانە، بزووتنی پارتیزانی، جەنگی بزواو، لە لادێوە گەمارۆدانی شارەکان، بەرەی نیشتمانی و پارتی پێشڕەوی کرێکاران، چەند ساڵێک بوو لە نووسین و کتێبەکانی مامجەلالدا توێژرپێژە کرابوون و ئیدی بۆ خستنەگەڕ و پراکتیزەکردنیان تەنیا باروودۆخێکی وەکو «هەرەس»یان گەرەک بوو.

مامجەلال، لە سەروبەندی رۆژگاری هەرەسدا لە شام دەژیا. چ مامجەلال و چ سەرکردە و کادرانی باڵی «م.س»، لە بەردەم هەرەسدا خۆیان بە بەرپرسیار نەدەزانی! لە راستیشدا، چوون ئەوان لە دەسگا و دامەزراوە گرنگەکانی شۆڕشدا (٩٧٤ ـ ٩٧٥)، چ لێپرسراوێتیی گرنگ و دیاریان نەبوو،

ئەگەر کورتبینانە لە «هەرەس» بنوارین، ئەوان بەرپرسیار نەبوون! دەشێ پرسێک لای خوێنەر بخولقێت و بێژێ: باشە ئەگەر مامجەلال و باڵی مەکتەبی سیاسی لە بری بارزانی و سەرکردایەتیی پارتیی دیموکراتیی کوردستان، رێبەرایەتیی ئەو قۆناغەی شۆڕشی ئەیلوولیان کردبا، چ هەڵوێستێکیان وەردەگرت و ئەنجامی بزووتنەوەکە، جگە لە هەواری «هەرەس»، بە کوێی دیکە دەگەیشت؟!

دەشێ ئەم پرسە وەڵامێکی موتڵەق لە خۆ نەگرێ و چەندین ئەگەر هەڵبگرێ. ئەگەرەکان بەندن بە شێوازی تێگەیشتن و خوێندنەوەی کەسە جیاوازەکان بۆ چەمکی «شۆڕش» و مەسەلەکانی دەوروبەری.

هەرەس، وەڵامێک بوو بۆ بزووتنەوەیەکی سیاسی ــ چەکداری کە لە ئاستەکانی نێوخۆ، نێوچە و نێودەوڵەتیدا، قەوارەی ئاسایی خۆی بەزاندبوو! ئەو بزووتنەوە جەماوەرییە چەکدارــ سیاسییەی کە زیاتر لە ٪۸۰ی خەڵکی کوردستانی باشووری لەژێر ئاڵای خۆیدا کۆوە کردبوو، ئیدی لەسەر دنگە و کۆڵەکەکانی خودی خۆی رانەوەستابوو.

لەو قۆناغەدا، بزووتنەوەکە ببووە کارتێکی سیاسیی نێوچەیی و نێو دەوڵەتی، کە دەشیا لە هەر سات و کاتێکدا، لەسەر مێزی سەودا سیاسییەکانی «جەنگی سارد»دا سازشی پێ بکرێت.

هەرەس، هەرەسی سیاسەت بوو، نەک فیکر و ئایدۆلۆژیا! خەسڵەتە تایبەتەکانی بزووتنەوەکە و میکانیزمی کارکردنی لە کایە سیاسییەکاندا، سرووشتی بەعس و تێڕوانینی شۆڤێنیانەی بۆ دۆزی کورد، هەڵکەوتی جوگرافیای کوردستانی باشوور و کورتمەودایی باری جیوپۆلیتیکی ئەو وڵاتە، هەرەسیان کردە رووداوێک کە رێگرتن لە روونەدانی، بۆ هەر گروپ و سەرکردەیەکی دیکە، کارێکی زێدەسەخت یان مەحاڵ بوو.

هەرەس، ئەگەر چی یەکێک بوو لە کارەساتە جەرگبڕەکانی مێژووی بزووتنەوەی سیاسیی میللەتی ئێمە و سەرپاکی کۆمەڵگەی کورد و هێزە سیاسییەکانی لە راستەوە بۆ چەپ هەژاند، دیسانیش زەمینەی ئەزموونکردنی فیکر و سیاسەتێکی دیکەی لە کوردستاندا خۆش کرد! ئەو سەردەمە، زەمەنی هەوڵدان بوو بۆ پراکتیزەکردنی فیکری چەپی مائۆیستی و جیڤاریستیی رۆشنبیران و وردەبورژوازیی کورد لە نێو پانتایی چینی ئەدار و زەحمەتکێشی کورد دا. ئەم تیور و فیکرە کۆنە بە نوێ نێوزەدکراو و خواستراوە، ئەگەر چی کۆمەڵێک مژدەی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو، دیسانیش لە توندڕەوی و زەبر و ئەویدی قەبوڵنەکردن سەرڕێژ بوو! ئەم بیرە، لە ناخ و کرۆکی شۆڕشگێڕانەی خۆیدا و لەژێر پێچی نەبینراوی میکانیزمی کاری سیاسی و درووشمە رەنگینەکانیدا، خەونێکی دیکەشی بۆ چەپی کورد و ئەو باڵەی مەکتەبی سیاسی کە چەندساڵێ پێشتر لە زەمینەی کاری سیاسی و چەکداریدا شکستی خواردبوو، لەگەڵ خۆ هێنابوو، ئەویش خەونی هەڵگرتنەوەی ئاڵای بزووتنەوەیەک بوو کە

زریانی هەرەس لە دەست بارزانی و پارتی دیموکراتیی کوردستانی فڕاندبوو! بە بارێکی دیکەدا، ئەمە زەمینەی هەوڵدانێک بوو بۆ جێگۆڕکێی سەرۆک و سیمبول و کاریزما لە نێو کۆمەڵگە و بزووتنەوەکەیدا. ئەمە زەمینەی سەوزبوونی خەونی بەرپاکردنەوەی شۆڕشێکی «نوێ» بوو. بێ ئەوەی خەسڵەتێکی «کۆن» لە خۆ بگرێت... خەونی هەڵکردنی ئالآی «سوور»ی شۆڕش بوو. شۆڕشێک بێ بارزانی و پارتی دیموکراتیی کوردستان! ئەم پرۆسە خەونامێزە، لە بواری فیکر، سیاسەت، پراکتیکی کاری شۆڕشدا، چۆن بزوا؟ بە کوێ گەیشت؟ چ دەرئەنجامێکی لێ کەوتەوە و تا چەند توانیی داهێنان و نوێکردنەوە لە زەمینە فیکری، سیاسی، کۆمەلآیەتییەکاندا بکات؟. داخۆ ئەم سەرهەڵدان و بزووتنە، پرۆسەیەکی نوێ بوو؟ من بۆ دەرخستنی روانینی خۆم لەمەڕ ئەم پرسانە، بە نیازم لە کۆتایی «ئەزموون و یاد»دا، چەند بەشێکی تایبەتیان بۆ تەرخان بکەم و کاریان لەسەر بکەم.
ئێستا کە قسە لەسەر بڕیاری چارەنووسسازی «کۆمەڵە»یە لەمەڕ شۆڕشی چەکداری و بەستنەوەی ئەو بڕیارە بە دەرەوەی کۆمەڵەوە، دەشێ بڵێین: مەرزەکانی دەرەوەی «کۆمەڵە»، واتە نێوەندێکی بڕیاری سیاسی لە دەرەوەی سەرکردایەتیی کۆمەڵە و دەرەوەی کوردستاندا. لێرەشدا مەبەستم مامجەلال و سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی تازەدرووستکراوبوو! بەلآم داخۆ مامجەلال، دەرەوەی کۆمەڵە بوو، یاخود رەگەزی نێوەرۆک و بڕیاردەر لە کۆمەڵەدا؟! بۆ ئەو سەردەمە، وا دەردەخرا کە مامجەلال لە دەرەوەی دەسەلآتی کۆمەڵەیە و تەنیا سکرتێری گشتیی یەکێتییە. بەلآم رۆژگارەکانی داهاتوو، شتێکی دیکەیان پێ گوتین!
هەرچۆن بێ، کۆمەڵە لە خەونی پرۆسەی رووخاندنی «کۆن» و بنیاتنانی «نوێ»دا ، لە خەونی پوچەڵکردنەوەی «ئەفسانە«ی بارزانیی باوک و بە «باوککردن»ی «مام»دا، لە زەمینەی واقیعی خەباتی شاخ و شار و زیندان و قوربانیدانا، رەگەزی سەرەکی و بنەڕەتیی بزووتنەوەکە بوو. بێ ئەم رەگەزە تازەکار و لە وزەلێوتلێوە، نە مامجەلال و نە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیش لە دەرەوەی ولآت، سەنگەرێکیان پێ درووست دەکرایەوە!

## سەکرانیتیی کاتیی پارتی « ق.م». تۆڵە دەکاتەوە

پاییزەنێوارەی رۆژێک لە رۆژەکانی مانگی ئۆکتۆبەرە. نان و چا نۆش کراون و هەوا دێت تاریک و تاریکتر دەبێت..

لە خوارێ فیتوویەک دەبیستم! پاسەوانەکە، دێتە ژوورەوە و پێمان رادەگەیەنێ. ئەحمەدگریانەیی، وەک کێچ هەڵدەبەزێ و بەرەو دەنگەکە دەچێ. من پێم وایە، یەکێک لە دۆستانی خۆمانە و لە «تەوێڵە»وە نامە یان هەواڵێکی پەلەی هێناوە. پاشی دە دەقیقە، ئەحمەد دەگەڕێتەوە و شاهۆ و من بانگ دەکاتە دەرێ.

_ فەتاحی حاجی ئەولە بوو!

_ چی گوت؟

_ قیادە، هەموو هێزی خۆیان هێناوەتە «ناوێسەر» و ئەمشەو دێنە گوندی «شۆشمێ» و لەوێوە هێرشمان بۆ دێنن!

کەوتینە خۆمان. کۆبوونەوەیەکی کورتمان بە پێشمەرگەکان کرد. پلانی بەرگریمان دارڕشت. نان و فیشەک و پەتوومان دابەش کردن و وەسەر شاخ کەوتین. زنجیرەشاخێکی بەرز و چڕگەن. لە لوتکەوە بۆ گەردەن و لە گەردەنەوە بۆ تروپک، سەنگەرمان گرت. ئێمە کە ژمارەمان ٢٠پێشمەرگە بوو، چوار لوتکەمان لێ گرتن. ئەحمەد کە فەرماندەی کەرت بوو، ئەمسەر و ئەوسەر. بە سەر سەنگەرەکاندا دەگەڕا، رێنمایی دەکردن. ورەی وەبەر دەنان و نهێنیی شەوی دابەش دەکرد.

_ وریابن! لە خۆڕا تەقە نەکەن! دەست بە فیشەکەوە بگرن! هەتا نەگەنە بەر لووتتان دەست نەکەنەوە! شەڕی شەو وەک هی رۆژ نییە! لە شەودا، پاش و پێش و راست و چەپ نییە. دووژمن لەژێر باڵی تاریکیدا، دەشێ لە هەموو لایەکەوە نزیک بێتەوە و خۆی لە سەنگەرەکەت باوێ! ئەگەر لە سەنگەرەکانی خۆمانەوە تەقەتان لێ کرا، ئەوە مانای ئەوەیە سەنگەرەکانمان گیراون و ئێوە پاشەکشە بکەن! شوێنی یەکگرتنەوەی پاش تێکشکان، چەمی «هاوار»ە.

ئەحمەد، ئەم رێنماییانەی بە گوێی ئێمەدا دا و بەرەو سەنەگەرێکی دیکە هەڵکشا! چوار پێشمەرگە و «عەزیز»ی دیل و من لە سەنگەرێکدا بووین! عەزیزمان لە نێوەڕاستدا دانا و هەر یەکە و روومان لە لایەک کرد. لە سەنگەری چاوەڕوانیدا و لەسەر زنجیرە شاخێک کە لەوێدا وڵاتێک دەبێت بە دوو بەشەوە، ئامادە بووین... ئامادەی پێشوازیی لەشکری براکانمان! ئەو برایانەی کە هاوتای بەعس لێمان دەڕوانین! دیارە ئەوانیش هەر وەهایان ئێمە دەبینی!

سەرمای پاییز و ترس و برسییەتی، لەرز لە هەناوبا دەچێنن! مانگ، وەک چرایەکی هەزاران «وات»ی بە ئاسمانەوە دەگرێ و لیزگەزەنگیانەی لەبەربا بهۆنەوە! کات دەڕوا و ئەوان نایەن! مانگ بە کاوەخۆ دەبزووێت و سرتەیەک نایە! لە چاوەڕوانیی کوشتنی ئەوی دیدا، رۆحی خۆت دەکوژرێت! لە عەزیز دەڕوانم. عەزیز، شانی لەسەر بەردێک داناوە و لە گژ فکران ڕاچووە! ئەوان دێن، هەتاکو تۆڵەی قوربانییەکانی خۆیان وەرگرنەوە! ئەوان، فریادڕەس و رزگارکەری «ئەم»ن. ئەوان بیر لەوە ناکەنەوە کە دیلکوشتن لە شەڕدا ئاسانە و رۆحی عەزیز لەسەر لەپی میزاجی ئێمە سەما دەکات! من دڵنیام، عەزیز بیر لە دوو شت دەکاتەوە:

* فرسەتی دەرباز بوون.. ئاخر لە شەڕدا، شیرازەی هەموو شتەکان دەپسێت و دیل ئەو دیلەیە دەرفەت ببینێتەوە و ئازادیی خۆی بکڕێتەوە.

* کوشتن! ئەو حاڵەتەی دەشێ هەموو کەسێکی لە چیادا دیلکراو کە چ یاسا و رێسایەک، جگە لە یاسای ویژدان، لە وێدا ڕەواییان نییە، بیری لێ بکاتەوە.

_ عەزیز! بیر لە شتی خراپ مەکەوە!.

_ لە وەزعی وەهادا، ناکرێت بیر لە شتی باش بکەمەوە.

_ نا.. مەگەر بە گوللەی برادەرەکانی خۆت بکوژرێیت، دەنا من رێگا نادەم کەسێکی دی ئەو کارە بکات!

عەزیز، بە چاوێکی پڕ لە هیواوە، هیوایەک کە لە پەژارەدا خنکاوە، لێم دەڕوانێت.

بەشێکی شەو راکشاوە و هێشتا جگە لە سرتەی نێوانی خۆمان، چرپەیەک نابیسترێت.

_ مامۆستا! کە نزیک بوونەوە، بە قەستی کوشت؟

_ ئەگەر بۆتان بکرێت، دووان دووان بیانکوژن!

_ خائینن؟

_ خائین، خۆفرۆش، کۆنەپەرست، بەکرێگیراوی شا، دژەشۆڕش و هەموو شتێکی تریش!

_ ئەوان ناهێڵن کورد سەربکەوێت؟

_ هێزی ئاشبەتاڵکەر و بەزیون. ئەوان شۆڕشیان تێک دا و کوردیان بە تەنیا بەجێ هێشت. ئێمە شۆڕشی نوێ بەرپا دەکەینەوە و ئەوان لێمانی تێک دەدەن! سەرکردەکانیان دەڵێن: ئەگەر نەتوانین شۆڕش بکەینەوە، ئەوا دەتوانین تێکی بدەینەوە!.

_ کە ئەوان بنەبڕ بکەین، خۆمان سەردەکەوین؟

_ خۆمان، کورد، کرێکاران و زەحمەتکێشان. شۆڕشی سوور سەردەکەون!

_ ئێمە هەموو زەحمەتکێش و ئەوانیش ئاغا و دەرەبەک و بورژوازیی «کۆمەڕەدۆڕ»ن.

ـ ئێمە ئەو شۆڕشگێڕانەین کە کۆتایی بە سەردەمی جەلالی و مەلایی دێنین و ئالآی شۆڕشی کرێکاران هەڵدەکەین.

ـ مەگەر مامجەلال سەرۆکی ئێمە نییە؟

ـ ئەو، سکرتێری یەکێتیی نیشتمانییە! ئێمە کۆمەڵەین. ئێمە کەڵک لە ناوبانگی مامجەلال، لە دەرەوەی وڵات وەردەگرین! لە کوردستاندا، کۆمەڵە هەمەکارە و مامجەلال هیچکارەیە! تەنانەت پاسەوانەکانی مامجەلالیش ئەندام و کادری کۆمەڵەن. هەموو بڕیارە گرنگەکان، بڕیاری نێوەندی کۆمەڵەن! ئەو، بێ رەزامەندیی کۆمەڵە، ناتوانێ پەنجە لە ئاو وەربدات!

شریخەی دەسترێژێک. گوریسی گفتوگۆی من و پێشمەرگەکەی پچڕاند. سەیری سەعاتەکەمم کرد، دە دەقیقە لە دووی بەیانی تێپەڕی بوو. شەڕ گەرم بوو. مانگ لەسەر لا، شانی لەسەر باسکی هەورامان دادابوو. مانگ دەهات بخەوێت و ئێمەش خەوەکەیمان دەزڕاند!

لە بن درەخت و نێوان دەوەنانەوە، تاپۆکان بە گڕی چەکەکانیانەوە سەردەکەوتن و لەژێر گڕکانی چەکی ئێمەدا پاشەکشەیان دەکرد.

شەڕ هەتا دەمەوبەیان درێژەی کێشا. لە سەعات شەشی بەیانیدا، لە چەپ و راستەوە وەبەر گوللە دراین. سەنگەرەکانی ئێمە کەوتن. ئێمە پاشەکشەمان کرد و عەزیزمان پێش خۆمان دا. هەتاو کەوت و ئێمە لە باخەکانی «هاوار»دا، بە ماندوویی توێشوومان لێ کردەوە. چاوەڕێمان کرد و کەس دیار نەبوو. هاوڕێکانمان سۆراغیان نەبوو.

دەمەونیوەڕۆژ، «حەمەی حەمەسەعید» و سێ پێشمەرگەمان دیتەوە. بەڵام هەواڵێک لە ئەحمەدگریانەیی، شاهۆ و ئەوانی دیکە نەبوو.

ـ مامۆستا! من چەماوچەم دەچمە نزیکی تەوێڵە و هەواڵ وەردەگرم.

ـ زۆر باشە... زوو بگەڕێوە و نان و چا و جگەرە لە بیر نەکەیت!

حەمە، رۆیشت. «ق.م»، لەو بەرزاییانەوەی داگیر یان رزگاریان کردبوون، دووربەتقەیان لێ دەکردین. نێوارە داهات و هەواڵێک نەهات، حەمەش گەڕانەوەی نەبوو. برسێتی زۆری پێ هێناین. بۆ پەیداکردنی نان و بژێوی، بڕیارم دا بەرەو گوندی «عەبابەیلێ» بڕۆین. لە «هاوار»ەوە بۆ گوندی عەبابەیلێ کە نزیکترین گوندی رانەگوێزراو بوو، سێ سەعات و نیو دەبێ.

نیوەشەو، لە دەرگای ماڵی «شێخ سەلاحی شێخ ئیبراهیم»مان دا.

دەرکەیان ئاوەڵا کرد. پشوومان دا و شیومان خوارد و نان و چامان هەڵگرت، بەڵام نە کات مەودای دەداین و نە ئێمەش برستی ئەوەمان هەبوو، بۆ شوێنی خۆمان بگەڕێینەوە. مەتارەکانمان پڕ ئاو کردن و بۆ ئەشکەوتەکانی پشت گوندی «دەڵەمەڕ» پێشیان کەوتم.

لە سەرکەورگاندا. «کەورگە بندوور»، تا بڵێی گەورەیە و لە ناوەکەی ڕا دیارە. ئێمە کە پێنج چەکدار بووین و دیلێکمان لەگەڵدا بوو، دەبوو ئێشک بگرین. دەستی عەزیزمان بەستن. «ئەمیر»م کردە یەکەم ئێشکگر و بە وریایی لێی خەوتین!

بخەوە و ئاگات لە خۆ بێت! ئەمە سرووشتی خەوی پارتیزانانە! تۆ، کە لە خەودا غافڵگیر نەکرێیت، ئیدی دەتوانی پەلەقاژەیەک بکەیت.

_ حەرەس! هاوارم کرد و دەنگ نەبوو!

_عەزیز! دەنگ و ڕەنگی نەبوو!

ئێشکگر، خەتبوو! عەزیز، چەکی ئەوی بردبوو و دەرباز بوو بوو!

عەزیز دەتوانێ بۆ کوێ بچێت؟! لە خۆمم پرسی.

پشتەوەمان بە ڕەبایە تەنراوە. بەرەوە، هەڵەبجەیە. عەزیز بۆ هەڵەبجە چووە. عەزیز، کە لە شەڕی «کانیژەنان»دا، چەند خزمی بە دەستی ئێمە کوژرابوون، چۆنە کە ئێمەی بە زیندوویی جێ هێشتووە؟.

هزری خۆمم گوشی و مەسەلەکەم هێنا و برد.

من و عەزیز هاوڕێی قوتابخانە بووین. ئەو ماوەیەی عەزیز لای ئێمە دیل بوو، ڕێزێکی زۆرم لێ گرتبوو. من لە بنەماڵەی «شێخانی عەبابەیلێ»م و عەزیزیش لە عەشیرەتی «تاوەگۆزی»یە! عەزیز، نەیویستووە خوێنی ئێمە بە دەستی خۆی لە کاسەی ناکۆکیی «سیاسی» دا. بگرە عەشایەری بکات! عەزیز، ئێمە دەکوژێ و تۆڵەی خۆی دەکاتەوە! ئەو، ناڕاستەوخۆ هەواڵ بە دەوڵەت دەدات و مەودای ئەم ئەشکەوتانە و شاری هەڵەبجەش، بە ئۆتۆمبیل تەنیا دە دەقیقەیە.

_ هەستن با بڕۆین!

_ دنیا ڕووناکە و هاکا خۆر کەوت! دەوروبەر بە ڕەبایە تەنراوە.

_ لە دانیشتندا هیچ شانسێکمان نییە! هاکا کۆپتەر و جاش پەیدا بوون.

لە ئەشکەوت وەدەر کەوتین و دولاودۆڵ، بنبەرد و بنبەرد، بە چیای شنرویدا هەڵگەڕاین. ئێمە سەربازەکانمان دەدیتن و ئەوان لە ئێمە بێئاگا! ئێوارە، گەیشتینەوە گوندی « گریانە». پاشماوەی مەفرەزەکەمان دیت و «شاهۆ»یان لەگەڵ بوو. ئەوان لە خەمبار خەمبارتر بوون! چاوم گێڕا، ئەحمەد گریانەیی دیار نەبوو. ئەحمەد ببووە قوربانیی شەڕی براکان. « ئار.بی.جی»یە تاقانەکەی «کەرت» و بڕی ١٥٠٠دینار کە بە ئەحمەد بوون، دەست ئەوان کەوتبوون.

ئەحمەد، بۆ بەخێوکردنی پێشمەرگەکان، ئەو هاوینە، لە شاخەکانی گریانە، بنێشتی کردبوو. بەرهەمی ئەو بنێشتکردنە، ١٥٠٠ دینار بوو!

تێبینی:

* پارتی دیموکراتیی کوردستان، لە خۆڕێکخستنەوەی پاش هەرەسدا و هەتا ساڵی ١٩٧٩ ، لەژێر ناوی «سەرکردایەتیی کاتیی پارتی دیموکراتیی کوردستان»دا کار و چالاکیی دەکرد. کورتکراوە عەرەبییەکەی ئەم ناوە، دەبێتە «ق.م». لە نێو ریزەکانی کۆمەڵە و یەکێتیدا، ق.م بووبوویە «قیادەی موەقەت، قیادە مەوقوتە، پاسدار موەقەتە» و چەندین ناتۆرەی دزێوی دیکەش کە زادەی فەرهەنگی جەنگی راگەیاندنی ملانێی خوێناویی براکان بوون. دیارە «ق.م»یش ناو و ناتۆرەی تایبەت بە خۆی، بۆ یەکێتی هەبوون.

## ماسییەکان لە وشکاییدا دەژین!

ژیان و گوزەرانی ئێمە لە ناوچەکانی هەوراماندا کە سووتماک و راگوێزراوبوون، لە چاو ناوچە ئاوەدانەکانی دیکەی کوردستاندا، سەخت و دژوار بوو. ئەگەر قسەکەی «ماو» (ماسی و ئاو)، دەرهەق بە شۆڕش و جەماوەر بە هەند بگرین، ئەوا رژێم لە ناوچە سنوورییەکاندا، ئاوەکەی چۆڕبڕ کردبوو. «ماسی»یەکان لەوێدا، لە نێوان مەرگ و ژیاندا لە خەباتێکی سەختدا بوون.
خەبات بۆ خۆپاراستن، دەست لە دوژمن وەشاندن، پەیداکردنی نان و جل و بەرگ، پەناگە و لانەی ژیان. ئەو ئەشکەوت و کونەبەردانەی کە ڕۆژگارێکی تەمەنمان تێدا بەسەربردن و دیوەخانی بێڕاخەر، پێخەف و چرا و رووناکاییمان بوون، شیاوی بەسەرکردنەوەن...
« هەزارپەز» و «کولێندەشت» لەسەر رۆخی رووباری «سیروان»، نزیک گوندی گریانە.
* ئەشکەوتەکانی «مەرمانگان» و « کونەبێخوێ». یەکەمیان نزیک دەراوی گریانە و دووەمیان لە پشتی گوندی «بۆیین»ەوە هەڵکەوتبوون. کونەبێخوێ، داهێنانی خۆمان بوو. لەم ئەشکەوتەدا، سێ رۆژان بێ «خوێ»، هەویرمان دەشێلا و لەسەر بەرد نانمان دەبرژاندن و لەگەڵ چای «بێشەکر»دا نۆشمان دەکردن.
* کونەسووتاو، دەکەوێتە پایینی گوندی «مۆردین» و لە دامێنی چیای «بالاَنبۆ»دا کە بەسەر رووباری سیرواندا دەروانێ، لە جێگایەکی زێدە سەخت و دژواردا هەڵکەوتووە.
ئەم ناوە «وەهمی»یانەی ئەشکەوتەکان بەسەر زاری خەڵک و دەسگا هەواڵگرەکانی رژێمیشەوە بوون، بێ ئەوەی شوێن و جێگاکانیان پێ بزانن.
شەوانی زستانان، لەم ئەشکەوتانەدا ئاگرمان دەکردەوە و وەکو مرۆڤە سەرەتاییەکان بە دەوریدا رادەکشاین. بەیانیان کە لە خەو رادەبووین، لەبەر دووکەڵ و دۆرنجی لەسەر رووخسارمان نیشتوو، بە دەستەم یەکترمان پێ دەناسرایەوە! زستانان، کاری خۆشتن و خۆپاککردنەوە ئەستەم بوون. بە درێژایی مانگەکانی زستان، تەنیا جارێک یان دووجار بە ناچاری ئاومان گەرم دەکرد و لە کەناری سیرواندا، لە نێو بەفر و بەستەڵکدا لەشمان دەشووشتن. ریشتاشین، بۆ ئێمە کارێکی زەحمەت بوو. پێشمەرگەی هەورامان، تا ساڵەکانی «٨١ _٨٢ »ش بە رێنی درێژدا دەناسرایەوە، پێچەوانەی پێشمەرگەی ناوچەکانی دیکە کە لە نێو خەڵکدا دەژیان و دەستێکیان بە خۆیاندا دەهێنا.
ئەسپێ، ئەو دەعبایە بوو کە هێندەی بەعس ئازاری دەداین! مانگی جارێک هەموو جلکەکانمان لە تەنەکەیەک دەکردن و لەسەر ئاگر دەمانکوڵاندن. بەو حاڵەش لەشکری ئەسپێ، بە زەحمەت تێک

دەشکا و پاشەکشێی دەکرد.
شەرەئەسپێ، کێبڕکێی نێوان ئەسپێکان و ئەسپێژماردن، ئەو یارییانە بوون کە هەندێک لە پێشمەرگەکان لە کاتی بێکاریدا خۆیان پێ سەرگەرم دەکردن!
مەفرەزەکان، دەچوونە گەڕان و دەهاتنەوە، دەچوونە شەڕ و دەهاتنەوە. هەمیشە لە گەڕانەوەدا، پێشمەرگەیەک یان زیاتر کەمی دەهێنا. ئەوان دەکەوتنە بۆسە و شەهید دەبوون، لە دەستوەشاندندا لە دووژمن، دەئەنگێوران، بە دیل دەگیران، ماندوو دەبوون و دەگەڕانەوە شارەکان و لاوانی سەرچڵ و خوێنگەرمی دیکە، جێگایان پڕ دەکردنەوە.
مەفرەزەیەک دەڕۆیشت و ئەوی دیکە لە ئەشکەوتدا دەمایەوە! لەوێدا بواری خوێندنەوە و خۆفێرکردن هەبوو، کۆبوونەوە و سیمنار دەگێڕدران و پێشمەرگەی خاوەن باوەڕ و بە دیسپلن بەرهەم دەهێنران.
کۆمەڵە گەنجێک، دڵ پڕهیوا و دەروێشی تەکییەی فیکر و سیاسەتێک، ئەگەر حەماسەت و هەستی شۆڕشگێڕیی ئانەقلانی لێ وەدەرنێی، ئەوا هێشتا لە ڕۆخی دنیای فیکر و سیاسەتدا تازەکار و هیچی لێ حاڵی نەدەبوون! کۆمەڵە گەنجێک، لەنێو دڵی دار و بەردی چیادا، تەنیا خۆیان و چەکەکانیان و برواکانیان بوون! ئەوان، تەنیا هێزێک دەیزووڕاندن کە سەرچاوەکەی ستەمی بەعس بوو. سیاسەتی داپڵۆسێنەرانەی بەعس، ئەو چاخماخەیە بوو کە کانیی هێزێکی ڕۆحیی لە جەستە و ئەقڵی ئەو ئینسانانەدا دەتەقاند و دەبوویە داینەمۆی هەڵسووڕاندنیان و وەجەزبەی دەخستن. فیکر و تیۆری «کۆمەڵە» کە ئامێتەی ئەم هێزە ڕۆحییە دەبوو، ئایدۆلۆژیای دەکردە مەزهەب و هەڵگرانیشی بە سۆفیی خەڵوەتکێشی کونجی تەکییەی حیزب، بزووتنەوە. سەرکردەیەک کە نەبینیبوویان و نە دەشیانناسی.
کۆمەڵەسۆفییەکی قەڵەندەر، توندڕەو، مێشک بە زەبر و خوێن و توندوتیژی سیخناخکراوی لە ئەشقی شۆڕش و خەڵکدا تواوە کە لە هەر لەززەتێکی جەستەیی بێبەری و لە ژێر گورزی ئازاری برسییەتی، ماندوویێتی و قەیرانی ڕۆحیدا دەبزووان و لە هەناوی تاریکاییدا لە خۆرێکی ونبوو دەگەڕان. دنگە لە شکانەهاتووەکانی ئەو بزووتنەوەیە بوون کە ئێستا بە «هەوار»ێک گەیشتووە.

# ساڵوەرگەڕان و بەزاندنی سنوور!

لە دوادووماندگی ساڵی ١٩٧٨دا، جۆرە گۆڕانکارییەک لە شێوازی گوزەرانی ئێمەدا و لە کشانی بازنەی ئۆپۆزسیۆنی ئێراقدا وەدەرکەوت.

هەرچی گوڕزی خەباتی شۆڕشگێڕانەی خەڵکی ئێران بۆ سەر دامودەسگاکانی دەوڵەتی شا بە زەبرتر دەبوو، دیوارەکانی سنووریش دەلەرزین و بۆ ئێمە درزیان دەبرد. درزەکان هێندی هێندی هەراو دەبوون و دەبوونە شەبەق. ئێمە، شەوانە لە ناوی سیروان دەپەڕینەوە و لە دەرگای ماڵی گوندییانی ئەو بەر «زێ»مان دەدا. لەو گوندانەدا، بەسەر ماڵاندا دابەش دەبووین، خواردنی گەرممان دەخوارد و پشوومان دەدا. لەوێڕا بۆ یەکەمجار، رۆژنامەکانی ئێرانمان دیتن کە بە وێنەی رەنگاورەنگی خۆپیشاندانەکان رازاوە بوون و وردینەی هەواڵەکانیان تێدا بوون. خەڵکی ئەو گوندانەی کوردستانی ئێران، هێندەیان ئازار و ستەم لە دەست دەسگا داپڵۆسێنەرکانی دەوڵەتی ئێران چێژا بوو، هێندە لە «ئەمنیە» و «چریک» و «ساواک» دەترسان و بە ئاستێک هەترەشیان چووبوو، ( هەندێک خوێندەواری لێ وەدەرنێی)، دەمیان لە باس و خواسی سیاسی وەر نەدەدا! ئێران مەنجەڵێک بوو لەسەر ئاگری شۆڕش قوڵپی دەدا، کەچی خەڵکی گوندەکان و خێڵەکانی ناوچەکە نەک هەر خۆیان لێ نەبان دەکرد، بگرە بەشێکیان بە ئاشکرا لایەنگری رژێمی شا بوون! ریشسپی و پیاوماقوڵانی گوندەکان، لە بەر رۆشنایی ئەزموونی خۆیان و شکستەکانی بزووتنەوەی سیاسیی ساڵانی چلەکان و پەنجاکان، چ لە کوردستان و چ لەسەرتاسەری ئێراندا، بەو قەناعەتە گەیشتبوون کە شا هێزێکی خواکردی لە پشتە و ئەگەر تێکیش بشکێ دووبارە بۆ سەرتەخت دێتەوە. را و بۆچوونی عەشیرەتەکانی سەرسنوور، بۆ ئێمە گرنگ نەبوون.. ئێمە دەمانزانی هێزەکانی شۆڕش لە جێگایەکی دیکەن.. دانشگا و کارخانەکان، شەقام و گۆڕپانی شارەکان، مزگەوت و بڵندگۆکانیان، چاوگی بەرهەمهێنانی ئەو هێزە لەبننەهاتووە بوون کە دەهات مێژوو وەرچەرخێنێت! دیتنی گۆڤار و رۆژنامەکانی ئەوێ رۆژێی ئێران کە سەرجەمیان بە وتاری ئاگراوی و وێنەی راپەڕیوان نەخشێنرابوون، بۆ ئێمە مانایەکی تایبەتیان هەبوو. ئەوان خۆراکیان بە رۆحی ماندوومان دەدا.

من، شەقامە خرۆشاوەکانی تاران و ئەو رووباری خوێنە لرفەکردووەم دەبینین، گۆڕەپانەکانی بەغدا و شارەکانی دیکەی ئێراقم دەهاتنە پێشچاو. من پێم وابوو: ئەوی لە ئێران دەگوزەرێ، درەنگ یان زوو، دەشێ لە ئێراقیش روو بدات... هەستانەوە و سەرکەوتنی بزووتنەوەی شۆڕشگێرانە لە وڵاتە جیاوازەکانی ناوچەکەدا، دەبێت کار لە یەکدی بکەن. ئێران، دوورگەیەکی گەورەیە لە زەریای

ڕۆژهەڵاتدا و تەقینەوەی بورکانی ئەو دوورگەیەش، دەشێ سەراپای ڕۆژهەڵات بهەژێنێ.
پسانی «مووی معاویە»ی نێوان حیزبی شیوعیی ئێراق و بەعسییەکان و بە بنبەستگەیشتنی (بەرەی نیشتمانیی و پێشکەوتووخوان)ی نێوانیان، هاوزەمانی کڵپەسەندنی شۆڕشی ئێران بوو. حیزبی شیوعی کە لە ساڵی ۱۹۷۳وە هاوپەیمانی بەعس بوون و لە ڕووخسار و فیکری «سەدام»دا «کاسترۆ»ی ئێراقیان دەبینی، باجی ساویلکەیی و بێسەریی خۆیان و خۆگرێدانەوەیان بە «سۆڤییەت»ەوە دا! پاشەکشەی نارێکخراوی «حشع» لە بەرەی بەعس و هەوڵدانیان بۆ پێستی خۆدەربازکردن، لە نیمچە ناشبەتاڵێکی سیاسی و رێکخراوەیی دەچوو. کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینیی کوردستان، لە ڕێگای «کاک ئارام»ەوە، هەر لە سەروبەندی دەستپێکی بزووتنەوە چەکدارییەکەدا، پەیوەندییان لەگەڵ حیزبی شیوعی گرتبوو، و داوایان لێ کردبوون کە لە هاوپەیمانییەتی بەعس پاشگەزبنەوە و لە خەباتی چەکداریدا هاوکاریی کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بکەن. دیارە «حشع» ئەوێ ڕۆژێ گاڵتەی بە ئەقڵی کۆمەڵە هاتبوو... ئەوانیان بە منداڵەورتکە و سەرچڵی سیاسی لە قەڵەم دابوو.
ئەحمەدین مامۆ، یەکەم کادری حشع بوو کە لە ناوچەی هەورامانەوە ڕووی لە بنکەی ئێمە، لە «پەروینی» کرد. ئەو برینپێچێکی سەروڕیش سپی بوو کە بە هاتنی ئێمەی دڵخۆش کرد. ئەحمەدین، ماوەی مانگێک لای ئێمە مایەوە و پاشی هێرشەکەی «ق م» بۆ سەر پەروینی، ئەویش پەرەوازە بوو. لام وایە گەڕابووییەوە تەوێڵە و لەوێ خۆی حەشار دابوو. ئێمە پاشتر ئەومان نەبینیەوە. لە مانگی نۆڤامبەردا، کادر و ئەندامانی حشع ڕوویان لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستان کرد و کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان پێشوازییان لێ کردن. تۆفیقی حاجی، سمایلی حاجی، عەبەی مامە و دوو ئەندامی دیکەی حشع، هاتنە بنکەکانی ئێمە، لەگەڵماندا و لە ئەشکەوتەکاندا دەحەوانەوە، لەگەڵ مەفرەزەکاندا جەولەیان دەکرد و کاروباری خۆیانیان جێبەجێ دەکرد.
یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لە چەند ڕووانگەوە لە وجودی «حشع»ی دەڕوانی:
* هێزی ئۆپۆزسیۆنی چەکدار لە کوردستاندا، بۆ فشارخستنە سەر ڕژێمی ئێراق، بەهێز تر دەبێت.
* پێگەی بزووتنەوەی چەکداری کوردستان، لای سۆڤییەت و وڵاتانی کامپی سۆسیالیستی بە هێز دەبێ و دەشێ سۆڤییەت بۆ خاتری حشع، پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ ئێراقدا بپسێنێت و پرۆژە ئابووری و سەربازییەکانی لە ئێراقدا ڕا بگرێت.. (دیارە لە مەیاندا هەموولایەک بە هەڵەدا چووبوون).
* پشتیوانیی حیزبە کۆمۆنیستەکانی وڵاتانی عەرەب و دنیا مسەوگەر بکات.
* حشع، ببێتە پارسەنگی هێزی یەکێتی و ڕابکێشرێتە نێو بازنەی ململانێی نێوان یەکێتی و پارتی.

بە قازانجی یەکەمیان.

لەمەشیاندا، حشع تا بۆی لوا رۆڵی ناوبژیوانی بینی و دەیویست هاوکێشەی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ هەردوو لادا تەرازوو بکات! پاشانیش کە درکی مەحاڵیی بەردەوامبوونی ئەم سیاسەتەی لە کوردستاندا کرد. بە ناچاری یاخود ناچار کرا کە بەرەی « جود» دژ بە یەکێتی هەڵبژێرێت و ببێتە بەشێک لە ململانێی خوێناویی نێوان براکان!

## خەوبینین، لەژێر کورتاندا!

هەڵشێلانی هەرگی شارەزوور و ئەمبەر و ئەوبەرکردنی رووباری «زەڵم» و بازبازێنی جۆگەکانی «دەلێن» و «ریشێن»، لە شەوانی باراناوی و رەهێڵەی زستاندا، نیوەمردوویان دەکردین. شەوان، رێکردن و رۆژانیش خۆحەشاردان و هەڵلەرزینی بن شەخەڵی تووترکان. پیشەی ئەو هێزە بوو کە دەیویست لە هەورامانەوە بۆ سوورێن یان بە پێچەوانەوە، گەشت بکات.

بەرەبەیانی رۆژێک لە رۆژانی مانگی یەنیوەریی ساڵی ۱۹۷۹، پاش ئەوەی شەوورۆژێکمان لە شارەزووردا گوزەراند، لە وێرانەگوندی «عامورە»دا پشتێنی پشووداغمان لێ شل کرد. باران بە لێزمە دەباری و ئاسمان وروونی ئەدەدا. یەک و دوو، لێرە و لەوێ، لەبەر باراندا خەوتبووین... دەبێ خەومان بە چییەوە دیتبێت؟

_ دەتوانیت هەستیت و سەیرێک بکەیت؟

_ سەیری چی؟

_ ئەگەر برستت تێدا ماوە، وەرە!

یەکێک لە پێشمەرگەکان خۆی خزاندبووە نێو کولانەقەلێکی نیوەڕوخاو! یەکێکی دیکەم دیت، کورتانی قوراویی گوێدرێژێکی بە خۆدا دابوو!

لە گوندەکانی بناردا، تەنیا خانوویەک بۆ ئەنوا و پەناگا بە پێوە نەمابوو!

رۆژگارمان لەگەڵ باراندا بەسەر برد! چ کەسێک هێندەی ئێمە هاوڕێی باران و بەفر و« با» نەبوو. بە درێژایی شەش مانگان، ئێمە و بەفر و باران، کۆمەڵێک ئاشقی جوان بووین کە بێ یەکدی هەڵمان نەدەکرد. کە وڵات، تەمومژی لە خۆی دەپێچا، ئێمە لە دنیای مژدا دەکەوتینە سەما و چ باکمان بە بەعس نەبوو!

دەمەوئێوارە، بە وێرانەگوندەکاندا، رووەو بناری « کانیی سێف» هەڵکشاین و بۆ دیتنی «کەرت»ەکانی دیکەی هەرێمی یەک، گەیشتینە گوندی «سیامێوە».

لەوێدا بۆ یەکەمجار، حەمەی حاجی مەحموودمان بینی کە لە سەفەری «هەکاری» گەڕابوویەوە و ئەندامی لیژنەی هەرێم بوو!

## دنیایەک، لە هەورامان بەرینتر!

زستانی ساڵی ١٩٧٩ ، سەخت و دژوار و بەفراوی، وڵات پارچەیەک بوو لە بەستەڵەک. پێشتر، باسم لە جێهێشتنی کونەبەرد و ئەشکەوتەکانی هەورامان و سەفەری بناری شارەزوور و گوندەکانی شارباژێر کرد.

چەند رۆژێکمان لە گوندەکانی «سیامێوە«، «خڕنووک»، «کوڵێتان» و «چەوتان» گوزەراندن و پاشان لە رێگای «دۆڵەسوور»ەوە بۆ بەری شارباژێر پەڕینەوە.

ئەو سەفەرە، بۆ ئێمە شکاندنی بازنەیەک بوو لە دابڕان و تەریکی و هەنگاوێک بوو بۆ خۆناسین و پەیبردن بە دنیایەکی فراوانتر لە بزووتن و هەڵسووڕانی کاری سیاسی و پێشمەرگایەتی و تێگەیشتن لە پێکهاتەی هێزی پێشمەرگەی هەرێمی یەک و خوێندنەوەی بیر و هەڵسوکەوت و رەفتاری لێپرسراوانی هەرێم و کادرە سیاسییەکان و چۆنییەتی مامەڵەیان لە گەڵ یەکدی و لەگەڵ جەماوەردا. زیاتریش، هەڵسەنگاندن و بە ئەنجام گەیاندنی جۆرێک لە خوودبوونەوە و بەراوردکردنی تیور و پراکتیک بوو لە هەڵسووڕانی کاری «شۆڕشی نوێ»دا و چەکەرەکردنی ئەو نیگەرانی و دڵەڕاوکێیانەی کە دەهاتن تاوڵی گومانیان لەسەر توانستی پراکتیزەکردنی«تیور» لە دنیای «واقیع»ی شۆڕشدا هەڵدەدا.

هەرێمی یەک، هەم وەکو هێز و هەم وەک رووبەر و هەڵکەوتی جوگرافیای ناوچەکە، ئەستوونێکی خورت و زێدەگرنگی راگرتنی قەوارەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو. وەکو هێز، بەشێکی زۆری کادر و ئەندامانی کۆمەڵە و پێشمەرگە جەربەزەکانی لەوێدا کۆببووبوونەوە. وەکو رووبەر و هەڵکەوتی جوگرافیا، لە چیای «بەمۆ»وە تا دەگاتە هەورامان، چیای سوورێن، بناری پێنجوێن، بەشێک لە شارباژێر و هەموو پانتایی شارەزووری دەگرتەوە. سنووری ئەم هەرێمە، بەدرێژایی رۆژهەڵات، خواروی رۆژهەڵات و باکووری رۆژئاوای لەگەڵ کوردستانی رۆژهەڵاتدا یەک دەگرێتەوە و راستەوخۆ دەروازەی ململانێی و تێکهەڵچوونی خوێناویی نێوان هێزەکانی «ق. م» و یەکێتی بوو.

سەرکردایەتیی هەرێم، کۆمیتەیەکی سێ کەسی بوو لە:

* حەمەی حاجی مەحمود، کە وەکو پاڵەوانێکی سەرکەوتوو لە کارەساتی «هەکاری» دەرباز و گەڕابووەوە ناوچەکە. حەمە، کە پێش چوونی بۆ هەکاری، لەسەر میلاکی کۆمەڵە لە قەڵەم دەدرا و یەکێک بوو لە ئەندامانی یەکەم دەستەی چەکدار لە کوردستانی پاش هەرەسدا. ئێستا ئیدی لە سۆنگەی کێشە و ململانێی دەسەڵاتدا، وەکو «خەتی گشتی» کاری دەکرد و راستەوخۆ پەیوەندی

لەگەڵ مامجەلالدا هەبوو.

* ڕەوفی خەلیفە سەعید. ئامۆزای حەمە و کادری بە قەولی حامیدی حاجی خالید، «سۆسیال عەشایر»ی کۆمەڵە بوو.

* شەوکەتی حاجی موشیر، کادری سەرکردایەتیی بزووتنەوەی سۆسیالستی کوردستان، لێپرسراوێکی لێزان، عەشایەرێکی زیرەک ، ورد و دنیادیدە و پسپۆڕ لە گەمەی ملانێی دەسەڵاتی نێو هەرێم و هێزی پێشمەرگەدا.

ئەم سیانە، سێکوچکەی دەسەڵاتی سۆسیال عەشایەری هەمیشە ناکۆکی هەرێم بوون و ئێمەش بە دنیای خەون و فەنتازیای شۆڕشگێڕانەی خۆمانەوە، پلوپووشی سووتاوی نێو ئاگردانی ناکۆکییەکانیان! کادرانی سیاسیی کۆمەڵە، وێڕای سەختی و دژواری سرووشتی خەباتی چەکداری، ئازار و مەینەتییەکی زۆریان لەدەست کادرە عەسکەرییەکان بە گشتی و سۆسیال عەشایەرەکان بە تایبەتی دەچێژا. هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی شێوازێکی گونجاو بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ڕەگەزە ناتەباکانی هێزی سیاسی و چەکداری شۆڕشی «نوێ»دا، کارێکی ئاسان نەبوو. کرۆکی گرفتەکانی نێوانمان، واتە نێوانی کادرانی کۆمەڵە و کادرانی (بزووتنەوە و خەتی گشتی) لەلایەک و پاشانیش کادرانی سیاسی و عەسکەریی خودی کۆمەڵە، جیاوازیی دید و ڕوانینمان بوو بۆ پێکهاتەی هێزی پێشمەرگە، چۆنییەتی دابەشکردنی دەسەڵات، هەڵسوکەوت و مامەڵەکردن لەگەڵ جەماوەردا، کۆکردنەوەی داهات و پیتاک و چۆنییەتی سەرفکردنیان...هتد. ئێمەی کۆمەڵەی پابەندی تیوری خەباتی شۆڕشگێڕانەی لە جیڤارا و ماوتسی تۆنگ ئیلهام وەرگەرتوو و گۆشکراو، مەسەلەی چرووپڕی و کەم و پوختیی هێزی پێشمەرگەمان لە پلەی یەکدا دادنا و دوژمنی سەرسەختی کۆکردنەوەی عەشایەر و زیندووکردنەوەی خێڵەکایەتی و لەشکری زۆر و بۆر بووین. ئێمە پێمان وابوو: شۆڕشی نوێ، دەبێ تەنیا لە تیور و دەقی بڵاوکراوەکاندا «نوێ» نەبێت. بەڵکو ئەم پرۆسەی نوێکارییە، تەوێ هەموو ڕەگەز و کۆڵەکە و دنگەکانی شۆڕش بگرێتەوە! ئێمە پێمان وابوو: دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری و ڕۆڵی کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینیی کوردستان لە ئامادەکردن و وەگەڕخستنی مەفرەزە سەرەتاییەکانی «بانگەشەی بزووتنەوەی چەکدار»یدا، سەرەتای قۆناغێکی نوێیە بۆ بەزاندن و یەکجارەکی جێهێشتنی قۆناغی شۆڕشی ئەیلول، بە «نێوەرۆک و شێواز»ەوە!

سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە گشتی (ئەگەر بەشێک لە سەرکردەکانی کۆمەڵەی لێ دەرهاوین) و مامجەلال بە تایبەتی، لایەنگری بیرۆکەی (کۆکردنەوەی هەرچەند دەکرێ)ی هێزی پێشمەرگە بوون و ئەمەش بۆ ئەوان گرنگترین سەرمایە بوو بۆ ڕاستکردنەوەی تای تەرازووی هێزەکانی یەکێتی لە ئاست هێزە نەیارەکانیدا. بەتایبەت پاشی هەرەسی هەکاری و بچووکبوونەوەی

قەوارەی هێزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە بەرانبەر هێزەکانی دیکەدا. ئەم کۆکردنەوەی هێز و بردنەسەرێی چەندایەتییە، هەمیشە لەسەر حیسابی چۆنایەتیی هێز و ڕێکخستن دەکەوتنەوە.
ئەگەرچی لە قۆناغەکانی دواتردا، یەکێتی توانیی هێزی خورت و بەدیسپلین و پتەو بنیات بنێت و کۆنترۆڵی سنووری ناوچەکانی خۆی بکات و لە هێزەکانی دیکەی بپارێزێت، بە تایبەت هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان، دیسانیش ئەو هێزە لە ئەقڵ و ڕۆشنبیریی سیاسی بێبەری بوو و ڕۆبۆت ئاسا ڕەفتاری دەکرد.
وێڕای ئەو دۆخەش، ئێمە لە هەوڵی تۆخکردنەوەی ئەو بازنە فیکری و سیاسی و ئەخلاقییانەدا بووین کە هێزی کۆمەڵەی بە عەشایەر ئابلۆقەدراویان لە سەرجەمی هێزەکانی یەکێتی جیادەکردەوە. هێشتا کۆمەڵە و هێزە بەدیسپلن و پوختەکەی، داینەمۆی بزوێنەری سیاسی و چەکداری بزووتنەوەکە بوون. هێشتا کۆمەڵە، وێڕای چەکەرەکردنی تۆوی هەندێ ناکۆکیی فیکری و شەخسی، وەکو یەک جەستەی یەکگرتوو دەهاتە پێشچاو کە وەئازارکەوتنی ئەندامێکی، سەرتاپای جەستەکەی دەهێنایە ژان! ئێمە، ئەگەرچی بە دوو ئاڕاستەدا هەڵگری باری قورسی ئەرکەکانی ئەوێ ڕۆژێی خەبات بووین (یەکێتی و کۆمەڵە)، بەڵام تا ڕادەی دەمارگیرییەکی شێتانە، لە هەوڵی خورتکردنی ڕێکخستن و فیکری کۆمەڵەدا بووین و کارەکانی یەکێتیشمان دەخستە خزمەت گەشەپێدانی کۆمەڵە و ڕێکخستنەکانی. ئێمە سوور بووین لەسەر ئەوەی کۆمەڵە دەبێت بە ئاقارێکدا ببرێت کە لە ئایندەدا، ببێتە هێزی جیاکەرەوەی نێوان دوو قوتابخانە تەقلیدییەکەی نێو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان و ئاکامیش «جەلالیزم» پێش «مەلاییزم» ڕەت بکاتەوە! من، لە سۆنگەی هەوڵدانمدا بۆ پراکتیزەکردنی ئەو چەمک و بۆچوونانە چ لە نێو هێزی پێشمەرگە و چ لە نێو جەماوەری نێوچەکەدا، گەلێک جاران لە خودی مامجەلالەوە گلەم لێ کراوە و سەرکۆنە کراوم.
ئەو ڕۆژگارە، بەکری حاجی سەفەر ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە و یەکێتی و لێپرسراوی لقی سلێمانیی یەکێتی بوو. ئەو چەند کۆبوونەوەیەکی بەمەبەستی ڕێکخستنەوەی لیژنە جیاوازەکانی یەکێتی، لە سنووری لقی سلێمانیدا سازدا. دکتۆر ڕەزا کە لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی هەڵەبجە بوو، دوو مانگێک پێشتر بە دەستی هێزەکانی ق.م دیل و ئیعدام کرابوو! من، وێڕای لێپرسراوێتیی کارەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵە لە سنووری هەرێمەکەدا، ئەوا ئەرکی بەڕێوەبردنی کارەکانی لیژنەی ناوچەی هەڵەبجەشیان لە شانم بار کرد و تا گەڕانەوەی تایەر عوسمان «م.سەرکەوت»، بە کاروباری ڕێکخستنی یەکێتیشدا ڕادەگەیشتم..
کێشەی ئۆرگانە سیاسییەکانی یەکێتی لە سنووری هەرێمەکەدا لەگەڵ کادر و لێپرسراوە عەسکەرییەکاندا، جگە لە کۆکردنەوەی پارە و چۆنییەتی سەرفکردنی، ئەوا چۆنییەتی چارەسەرکردنی گرفت و کێشە

کۆمەلایەتییەکانی نێو جەماوەریش خاڵی گەرمی ملانێی و ناکۆکییەکان بوو. کادرە عەسکەرییەکان، دەیانویست دەسەلاتی موتڵەقی خۆیان لە هەموو بوارەکاندا پراکتیزە بکەن. زۆر جاران ئەو کێشەیەی کە کادرێکی سیاسی چارەسەری دەکرد، ئەوان هەڵیاندەوەشاندەوە و بە بارێکی تردا لابەلایان دەکردەوە کە مۆرکی بەرژەوەندی خزمایەتی و عەشیرەتگەری پێوە بوو. کێشەیەکی دیکە، دەستتێوەردانی کادرانی عەسکەری و فەرماندەی کەرت و مەفرەزەکان بوو لە کاری رێکخراوەیی یەکێتی و هەندەک جاران وا دەکەوتەوە کە هەر کادرێکی عەسکەری، هێڵێکی رێکخستنی تایبەت بەخۆی لە نێو جەماوەردا دروست دەکرد و ئامادە نەبوو بە زنجیرەی رێکخستنی «کۆمەڵە» یان «یەکێتی»یەوەی ببەستێت. ئەم هێڵە تایبەتانە لە زۆر حاڵەت و بواردا، بۆ مەبەستی تایبەت و ناڕەواش بە کار دەهێنران و هەندەک کاریان پێ ئەنجام دەدرا کە زیانیان لە قازانجیان زیاتر بوون.

گەڕاینەوە هەورامان. دوو مانگی جەنیوەری و فیبریوەریمان لەو کونەبەردانەی ناوی بنکەمان لێ نابوون، گوزەراندن... لەگەڵ خورتبوونی باسکی راپەڕینی گەلانی ئێراندا، هێزەکەی ئێمەش دەهات خورت و تۆکمەتر دەبوو. هەندێک لە ئەندامانی کۆمەڵە لە شارەوە پەیوەندییان کرد و لە نێو هێزەکەدا شوێنیان گرت و گورێکی بەرچاویان بە بزووتنی فیکری و سیاسیی کۆمەڵە دا. تا ئەو رۆژەش، هێزی هەورامان شانبەشانی هێزی قەرەداخ، قامترین بنکەی کۆمەڵە بوو کە خەتی گشتی و بزووتنەوە بۆ دەرمانیش دەست نەدەکەوتن.
لەو سەفەرەی بناری سوورێن و شاربازێردا، هەندێک ڤایرۆسی ملانێ و دەستەگەری دەناو هێزەکەی کۆمەڵە کەوتبوون کە پاشتر تەشەنەیان کرد و کێشە و سەرئێشەیان بۆ دروست کردین.

# بەهاری پێشوەخت

لە ناخی «فێبریوەری»دا، گڕکانێک هەڵپژا. گڕهاوێژی ئەو گڕکانە، شەختەستەمی چەندین ساڵان کەڵەکەبووی سەر پەڕ و باڵی رچیوی بۆ ئازادی هەڵفڕیوی کۆمەڵانی خەڵکی ئێرانی تواندەوە. لەسەر سنووری بێئارامیدا، تەمی چاوەڕووانیی ئێمەی لە مەنگەنەدراو، لەژێر تیشکی خۆری ئەو بەهارە پێشوەختەدا، رەوییەوە.

ئێمەی: رۆحشەکەتی جەستەماندوو، بێهێزی بڕست لێبڕاوی مەزنەهیوای دڵقاییمی چاو لە سەرابی سەرکەوتن بڕیو، لەسەر باڵی پرژەگڕی ئەو گڕکانە، وەسەما کەوتین!

لە بنکاچ و بنڕەمەنان، وەدەرکەوتین. لە زناران دابەزین و بە باڵای گرێۆڵکاندا سەرکەوتین. بۆ یەکەمجار، بە تووڵەڕێیەکی پێچاوپێچدا قەیتولەمان بەست و بۆ شارۆچکەیەک، ساڵێک بوو من خەونم پێوە دەدیت، وەرێ کەوتین... ئەوسود، کە تاجی سپیی هەورامانی بە شکۆییەوە لەسەرنابوو، تا پشتێنەی لە باخی هەناری هێشتا گوڵنەگرتوودا، هەڵکێشا بوو، چاوەڕێمان بوو.

مەیدانی ئەوسود، جمەی دەهات! خەڵکی شار، ئاپۆرەیان لێ دابێ، لە ئامێزیان گرتین. ئەدیو و ئەناسراو، ماچبارانیان کردین. ئەو سنوورە بەزوڵم رۆنراوەی ساڵانێک بوو لێکی هەڵاوێردبووین، لە پەلکەزێرینەی ئازادیدا سڕایەوە... هێشتا پشوومان نەدابوو، سەرکەوت «تایەر عوسمان»، وەسەر سەکۆیەک کەوت و کەوتە خوتبەدان! قسە، بۆ کردن زۆر بوون. خوتبەخوێنی ئێمە، پاشی پیرۆزبایی سەرکەوتن و شیکردنەوەی مانای گەورەی ئەو راپەڕینە خوێناوییەی خەڵکی ئێران، قسەکانی بۆ روونکردنەوەی پلان و بەرنامە و ئامانجەکانی شۆڕشی نوێ و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، گوازتنەوە. ئەو، بەشێکی زۆری لێدوانەکانی بۆ ریسواکردن و هەڵتەکاندنی قیادەی موەقەت و بنەماڵەی بارزانی تەرخان کردن. دیارە ئەگەر منیش بام، هەر وەهام دەکرد!

_ بەخێر بێن سەر چاوی ئێمە! ئێمە کورد بە یەک چاو سەیر دەکەین. ئێمە هەموو پێشمەرگەی کوردستان، وەکو پێشمەرگە دەبینین و چ جیاوازییەک لە نێوانتاندا ناکەین. ئێمە پێمان خۆش نییە و رێگا نادەین ئەو دووبەرەکی و شەڕی براکوژییەی نێوانتان ، لە نێو ئێمەدا دووبارە ببنەوە.. پێشمەرگە، هەر پێشمەرگەیە!

ئەمە پەرچەکرداری کەسێک بوو، بە ناوی «ئاغای جەلالی» کە لە بری کۆمیتەی شۆڕشی ئێران لە ئەوسود، بەخێری هێناین.

رۆژ و شەوێکمان لە ئەوسود، لەنێو ئامێزی گەرم و والای خەڵکدا، بەسەر بردن. لەسەر خوانی

رازاوەی ماڵانی نانبدە و دڵاوا، خۆشترین خواردنمان خوارد. بە جلی چڵکن و سەروریشی پڵکن و پڕ لە «ئەسپێ»وە، بۆ یەکەمجار، لە پاکترین و ئەرمونۆڵترین پێخەفدا خەوتین! پێم وانییە، شتاقمان، ئەو شەوە خەونێکی دیتبێت. ئاخر ئەو شتانەی شەوانی دیکە، لەبن ئەشکەوتان و بەزگی برسی و هەڵگوشراومانەوە، خەونمان پێوە دەدیتن، ئەو رۆژە بوونە حەقیقەت.

لە ئەوسوی دابڕاوی سەرسنوورەوە، نەتدەتوانی وێنای رووناوەکانی شارگەلی گەورەی وەکو کرماشان و سنە و مەهاباد بکەیت. دیارە حاڵیبوون لەوەی لە تاران و شارە زێدەگەورەکانی دیکەی ئێراندا، چ دەگوزەرا، کارێکی ئاسان نەبوو. لەوێدا، جگە لە بەیەکداهاتنی خەڵک و شەوق و خۆشییەکی بێئەندازە، شتێکی دیکە بۆ سەرنج تێهاوێژتن نەبوو. چەند گەنجێکی خوێندکارمان دیتن کە بڵاوکراوەی چریکە فیداییەکانیان پێ بوو. چریکەکان، ئەوێ دەمێ، بەهێزترین رێکخراوی چەپی ئێرانی بوون کە مێژوویەک لە تێکۆشانیان دژ بە رژێمی شا هەبوو. لەو دەستپێک و گەرماوگەرمییەدا، هەواڵێک لە حیزب و رێکخراوی کوردی نەبوو کۆمەڵەی زەحمەتکێشان، جارێ خۆی نەناساندبوو. حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیش، تازە بنە و بارگەی لە هەندەرانەوە، بۆ کوردستان دەگوازتنەوە. من، چاوم بۆ ئەو هاورێیانە دەگێڕا، کە پێش سەرکەوتنی شۆڕش و لەژێر تاریکایی چەتری شەودا، خۆیان دەگەیاندە کێڵەباخ و ئەشکەوتەکانی ئێمە. مامۆستا جەلال، حەمەرەزا، مامۆستا حەمەرەشید، هۆشمەن ئۆتشەیی و براکەی، کێی دیکەش؟ نازانم! هێند دەزانم ژمارەیان لە پەنجەی دوودەست تێنەدەپەڕین.

رۆژی دواتر، لە شاری پاوە، هەندێکیانمان دیتنەوە، هاورێی دیکەشمان پەیداکردن. تێکۆشەرانێکی دیکەمان ناسین کە ساڵانێکی زۆری پاشتریش، بە هاورێ و هاوخەبات ماینەوە.

نوێنەرانی شاری «پاوە» گەیشتن و بۆ سەردانی شار، بانگهێشتیان کردین. کەژاوەی پێشمەرگە وەڕێ کەوت. بیست تا سی ئۆتۆمۆبێل، سەریان لەدوی یەک نا و بە کەناری «سیروان»دا، بەرەو «دوروئاوان» ئاژۆتن. لە پردی دوروئاوان پەڕینەوە.. شەقامی قیرڕێژ، پشتوێنێکی رەشی تا چاو هەتەرکات درێژی لە گەردنی گربۆڵکان و گەردەنەی کۆساران ئاڵاو بوو. کە لە گەردەنەی «کەلیان» سەرکەوتین، ئیدی تەنیا ئەو شیعرە فۆلکلۆرە دەیتوانی وەسفی جوانیی شار بکات:

سەراو چون هەوڵی مەسکەن چون پاوە

ئێژی بەهەشتە، وە رووی دنیاوە!

ئەشراف و پیاوماقوڵان لە دەرەوەی شار و خەڵکی گوندەکانی نزیک، لەسەرڕێگا، بۆ بەخێرهێنانمان چاوەڕێ بوون

_ بژی کۆمەڵەی مارکسیی _ لینینیی کوردستان... با بژی!

ـ سەگباب! باسی مارکس و لینین و ئەو شتانە مەکە... شۆڕشی ئیسلامە... ئیسلام!
ئەوە پێشمەرگەیەکی کۆمەڵە بوو کە لە حاڵەتی شاگەشکەبووندا، درووشمی دەدا و «مامۆستا سەرکەوت»یش دەمکوتی دەکرد!
کەمال شاکیر، لە شاری پاوە نوتقی دا. ئاخاوتنەکانی ئەمیش، شتێکی لەوەکەی تایەر عوسمان زیاتر نەبوو، هێند نەبێ، ئەم بەلای «ق.م»دا ئاوڕی ئەدایەوە و سەروپۆتەڵاکی ئەکوتانەوە.
کۆمیتەی شاری پاوە، بۆ قاوەڵتیی نیوەڕۆژ، بۆ میوانسەرای شاریان بردین و ژەمێکی شایانەیان پێ داین! پاشتر لەگەڵ کۆمیتەی شار دانیشتین و هەندێک پلانی هاوکاریمان داڕشتن.
خەڵکی شار، «هەندێک خوێندەواری لێ دەرهاوێ»، باسێکیان لە مەسەلەی کورد و چارەنووسی کوردستان، لە ڕێڕەوەی ئەو شۆڕشە مەزنەدا نەدەکرد. سەری زمان و بنی زمانی پیاوانی «کۆمیتەی ئینقیلابی شار» ، لە باسی ئیمام و ئیسلام تژی بوون! مامۆستا و خوێندەوارەکان، پێیان وابوو، کە ئەندامانی «کۆمیتە»، هەمان ئەو ساواکییانەن کە ساڵانێک هاوکاریی ڕژێمی شایان کردووە و ئێستا گێڕی بەرژەوەندییان گۆڕیوە. ڕووداوەکانی مانگەکانی داهاتوو، درووستیی ئەم بۆچوونەیان سەلماند. پاوە، تەنیا شارێکی کوردستانی ڕۆژهەڵات بوو کە لە هیچ سەردەم و هەلومەرجێکی ڕۆژانی سەرهەڵدانی شۆڕش و تەقینەوەی ناکۆکییەکانی نێوان کورد و کۆماری ئیسلامیدا، بە هێزەکانی کورد ڕزگار نەکرا و بۆ ڕۆژێکیش دەسەڵاتی کوردی تێدا جێگیر نەبوو!

## ((ڕژێمی شای ئێران، ١٢ تێکۆشەری کورد لە سێدارە ئەدات!))

ئەمە هەواڵێک بوو، کە من پێش ١١ساڵ لە ڕووخاندنی ڕژێمی شا، لە گۆڤاری «ڕزگاری»دا خوێندبوومەوە! بەهمەنی حەمەڕەشیدبەگی لهۆن، کە ناوی لە نێو لیستەکەدا هاتبوو، بە درێژایی ئەو ساڵانە، لە یادەوەریمدا خەوتبوو!

((بەهمەن بەگ، قارەمانێکی بێوێنە بوو. ئەو دەیویست لە هەورامانەوە، دژ بە شا، شۆڕش بەرپا بکات! داخەکەم، پێش یاخیبوون، دەستگیر کرا...)). کاک عەینەدینی براگەورەم، کە ئەوسات لێپرسراوێکی دیاری باڵی جەلالی بوو لە هەڵەبجە، وای دەگێڕایەوە.

بەهمەن بەگی ڕەحمەتی، پورزای ئێمە بوو. ئەو ڕووداوە، لە مێشکی ئێمەی مێردمنداڵدا، وێنەی جۆراوجۆری دەخولقاند و بەهمەن بەگ، دەهات بێتە نموونەی باڵای ئێمە.

ئێمە «شێخ عەبدوڵا، شێخ ئەمجەد و من»، هەر سێمان هاوزا و ئامۆزا بووین و لە سەروبەندی ١١ی ئازاری حەفتادا، حەفدەساڵان بووین، بە خەیاڵ، پلانی شۆڕشمان بۆ کوردستانی ئێران دادەڕژت و خۆمان وەکو سێ سەرکردەی شۆڕشەکە وێنا دەکرد.

_ من بڕنەوێک و دەمانچەیەکم هەیە! شێخ عەبدوڵا، وای دەگوت.

_ منیش دەمانچەیەکم هەیە و لە دیوەخانیش ئەنبارێک چەک دانراوە! ئەمجەد بوو، بە بڕێک خۆنازینەوە.

_ کوردستانی ئێمە ڕزگار بووە و ئێستا نۆرەی کوردستانی ئێرانە! منیش کە دەمانچە و بڕنەوم نەبوون، قسەی زلم بۆ کردن، زۆر بوون!

من، کە لە گەڵ چەند پێشمەرگە لە چاخانەیەکدا دانیشتبووین، ئەو وێنانە لە یادەوەریمدا دەژیانەوە و تێکەڵ بە واقیع دەبوونەوە...

دەبێ ماڵی بەهمەن بەگ لە کوێدا بێت؟ ژن و دوو کوڕەکەی ماون و لێرەن... دەبێ ئێستا هیچ کەس لەوان دڵخۆشتر نەبێت!

ماڵەکەیانم دیتەوە. لە دەرگام دا، دەرکەیان کردەوە. سڵاوم کرد و خۆم پێ ناساندن.. ژنێکی خوێنسارد و کوڕێکی بە مەزەندە تەمەن بیستساڵە. بەخێریان هێنام.. چ خۆشییەکم لە ڕووخساریاندا نەبینی! پرسیاری پوورەفاتمە و خزمانیان کرد، منیش هەواڵێکی ئەوتۆم لا نەبوو! وێنەیەکی گەورەی بەهمەن بەگ، بە بەرگ و کڵاوەشکیی بەگزادانەوە، سەرنجی ڕاکێشام، هەمان وێنە بوو کە ١١ ساڵ پێشتر، لە گۆڤاری ڕزگاریدا دیتبووم.

دوو ڕۆژان لە پاوە ماینەوە. کەمال شاکیر و دوو کەسی دیکە . بۆ پەیوەندگرتن لەگەڵ ڕێکخراوی چریکی فیدایی، سەفەری کرماشانیان کرد. پاوەمان جێهێشت و ڕوومان لە گوندەکانی جوانڕۆ کرد. لە ماوەی دوو هەفتەدا، گوندبەگوندمان بەسەر کردنەوە! ئێمە، هێند تامەزرۆی نێو خەڵک و ئاوەدانی بووین، بە خۆمان دا، ئەو گوند و شارۆچکانەمان بەجێ نەدەهێشتن! لە کۆتایی فیبریوەریدا، بەرەو سنوور و بنکەکانی خۆمان گەڕاینەوە.

فیبریوەریی ١٩٧٩، بۆ شۆڕشی کوردستانی ئێراق، بوویە خاڵی وەرچەرخان و هێڵی جیاکەرەوەی نێوان دوو قۆناغ.. قۆناغی ئێرانی شا و قۆناغی ئێرانێک، سەرڕێژ لە هێز و توانای شۆڕش و گۆڕان! ئێرانێک، جارێ چارەنووسە سیاسییەکەی، بۆ ئێمە و بۆ خۆشیان، نادیار بوو.

# تاڵێ لە ڕۆحی فرێوی «ئارام»،
# لە جەستەی «ئازادهەورامی»دا هەڵنیشتبوو!

سەرەتای مانگی مارسی ١٩٧٩یە. گوڵیلکەی بەهار لە ناخ و دەروونی ئێمەدا، گوڵجارێکی رەنگاورەنگیان ئەخشاندووە. کەژ و کۆی هەورامان، جارێ یەکلەت سپی و خاڵخاڵیان تێ نەکەوتووە! ئێمە بە بەهاری شۆڕشی گەلانی ئێران، سەرمەست و دەروونکەیلین. لە چاوانی ئێمەدا، پزیسکی هیوا و گەشبینی بڵاچە دەدەن. جەستە و ناخی ئێمە لە وزە و جووڵە لێوانلێون. ئێمە، ئیدی توانای دانیشتن و خۆکرکردنمان نەماوە. کونەئەشکەوت و کێڵەباخەکانی «پەروینی»، لە خۆیانمان ناگرن و بە جەستە و رۆحمان تەنگن. ئێمە دەبێت بجووڵێین!

+ دەڵێی چی، سەفەرێک بۆ سەرکردایێتی بکەین؟

پێشنیازی تایەر عوسمان«سەرکەوت» بوو. چ پێشنیازێکی بەجێ بوو! ئێمە، پاشی گەڕانەوەی م.بەختیار لە مانگی تەموزی ساڵی پێشوودا، ئیدی چ سەرکردەیەک یاخود لێپرسراوێکی سیاسیی لەخۆمان باڵاترمان نەدیتبوو. سەفەر بۆ سەرکردایێتی و بینینی مامجەلال و سەرکردەکانی کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، بۆ من خەونێکی پڕ مانا بوو.

سەفەر بۆ سەرکردایێتی، پێچەوانەی سەفەر و گەڕانەکانی دیکەمان لە شارەزوور و شاربازێڕدا، کۆڵەپشت و توێشووی گەرەک نەبوو. رێگاکانی کوردستانی رۆژهەڵات، شار بە شار تا دەگەیتە سەردەشت، ئاوەڵا و بێلەمپەر بوون. ماشێنی «دووکابینە»، لە «نەوسوود»ەوە بۆ «پاوە»، لەوێڕا بۆ کرماشان و سنە، چەندین شەوورۆژ، پیادەڕێی بۆ دەگێڕاینەوە.

چەند رۆژێکی بۆ نەورۆز مابوو. وەڕێ کەوتین. ئەو پێشمەرگانەی لەو سەفەرەدا هاوڕێمان بوون: قادرحەمەشەریف«دکتۆرقادر»، حەمەعەلی فەتاح، شەریف کەشکۆڵ، لەتیفی حەمەی مەلاسابیر، کەریمی حەمەی مەلاسابیر، موحەمەد حەمەکەریم و رەنگە کەسانی دیکەشمان لەگەڵ بوو بن و من لە بیرم کردبن.

سەفەر، هەتا شاری کامیاران، بێگرفت و کێشە بوو. لە کامیارانەوە بۆ شاری سنە، دەبوو رێگایەکی کوێستانیی چەپەک بگرین. رۆژانانی کوردستان، لە ساڵانی هات و پڕ سەرماوسۆڵەدا، تا کۆتایی مانگی مارس و نێوەڕاستی ئاپریلیش، بەستەڵەک و رێبەندانن. دەمەونێوارەیەکی درەنگ، ئاسمانی ساو، زەوین شەختە و رێگا سەخت. زەردەی ئێوارە، لەسەر دووندی کۆساران، بۆ ساتێکیش بەند نابێت. ئۆتۆمبیلێکی لاندرۆڤەری مۆدێلکۆنی شەقوشڕ، پێچاوپێچ بە گەردەنەی کێوێکدا سەردەکەوێت

و ئێمەی سەرنیشینانیشی، بێ لە دڵمان، ئازای لەشمان رچیوون...
+ مەسئولەکان لە پێشەوە پاڵیان لێ داوەتەوە و ئاگایان لە ئێمە نییە... خۆیان دەڵێن: مەسئولی کۆمەڵە، دەبێت لە هەموشتێک و لە هەموو شوێنێکدا لە دواوە بن، لە مەرگ و شەهیدبووندا نەبێت!
_ مەگەر هەروا نەبوونە؟ لێپرسراو یان کادرێکی کۆمەڵەت بینیوە، لە خەودا، لە خواردندا، لە پشوودانا، لە هەڵبژاردنی چەک و جلی بەرگی جواندا، پێش پێشمەرگە کەوتبێت؟!
+ راستە هەتا ئێستا هەر وا بوون، بەڵام ئێستا و لەم سەفەردا وەهانین. لە پێشەوە و بێخەم لێی دانیشتوون و ئێمەش وەکو گونی سەگ دەلەرزین! هەتا ئێستا ئۆتۆمبێل و شار و شتی وەها نەبوون، لێ گەڕێ و نارامت بێ، بزانە لەمەودوا چۆن دەگۆڕێن!
دوو پێشمەرگە، لە بەشی دواوەی ماشێنەکەدا، گلەیی و گازندە لە من و تایەر عوسمان دەکەن و نوقڵانە بۆ رەفتار و هەڵسوکەوتی ناپیندەمان لێ دەدەن. من، ئاوڕێکیان لێ دەدەمەوە و دەڵێم:
ئەم شرەئۆتۆمبێلە، پاش و پێشی زەمهەریرە و بەر و دوای نییە! ئەگەر بروا ناکەن، کێتان دەیەوێت، با بێتە جێگاکەی من. بۆ داهاتووش، رەنگە راست بکەن، بەڵام جارێ وەختە و حوکمی پێشوەخت مەدەن!
ماشێنەکە، پارچەیەک بوو لە شەختە، ئەگەر لەسەر رۆیشتن بەردەوام باین، ئێمەش دەبووینە پارچەیەک لە ئەو.
لە نیوەشەودا، گوندێکی سەرڕێگامان کردە هەوار. کام گوند بوو، ناوی چی بوو؟ نازانم! بەسەر سێ ماڵدا دابەش بووین و وەک هەمیشە بووینە میوانی ناوەخت.
بۆ بەیانی بەرەو شاری «سنە» وەڕێ کەوتین و دەمەوئێوارە لە شار بووین. شار، تەنیا ناوێک و رووخسارێک و وێنەیەک، کە پێشمەرگە شەیدایان بوو!
من، کە لە شاخ بووم، هەمیشە وێنەیەکی شارم لە هزردا بوو. من، پێم وابوو، شاخی سەربەست و دوور لە چنگی رەشی بەعسییان، پێگەیەکە بۆ پەڕینەوە بەرەو شاری ئازاد و رزگارکراو. ئێمەی لەشاردا پەروەردەبووی کەللەڕەقی لەشار یاخی و وەشاخ کەوتوو، هەمیشە بە هیوای چاوانی شار دەژیاین!
شاری سنە! مەڵبەندی میران و مەستوورەی ئەردەڵان، بەفرێکی ئەستوور بارگرانی کردووە. نازانم بۆ هەرساتێ ناوی مەستوورەم بە هزردا تێپەڕ دەکات، چامە بە نێوبانگەکەی حەزرەتی «نالی»م وەبیر دێتەوە...
((مەستوورە کە حەسناوو ئەبییە بە حیسابێ
هاتە خەوم ئەمشەو بە چ نازێک و عیتابێ)).
شوێن و کات، بۆ من گرنگییەکی زێدەگرنگیان هەیە. من، کە دەچمە شوێنێک یاخود پێیدا گوزەر

دەکەم. کاتی ئێستا تێ دەپەڕێنم و لە زەمەنە تۆزلێنیشتووەکانی مێژوودا دەگیرسێمەوە. من. چێژێکی کەموێنە لە دووبارە خولقاندنەوەی رووداوە تێپەڕیوەکان لە هزردا، دەبەم.
رەنگە یەکێک لە هاندەرەکان، بۆ گێڕانەوە و تۆمارکردنی چرکەساتەکانی «ئەزموون و یاد»، هەر ئەم پرۆسەی چێژلێبردنە بێت.
سنە، کە جارێ نازناوی «خوێناویی» لەخۆ نەگرتبوو. لە ئێوارەیەکی رچیودا ژاوەی دەهات. شەقامەکان، پڕ لە مرۆڤە دڵ لە هیوا سەرڕێژەکان، بە رووداوەکانی ئایندە ئاوس بوون... گوێسووانەکان، بە هێشووی گوڵەکانی شۆڕش شانگران بوون. هەموو شتێک و هەموو شوێنێک بۆنی ئازادی و شۆڕشیان گرتبوو. شۆڕش و ئازادییەک، هێچکەس نەیدەزانی سنووریان لە کوێدایە و بە چ سنوورێک دەگەن!
شەومان لە مەکۆ یاخود مەڵبەندی گرووپێکی لایەنگرانی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێراندا کە جارێ بە ناوی کۆمەڵە خۆیان نەناساندبوو، رۆژکردەوە.
ئەو شەوە، خۆمانم وەک چەپکەگوڵێلکە کێویلەیەک دەهاتە پێشچاو کە پەپوولە شەیداکانی شۆڕش لێی وروکابوون و پرسەماچی سیاسەت و شۆڕشگێڕییان بەسەردا دەباراند. کچان و کوڕانی پڕ لە وزە و سیخناخ بە تیۆرەکانی مارکس و لینین و ماوتسی تۆنگ. بارانی پرسیان چۆڕبڕ نەدەبوو! ئەوان لە کتێباندا شۆڕشیان دەدیتەوە و ئێمەش لە کورەی بەنێڵەی شۆڕشدا، لە کونەبەرد و بن ئەشکەوتاندا، سەرگەرمی خوێندنەوەی کتێبان بووین! ئەوان. جلکی خاکی لەبەر و جامەدانی لەمل بوون و ئەستێرەی سووریان لەسەر کاسکێتەکانیان ئەخشاند بوو.
دیوارەکان، پێشەنگای پۆستەرەکانی لینین، ماو، جیڤارا و شەهید حەمەحوسەینی کەریمی بوون. حەمەحوسێنی کەریمی، یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران. رۆژانی پاشتر، ساتێ کۆمەڵە خۆی ناساند، بۆ ئێمەی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، بوویە «کۆمەڵەی ئامۆزامان» و لە سەرەتا و دەستپێکی خەباتی ئاشکرایاندا، ئێمە هاوکار و پشتیوانێکی پڕمانایان بووین.
رۆژی دوایی، هەر لەوێ «ئازادهەورامی»مان دیت. ئازاد هەورامی، کەمتەمەنترین ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵەی رەنجدەران بوو. ئەو، کە لە کارەساتی «هەکاری»دا، لەلایەن هێزەکانی «ق م»ەوە بەدیل گیرابوو. پاش ساڵێک زیندانی، لەگەڵ «شێخعەلی»دا، لە زیندان هەڵاتبوون.
ئازاد، گەنجێکی رۆشنبیر، بەئەزموون، نووسەر، هونەرمەند و دەسترەنگین، رووخۆش و رەوشتبەرز کە لە یەکەم دیدارمانەوە هۆگری یەکدی بووین و پاشتریش وێڕای کێشە و گرفتەکانی نێو دەروونی کۆمەڵە و یەکێتی، تەنیا شەهیدبوونی ئەو. لێکی جودا کردینەوە. من کاک ئارامم نەدیتبوو، وەلێ

هێنەدیان باسی هەڵسوکەوت و رەوشتبەرزیی کاک ئارامی ئەفسانەیان، بۆ ئێمە کردبوو. زۆرجاران دەمگوت: هیچ دوور نییە، بەشێک لە رۆحی بەرزەفڕی کاک ئارام، لە جەستەی ئەم ئازاد هەورامییەدا هێلانەی چێ کردبێت! ئاخر ئازاد هەر بە فریشتە دەچوو، نەک بە سەرکردەی ئەم سەردەمە!

ئەو رۆژە، ئێمە لە گروپەکەی خۆمان جیابووینەوە. من و لەتیفی حەمەی مەلا سابیر، بەرەو بانە و سەردەشت وەڕێ کەوتین و مامۆستا تایەر و برادەرانی دیکەش، بەرەو مەهاباد بۆ دیتنی شێخعەلی رۆیشتن.

لە سەردەشتەوە، بە ئۆتۆمبێل دەچینە گوندی «بێوران». لە بێورانەوە، بە دۆڵێکی بەفرگرتووی پێچاوپێچدا، بە سێ سەعاتان پیادەڕێ، دەگەینە «خڕی نێوزەنگ»ی بارەگاکانی سەرکردایەتیی یەکێتی و کۆمەڵە.

ئێستا لەتیف و من، لە «خڕی نێوزەنگ»ین و وەختیش درەنگەئێوارەیەکی رۆژی ٢٠ی مارسی ساڵی ١٩٧٩یە.

## نەورۆزی پەرتبوون!

نێوزەنگ، تخووبی نێوان رۆژهەلات و باشووری کوردستانە. ئێمە، لە جۆگایەک پەڕینەوە و مەرزێکی دەستکردمان بەزاند. بازێک و ئێدی تۆ، لە ولاتێکەوە، دەچیتە ولاتێکی دی! مەملەکەتی سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لە دەرکەی قاچاخچییانەوە لێی وە ژوور دەکەویت! مەبەستم، دووکانی «ئەحمەدساروخ» و بازاڕێکە، کە شادەماری ئابووریی نێوچەکەیە! لە دنیای سەرکردایەتیدا، دەبوو ڕوو لە مەقەڕیک بکەین، هەم سەرکردە و هەم پێشمەرگەکانیش بناسین. لە یەکەم پێشمەرگەیەک توشی هاتین، سۆراغی مەقەڕی مەلابەختیارمان کرد و پێی گوتین: بارەگای ئەو، لە گوندی «شێنێ»یە... شێنێ، نیوسەعاتێک بە پێیان دوورە. لە نێوزەنگەوە گەیشتینە «زەلێ» و لەوێرا، تووڵەڕێیەکمان گرت کە دەستی ڕاستمان زنجیرەچیایەک و دەستی چەپمان چۆمێکی خوڕ و بەلووزەو بوون.

شێنێ، تەنیا گوندێکی ڕانەگوێزراو کە لە بناری «مامەندە»دا، مینا هەلۆیەکی ماندوو، هەڵنیشتبوو. کە لە باسکی بەرانبەری گوندەوە، داکشاین، دووکەڵی دەم دووکەڵکێشی ماڵەکان، هاوتەریب هەڵدەکشان و لە گەردنی مامەندەدا لێک دەئالان و پاشان بەتاسەوە، ڕووخساری بەمژداپۆشراوی پیرەچیایان دادەمووسی.

بە کۆڵانەبەفری پێچاوپێچدا، بەرەو بارەگای مەلابەختیار سەرکەوتین. بارەگا، خانوویەکی لە بەرد و قوڕ دروستکراوی دوو ژوور و هەیوانێک بوو. کە وەژوور کەوتین، مەلابەختیار و پێشمەرگەکان، بە ماچ و ڕامووسان، پێشوازییان لێ کردین و بەخێریان هێناین. لەسەر سفرەی پێشمەرگانە دانیشتین و سەرو قاپ نۆکاویان لەبەردەم داین. پاش شیوکردن، دەنگوباسمان ئاڵشت کردن. پاشتر، کۆبوونەوەی ڕۆشنبیریی هەفتانە دەستی پێ کرد. لە بارەگاکانی کۆمەڵەدا، لە هەر شوێنێکی کوردستاندا، کە نۆخەکە ڕێگای دابا، هەفتانە کۆبوونەوەی ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکانی پێشمەرگە، بەڕێوە دەچوون. تێمای کۆبوونەوەکان، بابەتی تیوری و شیکردنەوەی ئەزموونی شۆڕشی گەلان، هونەری شەڕی پارتیزانی، خەسڵەتە تایبەتییەکانی شۆڕش لە کوردستان و هێزە بنچینەییەکانی شۆڕش، بابەتە فەلسەفییەکان بە زمانی سادە، بەرنامە و میتۆدی کاری کۆمەڵە و میکانیزمی پێکەوەگرێدانی خەباتی نەتەوایەتی و چینایەتی لە کوردستاندا، کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانی کوردستان، یەکێتی و هێزە سیاسییەکانی دیکەی کوردستان، ناکۆکییەکانی نێو دەروونی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کوردستان و زۆر بابەتی دیکەی تایبەت بە ژیان و هەڵسوکەوتی پێشمەرگە بوون.

ئەو ڕۆژگارە، خەمی گەورەی سەرکردە و کادرەکانی کۆمەڵە، سازدانی کاکڵەی هێزێکی هۆشیار و

بەئاگا و خاوەندیسپلن بوو کە ببێتە ناوکی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و کۆمەڵەش لە بۆتەی ئەو خەباتە سەختەدا، ببێتە پارتی پێشڕەوی کرێکاران و رەنجدەرانی کوردستان!
ئەو ئێوارەیە و لە یەکەم پشوومانداا، لە بارەگای مەلابەختیار، چەند پێشمەرگە و کادریکی کۆمەڵەمان ناسین، کە هەندێکیان پاشتر شەهید بوون(هاوڕێ کاوەمەخموری و هاوڕێ جەبار)، و هەندێکیشیان ژیانیان بۆ نووسرا و ئێستاش لێپرسراون (مەلایاسینی هەڵەبجەیی)، کە پاشتر خۆی گوازتەوە بۆ سنووری هەڵەبجە و هەورامان و لە پرۆسەی خەباتی سیاسی و پێشمەرگانەدا، بوو بە کادرێکی وریا و لێوەشاوە.
پێشمەرگەیەکمان بە ناوی (سەلام خانەقینی)، لەوێ دیت کە لە چاوانیدا، زرنگی و کردەیی دەدرەوشان. ئەو، پاسەوانی تایبەتی «مەلا» و لە کەسە متمانەپێکراوەکانی بوو. ئەو، هاتوچۆی شاری دەکرد و یەکێک بوو لەوانەی نەیارانی شۆڕشی تیرۆر دەکردن. ئەو، پاشتر لەگەڵ بەعسدا گرێی دابوو و هەوڵی تیرۆرکردنی مەلابەختیاری دابوو. ئەو، وەکوو ناپاک، ئیعدام کرا!

رۆژی١ی نەورۆز «٢١ی مارس»، رۆژێکی دیکە بوو لە دووکەرتبوونی تەلاری چەکداریی و رێکخراوەیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا. بەیانیی ئەو رۆژە، لەگەڵ هەواڵی جیابوونەوەی بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان و گوازتنەوەی بارەگاکانیان لەمبەری چۆمەوە بۆ ئەوبەری، وەناگاهاتین. ئەو شەوە، دکتۆر مەحمود عوسمان و رەسوڵ مامەند و لایەنگرانیان، بارەگاکانی خۆیان لە «شێنێ»وە بۆ گوندی «گۆڕەشێر» گواستەوە و جاڕی جیابوونەوەیان دا!
ئەم رووداوە، لە دۆخێکدایە، هێشتا یەکێتی و تەلارە چەکداری و رێکخراوەییەکەی زامەکانی هەکارییان سارێژ نەکردوون و ئاسەواری ئەو گورزە خوێناوییە بە جەستەیانەوە دیارە.
بزووتنەوەی سۆسیالیستیی کوردستان(پێشتر سۆسیال دیموکراتی کوردستان)، لاباڵێکی سیاسی و چەکداریی بەسەنگی نێو یەکێتیی نیشتمانی و لەگەڵ کۆمەڵە و «خەتی گشتی»دا، نیمچەبەرەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیان پێک دەهێنا.
بزووتنەوە، لەساڵی ١٩٧٦دا و پاش ئەوەی کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینی کوردستان، یەکەم مەفرەزەی چکداری رەوانەی شاخ کرد، ئەویش کادر و ئەندامانی خۆی ناردنە شاخ و وەکو لایەنێکی نێو «یەکێتی»، هەڵسووڕانی سیاسی و چەکداریی خۆی بە ئاشکرا راگەیاند.

# ئاوڕێکی تیژپەڕ
# لە مێژووی بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان:

بیرۆکەی دامەزراندنی بزووتنەوە، بۆ چەند ڕۆژێک پاش هەرەسی بزووتنەوەی ئەیلوول دەگەڕێتەوە. مانگی نیسانی ساڵی ١٩٧٥، دوای ئاوارەبوونی زۆربەی سەرانی شۆڕشی ئەیلوول و مانەوەیان لە ئێران، بەشێک لە سەرکردە و کادرەکان، لە شاری ورمێ کۆدەبنەوە و لەسەر دامەزراندنی ڕێکخراوێکی سیاسی ڕێک دەکەون. هەندێک لەوان:

١ _ رەسوڵ مامەند ٢ _ عەلی عسکەری ٣ _ عەلی هەژار ٤_ کاربۆ گەلاڵی ٥_جەمال ئاغا ٦_کەمال موحێدین ٧_دکتۆر خالید سەعید و کەسانی دیش. ((بڕوانە ڕێباز، قەندیل بەغدای هەژاند، بەشی یەکەم)).

ئەم کۆبوونەوەیە، وا پێ دەچێ، تەنیا مەکۆی ڕسکاندنی بیرۆکەی دامزراندن بووبێت، چونکە چ دەکۆمێنتێکی نووسراو نییە کە ئاماژە بۆ ئەوە بکات، لەوێدا بەرنامە و تەلاری ڕێکخراوێکی سیاسی دارێژرابێت.

یەکەم ڕاگەیاندنی سیاسیی ئەو گرووپە، بە ناوی (بزووتنەوەی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان)، لە ١٦ی ئاگۆستی ١٩٧٦دا دەرچووە و خوالێخۆشبوو سەیدا ساڵەح یوسفی ڕێبەریان بووە.

دامەزرێنەرانی (بزووتنەوە)، تێکەڵەیەک بوون لەو کادرە سیاسی و عسکەرییانەی کە پێشینەی خەبات و تێکۆشانیان لە نێو هەردوو باڵی پارتیی دیموکراتیی کوردستاندا هەبووە!

بە واتایەکی دیکە، گروپێک لە کادر و هەڵسووڕاوانی نێو باڵی «م س»ی پارتی کە بەشێکیان لە ساڵانی ١٩٧٠ _ ١٩٧٤دا، جۆرێک لە بەرپرسییان لە شۆڕشی ئەیلوولدا هەبوو.

گرووپی دووەم، ئەو کادر و لێپرسراوانە بوون کە بە درێژایی تەمەنی بزووتنەوەی ئەیلوول، بۆ سەرکردایەتیی پارتی و ڕێبازی بارزانی وەفادار بوون. هەرەسی بزووتنەوەی ئەیلوول، هەندەک گومانی لای ئەم گروپە درووست کرد و تووشی ڕاپسکان و تێڕامانی کردن.

هەرەس، کە سەرکردایەتیی پارتی و ماڵباتی بارزانیی ئاوارەی ئەودیو سنوور کرد، دەرفەتێکی بۆ ڕیشاڵبوون و هەندێکجاریش پساندنی ئەو گوریسە ئەستوورە فیکری، سیاسی و ڕۆحییە ڕەخساند کە ساڵانێک بوو، سەدان کادر و لێپرسراوی بە سەرکردایەتیی پارتییەوە، شەتەک دابوون!

هەرەس، هەیبەت و توانستی ماڵباتی بارزانی و سەرکردایەتیی پارتیی لە چاوی ئەو گرووپەدا بچووک کردنەوە و بواری ئەوەی بۆ ڕەخساندن کە بێ ئەوان و دوور لەوان، کەمێک بەخۆدا بێنەوە و بە ڕواڵەتیش بێ، لە دیدێکی دیکەوە، بۆ حیزب، بزووتنەوە و جەماوەر بڕوانن و بیر لە دامەزراندنی

ڕێکخراوێکی سیاسیی ئەوتۆ بکەنەوە، کە لە ڕووی تیور و بەرنامەی سیاسییەوە، جۆرەجیاوازییەکی لەگەڵ پارتیدا هەبێت و هاوتای باروبۆخی سیاسی و ڕۆشنبیریی کوردستانی پاش هەرەس، خۆی بگونجێنێت.
ئەم گرووپە، لە هەوڵی تویژرێژەکردنی توڕەیی و نارەزاییەکانی خۆیاندا بوون، لەمەڕ سیاسەتی پارتی و ملدانی بۆ ئەمری واقیعی هەرەس و چوونەژێرباری بەرئەنجامەکانی ڕیککەوتننامەی ئەلجەزائیر. ئەمان، سەرجەمی کارەساتەکەیان لە ئەستۆ و ئۆباڵی سەرکردایەتی و ماڵباتی بارزانی دەدا. ئەوان، خۆیان بە لایەنگری موقاوەمەت و دریژەپێدانی بزووتنەوەکە دەناساند. بەشێک لە هەوڵەکانی ئەم گروپە و کەسانی دیکەش (دکتۆر مەحمود عوسمان و سامی عبدولڕەحمان..هتد)، دەچێتە خانەی هەوڵدان بۆ خۆدەربازکردن لەژێر باری لێپرسراوێتیی هەرەس و خۆپاکژکردنەوە لە هەر هەڵە و هەڵویستێکی سیاسی و چەکدارانەی نالۆژیک و نەگونجاوی بزووتنەوەی ئەیلوول کە دەرئەنجامی ئەرێتی و خراپیان لێ کەوتنەوە. ئەمان، باری گلاوی شۆڕشیان لە ئەستۆی بارزانی و ماڵباتەکەی دەدا و وەکو لێپرسراوی پلەیەکی شکستەکەیان دەناساندن. ئەم گرووپە، لەم بۆچوون و تێڕوانینەیاندا، لەگەڵ کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانیدا یەکیان دەگرتەوە. ڕۆژگاری هەرەس، بۆ بەشێک لە لێپرسراوەکانی بزووتنەوەی ئەیلوول، ڕۆژگاری پێستداماڵین و کارژەهەڵدان و دەنگ و ڕەنگگۆڕین بوو!
هەندەک بۆچوونی بێبەڵگە هەن، وای بۆ دەچن، کە گرووپی سەر بەباڵی «م س»ی نێو بزووتنەوە، هەر لەسەرەتای کارەوە، پرسیان بە مامجەلال و دەستەی دامەزرێنەی یەکێتی کردبێت و ڕەزامەندیی ئەوانیان بۆ دامەزراندنی وەها ڕێکخراوێک وەرگرتبێت. تەنیا شتێک ئەم بۆچوونە پشتڕاست بکاتەوە، سات و وەختی دەرچوونی بزووتنەوەیە لە یەکێتی و پێکهاتەکەیەتی، پاشی کارەساتی هەکاری.
کارەساتی هەکاری، بۆ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، گورزێکی کوشندە و شکستێکی سیاسی و چەکداری بوو. هەندێک لە سەرکردە دیار و جەربەزەکانی بزووتنەوە «باڵی م س»، بە دەستی هێزەکانی پارتی، دیل کران و پاشان ئیعدام کران. لەناوچوونی ئەم سەرکردە و کادرانە، هاوسەنگیی هێزی لە نێو بزووتنەوەدا لاسەنگ کرد. بزووتنەوەی پاش هەرەسی هەکاری، زۆرینەی کادر و سەرکردەکانی، بە ڕەچەڵەکی سیاسی، دەچوونەوە سەر باڵی مەلایی لە بزووتنەوەی ئەیلوولدا. ئەم بزووتنەوەیە، ئەگەرچی هێشتا مەودایەکی فیکری و سیاسیی لە نێوان خۆی و پارتیدا دەبینی، لەگەڵ یەکێتی و کۆمەڵەشدا، زەمینەی فیکری و سیاسیی هاوبەشی نێوانیان، دەهات کەلێنی هەراوتری تێ دەکەوت. دەبێ بڵێم: ئەگەر کارەساتی هەکاری بەو جۆرە نەبایە و ڕێبەرانی بزووتنەوە و یەکێتی، ((عەلی عەسکەری، دکتۆر خالید، شێخ حوسێن باباشێخی ئێزدی)) و کادرانی دیکەش مابان، مەسەلەی

جیابوونەوەی بزووتنەوە، وەها ئەنجامدەکەوتەوە و ئەگەریش رووی دابا، ئەو کارکردەی لەسەر ریزەکانی یەکێتی دەبوو!

ئەو سەرکردە و کادرانەی بزووتنەوە کە ئالآی جیابوونەوەیان هەڵکرد و بەکردەوەش جێبەجییان کرد، شتاقیان سەر بە باڵی (م س)ی نێو بزووتنەوە نەبوون:

رەسوڵ مامەند، تایەری عەلیی والی بەگ، سەیدکاکە، قادرعەزیز، حاجیی حاجی برایم، مەلاناسیح، حەمەرەحیم، عادیل موراد، عەدنان موفتی و لە کۆمیتەی ئامادەیی پارتی دیموکراتی کوردستانیش، دکتۆر مەحمود و قادرجەباری. ئەم دوو باڵە، پاشتر یەک دەگرن و

حیزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان، دروست دەکەن.

## کێشەکانی پێش دووکەرتبوون
## (جیاوازی لە فیکر و تێڕوانیندا!)

_ کۆمەڵە و بزووتنەوە، وەک دوو باڵی سەرەکیی نێو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، دید و تێڕوانینیان لەمەڕ شۆڕش و بزووتنەوەی چەکداری، جیا و دوورلەیەک بوون.
کۆمەڵە، پێی وابوو شۆڕشی درێژخایەن، پێویستی بە هێزێکی کاکڵەی کەم و پوخت هەیە. ئەم هێزە چەکدارە، لە بەردەوامیی پرۆسەی بزووتنەوەکەدا، بە کاوەخۆ، لە ڕووی چۆنایەتی و چەندایەتییەوە، گەشە دەکات و دەبێتە ناوکی لەشکرێکی گەلیی شۆڕشگێڕ کە پێبەپێی قۆناغە جیاوازەکانی شەڕی ڕزگاریی نیشتمانی، دەبێتە هەوێنی ڕەخساندنی زەمینەی شۆڕشێکی سەرتاسەری لە ئێراقدا و بزووتنەوەکە بە ئامانجی خۆی دەگەیەنێت. کۆمەڵە، بەم میتۆدە کاری دەکرد و هێزی بنچینەییشی، کەسانی خوێندەوار و ڕۆشنبیری شارەکان بوون کە لە بواری سیاسی و چەکداریدا، ڕۆڵی ڕێبەرایەتییان دەبینی.
سەرکردایەتیی بزووتنەوە، تێگەیشتنیان بۆ هێزی چەکدار، لەم ڕوانگەیەوە بوو:(کۆکردنەوەی هەرچی و هەرچۆن دەکرێت، کۆوەی بکە! تا دەبێتە هێزێکی قەبە و فشار بۆ ڕژێم دەهێنێت و ناچاری دەکەیت، پاشەکشێ بکات و دەرکەیەک بۆ دانووستاندن و گفتوگۆ واڵا بکات). بەشی زۆرینەی هێزەکانی بزووتنەوە، لە کۆکردنەوەی چەکدارانی عەشیرەتەکاندا بوو، کە لە ڕۆژگارە ناستەنگەکاندا، بە کۆمەڵ تەسلیم بە ڕژێم دەبوونەوە و سەنگەریان چۆڵ دەکرد. کۆمەڵە، دژبەری ئەم بۆچوونەی بزووتنەوە بوو. مامجەلال، بە جۆرێک لەگەڵ ئەم میتۆدەی حەشامات کۆوەکردندا بوو. مامجەلال، لە ساڵانی دواتردا و کاتێک دەستی ئاوەڵاتر و فشاری کۆمەڵەی لەسەر کەمتربوو، هەر ئەو کارەی کرد کە سەرانی بزووتنەوە لە سەرەتادا دەیانکرد.
_ دابەشاندنی پۆست لە دەسگا سەرکردایەتییەکانی یەکێتیدا، کێشەیەکی دیکەی نێوان کۆمەڵە و بزووتنەوە بوو.
سەرکردە و لێپرسراوەکانی کۆمەڵە، زۆربەیان لە بزووتنەوەی ئەیلوولدا، شوێن و پێگە و جێگایەکی دیاریان نەبوو. ئەوان، تێکۆشەرانێک بوون، لە بزووتنەوەیەکی نوێدا و لە ماوەی دووسێ ساڵێکدا، لە سۆنگەی توانا و جەربەزەیی و لێهاتوویی خۆیانەوە، بەناوێ بوون و لە بزووتنەوەکەدا و لەنێو جەماوەریشدا وەکو سەرکردەی مەیدانی، ناسران.
سەرکردەکانی بزووتنەوە، بە پێی پێشینە و ناوبانگی خۆیان، ڕێبەرانی کۆمەڵەیان بە سادە و

کەمئەزموون و مناڵومەزم، چاو لێ دەکرێن.
کۆمەڵە، کە سەرچاوەی لەنۆژەن دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری بوو، سەرکردەکانی، بە دابەشکردنی پەنجا بە پەنجای پۆستە گرنگەکانی نێو یەکێتی لەگەڵ بزووتنەوەدا، رازی نە دەبوون و لەمەشیاندا، لەسەر هەق بوون. بزووتنەوە، ئەگەرچی حەشاماتێکی لە دەور بوو، بەڵام لە رووی جۆنایێتییەوە، هاوتای کۆمەڵە و رێکخستن و هێزەکانی نەدەوەستا!

_ مامجەلال، سکرتێری یەکێتیی نیشتمانی و لە لوتکەی هەرەمی دەسەڵاتدا رۆ نیشتبوو. چۆنییەتی مامەڵەکردنی مامجەلال لەگەڵ لایەنەکانی نێو یەکێتیدا، رۆڵی گرنگی لە پێشهات و گۆڕانکارییە نێوخۆییەکاندا دەبینی. پاش کارەساتی هەکاری و لەنێوچوونی بەشێک لەو کادرانەی بزووتنەوە (عەلی عەسکەری، دکتۆر خالید و «شێخ حوسێن»...) کە کۆڵەکەی فیکر و دەسەڵاتی مامجەلال بوون لە نێو بزووتنەوەدا، ئیدی مامجەلال، هەم بەلای کۆمەڵەدا دایدەشکاند و هەمیش لە هەوڵی گەشەپێدان و بەهێزکردنی (خەتی گشتی/پان)دا بوو. ئەوەشمان لەبیر بێت کە مامجەلال، لە سەرەتای هەفتاکاندا، دەستپێشکەر و دامەزرێنەری کۆمەڵە بوو.

_ ئاڵوگۆڕەکانی کوردستان و نێوچەکە: سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران، هەستانەوەی بزووتنەوەی سیاسی و چەکداری لە رۆژهەڵاتی کوردستان، لەبەریەکهەڵوەشانی (بەرە پێشکەوتووخوازەکەی نێوان بەعس و حشع) و رووبەشاخکردنی ئەندامانی حشع، ژیانەوە و خورتبوونەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان و پووچەڵبونەوەی خەونێک لەمەڕ ئیفلیجبوونی پارتی و ماڵباتی بارزانی لە قەیرانی هەرەسدا!، ئەو فاکتەرە گرنگانە بوون کە رۆڵی کاریگەریان لەسەر دۆخی ئەوێ رۆژێی بزووتنەوەکە دانا و زەوینەی ململانێکانیان بەرینتر کرد.

_ درێژەکێشانی شەڕی نێوان یەکێتی و پارتی...
ئەو باڵەی بزووتنەوە، کە پاشی کارەساتی هەکاری مابوونەوە، ئەگەرچی بەشێک لە سەرکردەکانیان بە دەستی «ق م» ئیعدام کرابوون، دیسانیش ئەو شەڕەیان بە شەڕی خۆیان نەدەزانی. بەلادانەکەوتن و درێژەکێشانی شەڕی نێوخۆ، یەکێک لە بیانووەکانی بزووتنەوە بوو، تا لە تەلاری یەکێتی دەربچن و خۆ لە بازنەی شەڕەکە دەرهاوێن، کەچی ئەوان بەو هەڵوێستەیان، دەرگایەکی دیکەی خوێناوییان کردەوە و باڵای برینەکەیان بڵندتر کرد!
ئەمانە فاکتەرە گرنگەکانی جیابوونەوەی باڵی بزووتنەوە و کەرتبوونی یەکێتی بوون، لە رۆژگار و

سەردەمێکدا کە سەنگەری سیاسی و چەکداریی یەکێتی و بزووتنەوەی کورد، جارێ تۆکمە و بەهێز نەبوون.

ئەگەر قوڵتر رۆبچین، دەشێ بڵێین: هۆکاری بنەڕەتی، لە مێژووی پەرتبوونی بزووتنەوەی کوردیدا، پێکەوەنەسازان و هەڵنەکردنی کەسەکان، دەسکەوت و بەرژەوەندییەکان، دەسەڵات و پۆستەکانی، پێشینە و باکگراوندی سەرکردە و کادرەکانن، جیاوازیی فیکر و تێڕوانینەکان کەمتر رۆڵیان لە پرۆسەی پەرتبووندا هەبووە!

جیابوونەوەی بزووتنەوە، لە لۆژیکی خەباتی شاخدا، قبووڵ نەدەکرا. سەنگەرەکان نەیاندەتوانی بە ئاشتی پێکەوە هەڵبکەن. بەرەی شەڕی نێوخۆ فراوانتر و تێشەکانی ناپاچین خوێناویتر بوون. هاوڕێ و هاوسەنگەرە شۆڕشگێڕەکانی رۆژی پێشوو، لەگەڵ زەنگی شوومی جیابوونەوەدا، بوون بە: ناشۆڕشگێڕ، کافر، لادەر، شۆڤار و گەجەروگوجەری نێو بزووتنەوەی کوردایەتی!

مەخابن! ئێمە و ئەوان، بڵندگۆی پەخشاندنی ئەو تۆمەت و پاساوە نامەنتیقییانەی جیابوونەوەی خوێناوی بووین. ئێمە، هەمووومان لە هەمبەر بەزاندن و رووشاندنی حورمەتی یەکێتی، لەلایەن بزووتنەوەوە، لە لوتکەی «مامەندە» رژد و سەختتر بووین.

# دیداری سکرتێرەکان!

لە «شێنێ»وە بۆ «زەڵێ» و بە هەورازێکدا، هاوڕێی مەلابەختیار، بۆ «نێوزەنگ» و دیداری هەردوو سکرتێر (مامجەلال و نەوشیروان مستەفا)، سەردەکەوین. یەکەم ڕۆژی بەهارە و ئەم دەفەرە، هێشتا سپی وەک چۆڕی شیر. جارێ کوێستان خاڵی ڕەشی تێ نەکەوتووە، جارێ بەفر بێخەم بۆخۆی لێی خەوتووە!

سەرم پڕ پڕ لە خەیاڵ و وێنەی مامجەلال و ماڵ و بارەگای ئەو. من، پێشتر، تەمەنم بواری بینینی چ سەرۆکێکی بزووتنەوەی کوردی بۆ نەڕەخساندبووم، یان سرووشت و خەسڵەتی بزوتنەوەکە، بەتایبەت بزووتنەوەی ئەیلوول، ئەو دەرفەتەی بۆ کەمکەس ڕەخسانبوو. ئاخر زۆر کەمبوون ئەوانەی بە درێژایی ١٤ساڵ لە تەمەنی بزووتنەوەی چەکداریی ئەیلوولدا، شانسی دیداری مەلامستەفای بارزانیان پێ براببوو. من، ساتێ مێردمنداڵ بووم، مامجەلالم جارێک لە هەڵەبجە، لە دوورەوە دیتبوو. ساڵی ١٩٦٥، ساتێ لەگەڵ هاوڕێکانیدا، لە ئێران گەڕانەوە و لەگەڵ بارزانی و سەرکردایێتیی شۆڕشدا ئاشتبوونەوە. پاشتر، لە ڕۆژگاری دووکەرتبوون و جەلالی و مەلاییدا، من چوون کاکم جەلالی بوو، وەکو سیمبولێکی پیرۆز لە مامجەلالم دەڕوانی. ڕۆژگار ڕۆشت و من هەراشتر. سەرتای هەفتاکان و گروگاڵی خوێندنەوە و ختووکەدانی سیاسەت، ئیدی من، لە میانەی نووسین و کتێبەکانی مامجەلالەوە، کەوتمە نێو دنیای فیکری ماوتسی تۆنغ و شۆڕشی درێژخایەن. ئێستا، من بە ڕێگاوەم بۆ دیداری سەرکردەیەک، کە ساڵانێکە لە دووتوێی کتێبەکانییەوە، خەونی بینینی، بۆ من، خەونێکی گەورەیە!

من، پێشمەرگە، کادری کۆمەڵە و گەنجێکی خوێنگەرم کە پێم وایە سەرکردەکان، لەگەڵ هەلومەرج و قۆناغە نوێیەکاندا، کارژی فیکر، بیرکردنەوە، هەڵسوکەوت و مامەڵەی خۆیان لەگەڵ ڕووداوەکاندا فڕێ دەدەن و لە سەردەمی نوێ و شۆڕشی نوێدا، لەنۆژەن لەدایک دەبنەوە!

من، پێم وابوو، هەرەسی ئەیلوول و زەردەپەڕی خۆری بارزانی، دەستپێکی سەردەمێکی نوێ، ڕێبازێکی نوێ و لەدایکبوونی «ماو»ێکی نوێی کوردییە! ئێستا من بۆ ماڵ و دیداری «مائۆ»ی کورد بەڕێگاوەم!

لە ملەی شاخەوە دادەگەڕێین. خڕینێوزەنگ، دۆڵێکە لە نێوانی سێ شاخدا. سێ کەرتەشاخ لە دامێنی «مامەندە»دا، دەستیان لە کەمەری یەکدی وەرهێناوە و ئامێزیان بۆ کۆمەڵێک سەرکردە واڵا کردووە کە لەوێوە چارەنووسی بزووتنەوەی میللەتێک بڕیار دەدرێت.

ئێستا، بە دامێنی کەرتەشاخانەوە، سێ تا چوار خانوو دەبینرێن کە زیاتر بە کێڵەباخ دەچن. لە

بەردەمی هەریەک لەو کوختانەدا، چادریک یان دووان هەڵدراون.
ئێمە لە دابەزیندا، بەرەو لای راست لا دەدەین و لەبەر کوختێکدا دەوەستین کە دوو تاوڵی سپیی لەبەردەمدایە. ئێرە بارەگای مامجەلالە. خێمەکان، شوێنی پێشمەرگەی پاسەوان و خواردنسازکردنن.
مامجەلال، وەک نەریتی هەمیشەی، دێتە بەردەرگا و بەخێرمان دەهێنێت، لەئامێزمان دەگرێت، ماچمان دەکات و بۆ ژوورەوە فەرموومان لێ دەکات. ژوورێکی ئاسایی سێبەچوار، فەرشێک و چەند پەتوویەک راخراون، دەرگایەک و پەنجەرەیەکی بە نایلۆن گیراو، مێزێکی چکۆلە چەند رۆژنامە و پەڕەکاخەزی لەسەرن.... مامجەلال، بەرگی خاکیی لەبەردایە، کڵاوی لەسەردایە و جامەدانی دا. ئەو پۆشتە و ریشتاشراو، بە دوو چاوی بزۆز و تیشکبارەوە بەرانبەرمان دانیشتووە و لە پەسا پرسیارمان لێ دەکات و دەیەوێت لە زاری ئێمەوە، لە دۆخی شۆڕش و یەکێتی لە ناوچەی هەڵەبجە و هەوراماندا، بگات.
من، لەسەرخۆ وەڵام دەدەمەوە و باسی رێکخستن، ژمارە و وورەی مەفرەزەکان، جەماوەر و پەیوەندییەکان، گرفت و کێشەکانی بۆ دەکەم. مامجەلال، هێمن و بەتاسەوە گوێم بۆ رادەدێرێ... پاشان بە پشوویەکی درێژەوە، قسانمان بۆ دەکات و دۆخی ئێراق، ئێران و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی ناوچەکەمان بۆ شیدەکاتەوە... ئەو بە جۆرێک گەشبینە، ترۆپکی سەرکەوتنت لە ئاوێنەیەکی رۆشندا، نیشان دەدات!
پێشمەرگەیەک، لەسەر سینییەکی چکۆلە چامان لە «کوپ»ی فافۆندا بۆ دەهێنێت.
چا دەخۆینەوە و ماڵئاوایی لە مامجەلال دەکەین و بە هەورازەکەی ئەوبەردا، بۆ بارەگای سکرتێری کۆمەڵە سەردەکەوین. لە سەردانماندا بۆ لای نەوشیروان، تەنیاین و مەلابەختیارمان لەگەڵ نییە!
نەوشیروان ناوێکە، من لە کۆتایی شەستەکانەوە و لە گۆڤاری «رزگاری»یەوە دەیناسم. ئەو سەرنووسەر و سەرچاوەی فیکر و تێمای سیاسیی گۆڤارەکە بوو. من، ناوی هەر کەسێک دەبیستم، وێنەیەک لە شێوە و رووخساری ئەو، لە هزرمدا وێنا دەکەم.... پیاوێکی میانەباڵای سوورروسپیی تێکسمڕاو لە ژوورێکدا دانیشتووە.. رووگەش و دەمبەخەندە، کاسکێتێکی خاکیی بە وێنەی جیڤارا و ئەستێرەی سووری پێنجگۆشە نەخشێنراو لەسەرناوە! دیوارەکانی ژوورەکە، بە پلاکات و پۆستەری رێبەرانی بزووتنەوەی کرێکارانی دنیا، داپۆشراون....
_ بەخێر بێن! فەرموون!
_ دەچینە لای کاک نەوشیروان!
_ پێشمەرگەی کێن؟... لە کوێوە هاتوون؟
_ پێشمەرگەی کۆمەڵەین... لە ناوچەی هەورامانەوە...

پێشمەرگەی پاسەوان، وەژوور کەوت و یەکسەر وەدەر کەوتەوە و فەرمووی لێ کردین...
سڵاومان کرد. بەخێری هێناین و دەستی گووشین. پیاوێکی باڵابەرزی ئەسمەری داڵگۆشت، چوارمشقی لەپشت مێزێکی زۆر نزم و چکۆلەوە، بەرانبەرمان دانیشتەوە و بۆ ساتێک بە کاخەزەکانی سەر مێزەکەوە خۆی خەریک کرد و پاشان لەگەڵ ئێمەدا، دەستی بە گفتوگۆ کرد. پەرپووتیی ژوورەکە سەرنجی راکێشام. دیوارەکان رووت و هیچ پۆستەریان پێوە نەبوون. دیوارەکانی ژوورەکە بە وشکەکەڵەک درووست کرابوون. لە رووی ناوەوە سواخ نەدرابوون. بەڵام بە نایلۆن رووپۆش کرابوون. «با»ی سارد دەهاتە ژوورێ و نایلۆنەکانی پف دەکردن. ژوورەکە، بە رۆژی رووناک، تاریک و چرا هەڵکرابوو!
نەوشیراون، وەکوو سکرتێری کۆمەڵە، کەمتر هەواڵی کارەکانی کۆمەڵەی لێ پرسین و زیاتر بەدوی هەواڵی رێکخستنی یەکێتی و دۆخی پارتیزانان و ژمارەیان کەوتبوو. ئێمە وەکوو پێویست، وێنەیەکی گشتیی بارودۆخەکەمان نیشان دا. ئەو، پێچەوانەی مامجەلال، رووگەش و دەمبەزە نەبوو، بگرە تاڕادەیەکیش مۆن و توورە بەدیار دەکەوت. ساتێ ئەو، رووی پرسیاری لەمەڕ راکردنی دیلێکی «ق.م»ی، لای ئێمە تێ کردین، ریتمی دەربڕینەکەی توورەئامێز بوو....
_ نەدەبوو لە دەستتان هەڵبێت!
_ لە شەڕدا هەڵات!
_ چەند لاتان مایەوە!
_ زیاتر لە دوو مانگ! لە نەبوونی بارەگا و زیندان و راکەڕاکەی پێشمەرگەدا، دیلڕاگرتن ئاسان نییە... جگە لەوەی کە پەیوەندیمان لەگەڵ سەرکردایەتیدا پچڕا بوو، خۆشمان نەماندەتوانی بڕیارێکی لێ بدەین!
_ بڕیاری سەرکردایەتی نەدەویست. ئێوە دەتانتوانی سزای بدەن! بەڵام ئێوە بیرتان لە مەسەلەی خێڵ و تایبفەکەی کردووەتەوە... ئێوە ترسنۆکن!
راستییەکەی، ئێمە نە ترسنۆک بووین و نە حیسابمان بۆ خێڵ و عەشرەت دەکرد. ئێمە ئەو خوێندەوارانەی کۆمەڵە بووین، کە هەموو شتێکمان بە شۆڕش بەخشی بوو... ئێمە بە هیوای سەردەربازکردن نەبووین. ئاخر ئەو رۆژگارە سەخت و دژوارانە، جگە لە شەهیدبوون، هیوای ژیانیان تێدا نەدەبینرا.٠
من و لەتیف، بە نیوەدڵشکاوی ماڵئاواییمان کرد و بۆ «شێنێ» گەڕاینەوە...
لە رێگادا، من بێدەنگ و قسەکانی نەوشیروانم وەها تەفسیر دەکردن: (ددان بە ددان و چاو بە چاو!)، ئەمە لۆژیکی خەباتی شاخ بوو. ئەو، تۆ دەکوژێ، دیلت دەکات و ئیعدامت دەکات، ئەدی تۆ بۆ

نایکەیت؟! تۆ، لە جەنگەڵی پڕ دڕندانەدا، دەتەوێت وکوو «عیسا» رەفتار بکەیت!. دیارە کە کەوڵت دەکەن!

من، لە هەڵوێستی خۆم ژیوان نەبووم. من، لە نێوان بەرداشی دەستهاڕێکدا. ڕۆحم دەهات هەپرون دەبوو! ئێمە و ئەوان، چ تاوانێکمان نەبوو! ئێمە، هەموومان لەو دۆزەخی کوردکوشتنەدا، گوناه بووین.

پاش یەکەم دیدار و لە ماوەی دەساڵی خەباتی شاخدا، دەیانجار سکرتێری کۆمەڵەم بینی. دەیانجار قسەوباسمان کرد، لەسەر سفرەیەک نانمان خوارد، لە بارەگای ئەودا ڕۆژم کردەوە و هەرگیز بەو تۆن و ریتمە نەیدووانەم و ڕووی لێ گرژ نەکردم. بەڵام یەکەم دیدار و ژووان، زۆر شت لای مرۆڤ بەجێ دێڵێ. ئەو وێنانەی لە یەکەم پەیڤیندا دەنەخشێن، سڕینەوەیان ئاسان نییە. مرۆڤ، پێشنەوەی هەرشتێک بێت، پێکهاتەیەکی پێچەڵپێچە لە هەست و سۆز. ساتێ لەخۆڕا سۆزت بڕووشێنن و هەستت بریندار بکەن، بە ناڕەوا وێنەیەکی تڵ بەخۆتت بەسەردا بسەپێنن، ئیدی ناچار بە پەرچەکردار و دژههەڵویست دەبیت. ئەوەی کە من، لە درێژایی بگرەوبەردە و ململانێکانی هەناوی کۆمەڵەدا، لە سەنگەری ئەوبەری ڕێباز و تێڕینی فیکری و سیاسیی ئەوشیروان کەوتم، دەشێت «بەشێک»ی باریکی ریشەکەی لە کەناری ئەو یەکەم دیدارەدا چەقی بێت! دەڵێم بەشێکی گچکە، دەنا خودی ئەوشیروان خاوەنی تێڕین و دنیابینییەکی تایبەت بوو لەمەڕ کۆمەڵە، شۆڕش، بزووتنەوەی کۆمۆنیستی و دیاردە و دەرکەوتە جیهانییەکان کە لەگەڵ بۆچوون و تێگەیشتنی بەشێکی کادرانی ئەوێ ڕۆژێی کۆمەڵەدا یەک نەدەکەوتن و سەروکاریان لەگەڵ کێشە و گرفتە تیوری و فکرییەکانی کۆمەڵەدا هەبوو!

ئەوشیروان، کەسێکی بەئەزموون و سیاسییەکی مونەوەر بوو. ئەو سیاسەتمەدارێک بوو، خاوەن فیکر و دنیابینی و بەرنامەی کاری سیاسیی تایبەت بەخۆی. ئەو، بە درێژایی ئەو ساڵانەی خەباتی شاخ، بە پشوویەکی درێژەوە، کاری بۆ جێکەوتنی تێڕینەکانی خۆی دەکرد. ئەوشیروان مستەفا، لە گفتوگۆ و دیالۆگدا، کەسێکی کەمدوو، قسەلەڕوو، هەندەک جاریش توند و ڕووشکێن بوو. ئەو، سەرکردەیەکی خاکی، بێفیز و دەعیە بوو. لەژیاندا سادە، لە جلوبەرگ و پۆشاکدا لە سادە سادەتر و ئەم خەسڵەتانەیشی تا ڕۆژگاری ئێستا و دەورانی دەسەڵات و دەرکەوتنی فیرعەونەکانیش، هەر وەک خۆیانن و زۆر نەگۆڕاون. ئەو سەرکردە و لێپرسراوانەی کە لە شاخ و لەو هەلومەرجە سەختەی ژیانی پێشمەرگایەتیدا، شێتی جوانترین شتە جوانەکان بوون... جوانترین «کڵاشینکۆف، دەمانچەی سیمس، لاندکرۆزەر، شاڵ و کڵاشی هەورامان، ئاتاژی نێوماڵ»، لە ڕۆژگاری ئازادی و دەورانی دەسەڵاتی پاش ڕاپەڕیندا، بوون بە خۆرەی گەندەڵی و تا سەرئێسک دەسگاکانی دەسەڵاتیان ئیفلیج کرد.

مەلابەختیار پرسیاری کرد: دیدارتان لەگەڵ کاک ئەوشیروان چۆن بوو؟!

ـ باش نەبوو... پیاوێکی زۆر توورەیە! هەر لەخۆڕا و لەسەر کێشەیەک کە تۆ ئاگاداریت، خۆی لێ قەڵس کردین.

ـ گوێی مەدەنێ و لەدڵی مەگرن... ئەو هەروایە!

هەستم کرد، ئەوانیش دانوویان پێکەوە ناکوڵێ!

ئەو شەوەشمان لە «شێنێ» بە ڕۆژ کرد و بەیانی، بە کۆڵێک ڕۆژنامە و بڵاوکراوەی یەکێتی و کۆمەڵەوە، ڕێگامان بۆ «سەردەشت» گرتە بەر. لە سەردەشتەوە، هاوڕێی چەند پێشمەرگەی تر، بەرەو «بانە» و پاشان «مەریوان» ڕۆیشتین.

# شەڕی دزڵی

هەواڵی هێرش بۆ «دزڵی» و شەڕی نێوان هێزەکانی یەکێتی و ق.م لە ناوچەی هەورامان، زارەوزار لە نێو خەڵکی مەریواندا هەڵدەفڕی و دەنیشتەوە! ڕۆژنامەکانی «کەیهان» و «ئیتلاعات»ی ئێرانی، بە مانشێتی دیار و دەرکەوتوو، هەواڵی جەنگی خوێناویی «ئەفرادی تاڵەبانی» و «بارزانی»یان لە ناوچەی «هەورامانات» بڵاوکردبووەوە.
دزڵی، شارەدێیەکی گەورە لە نێو دڵی شاخاویی هەوراماندا هەڵنیشتووە و پێشتر موڵکی جافرسوڵتانی لهۆن بووە و تا ئەو ڕۆژگارەش، ئەوڵاخانی کوڕی سان، کۆشک و سەرایەکی لەوێ هەبوو. دواژنی «خان»، لە شێخانی عەبابەیلێ»یە و کچی شێخ کەریمە، کە دەبێتە پوری ئێمە.
ئێمە گەیشتینە مەریوان و هەواڵی کۆتاییهاتنی شەڕ گەیشت، بەڵام جارێ هەموو هێزەکانی یەکێتی هەر لە دزڵی و ناوچەی هەوراماندا بوون.
لە مەریوانەوە سواری ماشێنێک بووین و بەرەو دزڵی ڕۆیشتین. لە ڕێگادا، یەکێک لەو کادرانەی لەگەڵماندا بوو، چۆنییەتی دەستپێکردن و پاساوی شەڕەکەی بۆ باس کردین...
چەندرۆژێک پێشتر، مەفرەزەکانی«ق.م» لەسەر ڕێگای مەریوان _ دزڵی، چەند کەسێکی سەر بە «کۆمەڵەی جووتیاران» دەگرن و دەیانبەنە پاسگای دزڵی و زیندانیان دەکەن. کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران، کە هێزی چەکداریان بە نێوی «کۆمەڵەی جووتیاران»ەوە هەڵدەسووڕا، هانا بۆ یەکێتی و کۆمەڵەی مارکسیی_ لینینیی ناعۆزا دەبەن و داوای یارمەتییان لێ دەکەن. هێزەکانی یەکێتی، بە هانای کۆمەڵەوە دەچن و دیلەکانیان ڕزگار دەکەن و لە ئەنجامی شەڕێکی خوێناویی شەووڕۆژیدا، دزڵی و ناوچەی هەوارمان لە هێزەکانی «ق.م» پاک دەکەنەوە!
چیاکانی دەوری دزڵی، لوتکەیان لە دڵی ئاسمان سمیوە. ڕێگاکە، بە دەربەندێکی تەنگ و ڕژدا بە نێوی دەربەندی دزڵی، خۆی لە گەرووی چیاکان دەخزێنێ و دەگاتە هەناوی دزڵی.
دزڵی، لە پێشمەرگەی یەکێتی جمەی دەهات. ژمارەی هێز و چۆنایێتییان و ئامادەبوونی بەشێکی زۆری کادرە عسکەرییەکان و دوو ئەندامی سەرکردایێتیی یەکێتی (سالار عەزیز و بەکری حاجی سەفەر)، هۆکاری شەڕەکەیان لەو پاساوە ئەولاتر دەبرد.
شەڕەکە پێشتر پلانی بۆ دارێژرابوو. هێزەکانی یەکێتی، وێڕای جیابوونەوەی بزووتنەوە لە سەرەوە، شەڕەکەیان لە خوارەوە، پێکڕا و بەیەکگرتوویی ئەنجام دا. هێزەکانی هەرێمی یەکی شارەزور (حەمەی حاجی مەحمود و شەوکەتی حاجی موشیر)، هەرێمی دوو، هەرێمی سێ و چوار(جەمالی عەلی باپیر،

ئەنوەری مەجیدسوڵتان، عوسمانی قادرمونەوەر) و زۆر کادری دیکەش کە پاش ئەم شەرە، بەرەی بزووتنەوە و یەکێتییان لێک هەڵاوارد.
دزلی، لە سەر درێژایی سنووری نێوان رۆژهەلات و باشووری کوردستان، تەنیا پێگەیەکی «ق م» بوو کە لەوێ را مەفرەزەکانیان دادەبەزینە نێوچەکانی شارەزوور، شارباژێر، هەڵەبجە و هەوارمان و لەمپەریکیشی بۆ هاتوچۆی هێزەکانی ئێمە، لە نێوان ناوچەکانی هەڵەبجە و پێنجوێن، بە دیوی رۆژهەلاتدا دروست کردبوو. پاشی گرتنی دزلی، هێزەکانی «ق م» بۆ قولایی گوندەکانی هەورامانی رۆژهەلات و بەشێکیشیان بۆ ناوچەی «باوەجانی» و «درۆڵە» پاشەکشەیان کرد. لەو شەڕەدا، هەندێک کادر و پێشمەرگەی «ق م» بەدیل گیران و رەوانەی سەرکردایەتیی یەکێتی کران کە پاشتر لەگەل «حامیدی حاجی خالید و عەلی شێعە» کە لەسەردەمی «هەکاری»یەوە دیل بوون، ئاڵوگۆڕیان پێ کران.
هێزەکان بڵاوەیان کرد. ئێمە لەگەڵ هێزەکانی هەرێمی یەکدا، گەڕاینەوە مەریوان و پاشان بەرەو شارباژێر رۆیشتین.

# بزووتنەوەی چەکداری،
# سیاسەتمەداری نەخوێندەوار بەرهەم دەهێنێت!

هەرێمی یەک، یەکێک لە هەرێمە بەهێزەکانی یەکێتی و پانتایی ململانێی نێوان کۆمەڵە و بزووتنەوە، کۆمەڵە و لێپرسراوەکانی دەرەوەی کۆمەڵە بوو. هەرێم، هێشتا هەر لیژنەی هەرێم بەڕێوەی دەبرد و فەرماندەیەکی دیاریکراوی نەبوو. شەوکەتی حاجی موشیر، حەمەی حاجی مەحمود و رەوفی خەلیفەسەعید لە پێشبڕکێی وەرگرتنی دەسەڵاتی هەرێمدا، لە ملانێیەکی سەختدا بوون.
جیابوونەوەی بزووتنەوە و ئەوەی کە شەوکەتی حاجی موشیر لای ئەوان گیرسایەوە، ملانێکەی خاوکردەوە و رێگای بۆ حەمەی حاجی مەحمود هەموار کرد. کادرانی کۆمەڵە، لە نێوان شەوکەت و حەمەدا، هەمیشە لایەنگری حەمە بوون و ئەمیان پێ شایستە و شیاوتر بوو. حەمەی حاجی مەحمود، لە دیدی کادرانی کۆمەڵەوە، کادرێکی عەسەکەریی چالاک و بەتوانابوو، کەسێکی نەرم و لەسەرخۆ کە مامەڵە و هەڵسوکەوت لەگەڵیدا هاسان و بێگرفتتر بوو. دیسانیش کەسایەتییەکی عەشایەر و دەرکەوتووی ناوچەکە بوو. خەسڵەتی عەشایەریی حەمە، بە ناچاری هەندەک کاری پێ دەکرد و کەسانێکی وای لە دەور کۆدەکردنەوە کە لە ژێر چەتری دەسەڵاتی ئەودا، کاری ناشایستە و خراپیان ئەنجام دەدا. هەرچەند ململانێی نێوان ئێمەی کۆمەڵە و حەمە توندتر دەبوو، دەرفەت بۆ کەسانی پۆخڵەوات و بێکەڵک زیاتر دەرەخسا و کاری بێسەروبەر و راوڕوتکردن زێتر دەبوون.
ئەوەی کە گرفتەکانی نێوان کادرانی کۆمەڵە و «حەمە»ی قووڵتر دەکردەوە، ئەوەبوو کە:
_ هێزی پێشمەرگەی هەورامان وەکو بەشێک لە هەرێمی یەک، سەرپاکی کادر و پێشمەرگەکانی کۆمەڵە بوون و «حەمە»ش کە جارێ فەرماندەی هەرێم نەبوو، لەهەوڵی دروستکردنی پێگە و چاوی «خەتی گشتی»دا بوو.
_ لە شارەزووردا، کۆمەڵێک کادری دیار و لێوەشاوەی کۆمەڵە هەبوون، کە وەکو پێویست بواریان پێ نەدەدرا و کەسانی دیکەی ناشایستە بەسەر ئەواندا پێش دەخران.
_ لە سەردەمی کۆکردنەوەی پارەی ئۆردووگا زۆرەملێکاندا، بە تورەکە پارە کۆدەکرایەوە و سەرفکردن و بەخشینەوەیان روون و ئاشکرا نەبوو. من، کە چەند مانگ پاشتر بوومە رابەری سیاسیی هەرێم و لە نزیکەوە لەگەڵ حەمەدا، کە فەرماندەی هەرێم بوو، کارم دەکرد، دەتوانم بڵێم تا ئەوکاتە و ئەو سەردەمە، خودی حەمە لە هەرجۆرە گومانێکی «پارە» بەدوور بوو. ئەوە کەسانی دەوری ئەو بوون کە بێحیساب پارەیان کۆوە دەکرد و ئەویش لە ئاستیاندا خەمسارد و کەمتەرخەم بوو. حەمە، ئامادە

نەبوو سزای ئەو پێشمەرگە و فەرماندەی مەفرەزانە بدات کە کادرەکان لە دەرەوە و رێکخستنەکانی شار لە ناوەوە، لێیان نارازی بوون و راپۆرتیان لەسەر دەنووسین. یاخود کەسانێک کە لە سۆنگەی پیاوکوژی و کێشەی عەشایریدا، روویان لە شاخ دەکرد و بۆ مەرامی تایبەتی خۆیان دەبوونە پێشمەرگە!

وێڕای ئۆخی گرژیی نێوان کادرانی کۆمەڵە و حەمەی حاجی مەحمود، چ ئەو کات و چ ساتێکیش بوویە فەرماندەی هەرێم. هێشتا «حەمە» لە کەسانی دیکە زیاتر گیانی هاوکاری و دیالۆگی تێدا بوو. ئەو زۆر هێمنانە گوێی دەگرت و گرفتەکانی لەگەڵ کادراندا. تا ئەو جێگایەی کادرەکان زۆریان پێ دانەگرتایە، چارەسەر دەکرێن. حەمەی حاجی مەحمود، هەڵگری خەونێکی گەورە بوو. ئەو، تا ئەو سەردەمە، کە من پێم وانەبوو تاکە کتێبێکی لەسەر سیاسەت یان ژیانی کەسە ناودار و دەسەڵاتدارەکانی دنیا خوێندبێتەوە، هەمیشە لە وەهمی بەپاڵەوانبووندا دەژیا. ئەو کەچەخوێندەوارییەکی هەبوو یان هەر نەیبوو، کەچی پاشتر گۆڤاری دەردەکرد و وتار و لێکۆڵینەوەی دەنووسین! ئەو جارێک لە مەریوان بە منی گوت:(ئێمە دەتوانین«تایپ و رۆنیۆ»یەک بکڕین و وەکو سەرکردایەتی، بەیان و بڵاوکراوە دەربکەین! ئێمە چیمان لەوان کەمترە؟!)

ئۆخی بزووتنەوەی چەکداری و پەرتبوونی هێزەکان، دەستتێوەردانی وڵاتانی ئیقلیمی و جەنگی ئێران/ئێراق و زۆرفاکتەری دیکەی تایبەت بە پێکهاتەی کۆمەڵگەی کوردستان، زەمینەی لەباری خولقاندنی چەندین «پاڵەوان»ی نەخوێندەوار بوون کە پاشتر لە ئۆخێکی وێرانتردا، دەبنە سیاسەتمەداری نەخوێندەوار و چارەنووسی سیاسیی میللەتێک، لە دەستی خۆیان دەنێن! ئەم بۆچوونەی من، تەنیا لەدەوری«حەمە» ناسوورێتەوە و سەروکاری لەگەڵ بونیادی ئەقڵ و ئاوەزی سیاسیی بەشێکی زۆری دەسەڵاتدارانی ئێستای کوردستاندا هەیە کە ئۆخ و هەلومەرجی ئەوسای شاخ، لەسەر تەختی ئێستای سیاسەت جیگیری کردوون و تاجی فەرمانڕەوایی لەسەر ناون. ئەم ئێلیتە سیاسییە ئەقڵشاخاوییە نەخوێندەوارە، سەرئەنجام لە شاردا، بێسەروبەرترین و گەندەڵترین سیستەمی ئیداریی پڕ لە فەوزا دەخولقێنن و حکومەتی ناتامودەسگایی بەڕێوە دەبەن.

## جیابوونەوەی بزووتنەوە و
## دابەشبوونی هێزی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

جیابوونەوەی «بزووتنەوە» و دەرچوونی لە چوارچێوەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، تەلاری ڕێکخراوەیی و چەکداریی یەکێتیی دووکەرت کرد. پاشی کارەساتی «هەکاری»، ئەمە کوشندەترین گورز بوو کە بینای یەکێتیی شەق کرد و سەنگەرێکی دیکەی خوێناویی لەسەر جەستەی بزووتنەوەکە هەڵکەند!

ئەم رووداوە، پارسەنگی تەرازووی هێزەکانی لەسەر جوگرافیای شۆڕشی «نوێ» لەنگ کرد.

لە هەورامان، قەرەداغ ، گەرمیان و دەڤەری کەرکووک، لە سۆنگەی نەبوونی هێز و ڕێکخستنی «بزووتنەوە»دا، شتێک رووی نەدا و کاردانەوەیەک نەبوو. لە شارەزووردا، شەوکەتی حاجی موشیر و چەند کەسێک، ئاڵای «سۆسیالیستیان» هەڵکرد و جاڕی جیابوونەوەیان دا. ئەمانە، چوون کەمینە بوون و ڕۆڵ و کاکردێکیان نەبوو، هەر زوو بایاندایەوە و گەڕانەوە سەنگەرەکانی یەکێتی.

لە شاربازێر، دۆڵێ، بەری کۆیە، خۆشناوەتی و هەولێر، هێزی «بزووتنەوە»، بەهێز و بەرچاو بوون. لە هەندێک ناوچەدا، کۆنترۆڵی تەواویان کرد و کێشەی جددیان بۆ یەکێتی درووست کرد.

نەخشەی ریزبەندیی هێزەکان و هاوپەیمانییەتی و دوژمنایەتییەکان گۆڕانیان بەسەردا هات.

پارتی دیموکراتی کوردستان، سۆسیالیست و پاسۆک دەهاتن ناکۆکییەکانی خۆیان بەلادا دەخستن و لێک نزیک دەبوونەوە. «حشع»، وەکو سیاسەتی هەمیشەیی خۆی، لە نێوەندا جۆلانێی دەکرد. ئەمە سیاسەتێکی باش بوو، ئەگەر بۆی ڕاگیرابا!

پاشی دووکەرتبوون، کردنەوەی پەنجەرە خوێناوییەکان، زەمەنێکی گەرەک بوو. سەرەتا، شەڕی ڕاگەیاندن و زەمینەخۆشکردن بۆ زەبر و خوێنڕژتن! لەو ناوچانەدا، کە هێزەکان تێکلاو بوون، گێچەڵگێڕان و یەکتر تەنگەتاوکردن و پاشانیش ڕاوەدوونان و چەککردن سەریان هەڵدا!

لە هەرێمی یەکدا، لە ئەنجامی تاکتیکی سەنگەرگۆڕینی «شەوکەت»دا، حەمەی حاجی مەحمود بێ ڕکبەر مایەوە و مەیدانی بۆ چۆڵ بوو. زۆری نەبرد، لە ڕێکخستنەوەی هەرێمەکاندا، «حەمە» کرایە فەرماندەی هەرێم، رەوفی خەلیفەسەعید بە جێگر و منیش بە رابەری سیاسیی هەرێمی یەک!

دەبێ ئەوەش بڵێم: لەو زەمان و هەلومەرجەدا، بۆ ئەو پۆستە، کەسێک لە «حەمە»، شایستەتر و بەتواناتر نەبوو.

# کوردستانی رۆژهەڵات و
# سیاسەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان!

بزووتنەوەی سیاسی و جەماوەری لە کوردستانی رۆژهەڵاتدا، دەهاتن بەرینتر دەبوون و سەرجەمی چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکانییان لە خۆیان دەگرت. بزووتنەوەی جوتیاران، لە ناوچەکانی سنە و مەریوان، لەژێر کارکردی سیاسەتی رادیکالانەی ئەوێ رۆژێی کۆمەڵەی زەحمەتکێشاندا، یاخود وەکو چوارچێوە و فۆرمیک بۆ میتۆدی خەباتی ئەو رێکخراوە، هەستانەوەیەکی بەرچاوی بە خۆوە دی. نێوەرۆکی بەرنامەی ئەم بزووتنەوەیە، بەشێکی وەڵامدانەوە بوو بە خواستەکانی جوتیاران و زەحمەتکێشانی کوردستان و رێگرتن لە هەوڵی دەرەبەگ و خاوەنمولکەکان، کە لە بۆشایی دەسەلاتی ناوەندی لە کوردستاندا، دووبارە دەستیان بەسەر زەوییەکاندا دەگرتەوە و زوڵمیان لە هەژاران و نەدارانی کوردستان دەکرد.

بزووتنەوەی شۆرشگێرانەی خەڵکی کوردستان، بزووتنەوەی سیاسیی میللەتێک بوو، لە کایە و ئاقارە جیاوازەکاندا، لە هەوڵی ناساندن و ساغکردنەوەی ناسنامەی ئیتنیکی بەشێک لە نەتەوەیەک بوو، کە مێژووی سیاسیی رۆژهەڵاتی نێوەراست و رووداوەسیاسییەکانی نێوچەکە، رێگای شکڵگرتنی نەدابوو.

شۆرشی گەلانی ئێران، لە کورەی گرگرتووی خۆیدا، دەسەڵاتێکی سیاسیی دەرهاوێژت، کە لە فۆرمە ئیسلامییەکەیدا، هەڵگری خەسڵەتەکانی فیکری پانئێرانیزم و سەروەریی نەتەوەی فارس بوو لە ئێراندا!

رژێمی تازەوەسەرپێکەوتووی کۆماری ئیسلامی، هیچ بەرنامە و پلانێکی بۆ چارەسەری کێشەی کورد و نەتەوەکانی دیکەی ئێران پێ نەبوو.

لە کوردستاندا، دەیان رێکخراو، کۆمەڵە و گرووپی سیاسی لە نێو بزووتنەوەیەکی فراوانی جەماوەریدا، بە دید و بەرنامەی جیاوازەوە کاریان دەکرد و هەڵدەسووران. کۆمەڵەی شۆرشگێری زەحمەتکێشان و حیزبی دیموکرات، دوو هێزی بەسەنگ و بەرچاوی نێو ئەم بزووتنەوەیە بوون.

حیزبی دیموکرات، مێژوویەکی لە مێژینەی لە کوردستاندا هەبوو کە لەسەر سەروەرییەکانی کۆماری مهاباد و پێشەوا قازی موحەمەد کاری دەکرد. کۆمەڵە، هێزێکی تازەدەرکەوتووی نێو هەناوی بزووتنەوەی چەپ و زەحمەتکێشان بوو لە کوردستاندا و ئیلیتێک لە رۆشنبیرانی کورد رێبەرایەتییان دەکرد و هەڵیاندەسووراند.

خەڵکی کوردستان، ئەو چاوەڕوانییەی لە شۆڕشی ئێران هەیبوو، لە سۆنگەی فیکر و سیاسەتی ئیسلامیستە باڵادەستەکانی ئێراندا، دەهات کاڵ و کاڵتر دەبوویەوە. هەرزوو ناکۆکییەکان تەقینەوە و خەونەکانی خەڵک بۆ چۆنییەتی دابەشکردنی دەسەڵات و حوکمڕانی لە کوردستان و ئێراندا، پووچەڵ بوونەوە. کۆمیتەکانی شۆڕشی ئیسلامی لە کوردستاندا، بوونە لەمپەری بەرهەمهاتنی شێوازێک لە حوکمڕانیی خەڵک و فۆرمۆلەکردنی ئۆرگانەکانی دەسەڵاتێکی هەڵبژێردراو و دیموکراتیک لە کوردستاندا.

کۆمەڵە، بۆ بەرگرتن بە سیاسەتی کۆنەپەرستانەی ئیسلامییەکان لە کوردستاندا، چەندین شێوازی نوێ و شارستانییانەی بۆ خەبات و تێکۆشانی کۆمەڵانی خەڵک داهێنا!

ڕێپێوانی هەزاران کەسی، لە شاری «سنە»وە بۆ «مەریوان» چۆڵکردنی شار و دروستکردنی ئۆردووگا لە سەر ڕۆخی «زرێبار»، یاخیبوونێکی شارستانییانە بوو کە گوڕ و تینێکی بەهێزی بە بزووتنەوەی خەڵک دا و کۆمەڵەشی لە فۆرمی «یەکێتیی جووتیاران»دا، کردە هێزێکی خۆشەویستی کۆمەلانی خەڵک. دیاردەیەک کە بۆ ئێمە تەواو نوێ بوو و سەرنجی ڕاکێشابووین، بەشداریی فراوانی ژنان بوو لە بزووتنەوەی چەپی کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا و لە ڕیزەکانی کۆمەڵەدا. بە بارێکی دیکەدا دەبێت بگوترێت کە کۆمەڵە لە بەرنامە و کاری ڕێکخراوەیی خۆیدا، گرنگییەکی زۆری بە کێشەی ژنان و ڕۆڵی گرنگی ژنان لە بزووتنەوەی کۆمەڵایەتیدا دابوو.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و لە نێویدا کۆمەڵەی ڕەنجدەران، هیوایەکی گەورەی بە بزووتنەوەی کورد لە ڕۆژهەڵاتدا هەبوو. پەیوەندییەکان چ لەگەڵ حیزبی دیموکرات و چ لەگەڵ کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ، پێش ڕووخانی ڕژێمی شا و سەرکەوتنی شۆڕش، لە چوارچێوەی هاوکاری و بەدەنگەوەهاتندا دامەزرابوون.

لە سەرەتای وەشاخکەوتنی مەفرەزە سەرەتاییەکانی کۆمەڵەی «م ل»ی کوردستان، کادران و لایەنگرانی کۆمەڵەی زەحمەتکێشان، هاوکاری و یارمەتییان بۆ ئەو مەفرەزانە جێبەجێ دەکرد و لە ڕۆژگارە سەختەکاندا، بە دەنگ خواست و پێویستییەکانی سەرکردایەتیی یەکێتییەوە دەهاتن. یەکێتی، کە هەموو دەرگاکانی سنووری لێ داخرابوون، هاوڕێیانی کۆمەڵە، بە کلیلە سیحراوییەکانی خۆیان، دەرکەکانیان دەترازاندن و دەگەیشتنە قەندیل و بناری مامندە. هەندێک لەوان، کادری ڕێبەرایەتیی کۆمەڵە بوون کە بۆ ئێمە نەناسراو بوون. خانەی موعێنی، تێکۆشەری ناسراو، کادرێکی رابەریی کۆمەڵە بوو کە لەساڵی ١٩٧٨دا، لە ناوچەی ماوەت، بە دەستی بەعس، لەگەڵ چەند پێشمەرگەی یەکێتیدا شەهید بوو.

هەربووک «کۆمەڵە» ، لە هەردوو دیوی کوردستان، لە مەودایەکی زەمەنی لێکنزیکدا دامەزرابوون و هێڵە فیکری و سیاسییەکانییان، لە زۆر بواردا یەکیان دەگرتەوە! کۆمەڵەی ڕەنجدەران، لەو سات و زەمانەدا، هێزی باڵادەستی ناو یەکێتی و هەمەکارە بوو. ئیدی ئاسایی بوو کە ئاستی پەیوەندی و هاوکارییەکان لەگەڵ کۆمەڵەی زەحمەتکێشاندا، بەرزتر و تۆکمەتر بوون تا لەگەڵ برایانی حیزبی دیموکراتدا. ئەم داشکاندنەوەیەش، زۆرجاران کێشەی لەگەڵ حیزبی دیموکراتدا بۆ دروست دەکردین.

شەڕ، لە نێوان خەڵکی کورد و کۆمیتە و پاسدارانی کۆماری ئیسلامیدا، هەڵگیرسا! شەڕ لە مەریوان، سنە و شاری پاوە و پاشتر هەموو کوردستانی گرتەوە. بەشێکی زۆری هێزەکانی یەکێتی و بەتایبەت کادر و مەفرەزەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران، ڕوویان لە کوردستانی ڕۆژهەڵات کرد.
مەفرەزەکانی هەورامان، بەشێکیان لە مەریوان و بەشێکیان لە ناوچەی پاوە، بەشدارییی شەڕەکانیان کرد.
لە مەریوان، پێشمەرگەیەکی هەورامان بە ناوی «عەلی خڕە» شەهید بوو.
من، لە هەورامان مامەوە و لەگەڵ ئەو مەفرەزەیەدا، کە غەفور دەرەشیشی، لێپرسراوی بوو، هاوکاری هێزەکانی حیزبی دیموکراتمان لە شەڕی «پاوە»دا کرد. ئەو شەڕەی گەر هەڵە و کەمتەرخەمیی حیزبی دیموکارت نەبا، «چەمران» بە دیل دەگیرا! لەو شەڕەشدا، پێشمەرگەیەکی تەمەن هەژدە ساڵەی یەکێتی بە ناوی « کەریمی حەمەی مەلا سابیر» شەهید بوو! لە ناوچەکانی دیکەش، کادرانی وەکو (عەلی شێعە، حەمە ئەگرەیی، ئەنوەری مەجید سوڵتان) و زۆری دیکەش شەهید بوون.
لە گەرمەی شەڕ و پێکدادان و پێکداهەڵڕژانی خوێنەکاندا، برووسکەی پیرۆزبایی مامجەلال بۆ ئایەتوڵا خومەینی و جەختکردنی لەسەر پشتیوانیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆ شۆڕشی ئیسلامیی ئێران، هەموومانی توشی «شۆک»کردا ئێمە، کە مەلەنەزانانی نێو گۆمی سیاسەت بووین، لەبەردەم خەڵکی ڕۆژهەڵاتدا شەرمەزار دەکرد و پاساوێکمان پێ نەبوو! یەکێتی، وێڕای پشتیوانکردنی شێلگیرانەی لە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی خەڵکی کورد لە ڕۆژهەڵاتدا، دیسانیش نە دەکرا کۆماری ئیسلامیی ئێران، لە چوارچێوەی سیاسەتی خۆی وەدەرنێ! دەبێت ئەو ڕاستییەش بڵێم کە ئەو بەڵێنەی یەکێتی و مامجەلال بۆ کۆماری ئیسلامی، هەرگیز لە ڕووی پراکتیکی سیاسییەوە جێبەجێ نەکرا، یەکێتی هەرگیز پشتی لە هێزە سیاسییەکان و خەڵکی ڕۆژهەڵات نەکرد. ئەمە، لە کاتێکدا پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێراق، نەک هەر هاوکار و پشتیوانیی هێزە سیاسییەکانی

رۆژهەڵات نەبوون، بگرە لە زۆر کات و بواردا، هاوکاری کۆماری ئیسلامی و دژ بە هێزە سیاسییەکانی ئەو بەشەی کوردستان هەڵدەسووڕان! ئیدی شتێکی سەیر نییە کە لە پرۆسەی دانووستاندنی خەڵکی کورد و کۆماری ئیسلامیی ئێراندا، داخوازیی هەشتبڕگەیی هێزە سیاسییەکانی کوردستان، خاڵی هەشتەمی، داواکارییەک بوو لەمەڕ دەرکردنی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ئێران و کوردستاندا. ئەمە لە کاتێکدا، یەکیتیی نیشتمانیی کوردستان، رۆڵێکی ئاکتیڤی لەو پرۆسەی دانووستاندن و گفتوگۆیانەدا هەبوو. من، ئێستا و لە ساتەوەختی نووسینەوەی ئەم دێڕانەدا، تاڵەدەزوویەکیش بە یەکێتییەوەم نابەستێت، دیسانیش نووسینەوەی ئەم حەقیقەتانەی مێژووی سیاسیی بزوتنەوەی کوردستان، راستییەکن ناکرێ خۆمانیان لێ نەبان بکەین، یاخود ناوەڕۆو تۆماریان بکەین!

## جاشە پارتیزانەکان!

رۆژ و مانگان تێ دەپەڕن و تەمەنی پێشمەرگەیێتیی منیش هەڵدەکشێت. ئەزموونی من لە ژیانی پارتیزانی: مەفرەزەکردن بۆ ناوشار. خۆشاردنەوە. کاری ڕێکخستن و پەیوەندیگرتن لەگەڵ هێڵەکانی ڕێکخستن. لەگەڵ زەمەندا دەوڵەمەند دەبێ. رووخاندنی رژێمی شای ئێران و واڵابوونی سنوور، پارسەنگی بەشێک لە کێشەی راگوێزانی گوندەکانی بۆ ڕاستکردنەوە و هەوارێکی بۆ پشوودان، بۆ چێ کردین.

ئەم هاوینە. بارەگاکانمان لە چەمی «ئەوسود» و بەرزاییەکانی «پەرویێنی» لە هەورامان، دەراوی چنار و مۆردین. لە بناری «باڵانبۆ» و رۆخی «سیروان»دا رێکخستنەوە. ڕیکخستنەکانی کۆمەڵە، لە هەڵەبجە، تەوێڵە، شارەزوور و ئۆردووگاکان پتەوتر و بەربڵاوتر بوون. ئەم هاوێنە. ئومیدێک لە ناخی خەڵکدا ژیایەوە و ژمارەی پێشمەرگە زیادی کرد. سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران و ئەو فەوزایەی لە بەراییدا هاتە گۆڕێ. بواری دەستگەیشتن بە چەک و تەقەمەنیی بۆ ڕەخساندین. ئیدی مەفرەزەکان، لەچاو جاراندا. پۆشتە و تێروتەسەلتر بوون. لە ماوەی چەند مانگی ئەم دۆخە نوێیەدا، دەیان هاوڕێی کۆمەڵە روویان لە شاخ کرد و لە مەفەرزەکاندا و لە ناوچە جیاکانی سنووری هەرێمدا، جێگای خۆیان گرت و گوڕ و تینێکی باشیان پێ داین. چەند کادری وەکو سەیوان و سەیفەدین هاواری، فەرەح زۆراب «سامان» و مەلا یاسینی حەمەی حەسەن مووانی لە بارەگاکانی سەرکردایێتییەوە، گوازرانەوە بۆ هەرێمی یەک و بوونە کەرەستەیەکی باشی ڕێکخستن. دیارە هەر لەم ساڵ و چەند مانگەی تێپەڕین، چەندین کادر و پێشمەرگەشمان شەهید بوون و بەیەکجاری جێیان هێشتین... ئەحمەد گریانەیی، فەرەج تریفەیی، حوسەینی مەجیدی مەلاحامید، عەلی دەلینی، کەریمی حەمەی مەلاسابیر، عەلییەخرە لە هەورامان و دکتۆر زەزا. هاوار و چەندین پێشمەرگەی دیکەش لە شارەزوور و بەری سوورێن!.

ئێستاش بیرمە... درەنگەئێوارەیەکی مانگی یەنیوەری، لە «کونەسووتاو»دا، سەرما تا سەر ئێسک رۆچووە. فەرەج تریفەیی دەستم دەگرێ و دەچینە بن گابەردێک...

+ ئەو چەکەی خۆت بدە بە من و ئەم دەمانچەیەی من لای تۆ بێت!

_ ئەی ئەوەکەی خۆت؟!

+ چەکەکەی خۆم دەدەم بە ڕۆستەم. ئێمە بۆ هەندێک کار، دەچینە هەڵەبجە.

_ تەنها تۆ و ڕۆستەم؟!

+ کارەکە قەرەباڵەغیی پێ ناوێت. دەمەوبەیان دەگەینەوە لاتان.
ئەوان رۆیشتن. ئێمە، نان و چامان ساز کرد و شێومان کرد. پاشتر لە دەوری ئاگرێک کۆبووینەوە و شەوگارمان بەدەم قسەوباسەوە دووکەرت کرد.
+ رۆستەم بەتەنیا هاتووەتەوە و بریندارە! دواپاسەوانی ئەو شەوە، هاواری کرد.

رۆستەم، دەستی لە ملی هەڵپێچا بوو. بێهێز و برستلێبڕاو. لە بەردەم کونەسووتاودا. دانیشت و پاڵی بە گابەردێکەوە دا...
+ هەر کە گەیشتینە گۆرستانەکەی «شێخ سمایل»، بە دەستڕێژی گوللە ئاگریان داین. کاک فەرەج، لە جێدا کەوت و منیش دەستم دوو گوللەی وێ کەوتن! تەواو... کاک فەرج شەهید بوو! تەرم و چەکەکەیشی دەست جاشەکان کەوتن... بۆسەیەکی گەورە و وردچنراو بوو!

هاوینەشەوێکی ئەو ساڵە، حوسەین و عەلی دەلێنی، پاش ئەنجامدانی کارێک، هەڵەبجە جێ دەهێڵن و بەرەو چیا دەگەڕێنەوە. هەر شەوێک لە هەڵەبجە، کارێکی پێشمەرگانە ئەنجام درابا، جاشەکان وەخۆ دەکەوتن و بە ئۆتۆمبێل فریای رێگاکانی دەرەوەی شار دەکەوتن. ئەوان، شارەزای ناوچەکە و رێگاکانی هاتوچۆی پێشمەرگە بوون. تۆ کە پێشمەرگەیت و پاش دەستوەشاندنێک شار بەجێ دەهێڵیت، وریاو دەست لەسەر ماشەی چەک، تا دەرەوەی شار و چەند کیلۆمەتریش ئەولاتر، بە کورکەکورک و ئەسپایی رێ دەکەیت.
کە دەستت لە بناری چیا گیر دەبێت، ئیدی ئاهێکت پێدا دێتەوە و پشوویەکی بۆ دەدەیت. مەفەرزەی جاشان، لەو رۆژگارەدا، شەڕی پارتیزانییان دەکرد. لە شوێنێکدا بۆسەیان دەنایەوە، تۆی پێشمەرگە، چاوەڕێت نەدەکرد. حوسەین و عەلی دەلێنی، لەگەڵ گزنگی ئەو بەیانەدا، لوتکەی شنروێ دەبەزێنن و بە دۆڵی «ئەشکەوەڵ»دا دادەکشێن. ئەوان، لە زاری دەربەند وەدەرەکەون و گوندی هاوار وەبەر چاوی دووربینەکانیان دەنێن. گوندی وێران، دەنگی وێرانەی لێ دێت و جوڵەیەک نابینن. ئەوان، وەک دوو ئەسپی ماندوو، بە هەنکەهەنک، زەوییەسوور شەق دەکەن و دەگەنە باخەکانی کەوانەی ئاوایی. ئەوان، ئیدی سێ سەعاتان رێ، لە هەڵەبجەوە دوورن. هاوار، بنکەی کاتیی پێشمەرگە و لانەی حەوانەوەی پاش ماندووبوونێکی تاقەتپڕووکێنە. لێرەدا، ئەوان لە بۆسەی جاشان دەکەون! رێک لە نێو باخەکاندا و لەژێر لقی هەر درەختێکەوە، چەکێک گڕ دەهاوێ. ئەوان، پاشی بەرگرییەکی بێهودە، دابڵۆقە دەدرێن. جاشەکان لە پشتەوە سواری کۆڵی حوسەین دەبن. حوسەین بە زیندوویی خۆی بە دەستەوە نادات. حوسەین شەهید دەبێت و عەلی بە برینداری دیل دەکرێت. جاشەکان، تەرمی

حوسەین و عەلیی ئەنگێوراو، وەکو دوو نێچیر، بە دیاری بۆ بەعس دەبەنەوە! حوسەینی هاوڕێی منداڵیی من و هاوڕێیەکی زێدەچالاکی کۆمەڵە شەهید بوو! عەلی دەڵێنی، لە موسڵ ئیعدام کرا!

# لە چلەی شەهید فوئادی سوڵتانیدا

پاییز، بە جوانیی تایبەتی خۆیەوە دێت و ئەم دەڤەرە داگیر دەکات. من، لەگەڵ مەفرەزەیەکی خۆماندا و هاوڕێی هێزێکی تازەکاری کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکیشان، گوند، کێو، مەزرا و باخچەکانی ناوچەی مەریوان تەی دەکەین. شەوانە دەچینە گوندەکان و دەمەوبەیان بۆ شاخەکان هەیپێی لێ دەکەین.

ئەوان شارەزای ناوچە و ئێمە لێزانانی شەڕی پارتیزانی. دۆخی هەردوو دیوی کوردستان، لە رووی تەرازووی هێزەوە زۆر جیاواز بوو. لە دیوی رۆژهەڵات، جاڕی دەوڵەت، هێز و دەسەڵاتێکی ئەوتۆی نەبوو، جاڕی ژمارەی جاشان لە مەریوان، ئێجگار کەم بوو. دەوڵەت و جاشەکانی، نە بە رۆژ و نە بەشەو، پرکێشیی لە شار دەرچوونیان نەدەکرد. برادەرانی کۆمەڵە، گەرمکیان بوو، ئێربەدێری هونەری شەڕی پارتیزانیی نێو کتێبان، لەسەر زەوین جێبەجێ بکەن! ساتێ بە نێو چرگەن و لێرەواردا دەڕۆیشتین، دەبوو دواکەس، هەژگەرێک بە شوێن خۆیدا رابکێشێت، تا شوێنپێکانمان کوێر بینەوە! ئێمە، پێمان وابوو، ئەوە کارێکی ناپێویستە و هەقیش نییە بە رۆژدا گوندەکان چۆڵ بکەین، لە کاتێکدا، هێزی دەوڵەت ناکارێت لە شارەکان دوور بکەوێتەوە! دواتر تێگەیشتم، ئەوان بۆ رۆژگار و دۆخێکی تر خۆیان رادەهێنن.

شەو لە گوندی ئەڵمانەی زێدی کاک فوئاد بووین. ئەمڕۆ، چل رۆژ بەسەر شەهیدبوونی کاک فوئاددا تێ دەپەڕێت. بنەماڵەی مۆستەفای سوڵتانی، خەڵکی گوند و گوندەکانی دەوروبەر، هێزی پێشمەرگی کۆمەڵە و مەفرەزەکەی ئێمە، بۆ گۆڕستان دەچین. ئێمە، لەسەر مەزاری شەهید فواد و دوو برای ئەو، خەمبار و دڵ پڕ لە هیوا دەوەستین. فوادی موستەفا سوڵتانی کە لە نێو خەڵکدا بە «کاک فواد» ناسرابوو، یەکێک لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕ و تیۆریستە بەتواناکانی بوو. ئەو، وەکو سەرکردە و سکرتێری رێکخراوەکە و رێبەرێکی جەماوەریی دەناسرا. من، کاک فوادم جارێک لە مەریوان و لە ماڵی شێخ عوسمانی خالیدی دیتبوو. کاک فواد، لە فیکر، شارەزایی، توانست، کاراکتەری کەسایەتیی خۆیدا، بە کاک ئارام دەچوێنرا! سەرکردەیەک، لە ماوەیەکی زۆر کەمی خەباتی ئاشکرای نێو جووتیاران و زەحمەتکێشانی کوردستاندا، بوویە سیمبۆل و کاریزمای نێو بزووتنەوەی چەپ و هەموو لایەک حیسابییان لەسەر دەکرد.

مەخابن! ئەویش وەکو کاک ئارام، قەدەر ژیانێکی درێژی لە خەباتدا بۆ نەنووسی و بە شێوەیەکی چاوڕاواننەکراو شەهید بوو! شەهیدبوونی ناوادەی کاک فواد و کاک ئارام، مۆرکی ئەگێتیڤی خۆیان

لەسەر چارەنووسی بزووتنەوەی چەپ، لە هەردوو دیوی کوردستاندا دانا و ئاوەڕۆکەیان بە لایەکی دیکەدا برد!

گوێمان بۆ وتاری کۆمەڵە و بنەماڵەی موستەفا سوڵتانی ڕادێرا. سروودەکانی «شەهیدان» و «ئنتەرنسیۆناڵ»مان چڕین. من، بە ناوی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و یەکیتیی نیشتمانی کوردستانەوە، وتارم خوێندەوە.

ئێمە، چەند ڕۆژێکی دیکەش، لە گوند و چیاکانی مەریواندا، لەگەڵ هێزەکەی کۆمەڵە ماینەوە. سەفەرەکەمان بۆ شاری مەریوان کرد و بۆسەمان بۆ جاشان، لەسەر ڕێگەکان نایەوە. ئێمە لە ئەوان و ئەوان لە ئێمە، زۆر شت فێر بووین. لەو ڕۆژگارەدا، تیکۆشەرانێکم ناسین، کە زۆربەیان گیانیان بەخت کرد و ئەوانەشیان ماون، ئێستاش بەیادی ئە ورۆژگارانەی خەبات، دۆستایەتیمان ماوە.

# گێچەڵ لە بلەکێ!

پاشی نزیکەی مانگێک، ئێمە گەڕاینەوە شارباژێر و پاشتر گەیشتینەوە بنکەکانی هەورامان.
لە مانگی سێپتەمبەردا، بەشێکی زۆری هێزەکەی هەرێمی یەک لە گوندی بلەکێی بناری سورکێو بووین.
بلەکێ، گوندێکی گەورەی بەربڵاوی جێگرتوو لە کوێستانی سەرسنوور و بەهەشتێکی بە ڕەز و باخ ڕازاوە، بووەتە چەقی کۆبوونەوەی هێزەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات و باشوور و پردی کاروانی قاچاخچییانی نێوان هەردوو بەش. کۆمەڵێک «قۆخ» لە دەوروبەری بلەکێ هەڵکەوتوون و خاوەنەکانیان خاوەنڕەز و مەڕدارن.
لە یەکێ لەو قۆخانەدا، هێزێکی سۆسیالیست و پاسۆک، پێکەوە بنکەیەکیان دانابوو.
عوسمانی قادرمنەوەر، وەکو فەرماندەی هەرێمی سۆسیالیست، سەرپەرشتیی بنکەکەی دەکرد. هاوزەمان هێزێکی هەرێمی سێی یەکێتیش، بە فەرماندەیی بەکری حاجی سەفەر لەوێ بوو. ئازاد هەورامی و بەکری حاجی سەفەر، کە لەسەرکردایەتییەوە هاتبوونە خوارێ، لەگەڵ حەمەی حاجی مەحمودا، یەکیان گرتەوە و بۆ چارەسەری ئەو کێشە و گرفتانەی لەگەڵ هێزەکانی سۆسیالیست دەهاتنە گۆڕێ، کۆبوونەوەیان کرد.
پێچەوانەی بۆچوونەکانی حەمەی حاجی مەحمود (بڕوانە ڕۆژژمێری پێشمەرگەیەک، موحەمەد حاجی مەحمود، ل٢٧٥)، ئازادهەورامی و بەکری حاجی سەفەر، دژی لێدان و چەککردنی سۆسیالیست بوون و حەمە، بۆ پاکتاوکردنی نێوچەکە و ڕامالینی هەر لەمپەرێک، پێی لەسەر چەککردنیان دادەگرت. من، ڕابەری سیاسیی هەرێم بووم و لە نزیکەوە ئاگاداری گفتوگۆ و ڕا و بۆچوونەکان بووم. شەڕەکە ڕووی دا. هێزەکەی سۆسیالیست و پاسۆک، جگە لە خودی عوسمان و چەند چەکدارێک، هەموویان دیل کران. ئەو دیلانە نەک هەر سووکایەتییان پێ نەکرا، بگرە ئازاد و بەکر، لە ڕوویان هەڵنەهات سەیریان بکەن و قسەیان لەگەڵدا بکەن. ئاخر لەنێو ئەواندا، ژمارەیەک ئەفسەری پاسۆک هەبوون کە کەسانی پاک و شۆڕشگێڕ و دڵسۆز بوون، جگە لەوەی هەموویان دۆست و ناسراو بوون.
هەموو چەککراوەکان لەبەردەم مزگەوتی بلەکێدا وەستابوون. بەکر، ئازاد هەوارمی و حەمە، بەمنەیان تەکلیف کرد، بچم و قسەیان لەگەڵدا بکەم. من، زۆر بە شەرمەوە قسەم بۆ کردن و پێم گوتن: ئەوان ئازدن، بۆ هەر لایەک بیانەوێت، دەتوانن بڕۆن و ناوچەکە جێ بهێڵن!
لەگەڵ سەرهەڵدانی کێشەکانی نێوان یەکێتی و سۆسیالیست، ناکۆکی و کێشەکانی نێوان کادرانی کۆمەڵە و حەمەی حاجی مەحمود دەهاتن قووڵتر دەبوونەوە!

## مانگرتن لە خڕی نێوزەنگ!

کیشە و هەڵایەک لەنێوان کادرانی کۆمەڵە و پێشمەرگەکانی حەمەی حاجی مەحمودیدا، لە گوندەکانی ناوچەی سەردەشت، لە سەروبەندی گفتوگۆ و دانوستاندنی نوێنەرانی خەڵکی کوردی ڕۆژهەڵات و شاندێکی کۆماری ئیسلامیدا، کە بە بەشداریی مامجەلال و بەشێک لە ڕێبەرانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەڕێوە دەچوو، هاتە گۆڕێ و کار بە چەککردن و پەلاماردان گەیشت. کادرەکانی کۆمەڵە لە هەرێمی یەک، هاتنەوە بارەگاکانی سەرکردایەتی و بارەگایەکی بچووکیان دانا و مانیان لە کارکردن گرت.

ئەندامانی ناوەندی کۆمەڵە بەتایبەت سالار عەزیز، ملازم عومەر، فازیل کەریم، ئازادهەورامی و مەلابەختیار داکۆکی و پشتگیرییان لە هەڵویست و داواکانی کادرەکان دەکرد و لە هەوڵی ئەوەدا بوون کێشەکان بە شێوەیەک چارەسەر بکەن لە بەرژەوەندی کۆمەڵە بشکێتەوە و سنووریک بۆ لووتبەرزی و لەخۆباییبوونی حەمە و پێشمەرگەکانی دابنێن. مامجەلال، نەوشیروان موستەفا و سەرکردەکانی خەتی گشتی، دەیانویست هەم دڵی حەمە رابگرن و هەم کادرانی کۆمەڵە رازی بکەن و کێشەکە لە ئاستێکدا ڕابگەرن کە کاردانەوەی سەلبیی لەسەر دۆخی یەکێتی نەبێت. مامجەلال هاتە بارەگای ئێمە و بە هاوڕێیەتی ملازم عومەر و ئازاد هەورامی لەگەڵماندا کۆبوویەوە... قسەوباسەکان درێژەیان کێشا و ئێمە لە دیدێکەوە لە شۆڕش و کێشەکانمان دەڕوانی و مامجەلالێش جۆرێکی دیکەی دەبینین. شۆڕشی «سوور»ی نێو ڕووپەڕی کتێبان خولیای خەباتی ئێمە بوو. مامجەلالیش شۆڕشی ڕەنگاوڕەنگی گەرەک بوو. بۆ ئێمە، مۆراڵ و ئەخلاقی شۆڕشگێڕانە پرەنسیپ بوون و بۆ ئەویش هێز و کۆکردنەوەی لەشکر.....

((من شۆڕش دەکەم. شۆڕش تەنیا بە ئێوەی خوێندەوار بە ئاکام ناگات. من پێویستم بە هێز و لەشکر هەیە و جووتیاران و عەشیرەتەکانیش، هێزی بنچینەیی شۆڕشن. شۆڕش ئەوە نییە لە کتێباندا ئەخشەی بۆ کێشراوە. بەڵکو ئەوەیە واقیع درووستی دەکات. ئەم بۆڕخڵەوات و کەموکوڕییانەی ئێوە لەسەر هێزی پێشمەرگە بە گشتی و کاکە حەمە و پێشمەرگەکانی بەتایبەت باسی دەکەن و پێتان قەبوڵ ناکرێن، لەنێو هێزەکانی کۆمەڵەدا و لای لێپرسراوەکانی کۆمەڵەش هەن....)). مام، جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە دزی و ڕاوڕووت، بەرەڵایی و پەتی پرەنسیپ پساندن، دیاردەیەکی ئاسایین و لە شۆڕشدا سەر هەڵدەدەن و دەبێت بە ئەقڵ و حیکمەت مامڵەیان لەتەکدا بکرێت و بنەبڕ بکرێن. ئەو قسانەی مامجەلال، تەڵەزمێکی لە کێوی ئایدۆلۆژیای ئێمە ئەدەرووشاند. ئێمە پێمان وابوو، گەندەڵی

کە سەری هەڵدا، ئیدی تەشەنە دەکات و دەبێتە مۆریانەی جەستەی شۆڕش. کەللەشەقیی ئێمە لە رووی مامجەلالدا، مامجەلالی تووڕە کرد. ئەو بە تووڕەبوون و بێزارییەوە، مەقەڕەکەی بەجێ هێشتین، ئێمە لە دوی نەچووینە دەرەوە. ملازم عومەر گوتی: ئێوە دەبێت لە دوی بچن و دڵی ئاشت بکەنەوە و داوای لێبووردنی لێ بکەن. ئێمە گوتمان: با بڕوات! ئێمە کۆمەڵە دەناسین نەک یەکێتی!

پاش چەند کۆبوونەوەی نێوان ئێمەی کادرانی مانگرتوو و هەندەک لە سەرکردەکانی کۆمەڵە و دانیشتنی ئەوان لەگەڵ مام و مەکتەبی سیاسیی و پاشتر قسەوباسی ئەوان لەگەڵ حەمەی حاجی مەحمود، ڕێگاچارەیەک بۆ کێشەکە بینرایەوە و بە ئەنجامدانی هەندەک ئاڵوگۆڕ لە چۆنییەتی دابەشکردنەوەی لێپرسراوێتی و گوازتنەوەی هەندێک و هێنانی هەندێکی تر، کادرەکان ڕازی بوون و بڕیاری گەڕانەوە بۆ سنووری هەرێمی یەک و دەستبەکاربونەوە درا.
مانگەکانی زستانی ئەو ساڵەمان، لە شارباژێر، شارەزوور و هەورامان تێپەڕاندن. هێزی پێشمەرگە، وێڕای دژواری دۆخەکە و قوڵیی گەرفتەکانی نێوخۆ، دەهات خورتتر و بەهێزتر دەبوو. ئەندامانی کۆمەڵە لە شارەکانەوە دەهاتنە شاخ و گوڕ و هێزێکی نوێیان بە ڕێکخستن دەدا. ئەو زستانە، گەرچی تێکۆشان و هەڵسووڕان دژ بە بەعس لە برەودا بوون، دیسانش باشترین کادرەکانی کۆمەڵە بە تایبەت لە شارەزوور و قەرەداغ شەهید دەبوون. هەر لەو مانگانەدا، سیراون تاڵەبانی،حەسەن خاوێ و حاجی چاوشین و مەفرەزەیەک، لە شارەزووری بناری قەراخدا، لە بۆسە کەوتن و شەهید بوون. شەهیدبوونی سیروان و ئەو کادرانە، بۆشاییەکی گەورەیان لە ناوچەکەدا درووست کرد و پڕکردنەوەی زەمەنێکی زۆری گەرەک بوو.

# جێگۆڕکێ بۆ هەرێمی سێ

یەکێک لەو پێشنیاز و ڕێگاچارانەی بۆ هێورکردنەوەی تەنگژەکانی نێوان کادرانی کۆمەڵە و حەمەی حاجی مەحمود، لە لایەن سەرکردایەتییەوە جێبەجێ کرا، گوازتنەوەی من بوو بۆ هەرێمی سێ و ناردنی «ئاسۆی شێخ نووری» بوو وەکو لێپرسراوی کۆمەڵە و ڕابەری سیاسیی هەرێم. بۆ هەرێمی یەک. ئاسۆ، ئەندامی سەرکردایەتیی ناوخۆی کۆمەڵە و یەکێک بوو لەو کادرانەی سەرکردایەتی کە هاوزەمانی دەستگیرکردنی ڕێبەرانی کۆمەڵە، زیندانی و حوکم درابوو. لە هاوینی ١٩٧٩دا، لە سەروبەندی کودەتای سەدام بەسەر «بەکر»دا، لێبووردنی گشتی. سەرکردەکانی کۆمەڵەشی گرتەوە. ئەوان پاش ئازادکردنیان هاتنە شاخ و لە نێو ململانێکانی دەروونی کۆمەڵەدا وەکو «گرووپی زیندان» شوێنیان گرت. بە بارێکی تردا، گەیشتنی ئەو پۆلە کادرەی ڕێبەرایەتیی کۆمەڵە بۆ شاخ، خوێنێکی نوێی بە دەمارەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵە بەخشی و ورەیەکی بەرچاوی وەبەر کۆمەڵە نا کە لەو هەلومەرجەی ئەوێ ڕۆژێدا کارکردی خۆی هەبوو. ئەگەرچی ئەو هاوڕێیانەی کۆمەڵە ساڵانێک بو لە خەباتی پراکتیکیی ڕێکخستن دابڕابوون و دەرکردن و تێگەیشتنیان بۆ خەسڵەتە تایبەتەکانی خەباتی شاخ و ئەو دۆخە دژوارە ئاسان نەبوو، دیسانیش تەکانێکیان بە دۆخەکە دا و بە کاوەخۆ لە ملانێکانی دەروونی کۆمەڵەدا، بوونە لایەنی بەسەنگ و ڕۆڵیشیان لەسەر چارەنووسی کۆمەڵە وازی کرد. لە گێڕانەوەی وردینەی ڕووداوەکانی نێو یەکەمین کۆنفرەنسی کۆمەڵەدا، هەوڵ دەدەم ڕۆڵی ئەم گرووپە زەق بکەمەوە و وەستایی و لێزانییان لە گەمەی ململانێدا بنرخێنم.

ئەگەرچی من فاکتەری گرنگی قووڵکردنەوەی ناکۆکییەکانی هەرێمی یەک نەبووم و ئاستی پەیوەندی و مامەڵەی من لەگەڵ حەمەدا، گرژییەکی ئەوتۆی تێدا نەبوو، دیسانیش من وەکو لێپرسراوی سیاسیی هەرێم و لێپرسراوی کۆمەڵە، بەرپرسیارێتیی ئیدارەکردنی کێشەکانم لە ئەستۆ بوو. من، لە سۆنگەی بوونی هەندەک لێپرسراوی پۆخڵەواتی نێو هەرێمەکە کە «حەمە» دەستی لەپشت دەدان لە لایەک و هەندەک کادری زێدەتوندڕۆی کۆمەڵەش لەلایەکی ترەوە، گەلێک ماندوو بووبووم و بڕیاری گواستنەوەم بۆ هەرێمی سێ، پێ خۆش بوو.

من، پێچەوانەی زۆر کادر و لێپرسراوی دیکە، کە لە جێگۆڕکێکردندا، چەند پێشمەرگەیان لەگەڵ خۆیان دەگواستنەوە، تەنیا خۆم و چەکەکەم و جانتا چکۆلەکەم، هەرێممان گواستەوە!

سنووری کارکردن و هەڵسووڕانی هەرێمی سێ، پێنجوێن، دەشتی شلێر، شارباژێر، چوارتا و

هەندەک شوێنی دیکەشی دەگرتەوە. هەرێمی یەک و هەرێمی سێ، هاوسنوور و هەندێجاریش تێکڵاو بوون. دیاریکردنی سنووری دەسەڵات و کارکردن، هەمیشە مایەی کێشە و گرفتی نێوان دوو هەرێم بوون.

بەکری حاجی سەفەر، فەرماندەی هەرێمی سێ بوو. ئەو، ئەودەمە هەم ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە و هەمیش ئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو. من، پێچەوانەی هەندێک کادری دیکەی کۆمەڵە، پێم وابوو کارکردن لەگەڵ بەکردا، گەلێک ئاسان و بێکێشە و گرفت بوو. ئەو پیاوێکی لەسەرخۆ و ئیان و دامەزراو بوو. بەکر، وەکو پێویست و زیاتریش ڕێزی لە کادرانی کۆمەڵە و یەکێتی دەگرتن و هاوکاریی دەکردن. پێچەوانەی هەندەک کادری کۆمەڵە، کە دەبوونە لێپرسراوی چەکداری و کاری ڕێکخستنیان وەلا دەنا، ئیدی پێیان وا بوو هەرگیز کادری سیاسی نەبوونە، بەکر هەمیشە جەختی لەسەر کاری ڕێکخستن و سیاسی دەکردەوە و گرنگیی بە کادرەکان دەدا. من، ساتێ وەکو ڕابەری سیاسیی هەرێم کارم دەکرد، ئەو وەکو هاوکارێکی خۆی مامەڵەی لەتەکدا دەکردم و لە هەر کارێکی گەورە و بچووکدا پرسی پێ دەکردم و ڕای وەر دەگرتم. ئەمە جگە لەوەی هەمیشە دڵی خۆی بۆ دەکردمەوە و هەموو دیگەرانییەکانی خۆی بۆ باس دەکردم. جیاوازیی تەمەن، هەرگیز نەبوویە لەمپەرێک لە درووستبوونی متمانە و هاوڕێیەتییەکی سەرڕێژ لە ڕاستگۆیی کە تا کۆتایی ئەو تەمەنەی خەبات و ڕۆژانی پاشتریش بەردەوام بوو.

ئەو کادر و لێپرسراوانەی ئەو سەردەمە لە هەرێمی سێدا کاریان دەکرد، تا ئەو جێگایەی یادەوەرییم بە هانامەوە بێت: جەمالی حەمەی خواکەرەم، وەهاب، سەلاحی موهەندیس، حەمەی تەیب، عەلی چوارتایی، سەرداری حەمەمین ئاغای بارێ، تایەری حاجی عەزیز، حەمەعەلی، کاکەبرا، شۆڕش ئیسماعیل، جەمال جەلال، مامۆستا کەمال، لالۆئەورەحمان، مامۆستا جەمال، عەبدولکەریم، شێخ حوسەینەسوور و زۆری تریش.... ژمارەیەکی زۆر کەم لەو کادرانە، ڕۆژگاری سەختی چیا قەدەری ژیانی بۆ نووسین و بوونە شاهێدی ئەم ڕۆژگارەی دوای ڕاپەڕین و دەورانی دەسەڵاتی کوردی.

لە سنووری هەڵسووڕانی هەرێمی سێدا، جگە لە ڕووبەڕووبوونەوەی هێزەکانی دەوڵەت، هەمیشە ئەگەری پێکدادەڵپژان لەگەڵ هێزەکانی پارتی و سۆسیالیستدا هەبوو. مەفرەزەکانی پارتی لە سووریێنەوە، جاروبار بۆ ناوچەی شلێر و چیای «تالییەر» دزەیان دەکرد و خۆیان دەگەیاندە گوندەکانی «بەهانە» و «دەرەمیانە» و هەندەکجاریش بناری سوورکێو. سۆسیالیست، لە شارباژێر و ناوچەکانی دیکەش هەبوون. بە درێژایی ئەو ساڵانە سیاسەتی یەکێتی بەرانبەر سۆسیالیست، (سیاسەتی نە شەڕ نە ئاشتی!) بوو. واتە هەرگیز دۆخێکی داساکاو نەبوو، هیچ پەیمان و ڕێکەوتنێکی بڕواپێکراو بوونی نەبوو. کادرێک یاخود فەرماندەی کەرت یان مەفرەزەیەک، دەیتوانی گۆڵمەزێک

بنێتەوە و ئیدی لەسەر کێشەیەکی سادە، ئەگەر شەڕێک بەرپا ببێت و ئەیان پێشمەرگەی تیدا بکوژرێن. سۆسیالیست، لە هەرجێگایەک هێزی خۆیان ئەدیباوە و هەستیان کردبا سەنگێکیان هەیە، ئیدی ئەوانیش سڵیان لە گێچەڵنانەوە نەئەکرد و لە هیچ نەئەپرینگانەوە.
لە کۆکردنەوەی هێزدا بۆ ئژاوتیکردنی یەکێتی و هەندێجاریش یەکێتی بۆ لاوازکردنی ئەوان، کەسانی سەربەرژێم ئەکەوتنە نێو هێزەکانەوە. لە نێو یەکێتیدا، چاودێرییەکی توند هەبوو، رێکخراوەکانی شار لەو بوارەدا، واتە لە ئرخاندنی ئەو کەسانەی روویان لە مەفرەزەکان ئەکرد، زۆر چالاک بوون.

## سۆسیالیست و مام ئاراس و ئاسۆی قومری!

من، زۆربەی کات لەگەڵ وەهاب و کەرتەکەیدا دەگەڕام و هەڵسوکەوتم دەکرد. وەهاب، ئەگەرچی بە کادرێکی عەسکەریی توندو بەزەبر ناوی ڕۆشتبوو، دیسانیش پیاوێکی ئازا ، بزێو، وریا و ڕەوشتبەرز بوو.

ئێمە لە گوندی «پارەزان» بووین و هەواڵی کەرتێکی سۆسیالیستمان وەرگرت کە «ئاسۆی قومری»یان لەگەڵدایە و لە گوندێکی دەوروبەری «چوارتا»ن. وەهاب گوتی: «دەڕۆین و چەکیان دەکەین. ئاسۆی قومری سەربە موخابەراتە و بە پێی هەواڵی ڕێکخستنەکانی ناوشار، دەوڵەت بۆ دەستوەشاندن و ئاژاوەی ناردووە».

نۆڵ بە نۆڵ و شاخ بەشاخ، وەڕێ کەوتین و نیوەشەو گەیشتینە گوندی تایەن. لەنێو گوندا دابەش بووین، پشوومان دا و شیومان خوارد، پێخەفمان هەڵگرت و بۆ ماڵی خودا . لەو ڕۆژگارانەدا، زۆربەی کارەساتەکان لە مزگەوتدا دەقەومان. سۆسیالیست، پێش ئێمە لە مزگەوتدا جێگایان گرتبوو. سڵاومان کرد و پێمان گوتن: ئەمشەو دەمانەوێت پێکەوە بخەوین و هەندەک قسەوباسیش لەسەر چۆنییەتی ڕێکخستنی کاروبارەکانمان بکەین. ئێمە پلانی خۆمان دانابوو. ئەوان نزیکەی ٢٠ چەکدار و ئێمەش بە ژمارە هەر هێندە دەبووین. مام ئاراس و عەبدوڵاهەمزە لێپرسراویان بوون. وەهاب و من، مام ئاراسمان خستە نێوانی خۆمان و پێشمەرگاکانی دیکەش، هەر کەس و کاری خۆی پێ سپێردرابوو. پاشی کەمێک گفتوگۆ و قسەوباس، ئیدی پەرلەی «یا ئەڵڵا!»، بوویە دەستپێکی پەلامار و زۆرانبازی. ئەو پێشمەرگانەی پێش چەند چرکەیەک پێکەوە قسانیان دەکردن و بە یەکتربینین گەشاو بوون، ژیانیان کەوتنە سەر پەلەپیتکەی چەکی یەکتر. کارەکە زۆری نەخایاند و تەقەی تێدا نەکرا و خوێنی تێدا نەڕژا. هەموویانمان چەک کرد و دەستی «ئاسۆ»مان لە پشتەوە شەتەک دا. لە جێدا، جگە لە ئاسۆی قومری و نوورەکووپە، ئەوانی دیکەمان ئازاد کردن. هەر ئەوشەوە بەرەو شاربازێر و پاشان «بلەکێ»ی ئەودیوی بناری سوورکێو، بە دیل و دەستکەوتەوە ڕۆیشتین.

لە بلەکێ، پاش چەند ڕۆژێک، بە فەرمانی سەرکردایەتیی یەکێتی، چەکەکان بۆ سۆسیالیست گەڕێندرانەوە. ئاسۆی قومری کە هیچ گومانێک لەوەدا نەبوو باوەڕپێکراوی موخابەراتە، ئەویش ئازادکرا و لەگوڵ کاڵتری پێ نەگوترا! ئاسۆ، یەکسەر گەڕایەوە شار و وەکو دڕترین فەرماندەی جاش، بوویە بکوژی دەیان پێشمەرگە و خەڵکی بێگوناه. دەیانگوت: ئەو ڕۆژەی مام ئاراس و مەفرەزەکەی بێچەک دەگەڕێنەوە بارەگاکەیان لە بلەکێ، هەردوو ڕەحمەتی عوسمانی قادر مونەوەر و مام هێرش سەرگەرمی

گفتوگۆ و مشتومڕ دەبن و باس لە هۆکاری کێشە و گرفتەکانی نێوان یەکێتی و سۆسیالیست دەکەن. عوسمان دەڵێت: یەکێتی پاوانخواز و شەڕفرۆشە و هیچ گروپ و لایەنێکی پێ قەبووڵ ناکرێن و شەڕ لەگەڵ ئاسمانیشدا دەکات. مام هێرش دەبێژێت: وا نییە و ئێوە خۆتان پۆخڵەواتن و هێزەکانتان پڕن لە کەسانی گومانلێکراو و ڕاوڕووتکەر.... دەنگەدەنگی ئەمان تا دێت هەڵدەکشێت و لە پڕ مام ئاراس و کۆمەڵەکەی خۆیان بە ژووردا دەکەن و... عوسمان دەڵێت: ئەوە چییە؟ ئەی چەکەکانتان کوان؟ ئاراس دەڵێت: وەهاب چەکی کردین! عوسمان قووشقی دەبێت و دەڵێت: ئەمەش خەتای ئێمەیە هەی مام ...! مام هێرش و عوسمان، هاوڕێی خۆشەویستی یەکدی بوون و پاشتر، هەریەک لە کات و شوێنی جیادا کوژران.

## خەونی چەک و جبەخانە

مەفرەزە و هێزەکانی یەکێتی، هەر لە دەستپێکەوە، خەونیان بە گەیشتنی چەک و جبەخانەوە دەبینی و نەهاتنەدی خەونەکەش، هەمیشە لە نۆباڵی هێزەکانی «ق م»بوو کە دەڤەری بادینانیان تەنی بوو.
ساڵی ١٩٧٧، ساتێ مامجەلال و نەوشیروان موستەفا، لەگەڵ مەفرەزەکانیاندا، لە سوریاوە ئەمدیوی سنوور بووبوون، هەندەک چەکی سووک و ئاربیجییان لەگەڵ خۆیان هێنابوو. سەفەری هەکاری، لە ساڵی ١٩٧٨دا کە بە کارەسات بۆ یەکێتی شکایەوە، ڕواڵەتەکەی بەواقیعکردنی ئەو خەونە بوو.
کۆماری ئیسلامیی تازەوەسەرکارکەوتوو، ئاسمانەپڕێنێکی لە شامەوە بۆ تاران، بۆ یەکێتی ڕۆنا و تەنیا بۆ یەکجار، کۆمەڵێک چەک و تەقەمەنیی بۆ گواستەوە. ئەو بڕە چەکە، بەشێکی خۆیان دەستیان بە سەردا گرت و بەشێکی گەیشتە کوردستان و لە گوندی «کانیزەرد» ئەنبار کرا. ئێمە هێزێکی هەرێمی سێ بووین کە لە مزگەوتەکەی کانیزەرد، هەم بۆ پارێزگاریی چەکەکان و هەم بۆ پارێزگاریی بنکەکانی سەرکردایەتی، بارەگامان دانابوو. مەفرەزەی هەرێمەکان دەهاتنە سەرکردایەتی و بە کاخەزی مامجەلال یاخود مەکتەبی عسکەری، بەشەچەکی خۆیان وەردەگرت. ئەو ڕۆژانە، بۆ یەکەمجار، ڕژێم بەفرۆکەی «سیخۆ» بارەگاکانی سەرکردایەتیی لە «نێوزەنگ و توژەڵە» بۆمباران کردن، بەشێک لە بارەگاکان بەرکەوتن و چەند پێشمەرگە شەهید و بریندار بوون. دەنگۆی هێرشی حکومەت هەبوو. دەوڵەت لەناوچەی قەڵادزێ هێزی مۆڵ دابوو. دەبوو هێزەکان وەمێنن و لە ئەگەری هێرشی دوژمندا بەرگری لە سەرکردایەتی بکەن. ئێمە چەندین شەو لەسەر دووندی «مامەندە» ماینەوە و ئێشکمان گرت و شەوە ساردەکانمان بە ڕۆژ گەیاندن.

## نیسان هەرێمی یەک و هەورامان

من، لەگەڵ هێزەکەی هەرێمی سێدا جارێ لە بارەگاکانی سەرکردایەتی بووم کە بەشێک لە کادرەکانی هەرێمی یەک، هاتنە سەرکردایەتی و داوایان لە نێوەندی کۆمەڵە کردبوو کە دەبێت من بگەڕێمەوە سنووری هەورامان و هەرێمی یەک. ئەوان، جەختیان لە سەر پێویستیی بوونی من بۆ راپەڕندنی کاری رێکخراوەیی و بەڕێوەبردنی ئیش و کاری کۆمەڵە و یەکێتی، وێرای بوونی ئاسۆی شێخ نووری وەکو لێپرسراوی کۆمەڵە و رابەری سیاسیی هەرێم، ئەبوشەهاب وەکو لێپرسراوی لقی سلێمانیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، کردبوو.

حەمەی حاجی مەحمود، وەکو فەرماندەی هەرێم، لەگەڵ هێزێکی گەورەی هەرێمی یەکدا، بۆ هاوکاریکردنی هێزەکانی یەکێتی لە سنووری دەشتی هەولێر و خۆشناوەتی، هاوشانی هێزێکی سەرکردایەتی بەسەرپەرشتیی مەلابەختیار چووبوونە ناوچەکانی باڵەکایەتی، خۆشناوەتی و دەشتی هەولێر و سەرگەرمی پاکتاوکردنی هێزەکانی پارتی و جێگیرکردنی هێزەکانی یەکێتی بوون کە گرفت و کێشەی جددییان لەگەڵ هێزەکانی سۆسیالیست و پارتی هەبوو. دروستتر بڵێم: هێزەکانی یەکێتی و هەندەک لە لێپرسراوەکانیان، لەبەردەم هێزە نەیارەکانی یەکێتیدا لە پاشەکشێدا بوون. گەڕانەوەی ئەو هێزە بۆ سەرکردایەتی، پاشی بەجێهانانی ئەرکەکانیان و بوونی بەشێکی زۆر لە کادرە سیاسی و عەسکەرییەکانی هەرێمی یەک لەوێدا، مەسەلەی گەڕانەوەی منیان بۆ هەرێمی یەک، کردە راستییەک و ئیدی بەپێی فەرمانی ناوەندی کۆمەڵە، من ماڵئاواییم لە فەرماندەی هەرێـــمی سێ و کادرەکانیان کرد و خۆم بۆ سەفەری هەورامان ئامادە کرد.

رۆژێک لە رۆژەکانی مانگی ئاگۆستی، فەیسەڵی مەلاعەلی(کاکەشێخ)، لەتیفی حەمەی مەلاسابیر، دوو پێشمەرگە و من، ئێسترێکمان بەکرێ گرت و هەندەک چەک و تەقەمەنیمان لێ بار کرد، ماڵئاواییمان لە نێوزەنگ کرد و ملی رێگای سەفەرێکی چەندرۆژیمان گرت.

هاوینەسەفەری ناوچە کوێستانییەکانی رۆژهەلات، لە هەرلایەک دەست پێ بکەیت و بە هەر ئاقار و ناوچەیەکدا گوزەر بکەیت، لە گەشتی نێو ئەو باخچانەی بەهەشت دەچێت کە خودا لە قورئاندا بۆ موسڵمانانی وەسف کردوون.

دەراوی «تۆژەڵە« جێ دەهێڵیت و لە گوندی «کانی زەرد»ەوە هەتا دەوروبەری «ئنشکۆڵان» دووسەعات و نیو پیادەڕێ، تۆ رێ دەکەیت و تیرۆژێک لە خۆری هاوینت پێ ناکەوێت. تۆ،

دووسەعات و نیو، بە نێو چەمێکی چڕگەنی دارگوێز و هەموو میوەکانی باخی خوادا سەفەر دەکەیت و داخت لێوانلێوی مەستییە.
لە پشتی «سەردەشت»ەوە بۆ «قەڵەڕەشە» «دەرمانادا»، «ئەسپەنێزە« و هەورازەکەی کە لە هەوارگەی خودات نزیک دەکاتەوە. لە دووندی «هۆمل»ەوە بۆ «بێژوێ» شۆڕ دەبییەوە و لە بەهەشتی ئالانەوە بەرەو ناوچەی بانە دەڕۆیت. گوند بە گوندت دەسپێرێ و شاخ بە دۆڵ و دۆڵ بە مێرگ و مێرگ بە هەوراز و هەوراز بە نشیو و دیسان ڕەوەزی کەرتەشاخان و لەوێرا دابەزینی پێچاوپێچی رووەو بنار و پەڕینەوەی چۆمی ئاوی تاچۆکان هاتوو، وێنەکانی ئەو سەفەرانەن کە دەیانجار لە ژیانی شاخدا چەندبارە دەبنەوە و تۆ کە ماشێنی ئایدۆلۆژیا دەتبزووێنی، هەست بە ماندووبوون و وەڕزیی ناکەیت. ڕێگاڕۆیشتن، بەشێکە لە ژیانی ڕۆژانەی پارتیزانان. تۆی پارتیزان، هەرگیز بیر لەوە ناکەیتەوە، کەی دەگەیتە ئامانج و پشوو دەدەیت. لە ڕاستیدا، تۆ لەڕێگابڕیندا، هیچ ئامانجێکی کۆتاییت نییە. لەو ناوچانەدا کە مەترسیی دوژمن کەمترە یان هەر نییە، بۆ تۆ گرنگ نییە چەند خێرا دەڕۆیت و ئێوارە دەگەیتە کوێ و لەکوێ شەو بە ڕۆژ دەگەیەنیت. پێچەوانە، لە ناوچە مەترسیدارەکاندا، تۆ دەبێت بە وردی حیسابی کات و شوێن و جێگا و ڕێگا بکەیت و هەر هەڵەیەک لە حیساباتی تۆ دا، بە ژیانی خۆت یان هاوڕێکانت تەواو دەبێت.
باخەکانی گوندی «شۆشمێ»ی هەورامانی ئەودیو، ئەو بەهەشتە سرووشتکردەیە کە بۆ ئێمە دەبێتە بارەگا و هەواری جێگیربوون و لەوێدا بنکەکان دامەزراون و بوونەتە چاوگی دەرهاوێژتەی کاری سیاسی و ڕێبەرایەتییکردنی ئێشوکاری ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و یەکێتی لە ناوچەکانی هەورامان، هەڵەبجە و شارەزووردا.
من لەگەڵ تایەرعوسمان «م.سەرکەوت»دا دەوروتەسلیمی کارەکان دەکەین و سەرپەرشتیکردنی کاری لیژنەی ناوچەی هەڵەبجە و بەشێک لە کارەکانی کۆمەڵە لە ئەستۆیێ من دەکەون. ئەندامان و کادرانی کۆمەڵە لە شارەوە روو لە شاخ دەکەن و لە پەسا شوێنی ئەو کادرانە پڕ دەکەنەوە کە شەهید دەبن و ماڵئاواییمان لێ دەکەن. ناوهێنانی بەشێک لەو کادرانەی ئەو ڕۆژگارە سەختانە کاریتەی ڕێکخستنەکانی یەکێتی و کۆمەڵە بوون و پێکەوە هاوکاریمان دەکرد و لە هەوڵی گەشەپێدانی کاری ڕێکخراویی و ڕۆشنبیریدا بووین، بە ئەرکی خۆم دەزانم. لەبیرکردنی ناوی هەر تێکۆشەرێک بێمەبەستە و یادەوەرییم بە هانامەوە نایەت:
تایەر عوسمان، کەمال شاکر، محەمەدسەعیدئەحمەد«شاهۆ»، سەیوان عەلی ڕەزا هاواری، سەیفەدین هاواری، یاسین محەمەدحەسەن«مەلایاسین»، فەرەج زۆراب «سامان»، قادرحەمەشەریف«د.قادر»، ڕەسوڵ محەمەدسەلیم«مەلاڕەسوڵ»، مام ئەولخالق، مام هادی، م.پێشڕەو، ئاسۆ ڕەحیم، حەمەتۆفیق،

کەریم شێخ عەلی، ئەمیرتایەر، حەمەعەلی فەتاح، شێخ عەلی سەیدقادر، فەلاحی حەمەبۆر.... ئەمانە کادرە سەرەکییەکانی ڕێکخستن یاخود پێشمەرگەی بزێو بوون و ڕۆڵیان هەبوو. زۆر کادری عەسکەریش هەبوون کە شانبەشانی کارەکانی خۆیان کاری ڕێکخستنیشیان ئەنجام دەدا و ئەمیش هەم لایەنی باش و هەمیش خەراپی هەبوو.

# پاییزی دەستلێکبەردان

پاییزی ساڵی ۱۹۸۰، بۆ ئێمە، رۆژگارێکی پڕ کێشە و گرفت بوو. هەرێمی یەک ببووە دوو بەرەی دژ بەیەک و مەودای نێوانیان دەهات فراوانتر دەبوو. وێڕای قووڵبوونەوەی ناکۆکییەکانمان لەگەڵ سۆسیالیست و بەردەوامیی شەڕی خوێناویی لەگەڵ پارتیدا، قورسایی کێشەی نێوان کۆمەڵە و حەمە حاجی مەحمودیش، برستی لێ بڕیبووین.
ناسۆی شێخ نووری رابەری سیاسیی هەرێم و لێپرسراوی کۆمەڵە، ئەبوشەهاب لێپرسراوی لق، بەشی گەورەی هەرێمیان لەگەڵ بوو، لایەنێکی کێشەکە بوون و حەمەش لەگەڵ بەشێکی دیکەی هەرێم، دوو هێزی نەیاری یەکێتی کە هەردووکلا بەجیا بۆ سەرکردایەتیی یەکێتی بەڕێوە بوون.
سەرکردایەتی، ئەو هێزەی بانگهێشت کردبوو تا کێشەکە بە لایەکدا بخات و دەریچەیەک بۆ دەرباز بوون لەم گێژاوە سیاسییە ببینێتەوە.
ئەم گرفت و کێشانە، هاوزەمانی لەشکەرکێشیی پارتی بوو بۆ دەڤەری بارەگاکانی سەرکردایەتیی کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.
ئێمە، هێزی یەکێتیی هەرێمی یەکی لە «حەمە»مانگرتوو. زۆرینەی هێزەکە بووین و لە بەرزاییەکانی پشتی نۆکان و گۆڕەشێر بەرانبەر لەشکری پارتی سەنگەرمان گرتبوو و لە نواڵە چرگەنەکاندا بنە و بارگەمان خستبوون. حەمەی حاجی مەحمود و مەفرەزەکەی لە گوندی شێنێ هەڵیاندابوو. رۆژێک لەو رۆژەپاییزییانەی ئێمە لە سەنگەری چاوەڕوانیی شەڕی براکاندا لەسەر پشکۆی چاوەڕوانی دەمانگوزەراند، پۆلێک فرۆکەی دەوڵەتی ئێراق، بەسەر ئێمەدا مەرزی ئاسمانی ئێرانیان بەزاند و جاڕی دەستپێکردنی شەڕێکیان دا کە پاشتر هەشت ساڵانی خایاند و گەورەترین تراژیدیای ئینسانی و گۆڕنکاریی هەمەلایەنەی لە وڵات و ناوچەکەدا خولقاند.
ئەو جەنگە مۆرکی خۆی بە چارەنووسی هەمووولایەکەوە دا و هەموو هاوکێشە سیاسی، سەربازی، ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی لاسەنگ کرد و هەموو پێشبینی و حیسابەتەکانی هەڵوەشاندنەوە.
جەنگی ئێراق/ئێران، لە مەودای کورتخایەندا، دەرگای رەحمەتێک بوو لە بزووتنەوەی سیاسی/ چەکداریی کوردستان کرایەوە و لە تەمەنی درێژخایەنیشیدا، پردێک بوو لە مەرگ و کوردی بەرەو دۆزەخەکانی ئەنفال پەڕاندەوە.
پارتی، تەواوی هێزەکانی خۆی هێنابوونە سەری جاسووسان و پشتی دۆڵەتوو و ناوچەی قەڵاتووکانیان گرتبوو. مەسعودبارزانی و ژمارەیەکی دیاری لێپرسراوانی پارتی هاتبوونە گوندی دۆڵەتوو و میوانی

«سۆسیالیست» بوون. چاوەڕێی شەڕێک بووین ئەگەر رووی دابا، دەبوویە شەڕی «سەرە»کان و کارەساتێک دەقەوما. لەژێر کار و پەروەشیی حیزبی شیوعی و بەشێک لە سۆسیالیست و هێزە سیاسییەکانی کوردستانی ئێران، پارتی هێزەکانی خۆی کێشانەوە و هاوزەمانیش ئێراق هێرشێکی گەورەی بۆ سەر بەرزاییەکانی مامەندە و گوندی شێنێ دەست پێ کرد. هێزەکانی پارتی کە بۆ داگیرکردنی سەرکردایەتیی یەکێتی هاتبوون، لەوبەرەوە شاهیدی شەڕی خوێناویی نێوان دەوڵەتی ئێراق و یەکێتیی بوون. هێزەکانی ئێراق شکان، هێزەکانی پارتی کشانەوە و پرۆسەی لێکۆڵینەوە و دادگاییکردنی کادر و لێپرسراوەکانی هەرێمی یەک لە سەردەستی لیژنەیەکی تایبەتی مەکتەبی سیاسی کەوتە گەڕ.

هەموو کادر و فەرماندەکانی هێزەکە بە (کۆمەڵە و ناکۆمەڵە) و حەمەی حاجی مەحمود و رەوفی خەلیفە سەعیدی ئامۆزا و جێگریشییەوە، لێکۆڵینەوەیان لەتەکدا کرا. لێکۆڵینەوەکان چەندرۆژێکیان خایاند و ئەنجام بەشی زۆری کادرانی کۆمەڵە و یەکێتی سزای هەڵپەساردن دران و سزاکە رەوف و حەمەشی گرتەوە.... دەبوو رەوف لە سەرکردایەتی بمێنێتەوە، حەمەی حاجی مەحمود، دەستبەرداری فەرماندەیی هەرێم بێت و لەگەڵ مەفرەزەیەکدا بگەڕێتەوە سنووری هەرێمی یەک و چاوەڕووانی هاتنەوەی مامجەلال بکات کە لە دەرەوەی کوردستان بوو. مەلابەختیار بۆ سەرپەرشتی و یەکخستنەوەی شیرازەی هەرێمەکە لەگەل هێزەکەدا بچێتە ناوچەکانی سنووری هەرێمی یەک.

زۆری نەبرد، رەوفی خەلیفە سەعید سەنگەری گۆڕی و خۆی گەیاندە گوندی گۆڕەشێر و ئەم کادرەی لەسەر میلاکی کۆمەڵە جێگری فەرمەندەی هەرێم بوو، بوو بە «سۆسیالیست»!

سەکردایێتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، بەیانێکی تایبەتی لەسەر ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان دەرکرد و ئاگاداری خەڵکی ناوچەکەی کرد کە چیتر «حەمە« بۆی نییە وەکو فەرماندەی هەرێم رەفتار و هەڵسوکەوت بکات.

حەمەی حاجی مەحمود، زەنگی جیابوونەوەی لێدا و لەگەڵ چەند مەفرەزەیەکدا پەیوەندییان کرد بە سۆسیالیستەوە.

ئەم جیابوونەوەیە، زیانێکی گەورە بوو لە یەکێتی و کۆمەڵە کەوت و لە ئامادەیی مامجەلالدا و مکوڕیی سەرکردایەتی کۆمەڵە و پێداگرتنیان لە ئاست مەکتەبی سیاسی و بزووتنەوە و خەتی گشتیدا، ئەنجام بە جێگایەک گەیشت، ئەگەر توندڕەویی ئێمەی کادرانی کۆمەڵە و لووتبەرزیی و خۆبەهەموشتزانینی «حەمە» نەبوایەن. دەشیا کار بەو جێگایە نەگەیشتبا.

لە ناخی ئێمەی کۆمەڵەدا، ئاگرێک لە دڵسۆزی و دورکانێک لە «ئایدۆلۆژیا»ی نێو کتێبان ئێڵەی دەهات و لە خەیاڵی «حەمە»شدا، ئەفسانەی غروور و خەونی بەسەرکردەبوون جۆشیان دەخوارد.

ئاخر حەمەی حاجی مەحمودیش، پاش دەربازبوون و گەڕانەوەی لە کارەساتی هەکاری، هەندەکجاران وەکوو سەرکردە سەرکەوتووەکانی «گریک»ی کۆن رەفتاری دەکرد. ئەو ئەگەرچی کەسێکی ئازا و بەتوانا و پڕهیمەت بوو، ئیسانش هەموو سەرکردەیەکی یەکێتیی بە سەرکردەی خۆی نەدەزانی.
ئێمەی کۆمەڵە، هەمیشە لە پێکهاتە و ستراکتوری یەکێتی و میکانیزمی کارکردنی سەرکردایەتییەکەی بەگومان بووین و لەوە دەترساین کە گەشەکردنی ئەو پێکهاتەیە، لە ئایندەدا کۆمەڵە بپێچێتەوە، هەربۆیە ئێمەش زیاتر پابەندی کۆمەڵە و سەرکردەکانی کۆمەڵە بووین و هێندەمان حیساب بۆ سەرکردەکانی بزووتنەوە و خەتی گشتی نەدەکرد، مەگەر کەسانێکیان کە خۆیان خەسڵەتەکانی سەرکردەیان هەڵگرتبوو.
خەسڵەتی بزووتنەوەی چەکداری وەها بوو، کەسێک کە ساڵانێک هاوڕێ، هاوسەنگەر و فەرماندەی هێزی تۆیە، دەبێتە فەرماندەی هێزی نەیار و سەنگەرت لێ دەگرێ، لێی دەکوژێت و لێت دەکوژێت! حەمە، هێزی سۆسیالیستی لە شارەزوورda بووژاندەوە، بەڵام هەرگیز نەیتوانی چۆک بە هێزی کۆمەڵە و یەکێتی دابدات. ئەگەرچی شەڕەکان خەست و خوێناوی بوون، ئیسانیش کۆنترۆڵی شارەزوور و هەورامان و شارباژێر لەدەست نەدران و پێچەوانەی بۆچوونەکانی (ڕۆژژمێری پێشمەرگەیەک/حەمەی حاجی مەحمود) کە وای نیشان دەدات، تا ئەو زەمەنەی ئەو فەرماندەی هەرێمی یەکێتی بووە، یەکێتیی نیشتمانیی هەمەکارە بووە و کە ئەو بووەتە «سۆسیالیست»، ئیدی تەرازووی هێز وەرگەڕاوە. من، ئێستەش پێم وایە، بنچینەی هێزی بزێوی هەرێمی یەک هەر لە دەستپێکی کارەوە، کادرە سیاسی و عەسکەرییەکانی کۆمەڵە بوون و ئەمەش کەمکردنەوەی دەور و سەنگی هیچ کەسێکی دیکە نییە، بەڵام هەورامان، شارەزوور، قەرەداخ و گەرمیان بنکەی هێز و توانستی ئایدۆلۆژیایەک بوون کە لەو ڕۆژگارە سەختانەدا، بەرهەمهێنی تێکۆشەرانێک بوون، ترس و ماندووبوونیان نەدەناسی و لە ڕوانگەی فیکری نێو کتێبانەوە، بەگژ هەر دیاردەیەکی دەرەوەی خۆیاندا دەچوون و «مەحاڵ»یان دەپێچایەوە.

## ئەوشیروان مستەفا لە دۆڵی گەڵاڵە!

لە گوندێکی شارباژێر بووین. کەسێک نامەیەکی هێنا و دایە دەستی مەلابەختیار. مەلا، نامەکەی کردەوە و لەگەڵ خوێندنەوەیدا، رووخساری خوێنی تێ دەزا و لە نێوچەوانیدا رووناوێک دەخوێندرایەوە. ئەو، چەند کەسێکمانی بانگ کردە لاوە و لە کاتێکدا جۆرێک لە حەپەسان لە چاوانیدا دەبینرا گوتی: کاک ئەوشیروان بە نهێنی و بێ ئاگاداری ئێمە هاتووەتە خوارەوە و لەگەڵ یەک پێشمەرگەدا گەیشتووەتە دۆڵی گەڵاڵ. ئەو، بۆ کاروباری تایبەتی خۆی هاتووە و کەسی ئاگادار نەکردووە. ناوچەکە تەنیا یەک مەفرەزەی ئێمەی لێیە و دیار نییە داخۆ مەفرەزەکە لەگەڵ ئەودان یان نا! هێزێکی سۆسیالیستیش بە بەرپرسیارێتیی مولازم تایەری عەلی والی، قادرجەباری و رەوفی خەلیفەسەعید لە سەرکردایەتیی خۆیانەوە هاتوونەتە خوارەوە و لەگەڵ حەمەی حاجی مەحمود یەکیان گرتووەتەوە و لەو ناوچەیەدان.

گوند بە گوند و یەکوچان لەژێر لێزمەی باراندا، بەرەو رەزڵە و لەوێوە بۆ دۆڵی گەڵاڵ و گوندەکانی پەرخ و بیوەک وەرێ کەوتین. ئێمە گەیشتین و ئەوەی نەدەبوو روو بدات، رووی دابوو... هێزەکان پێکدا هەڵپژابوون. شەوی پێشتر، هێزەکانی یەکێتی، مەفرەزەیەکی سۆسیالیستیان لە گوندی بیوەک چەک کردبوو... رۆژی دوایی، هێزەکان لە دۆڵی گەڵاڵ و دەوروبەری «قەڵای سرووچک» لەگژ یەکدی را چووبوون و ئەوشیروان لەگەڵ حەمەی حاجی سابیر و دوو پێشمەرگە دابڕابوون وچووبوونە گوندی قەویلە و ماڵی «حاجی عەلی»یان کردبوویە پەناگای خۆیان.

دیارە، ئەوشیروان نە پلانرێژی شەرەکەی کردووە و نە سەرکردایەتی. ئەو سات و وەختێکی نالەباری بۆ هاتنەخوارەوە و گەیشتن بۆ ئەو ناوچەیەی هەڵبژاردبوو.

ئەوشیروان، بەمەبەستی ئاشتی و چارەسەرکردنی بارە ئاڵۆز و گرژەکە، نامەیەک بۆ ملازم تایەر دەنووسێ... خودی ئەو نامەیە هێزەکانی سۆسیالیست بۆ پەناگاکە کێش دەکات و ئەوشیروان بە داوی سۆسیالیست و حەمەی حاجی مەحمود دەخات!

دەستگیرکردنی ئەوشیروان، لە گەمەی خوێناویی سیاسەتی ئەوێ رۆژێی کوردستاندا و لەو قەیرانەی حەمەی حاجی مەحمودی تێ کەوتبوو، دوو «ئاس»ی دایە دەست حەمە و لە هەر دانووستاندن و گفتوگۆیەکدا، دەهات مەرجەکانی خۆی بسەپێنێت.

هێزەکانی قەرەداخ، شارباژێر، هەرێمی سێ، چوار و بەشێک لە هەرێمی یەک و هەورامان بە ئامادەبوونی مەلابەختیار، سالارعەزیز، ئازادهەورامی، جەمالی عەلی باپیر، مستەفاچاورەش، بەکری حاجی سەفەر

و زۆر کادر و لێپرسراوی دیکەش لە شارباژێر کۆبوونەوە و لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە فشار بۆ سۆسیالیست بهێنن و کێشەکە بەلادا بخەن. لەولاشەوە، حیزبی شیوعی، جەمال ئاغا، کاوەی شێخ لەتیف و کەسانی دیکەش لە هەوڵدا بوون. حەمەی حاجی مەحمود داوای هەموو چەکەکانی هەرێمی یەکی دەکرد و دەبوو یەکێتی، حسک لە ناوچەکەدا بە رەسمیی بناسێت و هەوڵ ئەدا کێشەی بۆ دروست بکات. هێزەکانی یەکێتی، لەبەر پاراستنی گیانی نەوشیروان، پرکێشیی شەڕ و پەلاماریان نەدەکرد و حەمەی حاجی مەحمود گوتەنی:(ڕۆحی کۆمەڵە لە دەست ئەواندا بوو!). سۆسیالیست، نەوشیروانیان لەگەڵ خۆیان بردە شاخی سوورێن و ئەو بارودۆخەی دەروونییەی ئێمەی تێدا دەژیاین، مانگێک زیاتری خایاند.
لە بارەگاکانی بناری ئەودیوی چیای بالانبۆ بووین، مەفرەزەیەک لە شارباژێڕەوە هات و هەواڵی دەربازبوونی نەوشیروانی بۆ هێناین.
ئەو هێزەی هەورامان کە لە بناری بالانبۆ بووین، لەگەڵ مەفەرزەکەدا، ئێوارەیەک لە چیاوە بەرەو شارەزوور داگەڕاین. هێزیکی پەنجا تا شەست کەسی دەبووین و دەبوو هەموو تەختایی شارەزوور بێنەوەی لەگەڵ سۆسیالیست بەیەکدا بدەین، ببڕین و بگەینە شارباژێر. لەژێر چەتری تاریکیدا، جادەی قیر دەبڕین و دوور لە گوند و ناوەدانییەکانی شارەزوور، دەگەینە «کوڵکنییەکان». هەمانشەو لە ڕووباری «زەڵم» دەپەڕینەوە و لە گوندی «دۆلاش» ئۆقرە دەگرین. تاریکوڕوونی بەیانی، ڕەوفی خەلیفە سەعید و پێنج چەکدار، بێئاگا لە بوونی ئێمە دێنە گوند و دەچنە ماڵی حەمە دۆلاشی. حەمە، کە ئەندام و کادری جەماوەریی کۆمەڵە و خزمی نزیکی حەمەی حاجی مەحمەد بوو، ئیدی ڕاستەوخۆ ماڵەکەی بنکەی سۆسیالیست بوو.
کادران و لێپرسراوە عەسکەرییەکانی ئێمە، سیخناخ لە توورەیی و گیانی تۆڵەسەندنەوە، پێیان وابوو نێچیرێکی زیدەچەوریان بەردەست کەوتووە و ناکرێت لە دەستی بدەن. چواردەوری گوند و ماڵی حەمەدۆلاشی گیرا و چاوەڕوانی فەرمانیان دەکرد. ئێمە کۆبووینەوە و دەبوو بڕیارێک بدەین. جگە لە فەرەیدون حەمەساڵەح و من، هەموویان ڕایان وابوو هەوڵ بدەین بە دیلیان بگرین و ئەگەر سەرەڕۆییان کرد بیانکوژین! من و فەرەیدون دژ بووین. من پێم وابوو چیدیکە خوێنەکان نوێ نەکەینەوە و ئازادبوونی نەوشیروان بکەینە خالی پێکهاتن و ئاشتبوونەوە و دۆخەکە سەختتر و دژوارتر نەکەین. لە بەرانبەر سووربوونی بەشێک لە کادرەکان لەسەر شەڕ و خوێنڕژتن، من گوتم: لەبەردەم سەرکردایەتی و کاک نەوشیرواندا، بەرپرسیاریی کارەکە لە ئەستۆ دەگرم و دەڵێم من دژی لێدانیان بووم. ئیدی ئاگادارمان کردن کە گوندەکە بەجێ بهێڵن و ژیانیان دەپارێزین. ئەوان بە ترس و لەرز و وریاییەکی زۆرەوە لە گوند دەرچوون. خەڵکی گوندیش هەڵویستەکەی ئێمەیان پێ

خۆش بوو. ئاوا دەستمان بە خوێنی رەوف و ئەو پێنج چەکدارە سوور نەبوو. رەوف پاش چەند رۆژێک و هەر لە شارەزوور و لە نزیک ئەو جێگایە، کەوتە بۆسەی جاشەکان و بەداخەوە شەهید بوو! بە درێژایی سالانی شاخ و شەڕی یەکترکوشتن، من یەک جووتیاریشم نەدیت، بە کوشتنی کورد و سەرکەوتنی لایەنێکی کوردکوژ دڵخۆش بێت.
ئێمە گەیشتینە شارباژێر، نەوشیروان گەڕایەوە سەرکردایەتی. هێزەکانی یەکێتی بڵاوەیان لێ کرد و دۆخێکی نە شەڕ نە ئاشتی لە نێوان ئێمە و سۆسیالستدا درووست بوو.

شیرازەی هێز و رێکخستنەکانی هەرێمی یەک رێک خرایەوە و مەلابەختیار نزیکەی دوو مانگێک لە ناوچەکە مایەوە. من، وەکو لێپرسراوی سیاسیی کۆمەڵە و یەکێتیش بەسەر ناوچەکەدا ڕادەگەیشتم و پێیەکم لە هەورامان و ئەویدیم لە شارەزوور و شارباژێر بوو. جارێ کەرتەکانی رێکخستنی کۆمەڵە دانەمەزرێنرابوون. ئۆرگانی رێکخستنی کۆمەڵە لە ناوچەکەدا، شانەیەکی سەرەکی بوو کە بۆ خوارەوە شۆڕدەبوویەوە و لە سەرێ را، پەیوەندیی لەگەڵ کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵە هەبوو.
ئێمە جگە لە سەرپەرشتیکردنی رێکخستنەکانی دەرەوە و ناو هێزی پێشمەرگە، لە شار و شارۆچکە و ئۆردووگا زۆرەملێکانیشدا هێڵی رێکخستنی چالاکمان هەبوون و ئەوان رۆڵی گرنگیان لە کار و خەباتی ئێمەدا دەگێڕا.

# کۆنفرەنسی یەکەمی
# کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانی ئێراق/ ئایاری ١٩٨١

لە هەوارمانەوە بۆ نێوزەنگ و ئامادەبوون لە کۆنفرەنسی کۆمەڵەدا، لانیکەم هەفتەیەک رێگابڕینی گەرەک بوو. نوێنەرانی کۆنفرەنسمان بە پێی ئەو مەرجانەی «ناوەند» دیاریی کردبوون، ئامادەکردبوون. مەرجی بەشدارییکردن لە کۆنفرەنسدا، بۆ ئەندامانی کۆمەڵەی نێو هێزی پێشمەرگە، سێ ساڵ ئەندامبوون و تەسلیمنەبوونەوە بوو بە رژێم.

نوێنەرانی کۆمەڵە، کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتن دەگەیشتنە نێوزەنگ و نوێنەرانی شارەکانیش بە دەمامکەوە ئامادەبوون و مالیمۆس کە کوێستانێکی زیدەسەخت و جوانی پشت گوندی کانیزەردی ناوچەی سەردەشت و نزیک بارەگاکانی سەرکردایەتی هەڵکەوتبوو، بوویە هەواری کۆبوونەوەکانی یەکەمین کۆنفرەنسی کۆمەڵە کە لەوێدا بۆ یەکەمجار و بە ئاشکرا نزیکەی ١٨٥ئەندام و نوێنەری کۆمەڵە بە خەون و دید و گرفت و کێشە فیکری ، سیاسی، رێکخراوەیی و شەخسییەکانییانەوە رووبەڕوو دانیشتن و بۆ سێ یاخود چوار رۆژ سەرگەرمی لێدووان و مشتومڕ و شەنوکەوکردنی مێژوو، فیکر، سیاسەت، بەرنامە، رێکخستن، راگەیاندن، کاروباری چەکداریی کۆمەڵە و یەکێتی، بازنەی پەیوەندییە رێکخراوەیی و نێشتمانییەکان، کێشە و گرفتە ناوخۆییەکان، ململانێ و ناکۆکییە ناوەکییە رێکخراوەیی و شەخسییەکان بوون.

لە کۆنفرەنسدا، مێژووی دامەزراندن و خەباتی کۆمەڵەیان گێڕایەوە و باسیان لە هەوڵەکانی سەرەتا و ئەو گرووپانەیان کرد کە بە یەککگرتنیان لەهەناوی باڵی مەکتەبی سیاسی پارتیدا و لە ساڵی ١٩٧٠دا، کۆمەڵەی مارکسی_لینینییان

دامەزراندووە. ئەم گێڕانەوە رەسمییە، هەر یەک لە مامجەلال، نەوشیروان مستەفا و شەهابی شێخ نووریی بە لێپرسراوی گرووپێک لەو گرووپانە ناوبێر کرد و ئەوانی بە دامەزرێنەرانی کۆمەڵە ناساند. کۆمەڵە، لە هەلومەرجی خەباتی نهێنی و سەختی شاردا و لە هەناوی خۆیدا کۆمەڵێک ناکۆکی و ململانێی هەڵگرتبوو کە لەسەرەتای هەفتاکاندا، تا ئاستی دەرچوون و جیابوونەوەی گرووپێکی بچووک لە کۆمەڵە هەڵکشابوو. ئەو گرووپە تێگەیشتن و تەفسیریان بۆ کۆمەڵە و پاشەڕۆژی خەباتی ئەم رێکخراوە لەو روانگەیەوە بووە کە کۆمەڵە پەرچەکرداری شکستخواردنی سیاسەتی جەلالیزمە لە واقیعی سیاسیی بزوتنەوەی کوردستاندا و پاشان دەبێتە دارێکی ئەفسووناوی بۆ زیندووکردنەوەی جەلالیزم لە شیوە و ناوەڕۆکێکی دیکەدا. ئەم گرووپە خۆشیان بە ئاکامێک نەگەیشتن و هیچیان لێ

سەوز نەبوو.
کۆمەڵە لەسەر هەر بنەما و بۆ هەر مەبەستێک دامەزرێنرابێت، پێشهات و ڕووداوەکانی ساڵانی هەفتاکان و هەرەسی بزووتنەوەی چەکداریی کورد، زەمینەیەکی لەباریان بۆ گەشەکردنی فیکری و ڕێکخراوەیی کۆمەڵە سازاند. زەمینەیەک، کۆمەڵە تێیدا بوویە دیاردەیەکی فیکری و سیاسیی نوێ لە کوردستاندا و دید و دنیابینییەکی سیاسی و فیکریی وەهای خولقاند کە بە سەرەتاکانی خۆی نامۆ بوو. کۆمەڵە، دەهات ببێتە هێزێکی سیاسی و فیکریی نوێخواز و بێوێنەی ڕۆژگاری خۆی و پێداویستییەکی هەرەگرنگی ئەو سەردەمەی خەبات. کۆمەڵە، لەسەرەتای سەرەتاکاندا، فیکر و بەرنامەی ناڕوون و تەمومژاوی بوو. ناو، بەرنامە و سنووری کارکردنی دیار نەبوو... ناوی سەرەتای کۆمەڵە (کۆمەڵەی مارکسی _ لینینی / بیروباوەڕی ماوتسی تۆنغ) بوو.
کۆنفرەنس، پاشگری ئێراقی لە کوردستان کردەوە و ناوی کۆمەڵەی کرد بە (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان) و ئەمیش هەڵلای لێ کەوتەوە.
کۆنفرەنس، ئەگەرچی پاشی مشتومڕ و بێنەوبەرەیەکی زۆر، هەندەک لە سەرخەتە گشتییە فیکری و سیاسییەکانی کۆمەڵەی ئەخشاندن و جێگری کردن، بەڵام داڕشتنی بەرنامەیەکی تێروتەسەل و هەمەلایەنی کۆمەڵە، بۆ کۆنفرەنسی دووهەم بەجێهێڵرا.
هەر سێ گرووپەکەی کۆمەڵە (گرووپی زیندان، کۆمیتەی هەرێمەکان «خەتی شەهیددارام» و گرووپی نەوشیروان مستەفا)، لە هەوڵی بە فیکرکردن و بە سیاسیکردنی ناکۆکییەکاندا بوون. لە ڕاستیدا گرفت و کێشەی فیکری و سیاسی زۆر بوون و کێشە و ملانێی دەسەڵاتیش لەمێژ بوو سەریان هەڵدا بوو.
کۆمیتەی هەرێمەکان، بە هیوا بوون، کۆنفرەنس هەڵسەنگاندنێکی ورد بۆ قۆناغی ناوەڕاستی هەفتاکان و هەڵویستی سەرکردایەتیی کۆمەڵە و هەوڵی شکستخواردووی ئەوان بۆ جێهێشتنی کوردستان و پاشان دەستگیرکردنیان لەلایەن ڕژێمی شا و تەسلیمکردنەوەیان بە بەعس، ڕووداوەکانی ناو زیندان، ئیعدامکردنی شەهاب و جەعفەر و ئەنوەر، هەڵویستی سەرکردەکانی دیکە لە زینداندا و چۆنییەتی بەڕێوەچوونی پرۆسەی دادگاییکردنەکان بکات و هەموو ئاڵۆزی و نادیارەکان ئاشکرا بکات. کەسەکان و خاوەن را و بۆچوونەکان ئامادە بوون، بەڵام هەرگیز زاتی ئەوەیان نەکرد و نهێنییەکانی ئەو قۆناغە ناسک و دژوارەیان هەر بە نهێنی و مەتەڵ هێشتنەوە.
لە گێڕانەوەی مێژووی کۆمەڵەدا، جیابوونەوەی ڕێکخراوی ڕەنجدەران (١٩٧٥_١٩٧٦)، بایەخ و گرنگیی پێ نەدراو وەکو پێویست تیشکی لەسەر نەخرا. دەرچوونی ڕەنجدەران لە کۆمەڵە، بنەما و هۆکاری فیکری و سیاسیی هەبوو. ئەگەرچی کادرەکانیان لێوەشاوە و بەتوانا نەبوون و بە

گرتنی کەسی یەکەمیان»ئیبراهیم حەسەن«، گورزێکی کوشندەیان لە خۆیان و لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە وەشاند و سەدان و کادر و ئەندامی کۆمەڵەیان بەگرت و ئیعدامکردن دا، ئیسانیش چەند مەفرەزەیەکیان ناردە شاخ و ئەوانیش هەرزوو سەریان تیدا چوو! ڕێکخراوی ڕەنجدەران. کێشەیان لەگەڵ قەوارەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و
سەربەخۆیی کۆمەڵەدا هەبوو.

## کێشە فیکرییەکانی کۆمەڵە و کۆنفرەنس:

•ناوی کۆمەڵە: کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان یاخود کوردستانی ئێراق!*
•ستراتیژی کۆمەڵە و بەرنامەی لانیکەم و لانیزۆری کۆمەڵە.
•پۆلێنکردنی ناکۆکییەکان(ناکۆکیی سەرەکی و ناکۆکیی لاوەکی).
•سەربەخۆیی کۆمەڵە و قەوارەی یەکێتی و بازنەی پەیوەندییە نیشتمانییەکان.
•کاڵکردنەوە یاخود تۆخکردنەوەی پرەنسیپە فیکرییەکانی مارکسیزم/لینینیزم لە بەرنامەی کاری سیاسی و ڕێکخراوەیی کۆمەڵەدا.

گرووپی ئەوشیروان و گرووپی زیندان، جەختیان لەسەر کوردستانیبوونی ناوی کۆمەڵە دەکرد و لایەنگری قرتاندنی پاشگری «ئێراق»بوون. بەشێک لەو گرووپەی خۆیان بە میراتگری کۆمیتەی هەرێمەکان و خەتی «ئارام» دەزانی، لایەنگری (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان_ ئێراق) بوون و ئەمەش دەلالەت و مەغزای فیکری و سیاسیی خۆی هەبوو. ئەمان جەختیان لەسەر قوڵکردنەوەی فیکری مارکسیزم، پاراستنی سەربەخۆیی کۆمەڵە و نەتواندنەوەی لە بۆتەی یەکێتیدا و درێژەپێدانی سەرخەتە فیکری و سیاسییە سەرەکییەکانی ڕێبازی «ئارام» دەکرد و پێیان وابوو بازنەی پەیوەندییەکانی کۆمەڵە، لە کایەی بزووتنەوەی نیشتمانیدا، دەبێت سنووری یەکێتی بەزێنێت و واوەتر بکشێت.
گرووپی زیندان، پێی وابوو، ناکۆکی سەرەکیی کۆمەڵە و بزووتنەوەی کورد، دەبێت لەگەڵ ئیمپریالیزم سەرەکی بێت و لەگەڵ بەعسدا ناسەرەکی!
ئەوشیروان، پێی وابوو ناکۆکی لەگەڵ پارتی و ماڵباتی بەرزانیدا
سەرەکییە و ئەوان لەبەرەی دژەشۆڕشدا وەستاون!
کۆنفرەنس، مەکۆی توێرڕێزەکردنی ناکۆکییە فیکری و سیاسییەکانی دەروونی کۆمەڵە بوو کە پاشتر ڕێباز و ڕێچکەی نەشیاو و نادرووست بۆ چارەسەرکردنیان پراکتیزەکران و چەندساڵ پاشتر، بزماریان لە تابووتی کۆمەڵە دا و لە پێچێکی مێژوودا ناشتیان.

•ناکۆکییە شەخسییەکان (ململانێی دەسەڵات)

کۆمەڵە، مێژوویەکی ١٣ساڵەی لە خەباتی فیکری، سیاسی، رێکخراویی و ٥ساڵیشی لەخەباتی سەختی چەکدارایدا تێ پەڕاندبوو. رووداوە سیاسییەکانی ساڵانی هەفتاکانی کوردستان، بەناچاریی ناڵوگۆڕێکی چارەنووسسازی لە هەرەمی دەسەڵاتی کۆمەڵەدا کردبوو. مامجەلال و نەوشیروان، لە سەرەتای هەفتاکاندا و پاش دامەزراندنی کۆمەڵە، کوردستانیان جێ هێشتبوو. لە ساڵی ١٩٧٥دا، هەموو سەکردایەتیی کۆمەڵە کوردستان جێ دەهێڵن و پاشتر لەلایەن رژێمی شای ئێرانەوە تەسلیم بە دەڵەتی ئێراق دەکرێنەوە و سێ لە سەرکردەکان(شەهابی شێخ نووری، جەعفەر عەبدولواحید و ئەنوەر زۆراب) لە سێدارە دەدرێن و دەبنە سیمبۆلی خۆڕاگری و بەرخۆدان و پرۆسەی (کەمژیان و کەڵژیان)، دەکەنە نەریت و سەرمەشقی خەباتی کۆمەڵە. ئەندامانی دیکەی سەرکردایەتی کە گیان دەرباز دەکەن، چوارساڵان لە زینداندا دەگوزەرێنن و پاشتر بەر لێبوردنێکی «سەدام» دەکەون و دێنەوە شاخ.

لە ماوەی ئائامادەیی سەرکردایەتیی کۆمەڵەدا، زەمینەی دەرکەوتنی شەهیدئارام و کۆمیتەی هەرێمەکان دەرەخسێت و ئەمان لە دژوارترین دۆخی کۆمەڵە و هەلومەرجی سەختی کوردستاندا ڕابەرایەتیی کۆمەڵە و هێزەچەکدارەکانی دەکەن و بەکردەوە دەسەڵاتی باڵای کۆمەڵە بە دەستەوە دەگرن. کۆنفرەنس، پانتاییەک بوو بۆ خەباتی مامجەلال، نەوشیروان و گرووپی زیندان بۆ وەرگرتنەوەی دەسەڵاتێکی موتڵەق کە رۆژگاری پێشتری کوردستان لێی زەوت کردبوون و واوەتریش، لاوازکردنی پێگەی دەسەڵاتی ئەو گەنجانەی کە لە دۆخێکی نائاسایی کۆمەڵەدا و بە هەوڵی خۆیان هەم دەسەڵاتیان وەرگرتبوو و هەمیش کۆمەڵێک پرەنسیپی فیکرییان لەسەر پاشخانی فیکری «ئارام» لەنێو ڕیزەکانی کۆمەڵەدا، جێگیر کردبوو.

ئازادبوون و هاتنەشاخی گرووپی زیندان بە کۆمەڵ، جۆرێک مەترسیی لەسەر دەسەڵاتی ئەوانە درووست کردبوو کە ناسنامەی فیکری (ئارام)یان لە گیرفان نابوو، ئەمانیش بە پێی سەرەتاکانی گەمەی دەسەڵات، سەرسەختانە خەباتیان دەکرد و ناکۆکییان لە رێباز و بۆچوون و پێگەی خۆیان دەکرد.

سالارعەزیز، مەلابەختیار و فازیل کەریم بە پشتیوانیی چەندین سەرکردە و دەیان کادری کۆمەڵە، لە هەوڵی نەگەڕانەوەی بەقەولی شەهیدئارام (کۆمەڵەی عەهدی بایید)دا بوون! ئەمان، جڵەوی ململانێکەیان وەدەستەوە گرتبوو.

دیلکردنی نەوشیروان مستەفا لەلایەن هێزەکانی سۆسیالیستەوە، یەکێک بوو لە کێشە سەختەکان و لە بەرگی ناکۆکییە شەخسییەکاندا نیشان دەدرا. کورتییەکەی، سالار و مەلابەختیار کە لەو سەروبەندەدا،

لێپرسراوێتیی هێزەکانی یەکێتییان لە شارباژێر لە دەستدا بووە، بە جۆرێک مامەڵەیان لەتەک کێشە و رووداوەکاندا کردووە کە بەرەو لەناوبردن و ئیعدامکردنی نەوشیروان، سەربکێشن!
ئەم مەسەلەیە، کەسانیکی ماستاوچی دەیانورووژاند و دەچوونە بنکڵێشەی نەوشیروان و پفیان دەدا. ئەم کێشەیە، نیوەرۆژێکی خایاند و ویڕای بوونی چەندین بەڵگەی دژ بەم بۆچوونە ناڕاستە، دیسانیش نەوشیروان ئامادە نەبوو بیسەلمێنێت.
وتارێکی فازیل کەریم، لەمەڕ ئۆپۆرتۆنیزم، کە وا لێک دەدرایەوە لە ناتامادەیی نەوشیرواندا دژ بە نەوشیروان نووسرابێت، نان و ناوی لێ کردین بە ئۆپۆرتنیزم و هەلایەکی لێ کەوتەوە، نووسەری دیار نەبوو.
کێشەکان، لەسەروبەندی هەڵبژاردندا، بە جێگایەک گەیشتن کە کارەکانی کۆنفرەنسی بۆ دوو رۆژ دواخست.
نەوشیروان، جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە ئەو لە کۆمیتەیەکی سەرکردایێتیی کۆمەڵەدا کار ناکات کە سالار و فازیل کەریمی تێدا بن! هەر کەسێک دەنگ بە ئەوان دەدات با دەنگ بە نەوشیروان نەدات!
هەوڵی نیازپاکان و نیازچاکان و پرۆسەی ئاشتەوایی و چاکخوازیی دۆخەکە کەوتنە گەڕ. وەلێ لەو کۆبوونەوەدا کە بەندە هاوڕێی ملازم عومەر، ئازادهەورامی، بەکری حاجی سەفەر و لێپرسراوانی دیکەش ئامادەبووم، نەوشیروان، لە ڕایەکانی خۆی پاشەکشەی کرد و ئامادەیی ئەوەی نیشان دا کە لە بەشی دووەمی پرۆسەی هەڵبژاردندا، کارێک بکات هاوکێشەکە هاوتا بکاتەوە. فازیل کەریم، سالار عەزیز و ملازم عومەر و سەرکردەکانی دیکەش کە
دەنگی پێویستیان لە هەڵبژاردندا نەهێنابوو، بۆ جاری دووەمیش کە هەڵبژاردن کرایەوە، ئەوان خۆیان هەڵنەبژارد و ئیدی
نەتوانرا سەرکردایێتییەکی شیاو لە رووی ژمارە و چۆنایێتییەوە بۆ کۆمەڵە هەڵبژێررێت.
لەو جۆرە کۆنفرەنسانەدا، هێندەی پەیوەندییە تایبەتەکان و مەحسوبییەت ڕۆڵ لە پرۆسەی هەڵبژاردن و یەکلاکردنەوەیدا دەگێڕن، نیوەهێندە زانایی و لێوەشاوەیی و تواناکان گرنییان نییە، دەنا چۆن دەبێت کەسێکی وەکو دکتۆر کەمال خۆشناو کە لەو کۆنفرەسەدا
وەکو ئەندامی کۆمەڵە خۆی ناساند و ئامادەیی نیشان دا کە خۆی بۆ کاروباری کۆمەڵە تەرخان بکات، لوتکەی دەنگەکان بە دەست بێنێت و کەسانێکی وەکو سالارعەزیز، ئازادهەورامی و مولازم عومەر دەنگی پێویستیان پی نەدرێت.

کەسانێکی زۆر لە هەردوو گرووپی زیندان و «ک. هەرێمەکان» کە پێشتر سیفەتی ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵەیان هەبوو، لەم کۆنفرەنسەدا وەلا نران.
کۆنفرەنس، لە بواری سیاسیی و ڕێکخراوەییدا کۆمەڵێک بڕیاری وەرگرت، بەڵام هەڵوێست بەرانبەر پارتی و سۆسیالیست، هیچ نەرمییەکی لەخۆ نەگرت.
لە بواری ڕێکخراوەییدا، ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لەسەر بنچینەی کەرت، پۆل، شانەی سەرەکی و شانە، ڕێکخرانەوە. کەرتی ڕێکخستنەکان لەسەر بنچینەی سنووری ئیداریی قەزاکان دانران و ڕاستەوخۆ پەیوەندییان لەگەڵ ناوەندی کۆمەڵە هەبوو. لێپرسراوێتیی کەرتی ڕێکخستنی هەڵەبجە کە سنوورێکی تاڕادەیەک فراوانی هەبوو، بە من سپێردرا.

* لە یاد و یادەوەرییەکانی یەکەمین کۆنفرەنسی کۆمەڵەدا کە ئێستا ٢٦ساڵیان پێچاوەتەوە، جێگای سەرنجە باس لەوە بکەم کە بەشێک لەو مەسەلە فیکرییانەی ئەوسا مشتومڕیان لەسەر بوو، بە ئانقەست و بۆ موزایەدە و پشتشکاندنی گرووپی نەیار دەهرووژێنران، بۆ نموونە: ئاڵاهەڵگران و تیۆریستانی کوردستانیبوونی کۆمەڵە و ئەوەی کە مەسەلەی کورد یەک مەسەلەیە و ناکرێت پارچە بکرێت، لە ڕۆژگاری ئێستادا، لە عەرەبان ئێراقچیترن، هەندێک لەوان، کە کتێبانیان لەسەر یەکتۆزیی مەسەلەی کورد دەنووسی، ئێستا ئەندامی پەرلەمانی ئێراقن و ئەگەر شتێکی زیاتریان بدەنێ، دیزداشە دەپۆشن و عەگاڵیش لەسەر دەنێن! لە هەلومەرجی شاخدا، ئەگەر ئێراقی بایت یاخود کوردستانی، شتێکت نەبوو بیدۆڕێنیت، هەروەها کوردیش هیچی نەدەدۆڕاند، وەلێ ئێستا ئێراقیبوون، دەتکاتە گەورەترین سەرمایەدار و کوردستانیبوونیش خودا دەیزانێ چت بەسەر دێنێ... لە هەلومەرجی پاش ڕاپەڕیندا، بینینی سیاسەت لە دیدی کوردستانیبوونەوە دەکرا کورد بە هەوارێک بگەیەنێت، کەچی سیاسەتمەدارانی کوردی بۆ دەسەڵات و سەرمایە مردوو، بە خوێنی کورد و بۆ بەرژەوەندیی خۆیان، ئێراقێکیان درووست کردەوە، کە ٨٥ساڵ بوو خەونمان بە رووخاندنییەوە دەبینی...

* * *

کۆنفرەنس، وێڕای گرفت و کێشە و ململانێکانی، بۆ من ئەزموونێکی نوێی زیندەگرنگ بوو. لە کۆنفرەنسدا ڕووبەڕوو لەگەڵ سەرکردە و کادرەکانی سەرتاسەری کوردستان ئاخاوتین و گوڕ و تینێکی بەرچاومان بەیەکدی دا. کۆنفرەنس هێز و بەرچاوڕوونیی پێ بەخشین و هێڵەکانی خەبات و ململانێی فیکری و سیاسیی زەقتر کردنەوە.
لە کۆنفرەنسدا، ئاستی فیکری و سیاسی و کارەکتەری کەسایەتیی کادر و سەرکردەکانم درک کردن و تێگەیشتم کە وێناکردنەکانی من، لە دوورەوە، بۆ زۆر دیاردە و کەس و سەرکردە لە جێگای خۆیاندا

نەبوون.
من، دووساڵ پێشتر و لە پاییزی ١٩٧٩دا، لەسەروبەندی کێشەکانی هەرێمی یەک و حەمەی حاجی مەحموددا، لە دانیشتنێکی تایبەت بەو کێشانە لەگەڵ مامجەلالدا، هەموو وێنە ڕەنگینەکانی فەنتازیای شۆڕشی نێوکتێبانم دڕاندن و درکم کرد کە گۆڕان و نوێخوازییە جارڕبۆدراوەکانی شۆڕشی نوێ، جگە لە ورێنەی شۆڕشگێڕانە شتێکی دیکە نین و ئەو پارچەبوونەی بزووتنەوەی سیاسیی شەستەکانی کوردستان، قەیرانەکانی لە فۆڕمێکی نوێدا درێژەیان هەیە. ئەوسات نامەیەکم بۆ «عومەرحەمەساڵەح» کە ئەندامی یەکێک لە کۆمیتەکانی کۆمەڵە بوو لە شاری سلێمانی نووسی و نیگەرانییەکانی خۆمم لەمەڕ جیاوازییەکانی شار و شاخ و کێشە و گرفت و بێهیواییەکان بۆ روون کردنەوە...(هیچ وەرچەرخان و دابڕانێک لەنێوان کۆن و نوێدا نابینم. مامجەلالی شەستەکان و هەفتاکان، لە نێوەرۆکدا یەکدییان جێ نەهێشتووە! کۆمەڵە هەمووشت و هەمەکارە نییە. ئەوی لەنێو ڕێکخستنەکانی شاردا باسە، لێرە پێچەوانەی ئەوێ، هەمان کۆنەحەمام و هەمان تاسە! من تا سەر ئێسک بێهیوام و چ ئاسۆیەک بۆ نوێخوازی نابینم. دیسانیش هەر بەردەوام دەبم و ڕێگایەکی گرتوومە، بە زیندوویی نایگۆڕم. وەک وەفایەک بۆ خوێنی ئەو هاوڕێیانەی لە شاخ و شار ونم کردن، تا شەهیدبوون دەست لە شاخ بەرنادەم!). من نامەکەم بەم مانا و نێوەرۆکە نووسی بوو. وێرای ئەو قەیرانە فیکری و دەروونییەی پاش ساڵێک لە خەباتی شاخ تێی کەوتبووم، دیسانیش پێم وابوو، هێشتا بوارێک بۆ هەوڵ و کۆشان ماوە و ڕیزەکانی کۆمەڵە سەدان کادر و ئەندامی بەتوانا و تەندرووستیان تێداهەن کە بینە هەوێنی گۆڕانکارییەکان و ناسنامە و فیکر و ڕێبازی کۆمەڵە خورت بکەن و لە تەوژمی جەلالیزمی بپارێزن، کۆمەڵە ببێتە هێزێکی سەربەخۆی نوێخواز لە نێوان هەردوو قوتابخانە تەقلیدییەکەی بزووتنەوەی سیاسیی کوردستاندا.

***

مانگەکانی هاوین و پاییزی ساڵی ١٩٨١، خوێنی براکانیان لێ دەچۆڕا. بەرەی شەڕەکان دەهاتن فراوانتر دەبوون. لە گێڕانەوەی حیکایەتی ئەو زەمەنە خوێنلێتکاوە ماندووم. وێنەگرتنی وردينەی ساتەوەختی گیاندەرچوون و کوژانەوەی دواترووسکایی ژیان لە ڕووخساری براکاندا، ئێستاش، پاشی بیست و ئەوەندە ساڵان لە ناخەوە دەمهەژێنن و هەست بە کزانەوەی ویژدان دەکەم....
هیچ پاساوێک بۆ ڕژانی ئەو لافاوی خوێنە نابینمەوە. جگە لە باڵادەستیی کولتوورێکی خوێنتێزاوی سیاسیی نەبێت کە زەمەنی گۆڕانکاریە کولتووری و کۆمەڵایەتییەکان هێشتا بەشی وەرچەرخانێکیان نەدەکرد و ڕەگەز و فاکتەرە فیکری، سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەو بزووتنەوە چەکدارییە، کە لە پرۆسەی نوێکردنەوەدا تەنیا ڕواڵەت و خوازراو بوون و هیچ زەوینە و بنەمایەکی ماددیان نەبوو.

دانووستاندن. دیالۆگ و یەکترقەبوڵکردن لە پێناوی ئامانجێکی هاوبەشدا، مانایەکیان نەبوو. لە سەرەکاندا، هەستی خۆسەپاندن و ئەوی تر زەلیلکردن، بێهودەیی هەوڵدان بۆ کردنەوەی گرفنچکی مێژوو، داڕژتنەوەی مێژوو بە حەزی سەرۆکانێک کە هەستیان بە کەمایسی دەروونی و سیاسی دەکرد، دەجۆشا. بانگەشەی «کۆمەڵە» بۆ فیکری نوێ، ڕێبازی نوێ، دنیایەک و دیدێکی نوێ بۆ خەبات و شۆڕش، بە کەرەستە و ئامرازی کۆن و لەسەر زەوینەیەکی وێرانی کولتووری و کۆمەڵایەتیی سیخناخ بە ڕک و کینەی ئەو سەرکردانەی گرفنچکی «شەستەکان» دەمیزرواندن، مەحاڵ بوو بە خاڵێکی کوردخواز بگات.

کۆمەڵە، بۆ ئەوەی بیتوانیبا وەکو هێزێکی نوێی کاریگەر لە پانتایی بزوتنەوەکەدا ڕۆڵی بەرهەمداری هەبێت، پێویستی بە کۆمەڵێک سەرکردەی بەتوانا هەبوو کە پشتیان بە خۆیان و هێزی کۆمەڵە بەستبا و توانست و هەیبەتی خۆیان لە سێبەری مامجەلالدا نەدیتبا. سەرکردانێک پێویست بوون کە بتوانن سنوورەکانی نێوان خۆیان و مامجەلال، کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانی، تۆخ بکەنەوە و ڕێگا نەدەن یەکێتی لە گەڵ زەمەندا و لەسەرخۆ، کۆمەڵە حەپلووش بکات. سەرکردانێک وێڕای ئامانجی نێوکۆیی کۆمەڵە و یەکێتی، دەبوو هەمیشە جیاوازییەکان ببینن و بیانپارێزن. کۆمەڵە ئەگەرچی لە هەناوی باڵی مەکتەبی سیاسیی و فیکری جەلالیزمدا لەدایک بووبوو، بەڵام لە سەردەمی ڕێبەرایەتیی «ئارام»دا، وەرچەرخانێکی فیکری و سیاسیی بەرچاوی بڕیبوو. کۆمەڵە، «کۆمەڵەی عەهدی بایید»ی جێ هێشتبوو. بە داخەوە، پاش شەهیدبوونی ئارام، کەس نەیتوانی ئەو ئاڵایە بڵند ڕابگرێت، ئەوانەشی بۆ ماوەیەکی کورت لە هەوڵی جێنیشینیی ئارامدا بوون، شتاقیان شۆڕەسواری ئەو مەیدانە و سەرکردەی ئەو ئەرکانە نەبوون. ئێمە نازانین ئەگەر ئارام شەهید نەبووبا، کار چلۆن دەگوزەرا و چارەنووسی کۆمەڵە بە کوێ دەگەیشت؟! بەڵام هەموو ئەو دەکۆمێنتانەی لە ئارام بەجێماون، شتێکی پێچەوانەی دۆخی ئێستامان پێ دەڵێن! کەس نەیتوانی درێژە بە کاری فیکری و سیاسیی ئارام بدات. کەس وەکو ئارام بیرتیژ و باڵابەرز نەبوو، گەورەیی ئەو لە ژیان و فیکر و بینینیدا بوو بۆ شتەکان، نەک لە شەهیدبوونیدا. شەهیدبوون، ئارامی کردە ڕەمز، بەڵام تەنیا ڕەمز و هیچی تر، ڕەمزێک کە هەمیشە نەیارانی لە هەوڵی شێواندنیدا بوون!

## وێنە گەرلێنیشتووەکان
## «من لە وێنەکان ماندووم و ئەوان دەست لە ئێخەم ناکەنەوە!»

* «دەومرە»، کانی و باخێکی پایینی گوندی «مۆرینن»ی بناری چیای «باڵانبۆ» و کەناری ڕووباری «سیروان»ە. لەوێدا، کێڵەباخێکمان ئاوەدان کردووەتەوە و بووەتە بنکەیەکی سەرەکیی ئارامگرتنمان لە ناوچەی هەڵەبجە. لە هەورامان، شارەزور و شارباژێڕەوە دەگەڕێینەوە و لەوێدا پشوو دەدەین و خۆمان سازدەدەینەوە. لەسەر بانی کێڵەباخ دانیشتووم و سەرگەرمی نووسینی ڕاپۆرتێکم بۆ ڕێکخستنی شار. من، کە بە فەرمیی لێپرسراوی چەکداریی هێزەکە نیم، دیسانیش لە نەبوونی فەرماندەیەکی دیاریکراو بۆ هەرێم و دووریی ئەندامانی لیژنەی هەرێم، فەرماندەی کەرت و مەفرەزەکان، بۆ هەرکارێک پرس بە من دەکەن.

پێشمەرگەیەک دێت و دەڵێت: دەچینە ڕاوەماسی و دینامێت دەتەقێنین!

_ بڕۆن و ئاگاداری خۆتان بن!

مەفرەزەیەک بە کەرەستەی ماسیکوشتنەوە قەیتوولە دەبەستن و بەرەو سیروان دادەگەڕێن. کەسێکی دیکە دێت و دەڵێت: مامۆستا منیش دەمەوێت لەگەڵیاندا بڕۆم.

_ تۆ دوێنێ هاتوویت بۆ پێشمەرگایەتی و پێشم وا نییە مەلەوان بیت!

+ مەلەوان کە نیم، بەڵام با دوێنێ هاتبم، چ قەیدی هەیە؟

_ تۆ مەڕۆ بابە گیان، لێرە وەمێنی و چاوەڕوان بیت چاکترە....

ئەو دوور دەکەوێتەوە و منیش سەرگەرمی کاری خۆمم.

دەنگی دینامێت سیروان و باڵانبۆ دەهەژێنێت. سەرهەڵدەبڕم و چاوم لێیە پێشمەرگەکان ئامبازی شەپۆلەکان دەبن و ماسییەکان دەگرنەوە.

پێشمەرگەیەک لە ڕۆخی سیروانەوە هاوار دەکات و هیچ تێ ناگەین. ئەو نزیکتر دەبێتەوە و بە دەنگێکی شێواوەوە دەڵێت: ڕێبوار خنکا! فریا کەون!

ئێمە بە ڕاکردن دادەگەڕێین و بە ١٠دەقیقەیەک دەگەینە لایان. تەرمی ڕێبواریان لە بن گابەردێکدا داناوە و زیاتر لە بیست ماسی کە.هیچیان لە ٢٠ کیلۆ کەمتر نابن، لەو نێوەدا کەوتوون.

_ من گوتم با ڕێبوار نەیەت! ئەو تەنیا یەک ڕۆژە بووەتە پێشمەرگە!

+ خۆی هات... هەر کە ئەو هەموو ماسییەی بینی سەرئاو کەوتن، یەکسەر خۆی فڕێدایە ناو ئاوەکە و شەپۆلەکان گێژیان دا و بەهەزارحاڵ گرتمانەوە. لە تەرمی ڕێبوارم ڕوانی، دەمی کەفی سپیی چەڕاندبوو، نێوچەوانی بەر گاشەبەردەکانی سیروان کەوتبوو و دڕزی بردبوو.. ئەو گەنجە ١٧ساڵەی

پێش نیوسەعات لەگەڵ من دەدوا و هێزی جوانەگایەکی تێدا بوو، ئیدی تەواو! دوو ئێستریان هێنا و تەرمی ڕێبواریان لەیەکێکیان بار کرد و ئەوی دیکەش چەند ماسییەکیان بە دابەدڵی لێ دا و بەرەو بنکە هەڵگەڕاین. ڕێبوار قوتابییەکی خەڵکی تەوێڵە و لە خێزانێکی کۆمۆنیست بوو. نامەیەکم نووسی بۆ ماڵی باوکی ڕێبوار و ڕووداوەکەم بۆ ڕوون کردبووەوە و هەر ئەو ئێوارەیە بە مەفرەزەیەکدا ناردمە شار. چەند ناخۆشە هەواڵی وەها جەرگبڕ بۆ دایکوباوکێک بنێریت...(سبەینێ ئۆتۆمبیلێک بهێننە بناری بالآنبۆ و ئێمە لەگەڵ تەرمی ڕێبواردا چاوەڕێتانین. تکایە بە نهێنی وەرن و ئاگادار بن!)

مەفرەزەکە ڕۆیشت و منیش لەگەڵ مەفرەزەیەکی تر، تەرمی ڕێبوارمان بردە ناو گوندی مۆردین و لەبەردەرکی ماڵێکی نیمچەوێرانندا دامان نا و ئاگرمان کردەوە. پاییزێکی درەنگوەخت، هەوا ساردە و لەسەرخۆ باران دەبارێ. مەرگی ڕێبوار، ماسیخواردنی بیربردینەوە، بەڵام برسییەتی مەرگ و شەهیدبوون ناناسێت.

_ برسیمانە! دەچین و ماسییەک دەهێنین!

سێ پێشمەرگە ڕۆیشتن و پاشی نیوسەعاتێک بە ماسییەکەوە هاتنەوە کە من کەمتر ماسیی وەها گەورەم دیتبوو. ماسییان پارچەکرد و هاوێشتیانە نێو پۆڵووی وشکەداربەڕوو.

پێشمەرگە ئەگرچی هەمیشە لەگەڵ مەرگ و خوێن ئاشنایە، کەچی پێ دەچوو تەرمی ڕێبوار لە تاریکەشەوێکی پاییزدا، ترس و هەیبەتی خۆی هەبێت. هەستم دەکرد، پێشمەرگەکان دەیانەوێت بەجووت ئێشک بگرن و بە تەنیا زاتیان نەدەکرد. ئەوانە هەموو پێشمەرگەی جوامێر و چاونەترس بوون، کەچی لەبەردەم لاشەی سارد و ڕۆحی هەڵفڕیوی ڕێبواردا، دڵیان دەلەرزین. شەومان بەڕێ کرد و بەیانی لەگەڵ تەرمی ڕێبواردا دامبازی ملەی بالآنبۆ بووین و لە بناری ئەودیودا، چاوەڕێی کەسوکاری ڕێبوار بووین.

ئۆتۆمبیل گەیشت و مامۆستایەک کە برای ڕێبوار بوو لەگەڵ چەندکەسی تر دابەزین، باوەشمان بە یەکدیدا کرد و بە کەسەرەوە ڕووداوەکەمان بۆ باس کردن. ئەوان بە وردی لەتەرمی ڕێبواریان ڕوانی و پرسیاری برینی نێوچاویان کردا من دڵنیام کردن کە ڕووداوەکە هەر ئەوەیە کە بۆیانم باس کردووە و خۆیشیان دەتوانن پاشتر لێکۆڵینەوە بکەن.

ماڵئاواییمان لە ڕۆحی ڕێبوار کرد. ئەوان بەرەو شار ڕۆیشتن و ئێمەش بۆ مۆردین گەڕاینەوە.

***

* گوندی «ناوگردان» لە گەرمای هاویندا هەڵدەقرچێت و ئێمەش لەژێر ڕێژنەی گوللەی براکاندا ناخمان بۆتە بورکان و دیگی بەرگری و تۆڵەسەندنەوەمان جۆش دەخوات. ئەوان لە گوندی

«بیرەشکە»وە، لەژێر چەتری گوڵەبەڕۆژەی هەڵچوودا. لەپەسا هێرش دێنن و ئێمەش بە کارەمتۆری گوللە دروێنەیان دەکەین. هێزی پارتی و سۆسیالیست بۆ یەکەمجار و پێکڕا لە هەوڵی داگیرکردنی قەڵای «ناوگردان»دان و ئێمەش، هەموو هێزی شارەزوور و هەورامان. سەرسەختانە داکۆکی لە گوندێک دەکەین کە هێشتا موڵکی کەسمان نییە!
ڕاستیەکەی ئێمە لە هەوڵی سڕینەوەی سەروەرییەکانی یەکتردایین و کێشەکە هێندەی لە دەوری مێژوو دەسووڕێتەوە، هێندە سەروکاری لەگەڵ خاک و جوگرافیادا نییە.
خەڵکی ناوگردان خۆیان لە ماڵەکانیان پەستاوە و لە ڕۆژنە و دەلاقەکانییانەوە لە شەڕی خوێناویی براکان دەڕوانن و چاوڕێن تا قوربانیەکان بە خاک بسپێرن.
لە خەندەقی بەردەم ئاوایی دەرباز دەبم و لەگەڵ دوو پێشمەرگەدا، بە ژێر داربییەکاندا، سەرەوەخوار، بۆ بەسەرکردنەوەی سەنگەرەکان دەڕۆم. پێشمەرگەیەک بەرەوڕوومان دێت و غەفوردەرەشیشیی لەکۆڵ داوە. لەگەڵ ئەوان بۆ ناو ئاوایی دەگەڕێمەوە. لە پشتەوە لە غەفور دەڕوانم. خەڵتانی خوێنە. دەچینە ماڵێک و لەسەر سەکۆیەک غەفور دادەنێین. دکتۆر دێت و برین تیمار دەکات. چەند گوللە نێوزگیان بڕیوە. ئەو خوێنڕێژیی ناوەکی هەیە و دکتۆر دەڵێت ڕەوشی ئەو مەترسیدارە.
یەکسەر نامە بۆ شار دەنووسم و داوای یارمەتی و داودەرمان دەکەم. کاتژمێریک نابات، دکتۆر و دەرمان دەگەن. لە ڕێکخستنی شارەوە کەسانێک ئامادە دەبن کە لە هەموو دۆخە دژوارەکاندا وەکو ئامبولانس ئامادە دەبوون. کاوە، حەمەی حاجی حەمەشەریف و فەرهەنگی حەمەمینی عەلیی شاکە و کەسانی تریش. ڕەنگی غەفور دێت زەرد و زەردتر هەڵدەگەڕێت و دکتۆر دەستەوەستانە. لە چاوەکانی غەفور دەڕوانم، دەست لە نێو دەستی دەنێم و دەمەوێت دڵخۆشی بدەمەوە....
ئەو سەیرم دەکات و چاوەکانی زۆر شتم پێ دەڵێن. ئەو زۆر نەبوو لە سەرکردایێتی گەڕابووەوە و ماوەی هەڵپەساردنی تەواو کردبوو. ئەو بە نیگا ساردەکانی پێی دەگوتم: زۆلمیان لێ کردم، هەموو ئەو شتانە دروستکراو بوون، من پاکترین کەسێکم کە بە داخەوە لە شەڕی نەیاراندا، وا دەکوژرێم.
هێشتا غەفور گیانی دەرنەچوبوو کە تەرمی حەیدەری حاجی عوسمانییان گەیاندە لامان. غەفور فەرماندەی کەرت و پێشمەرگەی سەرەتای ساڵی ١٩٧٧بوو. ئەو لێزانترین، ئازاترین و قسەخۆشترین کەسێک بوو کە من زۆر هۆگری بووم. گەلێکمان یادگاری تاڵ و شیرین پێکەوە هەبوو، داخەکەم لەبەردەستماندا گیانی سپارد. حەیدەر، گەنجێکی ئازا و بەئەمەک و جوامێر بوو. ئەو سێ ساڵ زیاتر بوو پێشمەرگە بوو. ڕۆژی دواتر تەرمی هەردووکیان بۆ هەڵەبجە نێردرانەوە.
نیازی حاجی ئازیزە، گوللەیەک وە سەردڵی کەوتبوو. ئەو چانسی هەبوو، ژیا بۆ ئەوەی دوای ڕاپەڕین لە قۆناغی نوێی شەڕی دەسەڵاتدا، بکوژرێت.

شەڕ تەواو بوو. قەڵای ناوگردان نەگیرا و ئەوان تێک شکان. ئەوانیش ٧ تەرمیان لێ بەجێما و چەندین بریندار و تەرمی دیکەشیان لەگەڵ خۆیان بردنەوە. ئەوانیش خۆشەویستیان زۆر هەبوون کە فرمێسکیان بۆ بڕێژن. ئەم وێنە خوێناوییە گەرڵێنیشتووانە، هەمێشە بە شنەیەکی دارستانی یادەوەرییەکانم زیندوو دەبنەوە.

ئێوارەیەکی زستانی ١٩٨٢، لە گوندی «سواری»ی شارەزوور، بەسەرماڵاندا دابەش دەبین و دیوەخانێک بۆ خەوتن دیاری دەکەین.

بەرودوا، لە دیوەخانی تایەن کۆوە دەبین. لە ڕووخساری پێشمەرگەکاندا خەمێک دەبینم. شتێک ڕوویداوە و لە منی دەشێرنەوە. کەسێک کوژراوە و لە دڵی مندا و لای ئەوانیش جێگایەکی تایبەتی هەیە. دەپرسم چی بووە؟ چیتان بیستووە؟

هەموویان لەیەک دەڕوانن و نیگای خەماوییان بۆ لای من دەگوێزنەوە و دواجار بە ئەوکی پڕ گریانەوە دەبێژن:

+ حەمەتۆفیق شەهید بووە!

تەزوویەک سەرتاپام تەی دەکات و بۆ ساتێک دەحەپەسێم. لە ساتێکدا هەموو یادەوەرییەکانی منداڵیم بە هزردا گوزەر دەکەن. حەمەتۆفیق، هەر ئەو مێردمنداڵەیە کە لەسەرەتای ئەم کتێبەدا، چیرۆکی ماچکردنی گوجیلەسەکەکەم لێ گێراوەتەوە. حەمەتۆفیقی پورزا و هاوڕێی منداڵی و پێشمەرگایەتیم. لە هەڵەبجە دەکەوێتە بۆسەیەکی دادیارەوە و لەبەردەم ماڵی گەلاوێژی خوشکیدا شەهید دەبێت. ئەو لێپرسراوی دەستەکەی من بوو. پاشتر شاهۆ داوای کرد بیگوێزینەوە بۆ لای ئەو تا ببێتە جێگری فەرماندەی کەرت. ئەو بە کارێک دەچێتە ناوچەی هەڵەبجە و پاش شەڕێک لەگەڵ سەربازانی دەوڵەتی ئێراقدا، ناچار دەبێت لەگەڵ قادری حاجی حەمەشەریف«د.قادر»دا بچێتە ناوشار و لەوێ بکەونە بۆسەیەکەوە کە پاشتر دەرکەوت «عەزیزی حەمەساڵەح» و چەند چەکدارێکی تر، کارەکەیان ئەنجام داوە.

من، لە کتێبی «گێڕانەوەی یادەوەرییەکان»دا، چیرۆکی «حاجی یەکلاق»م بڵاوکردوەتەوە کە دوو پاڵەوانە سەرەکییەکەی» د.قادر و حەمەتۆفیق»ن.

کە بەخۆمدا هاتمەوە و لەژێر قورسایی تراوماکەدا خۆم ڕاپسکاند، ئەوجا وەکو پیشەی هەموو جارێکم، دەستم بە قسان کرد و دڵی هاوڕێکانیم دایەوە و جەختم لەسەر شەهیدبوونی هەمووماں کرد، بۆم ڕوون کردنەوە کە درێژایی ئەم خەباتە بەشی کوژرانی هەموومان دەکات!

## شەپۆلەکان، خوێن دەپۆشن!

گوندەکە دەکەوێتە ڕۆخی زەریاچەی دەربەندیخان و خانووەکان لە نێو ئاودا، قاچیان داکوتیوە. نێوانی ئێمە و گوندی پاشتر، سەعاتەڕێیەک دەبێت. دوو بەلەم لە ڕۆخی ئەوبەری زەریاچەکەوە بۆ لای ئێمە سەوڵ لێ دەدەن، بە دووربین دەیانڕوامێ، هەردووک بەلەم، پڕن لە چەکدار!

_ مەفرەزەکەی «ق م»ن! کەسێک هاوار دەکات.

+ سەنگەر بگرن و چاوڕێ بن! من دەڵێم.

ئەوان هەست بە بوونی ئێمە ناکەن. ئێمە هەرگیز نەهاتووینەتە ئێرە.

+ تەقەیان لێ مەکەن! هەوڵ بدەن با خۆیان بە دەستەوە بدەن. ئەوان لە ئاودان و ئێمە لە وشکاییدا، بێ خوێنڕژتن باشترە!

ژمارەیان ٢٠چەکدارێک دەبوو. کە تەواو نزیک بوونەوە، ئیدی بواری پاشەکشەیان نەما. ئەوان دەستیان بەرزکردوە و هاواریان کرد: تەقە مەکەن، تەسلیم دەبین! کەچی بە دەسترێژەوە لەبەلەمەکان دابەزین و سەنگەریان گرت. یەکەم دەسترێژی ئەوان سەردار هەورامی بوویە قوربانی و ئیدی ڕۆخی زەریاچەکە سوور هەڵگەڕا. ئەحمەدی حوسێن، فەرماندەی لێزان و شارەزای ئەوان بوو. ئەو ئەگەرچی لەوێدا کوژرا، بەڵام ئاودری ڕۆخەکەی کردە سەنگەر و لەگەڵ چەند لە هاوڕێیانی تا تاریک داهات شەڕیان کرد. هێزەکەی قەرەداخ کە لە گوندەکەی دیکە بوون، پاش سەعاتێک گەیشتن. دوو پێشمەرگەی قەرەداخیش کوژران.

+ مامۆستا گیان نامەوێت بمرم! فریام کەون کوژرام! ئەمە دەنگی منداڵترین پێشمەرگە بوو بە ناوی «ڕێبوار» و خەڵکی هەورامان بوو. ڕێبوار، سێ گوللەی وێ کەوتبوون. کە من توانیم بگەمە لای ڕێبوار، ئەو دەمێک بوو ئەو دۆزەخەی جێ هێشتبوو. دەنگی پڕ ترسی ڕیبوار، بۆ هەمیشە لە ڕۆحمدا زایەڵەی دێ! بە هەزاران «ڕیبوار» کە هێشتا تەمەنی میرمنداڵییان تێنەپەڕاندبوو، بوونە قوربانیی شەڕی خێڵە سیاسییەکان.

بەلەمەکان، بە ماندوویی سنگی زەریاچەکەیان شەق دەکرد. تریفەی مانگ خۆی لە ڕووخساری ساردی «سەردار» و «ڕێبوار» و دوو پێشمەرگەی قەرەداخ هەڵدەسوو. لەولاتریش، لە دامێنی گوندەکەدا، وردەشەپۆلەکان یارییان بە کاکۆڵی خوێناویی برادوژمنەکان دەکرد.

# زەردە لە خوێنیان ئالاّ بوو

لەسەر چەمەڵەغی تراکتۆرەکەوە لە ئاسۆی گردەکەم دەڕوانی. گردی «سۆیلەمیش» هێشتا تەمێکی پاییزیی لە خۆی پێچابوو. ژن و منداڵ بە چاوانی هەترەشچوویانەوە، لە کاروانی سەفەری ئێمەیان دەڕوانی. باری دوو تراکتۆر ئەنگاوتە و کوژراومان هەڵگرتووە و ماڵئاوایی لە گوندێکی قژوپۆپ خوێناوی دەکەین. تراکتۆرەکەی بەردەممان عەرەبانەیەک رادەکێشێ سیخناخ لە لاشەی براکان. مامناراس، لەژێر خۆڵی رۆخی تانجەرۆدا بەجێما. ئەو، پێش ئەوەی بیبەن، نیگایەکی لە من گرت، نیگایەک پاڕانەوەی تێدا نەبوو!

نیگام لەسەر تابووتی تەراکتۆرەکە بەند دەبێ. ڕێچکەی خوێن دەچکێتە سەر زەوین و تراکتۆرەکەی ئێمە تایەماڵی دەکات. تیشکی زەردەپەڕ لە دڵۆپی یاقووتیی خوێنەکان دەئاڵێ و لە نیگای مندا سەوز دەبێت. درەختی خوێنەکان، هەرگیز لە ڕۆحما وشک نابن. لە گوندی «ئالان»، بارەکوژراو دادەگرین تا خەڵکوخوا بیانناژن. کاروانی خوێنەکان لە ڕۆیشتن بەردەوامە و من بڕیاری دابڕان و تەرەبوون دەدەم.

## عەزیزی حەمەساڵەح، دەست لە ئێخەمان بەرنادا!

کات، هێشتا زستانی ساردی ساڵی «١٩٨٢»ە. شارەزوور، لەژێر بەفرێکی ڕچیودا دەبریسکێت. ئێمە، کاتژمێر ٤ی بەیانی، جادەی نێوان هەڵەبجە و سیروان دەبڕین و بۆ «بەکراوا» دەپەڕینەوە. لە بەکراوا فراڤین دەخۆین و پاشان بەرەو «گورگەچیا» دەڕۆین. هەموو هێزی هەرێمی یەک و بە سەرپەرشتیی هەرسێ ئەندامانی لیژنەی هەرێم (شەوکەتی حاجی موشیر، حامیدی حاجی خالید و حاکم عومەر عەزیز)، لەو شارەزوورە وەر بووبووین.

لە گوندی گوورگەچیا، پسکەپسک و دەنگێکی نائاسایی لە نێو هێزەکەدا پەیدا بوو...

+ ئێستا عەزیزی حەمەساڵەح و سێ چەکدار پەیوەندییمان پێوە دەکەن!

_ چۆن؟ کێ دەڵێت؟

+ کاک حامید! ئەو نامەی مۆرکراوی بۆ ناردووە و بە ناوی هەرێمەوە لێبووردنی بۆ دەرکردووە و ئێستا ئەم هێزە چاوەڕێیە!

کادر و فەرماندەکانی کۆمەڵە کەوتنەخۆ و بەیەکداهاتن. من گوتم با لەگەڵ حامید قسە بکەم و بزانم مەسەلەکە چییە. من، دڵنیابووم کە حامید سەرگوزشتەی عەزیز باش دەزانێت و ئاگادارە کە عەزیز

چەند رۆژێکە لە پارتی جیا بووەتەوە و هاتووەتە هەڵەبجە و لە پەنای موخابەرات و تۆفیقی رەحیمدا کە ئامر مەفرەزە جاشان و کۆنەهاورێی هەموومانە، پشووی داوە. عەزیز لە شاردا، دوو کادری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی تیرۆر کردبوو کە گوایە دەستیان لە کوشتنی قادری برایدا هەبووە، هەروەها حەمەتۆفیق، بە پێی زانیارییەکانی رێکخستنی شار، لە بۆسەی ئەودا کوژراوە.

+ کاک حامید ئەم هەواڵە راستە؟

_ بەڵێ درووستە و هاکا پەیدا بوون!

+ تۆ دەزانیت عەزیز چیی کردووە؟

_ بەڵێ دەزانم، بەڵام من رای سەرکردایەتییم وەرگرتووە!

+ رای هەرکەست وەرگربێت ئێمە وەکو کۆمەڵە قبووڵ ناکەین! جگە لەوە تۆ خۆت ئەندامی کۆمەڵەیت و منیش لێپرسراوی کۆمەڵەم، ئەی ئەدەبوو ئەم مەسەلەیە لەگەڵ من باس بکەیت؟

_ دەی برا تازە کریاگە و وەعدم داگە.. دەشێ بیوەمەسەر!

+ پێم وا نییە بۆت بچێتە سەر.

_ با بزانین...

کۆبونەوەیەکی سەرپێیمان لەگەڵ فەرماندەی کەرت و مەفرەزەکانی کۆمەڵەدا ئەنجام دا و بڕیارمان دا هەر کە عزیز گەیشت چەک بکرێت. قسەمان لەگەڵ شەوکەت کرد ئەویش رای لێ بوو. شەوکەتی یەکێتی، هاورای ئێمە، دژی هەڵویستی حامیدی کۆمەڵە وەستا و هاوکارمان بوو. لە دوورەوە، تاپۆی سێ چەکدار دەرکەوتن. خۆیان بوون، عەزیز لە پێشەوە و دوو چەکداری تر لە دواوە. حامید بەرەوپیریان چوو، بەخێری هێنان. سەرنجی چەکەکەی شانی عەزیزم دا، هەمان چەکەکەی خۆم بوو کە سێ ساڵ پێش ئەو کات، ئێوارەیەک دابووم بەفەرەج تریفەیی و لەناوشاری هەڵەبجە کەوتە بۆسەی جاشەکانی تۆفیق و شەهید بوو. ئەو چەکە لە سەرەتادا موڵکی عەزیز خۆی بوو، کە ساڵی ١٩٧٨ چەک کرا، مەلا بەختیار بەخشییە من. ئەوا ئێستا عەزیز لە جاشانی بەدیاری وەرگرتووەتەوە و لەشانی کردووە!

ئێوارە و پاشی نانخواردن، عەزیز بێ گرفت چەک کرا. بەڵام لە هەرێمدا کێشە درووست بوو. حامید، خۆی توڕە کرد و لەگەڵ هەندەک پێشمەرگە گوندەکەی بەجێ هێشت و هەر ئەو شەوە پەڕییەوە ئەو بەری ئاو.

ئێمە چووینە گوندی «کاگردەڵ» و لە ماڵێکدا دەستمان بە لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەو چەکدارە کرد کە لەگەڵ عەزیزدا موخابەرات ناردبووی. ئەو ناوی «یوسف» بوو، خزمی نزیکی تۆفیق و یەکێک لە جاشە هارەکان بوو کە بەپێی دانپێدانانی خۆی لە پرۆسەی شەهیدکردنی بەشێکی زۆری کادر و

پێشمەرگەکانی ناوچەی هەڵەبجەدا بەشداریی کردبوو.
ئەو هەمووشتێکی دڕکاند و پاشتر کە لە ژیانی خۆی بێهیوا بوو، لە ژوورەکەدا و لە نێوەندی هەمووماندا، پەلاماری چەکێکی دا. ئەو، ویستی لە دواساتەکانی ژیانیدا، هەرچی پێی دەکرێ بکوژێت!
هەر ئەو شەوە لەگەڵ مەفرەزەیەکدا، نێردرایە نزیکی شارۆچکەی سیروان و بە سزای خۆی گەیشت.
دەمەوبەیان، ئێمەش لە ناو پەڕینەوە و لە یەکێک لە گوندەکانی بناری شارەزوور بە حامید گەیشتینەوە. لەوێ بۆ دیاریکردنی چارەنووسی عەزیز، کۆبوونەوەیەک بەسترا و حامید ڕازیی نەبوو من بەشداری لە کۆبوونەوەکەدا بکەم. من، لەگەڵ فەرماندە عسکەرییەکانی کۆمەڵە قسەم کرد و گوتم: پێشنیازی من ئەوەیە، ئێمە عەزیز ببەینە سەرکردایەتی و بڕیارەکە بۆ سەرکردایەتیی کۆمەڵە و یەکێتی بەجێ بهێڵین. ئەوان لە کۆبوونەوەکەدا بە ناوی خۆیانەوە بۆچوونەکەی منیان خستبووە ڕوو.
ئەوە کرایە بڕیار و ئێمە عەزیزمان نەدایەوە حامید و خۆمان ئەرکی گەیاندنی ئەومان بۆ سەرکردایەتی، لە ئەستۆ گرت.

## لەگەڵ عەزیزدا بەرەو نێوزەنگ!

لەگەڵ مەفرەزەکەی خۆمدا و چەند پێشمەرگەی تریش، لە شارەزوورەوە بەرەو شارباژێر بەڕێ کەوتین. لە شارباژێر، لەگەڵ «ئەبوشەهاب»دا کە ئەوسات لێپرسراوی لقی سلێمانیی یەکێتی بوو، یەکمان گرتەوە، ئەویش بۆ سەرکردایەتی بەڕێوە بوو.
ئەوساڵە، کوێستانانی هەردوو دیوی کوردستان، زێدەسەخت و بەفراوی بوون. لە گوندی «بێژوێ»، بەفر هەفتەیەکی ڕاگرتین و شەوانمان لە مزگەوتە زێدەگەورەکەی گوندا ڕۆژ دەکردەوە. شەوێک دوو پێشمەرگەی دەستەکەی خۆم هاتن و گوتیان: تۆ مۆڵەتمان پێ بدە، ئێمە عەزیز دەکوژین و دەچین تەسلیم بە دەوڵەت دەبینەوە!
+ کاری وەها کاری ئێمە نییە. ئێمە چ کێشەیەکی تایبەتمان لەگەڵ عەزیز نییە و ئەوە کاری سەرکردایەتییە. با ئەوان بڕیاری خۆیان بدەن.
_ ئەوان نازانی دەکەن. عزیز عەشرەت و کەسوکاری زۆرن. کاک حامید پێش ئێمە دەگاتە سەرکردایەتی و مەسەلەکە بە جۆرێکی تر دەشکێنێتەوە.
+ چۆن دەشکێتەوە، با وا بێت. من ئەرکی خۆم بەجێ دەهێنم و پاشتریش بابزانین چی دەبێت. بەڵام کاری وا کاری نامەردانە! ئێوە دەبێت وەکو ئینسانێک ڕێزی لێ بگرن و بڕیاریش هەرچی بوو، پاشان ئەوە جێبەجێ بکەن.

_ ئەی خوێنی حەمەتۆفیق؟
+ شۆڕش لەخوێنی ئەو و هەموو شەهیدەکانی تریش بەرپرسیارە. سەرکردایەتی دەبێت تۆڵەی خوێنەکان بستێنێتەوە و سزای تاوانباران بدات!
بەیانییەک ئامبازی «هۆمل» بووین و لەگەڵ بەفر و شەختەدا کەوتینە ملانێ. نیوەڕۆژ، ترۆپکی هۆملمان بەرزەفت کرد و بۆ «ئەسپەمێزە» داگەڕاین. چ داگەڕانێکی سەخت و پڕ فەلاکەت بوو!
ڕۆژی دواتر، بۆ دەرماناوێ، قەلەڕەشە و پاشان گوندی بێوران.
لە گوندی بێوران، نامەیەکی مامجەلالم پێ گەیشت، کورتییەکەی ئەمە بوو:
(برای تێکۆشەر مامۆستا پشکۆ
سڵاوی گەرم
ئاگادارت دەکەم کە پاراستنی گیانی عەزیزی حەمەساڵح لە ئەستۆی تۆدایە و هەرچی زووتر و بە سەلامەتی بیگەیەننە لامان.
هەربژیت بۆ براتان
نیمزای مامجەلال)
دەنگەئێوارەیەک گەیشتینە بەردەم بارەگای مامجەلال. عەزیزمان بە پێشمەرگەکانی مام سپارد. من، چوومە لای مامجەلال و هەموو باسەکەم بۆ گێڕایەوە. مام فەرمانی دا عزیز ببەن بۆ لای عەلی شامار کە ئەوسات لێپرسراوی زیندان بوو.
ڕۆژی پاشتر، چوومە نێوەندی کۆمەڵە و ڕاپۆرتی تایبەتی خۆمان و ڕاپۆرتی سەرکردایەتیی ناوخۆی کۆمەڵەم پێ دان. ناوەندی کۆمەڵە بەڵێنیان دا، وەکو پێویست مامەڵە لەگەڵ کێشەکەدا بکەن و لە مەکتەبی سیاسیی یەکێتیش لایەنگری لە بۆچوونەکانی ئێمە بکەن.
عەزیز، تەنیا دوو ڕۆژ لە زیندان مایەوە و پاشان لەسەر داوای تایەری عەلیی والی بەگ، بوویە میوانی سۆسیالیست!
ئێمە پاش چەند ڕۆژێک بە دڵشکاوی سەرکردایەتیمان جێ هێشت و بۆ ناوچەی خۆمان گەڕاینەوە.
عەزیز، ئەو زستانە لە سەرکردایەتی مایەوە و پاشان کرایە فەرماندەی کەرتی یەکێتی، لای حامیدی حاجی خالید.
ئەم هەڵوێستەی سەرکردایەتیی یەکێتی، هێند نادرووست و ناڕەوا بوو، بەشێکی زۆری پێشمەرگە و کادرانی کۆمەڵەی زویر کرد. دوو کەرتەکەی هەورامان بە لێپرسراوێتیی شاهۆ و مەحمودی حاجی فەرەج، مانیان گرت و بڕیاری ئەوەیان دا کە هیچ چالاکییەک ئەنجام نەدەن تا «م س» لەو بڕیارە پاشگەز نەبێتەوە!

# پاکتاوکردنی لەشکری
# ئیسلامیی کوردستان و ئیعدامکردنی عەزیز!

کە شەڕی ئێران و ئێراق دەستی پێ کرد، ئێران لە هەوڵی ئەودا بوو کوردستان بکاتە بازاڕێکی بەرمێن بۆ کردنەوەی دوکانی سیاسی و چەکداری. هەر شێخ، مەلا و حاجییەک ڕووی دەکردە ئێران، پاش ئەوەی ڕەزامەندیی یەکێتیی وەردەگرت، بە چەندین بار چەک و پارەوە دەگەڕایەوە کوردستان. ئەوان پارە و چەکیان دەبەخشینەوە و چەکداریان بەکرێ دەگرتن.

حاجی شێخ قادر یەک لەوان بوو کە لەشکری ئسلامیی بنیات ناو لە ماوەیەکی کورتدا چەکدارێکی زۆری کۆ کردنەوە و دەهاتن مەترسی بۆ سەر دەسەڵاتی یەکێتیی درووست بکەن. لەشکری ئیسلامی، لە ناوچەکانی شاربازێر، دۆڵی جافەتی و خاڵخاڵان و دەوروبەری کەرکووک، هێزەکانیان دەگەڕان و وەخت بوو دەبوونە هێزێک کۆنترۆڵکردنیان ئاسان نەبێت.

یەکێتی بڕیاری دا، لە یەک کاتدا و بە پەلاماریکی خێرا و چڕ، هەموو «لاک»پاکتاو بکات.

کۆتایی بەهاری ١٩٨٢، هەموو هێزەکان لە شاربازێر و دۆڵی جافەتی کۆبوونەوە و لە کاتی بڕیارلێدراودا، لە دۆڵی حاجی مامەند و ناوچەی سەرگەڵو ، پەلاماردران و پاش کوشتارێک، زۆربەیان بەدیل گیران و چەک و جبەخانەیان دەست یەکێتی کەوتن. لە نێو ئەو پێشمەرگانەی یەکێتیدا، کە لەو شەڕەدا بوونە قوربانی، سەلاحی موهەندیس، کادرێکی زیندەزرنگ و بەتوانا بوو.

پاش شەڕەکە، لە گوندی پاڕەزان بووین. ملازم عومەر، شەوکەتی حاجی موشیر، حامید و مەفرەزەکەی بە عەزیزیشەوە، بەکری حاجی سەفەر و زۆر لێپرسراو و کادری دیکەش. ئەو ڕۆژە پێشمەرگەیەک لە سەرکردایەتییەوە گەیشت و نامەیەکی پێ بوو کە فەرمانی ئیعدامکردنی عەزیزی حەمەساڵەحی تێدا نووسرابوو. دیار بوو مامجەلال و سەرکردایەتی لەژێر فشاری ڕێکخستنەکان و ناوەندی کۆمەڵەدا، بڕیارەکەیان دابوو و فەرمانێکیان بە ئیمزای مامجەلال دەرکردبوو. عەزیز کە بە دەمانچەیەکەوە و چەند چەکدار لە دەوری ، لە نێوەندی گونددا وەستابوو، چەکی لێ وەرگیرا و لە گەڵ مەفرەزەیەکدا بۆ ئیعدام نێردرا!

چەندڕۆژ پاش ئیعدامکردنی عەزیز، برازاکانی کە لای پارتی بوون، برایەکی «شاهۆ»یان لە گوندی زەمەقی تیرۆرکرد. ئەو برایەی شاهۆ، جووتیارێکی بێگوناه بوو. تاوانی ئەو، تەنیا ئەوە بوو کە نیوبرای شاهۆ بوو. ئێستا کە بە ٢٤ساڵان بەسەر ئەو ڕووداوەدا دەگوزەرێت، دەبێ بڵێم نە شاهۆ و نە هیچ لێپرسراوێک، هۆکاری ئیعدامکردنی عەزیز بوون. ئەوە تەنیا ئەنجامێکی ئاسایی کردەوەکانی

خودی عەزیز بوو کە بەو چارەنووسەی گەیاند. ئەوە یاساکانی بزوتنەوەی چەکداری و شۆڕشی شاخ بوون کە بڕیاری تۆڵەسەندنەوە و ئیعدامکردنی بکوژانیان دەدا. من، وەکو لە شوێنی دیکەی ئەم کتێبەدا باسم کردووە، عەزیز، هاوڕێی قوتابخانەم بوو. من، لە ناخەوە مەرگی ئەوم پێ خۆش نەبوو. بەڵام ئەو کەسانێکی کوشتبوون کە خۆشەویستی من و کەسانی دیکە بوون. ئەو ڕووداوە و دەیان ڕووداوی هاووێنەی، بەرهەمی باری ناناسایی میللەت و وڵاتی ئێمەن. کوڕێکی عەزیزی حەمەساڵەح، چەندجاران بە ئیمەیل پەیوەندی لەگەڵ من گرتووە و داوای ئەوەی لێ کردووم کە وردینەکانی حەقیقەتی ئیعدامکردنی باوکی بنووسم. لێرەدا پێی دەڵێم: ئەمە حیکایەتی کوژرانی باوکت بوو. باوکی تۆش، قوربانییەکی بارودۆخی ناناسایی بزووتنەوەی سیاسیی میللەتی کورد بوو. ئەگەر دۆخی کوردستان ئەوە نەبایە کە بوو، دیارە چارەنووسی باوکی تۆ و هەزاران باوکی دیکەش، وەها نەدەکەوتنەوە!

کەسانێکی دیکەش، لێرەو لەوێ گلەی ئەوەیان لێ کردبووم کە من لە نووسینەدا، هەندێک کەس بە «شەهید» ناوبێر ناکەم. من، مەگەر بە هەڵە و لە بێئاگاییدا، دەنا پێشگری «شەهید»م بۆ ناوی هیچ پێشمەرگەیەک بەکار نەبردووە کە لە شەڕی براکانەدا کوژرابێت. ئەوان، دەتوانن قوربانییە بێگوناهەکانی شەڕی نێوخۆ و سیاسەتی چەوتی حیزبەکانیان بن. شەهید، لە چەمکە نەتەوەییەکەیدا، کەسێکە لە پێناوی ئامانجی بەرزی نەتەوەکەیدا گیانی دەبەخشێت. ئەوانەی لە شەڕی نێوخۆدا بوونە قوربانی، گیانلەدەستدانیان چ سەروکارێکی لەگەڵ ئامانج و ستراتیژی دۆزی نەتەوەیی کورددا نییە. ئەوان تەنیا قوربانیانی بەرژەوەندییەکانی حیزب و سەرکردەی خۆیانن.

## خۆسازدان بۆ کۆنفرەنسی دووەمی کۆمەڵە!

بەپێی بڕیاری کۆنفرەنسی یەک، دەبوو کۆمەڵە دووەمین کۆنفرەنسی خۆی، لە هاوینی ١٩٨٢دا ببەستێت.
بەسەرکردنەوەی پۆل و شانەکانی ڕێکخستن، سازدانی کۆبوونەوەی بەردەوام لەگەڵ ئەندامانی پۆل و شانەسەرەکییەکان و ڕێکخستنەکانی ناوشار و شارۆچکە و ئۆردووگا زۆرەملێکان، ئەرکێک بوو دەبوو لە ماوەی دوو مانگاندا جێبەجێی بکەم. هەڵەبجە بەتایبەت و دەڤەری دەروبەری بە گشتی، مەڵبەندی بەهێزی ڕێکخستنی کۆمەڵە بوون. ئێمە کە بواری بەستنی کۆنفرەنسی ناوچەییمان نەبوو یان بڕیارێکی وەها لە نێوەندەوە نەدرابوو، ئەرکی هەڵبژاردنی نوێنەرانی کۆنفرەنسیش (لە ناو هێزی پێشمەرگەدا)، لە ئەستۆی ئەندامانی کارت و من بوو.
لە باڵادەستیی هێزەکانی بەعس و زۆریی نەیارانی سیاسیی خۆمان، ڕاپەڕاندنی ئەو ئەرکانە، ماندووبوون و سەرچڵییەکی زۆریان گەرەک بوو. ئەوەی کارەکەی کەمێک ئاسان دەکرد و لەمپەرەکانی جووڵە و بزووتنی ئێمەیان هەڵدەگرتن، لێهاتوویی کادرانی کۆمەڵە و بزێویی و چاونەترسیی ئەو مەفرەزەیە بوو کە کۆیان لە هیچ ئاستەنگییەک نەدەکردەوە. لەشاری هەڵەبجەدا. وێڕای پتەویی ڕێکخستن، کۆمەڵێک خێزان هەبوون کە بە هەفتە باڵدەی ئێمەیان دەدا و لە ماڵی ئەواندا، لە نێو منداڵ و خێزانی ئەواندا، کۆبونەوەکانمان ساز دەدان و ئەرکەکانمان ڕادەپەڕاندن و مەترسیی گەورەمان بۆ سەر ژیانی ئەوان دروست دەکرد.
ماڵی ئیسماعیلی حاجی ئەورەحمان، حەمەی حاجی حەمەشەریف، فەرهەنگی حەمەمینی ئەلەی شاکە، عەلیی حەمەبۆر، کەمالی شۆفێر، عەبدوڵای موهەندیس، فەرەیدون عەبدوڵا، ئەنوەر و عەلیی حاجی میرزاتۆفیق و عەلیی مەلاحەسەن و زۆر بنەماڵەی دیکەش کە لە ڕۆژە سەختەکاندا، ئەو ڕۆژانەی بەعس لەسەر وێنەیەک یان کوتەبەیانێک خەڵکی ئیعدام دەکرد و ماڵی بە شۆفڵ ژێراوژوور دەکرد، لەو ڕۆژانەدا ماڵەکانی ئەوان، بنکەی نهێنیی پێشمەرگەی کۆمەڵە بوون.
بۆ سازدانی پێشکارەکانی کۆنفرەنس، لەگەڵ مەلایاسین، سامان، لەتیفی حەمەی مەلاسابیر و دوو پێشمەرگەدا، سێ ڕۆژ لە ماڵی ئیسماعیل ماینەوە و وێڕای کارەکانی ناو شاری هەڵەبجە، ڕۆژێک لەگەڵ دوو نوێنەری ڕێکخستنی سلێمانی بۆ تاوتوێکردنی بەرنامەی کۆنفرەنس و گفتوگۆ لەسەر کێشە فکرییەکانی کۆمەڵە و ئەو مەسەلانەی کە مایەی ململانێی نێو ڕێکخستنەکان بوون و لە کۆنفرەنسدا دەبوونە تەوەری لێدوان و لێکۆڵینەوە، دانیشتین و سەرنج و بۆچوونەکانمان ئاڵوگۆڕ کردن.

## تۆفیق ڕەحیم «حاکم کامەران»، پێشنیازی سەنگەرگۆڕین دەکات!

من، لە چەند جێگایەکی ئەم نووسینەدا باسم لە «تۆفیق» کردووە، ئەوێش لە دوو ڕوانگەوە:
+ ئەو، یەکێک لەو حەوت تیکۆشەرە بوو کە لە ساڵی ١٩٧٦دا، یەکەم مەفرەزەی پڕوپاگەندەی چەکداریی کۆمەڵەیان لە کوردستاندا درووست کرد. مەخابن، ئەو لە دۆخێکی نادیاردا خیانەتی کرد و بوویە ئامر مەفەرزەی جاشان.
+ تۆفیق، هاوڕێی زیندەنزیکی من بوو. ئێمە، کۆمەڵێک گەنجی خوێندەوار بووین کە پاشی ڕۆژگاری هەرەس، هەمیشە پێکرا هەڵسوکەوتمان دەکرد و چاومان لە ئاسۆی خەباتی کۆمەڵە و شۆڕشی نوێ بڕیبوو. تۆفیق و مەفرەزەکەی، ئەگەرچی سەرسەختانە شەڕی پێشمەرگەیان دەکرد، دیسانیش لە ئاستی پەیوەندیی هاوڕێیەتیدا، بۆ هیچ کارێک دەستی بەڕووی ئێمەوە نەدەدا. من، لەسەرەتادا، باسی ڕۆڵی «تۆفیق»م لە ڕزگارکردنی «حەمەئاوات»ی بریندار‌دا کردووە و ئێمە وەکو خێزان بە گیانی «حەمەئاوات»، قەرزداری ئەوین.
بەکری حاجی سەفەر، لە گوندی پاڕەزان و لە ماڵی خۆیدا، پێی گوتم:
تۆفیق پەیوەندیی بە سەرکردایەتییەوە کردووە و داوای کردووە کە خۆی و مەفرەزەکەی و ژمارەیەک لە خزمان و عەشیرەتەکەی ئامادەن پەیوەندی بە یەکێتییەوە بکەن. بە مەرجێک یەکێتی لە ڕابوردوو ببورێت، هێزێکی سەربەخۆیان لە ناوچەی هەڵەبجە بۆ درووست بکات و ئەوانیش هەموو داوایەکی یەکێتی جێبەجێ دەکەن. مامجەلال نامەی بۆ من ناردووە و داوای کردووە کەسێک بچێت و لە شوێنێک تۆفیق ببینێت و کارەکەی لەگەڵ ببڕێنێتەوە. تۆ دەتوانیت ئەو کارە بکەیت؟.
وەڵامی من ئەرێ بوو. من دەمزانی ئەگەر مەسەلەکە پیلان و تەپکەش بێت، تۆفیق کاری وا لەگەڵ من ناکات.

ئێوارەیەک، لەگەڵ مەلایاسین، حەکیمی مەلاساڵەح، فەرەیدون عبدولا، د.قادر و مەفرەزەیەک پێشمەرگە، چووینە ناوشاری هەڵەبجە. لە دوو ماڵدا شوێنمان بۆ پێشمەرگەکان پەیدا کرد و خۆمان ڕۆیشتینە ماڵی عەبدولای برای میرزا حەسەنی ئەوروڵی «عەبدوڵای موهەندیس» کە هەم زاوای «د.قادر» و هەمیش کەسی دیاری نێو عەشیرەتی ئەوروڵی، واتە لە خوێی عەشیرەتەکی تۆفیق بوو. لە نیوەڕۆژدا، تۆفیق لەگەڵ یەک چەکداردا هات و پێکەوە نانمان خوارد و دەستمان بە قسان کرد. من، بەناوی یەکێتییەوە، هەموو دواکارییەکانی ئەوم سەلماندن و بەڵێنم پێ دا کە مامجەلال و سەرکردایەتیی یەکێتی بە پێشنیازەکانی ئەو ڕازین و لە بەرانبەردا دەبێت ئەویش کارێک بکات کە پێشتر لەو ناوچەیەدا

نەکرابێت. ئەو گوتی: من دەتوانم هەموو مەقەڕی ئەمن، یاخود مونەزەمەی بەعس بگرم یان هەموویان بکوژم و ئەوجا شار بەجێ بهێڵم. ئێمە لەسەر ئەمە پێک هاتین و ماڵئاواییمان لە یەکدی کرد. ئەو ڕۆیشت و ئێمە چاوەڕووانی چەتری شەومان دەکرد. ئێوارە کە تاریک داهات، ئێمە ئامادەی لەشاردەرچوون بووین و لە هەموولایەکی شارەوە بوو بە دەستڕێژ!

ماڵی عەبدوڵا. لە شوێنێکدا بوو، نزیک مەقەڕی جاشان و ئێمە کەمێک سەغڵەت بووین. لە چاوەڕووانیدا، ئەوی ئێمە بە تەپکەی تێدەگەیشتین، وەها دەرنەچوو. تەقە نەما و ئێمەش شارمان جێ هێشت.

من، ئەنجامی گفتوگۆکەم بۆ سەرکردایەتی ناردەوە و چاوەڕێی ئەنجامدانی کارەکەمان دەکرد. تۆفیق هەرگیز کارەکەی نەکرد. تۆفیق، متمانەی بە چەند لێپرسراوێکی کۆمەڵە نەبوو. ئەو پێی وا بوو بەجۆرێک تۆڵەی لێ دەکەنەوە و لەناوی دەبەن.

## كۆنفرەنسی دووەمی كۆمەڵە

هاوینی ١٩٨٢، لە «خڕی نێوزەنگ» و لە هۆڵی «شەهید شیهاب»دا، كارەكانی دووەمین كۆنفرەنسی كۆمەڵە، دەستیان پێ كرد. وێڕای جێبەجێكردنی كارە ڕۆتینییەكانی كۆنفرەنس، گفتوگۆ و لێدوانی تێروتەسەل لەسەر بەرنامەی كاری كۆمەڵە، سیاسەتی ناوخۆ و پەیوەندییە نیشتمانییەكان، هەڵسەنگاندنی سروشتی چینایەتی و جێگە و پێگەی هێزە سیاسییەكانی كوردستان، پرۆگرام و پەیڕەو و بەڕێوە چوون.

ناوی كۆمەڵە وەكو «كۆمەڵەی ڕەنجدەرانی كوردستان» جێگیر كرا و مەیلی نەتەوایەتی و نیشتمانی، لەسەر حیسابی كاڵكردنەوەی ناسنامەی چینایەتیی كۆمەڵە، تۆخ كرانەوە و پاش كۆنفرەنسیش، نارمی «چەكوش و داس» بە بلاوكراوەكانی كۆمەڵەوە هەڵگیران. پرۆسەی هەڵبژاردنی ئەندامانی سەركردایەتیی كۆمەڵە، وەكو كۆنفرەنسی یەك، زۆر خەست و دژوار نەبوو، بەڵام لێدوان و مشتومڕ لەسەر ناسنامە و بەرنامەی كۆمەڵە توند و چڕ بوون. پێشتر، فەرەیدون عەبدولقادر، نامیلكەیەكی لەسەر «كوردستانیبوونی كۆمەڵە» چاپ كردبوو. ئەو لە وێدا جەختی لەسەر یەكمەسەلەیی كێشەی كورد كردبوو. ئەو، لەو دید و گۆشەنیگایەوە، دروستكردنی پارتێكی بۆ هەموو ڕەنجدەرانی كوردستان، بە ئەركی كۆمەڵە دانابوو. ئەو تێز و بۆچوونانە، بەپێی هەلومەرجی ئەوێ ڕۆژێی كوردستان و بزووتنەوەكەی، نەك هەر نالۆژیك دەهاتنە پێشچاو، بەڵكە بە بۆچوونی ئێمە، نامومكن و ناپراكتیكی بوون. ئەوەی كە ئێمەیان بە «ئێراقی» یان «ئێراقچی» تۆمەتبار دەكرد، جگە لە بیانووی خەستكردنەوەی ململانێكان هیچی دیكە نەبوو. ئێمە، جەختمان لەسەر ئەوە دەكرد كە كێشەی پارچەكانی كوردستان، ئەگەر لە بنچینەشدا، كێشەی گەل و نیشتمانێكی پارچەكراو بێت، دیسانیش لە ڕووی پراكتیكییەوە، ئاگێندا و ئامرازی خۆیان گەرەكە. ئێمە جەختمان لەسەر پارتی ڕەنجدەرانی كوردستان_ ئێراق دەكرد و پێمان وابوو، دروستكردنی حیزبێكی پانكوردستانی، دەبێت بۆ زەمەن و داهێندەی بزووتنەوەی سیاسیی پارچەكانی دیكەی كوردستان، بەجێ بهێڵرێت.

سالارعەزیز، نامیلكەیەكی لە وەڵامی تێزەكانی «فەرەیدون»دا نووسیبوو.

ئەم دوو دید و بۆچوونە دژبەیەكە، لە كۆنفرەنسدا، بوونە مایەی مشتومڕ و لێدوانی قووڵ.

كۆنفرەنس، دەسگایەكی نوێی بە ناوی«دەسگای ناوەندی ڕێكخستن» دامەزراند كە ئازادئەورامی و قادری حاجی عەلی كاریان تێدا دەكرد. هەموو ڕێكخستنەكانی كۆمەڵە بۆ چوار ڕێكخراو دابەش كران و پاش كۆنفرەنس لێپرسراویان بۆ دیاری كرا.

سالار عەزیز، لەم کۆنفرەنسەشدا، خۆی بۆ سەرکردایەتیی کۆمەڵە هەڵنەبژارد و خۆی بۆ بەڕێوەبردنی ململانێی تیوریی نێو کۆمەڵە ئامادە کرد.
کۆنفرەنس، لیژنەیەکی بۆ لێپرسینەوە و بەدواداچوونی ئەو سکاڵایانە درووست کرد کە لەسەر کادرانی کۆمەڵە، لە ناوچە جیاوازەکانەوە هاتبوون. ئازادهەورامی، لێپرسراوی لیژنەکە و جەبار فەرمان و منیش ئەندام بووین. «حەمەی عەتییە» یەکێک لەو کادرانە بوو کە راپۆرت و سکاڵای لەسەر هاتبوون. تۆمەتەکان هێند گەورە و گران نەبوون، دیسانیش ئەنجامی لێکۆڵینەوە، «حەمە» ی بۆ ماوەیەک هەڵپەسارد.
پاش کۆنفرەنس، نێوەندی کۆمەڵە دەیویست هەندەک ئاڵوگۆڕ لە لێپرسراوەکانی کۆمەڵەدا بکات و جێگۆڕکێیان پێ بکات.
نێوەند، پێشنیازیان کرد، من کەرتی ڕێکخستنی هەڵەبجە بەجێ بهێڵم و لێپرسراوێتی ڕێکخراوی چواری کۆمەڵە لە ئەستۆ بگرم. من ئامادەیی بەجێهێشتنی کەرتی ڕێکخستنم نیشان دا، بەڵام پۆستی ڕێکخراوم ڕەت کردەوە. ململانێ و کێشە و گرفتەکانی نێو دەروونی کۆمەڵە ماندوویان کردبووم. هەستم دەکرد، پێویستم بە پشوودان و دۆخێکە تا بە ئارامی بیر بکەمەوە. بەردەوامیی شەڕی ناوخۆ و نەبوونی چ ئاسۆیەک بۆ دەربازبوون لەو گێژاوە مەترسیدارە، تین و تاوی بەردەوامییان لاواز کردبووم. یەکێتی، بە کۆمەڵەشەوە، سیاسەتێکی مژاوییان بەڕێوە دەبرد. شەڕی نێوان یەکێتی و هێزەکان ئەگەرچی کەمێ هێور بووبوویەوە، دیسانیش هیچ بنەمایەکی پتەو بۆ بەردەوامیی ئەو ئارامییە نەبوو. هەموو چوونەسەرێکی ئەگەری سەرکەوتنی موفاوەزات، ئاستی شەڕ و پێکدادانەکانی هەڵدەکشاند.
«مەسەلەی کورد یەک مەسەلەیە!»، دەهات سیاسەتی یەکێتیی بەرەو هەڵدێر و دوور لە لۆژیکی سیاسی دەئاژووت!
ئەم درووشمە، هەروا سادە نەبوو. ئەمە ڕێگاخۆشکردن بوو بۆ هاوپەیمانێتیی یەکێتی و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و پاشان شەڕکردن لەگەڵ هێزەکانی کۆماری ئیسلامیی ئیران کە دەهاتن لە کوردستاندا پێشڕەوییان دەکرد و ئاکامیش لە هاوکێشەی شەڕی ئێران_ ئێراقدا، بە ناڕاستەوخۆ دەکەوتینە بەرەی دەوڵەتی ئیراق.

نێوەند، حەمەڵۆی ئەحمەدکوردە«ی بۆ لێپرسراوی کەرتی هەڵەبجە دیاری کرد. هەڵۆ، تازە لە شارەوە هاتبووە شاخ. من، هەڵۆم لەگەڵ خۆم بردە ناوچەکانی هەرێمی یەک و هەموو کادر و ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەم پێ ناساندن و لەوێم جێگیر کرد. من، پاشی هاتوچۆ و گەڕانێک کە نزیکەی مانگێکی

خایاند، لەگەڵ مەفرەزەکەی خۆمدا گەڕامەوە نێوزەنگ و لە بارەگای شێخەلی کە خۆی بە کارێک چووبووە ناوچەی سلێمانی، بنەم لێ خست.
ئەو ڕۆژگارانەم لەگەڵ برادەرانی سەرکردایەتی و هەندەک کادر و هاوڕێی خۆم گوزەراندن. عومەر حەمەساڵەح و تانیای خێزانی تازە هاتبوون و کچێکی سێساڵەیان بە ناوی «کوردە» هەبوو. فەرەیدون عبدولا و سەباحی موهەندیس کە کادری کۆمەڵەبوون و لە ئەنجامی شاڵاوی بەعسدا بۆ سەر کۆمیتەکانی شاری سلێمانی، هاتبوونە شاخ، پێکەوە بووین. ئەوان هەرزوو، دۆخی ناناسایی و دوور لە چاوەڕوانییەکانیان، ناهومێدی کردن و بە بەرەی ناڕازییانی نێو کۆمەڵەوە پەیوەست بوون. حەمەئاوات، مامەحەمە، فەرەیدون عەبدولا، کەریمی حاجی عەلی، سەرۆکی عەلی حاجی فەرەج، عەریف کەریم، ئەبەزی شێخ جەمال، حەمەسەلیم و کەسانی دیکەش لەو بارەگایەدا بووین.

# هێزی پشتیوان، سەرلێشێواویی سیاسەت!

هێزی پشتیوان، نازناوی ئەو هێزەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو کە لە سێپتامەری ١٩٨٢دا، بۆ پشتگیریکردنی هێزەکانی «حدکا» ناوبەوی سنوور کرابوو.
هێزەکانی کۆماری ئیسلامیی ئێران، لە هێرشێکی بەرفراواندا، تەنگی بە هێزەکانی «حدکا»و مەکتەبی سیاسییەکەی هەڵچنیبوو. بەپێی گێڕانەوەی ئەوشیروان مستەفا «نووسەری پەنجەکان یەکتر دەشکێنن»، د. قاسملۆ هانای بۆ یەکێتیی نیشتمانی و «حشع» بردبوو. دیارە «حشع» وردبینتر و لە مەترسیی دۆخەکە گەیشتبوو. حشع نەچووبووە ژێر ئەو بارە سیاسییە گرانە و خۆی لە جەنگێکی بێئاکام نەهاوێژتبوو. یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، ئەو هێزە سیاسییە سەرچڵە بوو کە کورتبینانە و بەپێی رۆژگار سیاسەتی دەکرد. تاکتیکە سیاسییەکانی یەکێتی، هەمیشە کورتیان دەهێنا و ئاکامی خراپیان لێ دەکەوتنەوە. شەڕکردن لەگەڵ ئێران، بە هەر پاساوێک، بۆ یەکێتی و سیاسەتی ئەو رۆژگارە، هیچ لۆژیک و ئەقڵێکی تێدا نەبوو. هەر هێزێکی سیاسیی لەو سەردەمەدا، بەری بە هێزی ئێران گرتبا، دەبوو خۆی بۆ جۆرێک لە سازش لەگەڵ ئێراقدا ئامادە بکات. حدکا، یارمەتیی و کۆمەکی لە ئێراق وەردەگرت و بەو حاڵەشەوە، لەبەردەم هێرشی ئێراندا خۆی پێ نەدەگیرا.
ئێمە بە ئاشکرا و بێ پێچ و پەنا، دژی ئەو سیاسەتەی یەکێتی بووین و پێمان وابوو بە زیانێکی سیاسیی گەورە دەشکێتەوە. مەلابەختیار، کە ئەندامی سەرکردایەتیی یەکێتی بوو و لە قوڵێکیشەوە سەرپەرشتیی بەرەکەی دەکرد، ئیسان لە کۆبوونەوەدا، دەنگی بە بڕیارەکە نەدابوو و پاشتریش بە نووسین نارەزایی خۆی بە «م س» گەیاند بوو.

شەڕەکان، دەهاتن سەختتر و خوێناویتر دەبوون، ئاسۆیەک بۆ سەرکەوتن دیار نەبوو. ئێران، دەهات زنجیرەچیاکانی دەگرتن و نارەزایی کادر و فەرماندە عەسکەرییەکانیش لە هەڵکشاندا بوو. ئەوە تەنیا ژەنراڵ بەفر بوو کە شمشێری سپیی هەڵکێشا و ستۆپێکی بە لەشکری ئێران کرد.
لەو شەڕانەدا، نزیکەی «١٧» پێشمەرگەی یەکێتی کوژران و لەناو ئەواندا، هاوڕێیەکی زیدەنازیزی منیش بە ناوی «فەیسەڵی مەلاعەلی_ کاکەشێخ» کە فەرماندەی کەرتێکی هەورامان بوو.
یەکێتی، ئەدەبا لەژێر چەتری چ پاساوێکدا، دژایەتیی ئێران بکات و دەکرا لەنێوان دژایەتی و هاوکاریدا، بێلایەنی هەڵبژاردبا. ئەو سیاسەتە، خەندەقێکی قوڵی لە نێوان ڕیزبەندیی «ئێران و جود» و یەکێتیدا هەڵکەند و پاشتر ڕووبارێ خوێنی تێ زا. ئەم سیاسەتە، پاش ساڵێک بە ناچاری، سازشی

نێوان بەعس و یەکێتی دەخولقێنێت.

پاش تەواوبوونی شەڕ و لەسەرتای ساڵی ١٩٨٣دا. یەکێتی ئۆرگانەکانی خۆی نوێ کردنەوە و بەڕێوەبردنی کاری ئیداری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و عسکەریی خۆی لە فۆرمی «مەڵبەند»دا ڕێک خستنەوە و هەموو کوردستانی کردە ٤ یەکەی ئیداری و هەر مەڵبەندێکیش ئەندامێکی کۆمیتەی سەرکردایەتیی یەکیتی، لێپرسراوی بوو.

# دلۆپەقیی بەفر

زستانی ساڵی ١٩٨٣، لە سارد ساردتر بوو. کوێستان و گەرمێنی کوردستان شەختەبەند بوون. جوڵان و بزووتن لە شاخەکاندا قەستی سەر بوون. ئێمەی پێشمەرگە، ئەگەرچی ئەزموونی چەندین ساڵی ژیانی زستانانمان لە چیا و هەردی کوردستاندا هەبوو، دیسانش هیچ ساڵێک بێ قوربانییانی بەفر نەدەگوزەری. ملازم تایەری عەلی والی بەگ، کاوەی شێخ لەتیفی حەفید و چەند پێشمەرگەیەک، لە شاخی قەندیل و بە ڕێگاوە بەرەو ئێران، ڕەقهەڵاتن و لە بەفردا گیانیان سپارد.

من زستانەڕۆژێکی ساڵی ١٩٧٩م لەبیرە کە لە چەوتان و کۆڵێتانەوە، بە نیازی ناوچەی مەریوان، بە چیادا هەڵگەڕاین. ئەو ڕۆژانە، پلەی گەرما ڕەنگە ١٠ تا ١٥ی ژێرسفر بوو بێت. ئێمە دەبوو لە جۆگایەک بپەڕینەوە کە بەفر لەسەر ڕۆخەکانی باڵازەلامێک کەوتبوو. «فەرهاد». کەمێک کورتەباڵا و قەڵەو بوو. بازەکەی کورتی هێنا و لە ناوەکەدا نوقم بوو. فەرهادمان ڕاکێشایە دەرێ و لە ساتێکدا هەموو باڵای بوو بە چلوورە، ئاگرمان کردوە و نزیک بە چارەکەسەعاتێکی خایاند تا شەختەی ڕیشی درێژی توایەوە و ئاهێکی بە بەردا هاتەوە. چیا وەک ئاوێنە لووس بوو. ڕچەشکاندن، ڕەنجی فەرهادی گەرمک بوو. کەسێک لە پێشەوە و بە نێزەی چەکەکەی شوێنپێکانی هەڵدەکەندن. دەبوو بە ئەزموون و شارەزاییەوە پێیەکانت وەگوێزیت. من، لە هەنگاوێکدا هەڵدێرام و وەک ئەوانەی لە وڵاتانی ئەورووپادا، بەفرخلیسکێنە دەکەن، سەرەنگرێ بووم و بەرەو چەم داخزام. هەرچیم دەکرد و دەکۆشا، شتێکم بۆ خۆگرتنەوە شک نەدەبرد. هاوڕێکانم، لەسەرەوە ئەبڵەق مابوون و لێیان دەڕوانیم کە داخۆ کەی لە زەرەدمایەکەوە بازرە دەبم و بە جێیان دەهێڵم. دەخلیسکێم و خێراییم زیاتر دەبێت و کۆنترۆڵم نامێنێت، وردە وردە خەریکم ورە بەردەدەم و خۆم تەسلیمی دلۆپەقیی بەفر دەکەم. بەرەوڕووی بنەداربەڕوویەک دەبمەوە، هەردوو قاچم جووت دەکەم و بەو خێراییە، خۆم بە داربەڕوودا دەکێشم. پەرچەکرداری پێکدادانەکە، بە دەوری داربەڕوودا دەمسووڕێنێت و لەنگەر دەگرم. ئازارێک لە هەناومدا دەمکرۆژێت. سەرم گێژ دەخوات و چاوم ڕەشکەوپێشکە دەبینێت. قەدەرێک بەو حاڵە دەمێنمەوە و پاشان پشووم وەبەر دێتەوە. لە هاوڕێکانم دەڕوانم، وەکو زنجیرەخاڵێکی ڕەش بە ناوقەدی چیاکەوە دیارن. ئەوان پشتێنەکانیان لە یەکتر گرێ دەدەن و بۆ منی دەهاون و نزیکەی ١٠٠ مەترێک هەڵمدەکێشن.

## یادێک لە ئۆڵدپار!

لە سەرەتایساڵی ١٩٧٨وە کە شارم بەجێ هێشت و تا ئەوسات کە پێنج ساڵان تێ دەپەڕین، چ خواردنەوەیەکی ئەلکهولم نەخواردبوویەوە و لە هەرکوێش کارم کردبوو، ڕێگام بە کادر و پێشمەرگەکان نەدابوو، مەشروب بخۆنەوە.

ئێوارەیەکی بەفراوی، دلێری سەید مەجید پێی گوتم: ئەمشەو بەتەنیا وەرە بۆ مەقەڕی کاک سالار، بۆخۆمان لەگەڵ کاک ئازادهەورامی و کاک قادری حاجی عەلیدا دادەنیشن و قسەوباس دەکەین. سالارعەزیز، چووبووە خوارەوە و مەقەڕەکەی جێ هێشتبوو.

شەو، لەوێ کۆبووینەوە. دلێر گوتی: من دەچمە لای مامجەلال، کارێکم هەیە و زوو دێمەوە، بزانم شتێکێش لەگەڵ خۆم دەهێنم.

دلێر ڕۆیشت و زۆری نەبرد بە بوتڵێک ویسکیی «ئۆڵدپار»ەوە، گەڕایەوە.

گۆشتی قاورمە لە تەنەکەدا و لە شارەوە هاتبوو، ویسکیی ئۆڵدپار، پەنجەی ناسکی ئازادهەورامی لەسەر ژێی گیتار، گۆرانی عەلی مەردان و دەنگی بەسۆزی زۆرنزمی قادری حاجی عەلی، قسەی تامدار و بەکاوەخۆی دلێری سەید مەجید و فەنتازیا و تێڕامانەکانی من لە ئایندە و چارەنووس، لە نێو دڵی شەختەبەندی «نێوزەنگ»دا، ڕەگەزەکانی دنیایەکی سوریال بوون. من، ئەو شەوە، بارتەقای هەموو ژیان، لەززەتم لە خواردنەوە برد.

«قادری حاجی عەلی»، کەسێکی وردبین، هێمن و ڕێزدار بوو کە زۆر زوو دەتتوانی خۆشت بوێ. لە شوێنی دیکەدا، باسم لە «ئازاد» کردووە و لە بەرگی دووەمی «ئەزموون و یاد»دا، ئێمە تەمەنێک پێکەوە دەبین.

## لێقەومان لە بەفردا

+ بەم بەفر و شەختەبەندانە سەرمان تێدا دەچن. با مانگێکی دیکە لێرە وەمێنین و ئەوجا بەرەو شارباژێر برۆین.

_ ئێمە دەبێت برۆین. ماوەی نێوان نێوزەنگ و شارباژێر، لە کەشی ئاساییدا، چوار رۆژ رێگا دەبێت، ئێمە بەم زستانە و بەکاوەخۆ، با دە رۆژانمان پێ بچێت.

+ دوو هەفتە نابێت ملازم تایەر و شێخ کاوە و هاورێکانی لە بەفردا تێدا چوون، بەفر وەکو ئاگر و ئاو، ئامانی نییە!

_ رێکردن لە بەفر و شەختەدا، هونەری خۆی هەیە. جگە لەوە ئێمە بە ناوچەیەکدا تێدەپەرین پڕ لە گوند و ئاوەدانی، تۆ. ئەگەر هەرگیز پاشنیوەڕوان و دەرنگتر نەکەویتە رێگا، ئیدی شەوت بەسەردا نایەت و تووشی گێچەڵی بەفر نابیت.

قسەوباسمان لەسەر سەفەری نێو بەفر و گەڕانەوە بۆ ناوچەی شارباژێرە.

ماڵوحاڵێکمان بۆپێچانەوە نییە. بەیانییەک زوو، خۆمان و چەکەکانمان، دەستەیەکی دوانزە کەسی ماڵئاوایی لە ناوزەنگ دەکەین و بە رچەی شکاوی کاروانی قاچاخچیاندا، بەرەو گوندی «بێوران»ی ناوچەی سەردەشت دەجمێین.

کاتژمێر یەکی پاشنیوەڕۆی رۆژێکی وەیشوومە و بەفراوی، لە چاخانەکەی «بێواران»دا دانیشتووین و لە پەنجەرەکانەوە، لەو بەفرە دەڕوانین کە لە پەسا دەبارێت. بەفری چەندرۆژەکەوتوو دادەپۆشێت و وڵات دەکاتە پارچەیەک لە زیو.

+ خاڵەگیان! لێرەوە بۆ گوندی «قەڵەڕەشە» چەند سەعات دەبێت.

_ رێگاکە هەر دووسەعاتان دەبێت، بەڵام بەم بەفر و زریانە چوارسەعاتان دەخایەنێت.

+ ئێستا وەڕێ بکەوین، سەعات پێنج دەگەینە مەنزڵ!

_ ئەگەر لەسەرخۆ و پێشمەرگانە برۆن، دەنا زووتریش دەگەن.

+فەرموون با بجمێین!

من، لە چاخانەکە وەدەر دەکەوم و ئەوانیش بە ئابەدڵیی دوم دەکەون. پێشمەرگەیەک پێش دەکەوێت و ئێمەش ریز دەبەستین و بە سپیایی جادەکەدا کە ئیدی شوێنەواری جادەی لێ نەماوە. گوندی بێوران لە پێچی باخەکاندا جێ دەهێڵین و پێچاوپێچ شوێن تارمایی رێگاکە دەکەوین. چەند لە گوندی دوور

دەکەوینەوە، بەفربارین قورستر دەبێت، ڕچەشکاندن ئەستەمتر. هەیبەت و شکۆیی پڕترسی بەفر بالآدەستتر.
لە بەفردا، لەژێر گەردەلوولی زریاندا، تاپۆی شوێن و شتەکان لە مەودای ڕاستەقینەی خۆیان نزیکتر دێنە پێشچاو. ئێمە دەڕۆین و زمانی سپیی زریانەکە دەمانلێسێتەوە و دەمانکاتە ١٢پیاوەبەفرینە.
لە بەفردا، کەسێک ناتوانێت تا دوامەنزڵ لە پێشەوە بڕوات و ڕچەشکێن بێت، بەڵکو دەبێت کەسی پێشەنگ پاش ماندووبوون، بوەستێت و ڕێگا بۆ کەسی دووەم چۆڵ بکات و خۆی بێتە دواکەس و ئیدی ئاوا. دەبێت کەسەکان جێگۆڕکێ بکەن.
کات هەڵدەکشێت، ئێمە لە ئێوارە نزیک دەبینەوە و بەرەو تێشکی چراکان خۆمان دەکوتین. ئێمە برستمان لێ براوە و چراکانی گوند، سەرابی تیشکن و پێیان ناگەین. لە بوولێڵی ئێوارەدا، بەفر و زریان زۆرمان پێ دەهێنن و دێین لەژێر قورسایی بەفردا کەسیرە دەبین و هێزی جمان و تەکانمان بە جۆرێک لاوازە، لەتر دەبەین و هەنگاوێک بۆ پێشەوە و دوو شەقاوان دەکشێینە دواوە. عومەری حەمەساڵح، لەڕێ لای داوە و ڕەنگی قاچی بە جۆرێک گرژ بووە، توانای ڕۆیشتنی نەماوە. مام وەسوو، لە هەموومان بە گوڕترە. ئەو پێش دەکەوێت، هەموو دەستی یەکتر دەگرین و یەک ئەویدی پەلکێش دەکات. ئێمە، ململانێ لەگەڵ بەفر و مەرگدا دەکەین و خۆشەویستیی ژیان دەمانبزوێنێ و لە دڵماندا تارمایی مردن و ڕەقبوونەوە کاڵ دەبێتەوە. وەسەر گرد دەکەوین و ئیدی ئێمە تا ئێوقەدمان لە بەفردا نوقم بووە. دەبێ تەقە بکەین و خەڵکی گوند بە هانامانەوە بێن. ڕێژنە گوللەیەک، هەواڵی پەرێشانحالیمان بە گوند دەگەیەنێت. لە گوندەوە وەڵاممان دەدرێتەوە. لە گوندەوە، چراکان بە گردەکەدا هەڵدەگەڕێن و تیشکی هەر چرایەک، ترووسکەی ژیان لە هەناوی ڕچیوی ئێمەدا هەڵدەکات.
ئێمە لە نێو بەفردا کەوتووین و توانای یەک هەنگاویشمان نەماوە. پیاوانی گوند بە ئێسترەوە دەگەن و ئێمەی نیوەمردووە، وەکو بارەشەختە، لە پشتی ئێسترەکان بار دەکەن و بۆ گوند دادەگەڕێین. لە ماڵەکاندا، ژنانی گوندی، بە سەلیقەی خۆیان، تیماری قاچ و دەستی سەرمابردوو و کەسیرەبوومان دەکەن. ئەوان، نانمان دەدەنێ و لەپەسا چای گەرممان دەرخوارد دەدەن و پاشتر لە پێخەفی پاک و گەرمدا دەمانخەوێنن.
ڕۆژی پاشتر، یەکدی دەبینینەوە و ئەوان بە چاوی پڕ گلەیی و گازندەوە لە من دەڕوانن. من دەڵێم: هەقی خۆتانە، وەخت بوو هەموومان ڕەق هەڵبێین، ئەویش لە سۆنگەی باش بیرنەکردنەوەی مندا بوو.
ڕۆژێکی دیکە لە هەمان گوند دەمێنینەوە و پاشان دەچینە گوندی «ئەسپەمێزە».
ڕۆژی پاشتر، ڕەگەڵ قاچاخچیان دەکەوین و «هۆمل» دەبەزێنین.
«بێژوێ» ، «بێتووش» و «ئەشکان» و بە چەندڕۆژ و بەوچان دەگەینە ناوچەی بانە و گوندی

بلەکێ.
لە نێوان «قۆخ»ەکانی بلەکێدا، لەسەر جۆگەئاوێک، بە ڕیز دەڕۆین. شۆخەکچێک، لەو پەرییانەی نێو شیعرەکانی «گۆران»، سەتڵێک ئاو لە سەرشان، بەرەو ڕوومان دێت. چۆڕاوگەی ئاو، بەسەر شانوملی ڕووتی گوڵناسادا دەچۆڕێتەوە و مەمکۆڵەی نیوەڕووتی بێمەکدان. لە ژێر کراسی تەنکەوە، وەک دوو ئەستێرە دەجریوێنن. کچ دەگاتە ئاستی من و من سەر دادەخەم. لە پشتەوە، گوێم لێیە کەسێکیان دەڵێت: وای! بە ڕووتی خۆی لەبەر کردووە «لابس بدون هدوم!» من، ئاوڕ دەدەمەوە و لێی تووڕە دەبم... شەرم ناکەیت! ئێمە پێشمەرگەین یاخود جاش؟ تەریق نابیتەوە؟!
ئەو دەڵێت: شتێکی خراپم نەگوتووە، ڕاستییەکەی دەڵێم.
مەسەلەی ژن و سێکس، تا ئەو کاتەش، لای ئێمە زۆر بە سەختی گیرابوو. من، بەشبەحاڵی خۆم، لە ماوەی دەساڵی ژیانی شاخدا، هەرگیز دەستم بەر دەستی هیچ ژنێک نەکەوت. دەزانم، لێپرسراوانێکیش هەبوون، هیچ دەرفەتێکیان لە دەست نەدەدا. من، لە لێپرسراوم بیستووە، گوتوویەتی: لە شارەزوورەوە تا قەرەداغ، لە هەر دێیەکدا، «ژنێکم» هەس! وەخوا من بێ ژن هەڵناکەم. بەڵام، ئەوانە دەگمەن بوون. ئێمەی کۆمەڵە، لە مەسەلەی «سێکس»یش، وەکو زۆر مەسەلەی دیکە، سەقەت گەیشتبووین.
چەپاندنی سێکس، لەتەمەنی هەرزەکاریدا، دەشێت کارکردی خراپ لەسەر باری دەروونی مرۆڤ دابنێت و لە تەمەنی سەرووتردا، گرێ و گرفنجکی دەروونیی بۆ درووست بکات. خوێندنەوەی شیعرێکی من، کە بیست ساڵێک پاش ئەو زەمەنە نووسیومە، دەشێت جۆرێک لە ئازاری ئەم چەپاندن و لە ئەشق بێبەریبوونەی لێ بتکێت:

گازندەی نێوانی خۆمان بێ،
نەدەبوو هێندەم زات لە بەرنێی،
جوانەگای توانستم، لە گێرەی سەرابی شۆڕشدا بپرووکێ!
تۆ وات کرد تا شەوقی بینینم
بۆ ئەشق و
بۆ ژن و
بۆ جوانی،
لە لوولەی تفەنگدا بخنکێ!
(کۆپلەیەک لە شیعری «ژنباران»، دیوانی بە تیرۆژێک لە نیگای تۆ...)

## پارەزان،
## گوندێک بۆ پشوودان و ماڵێک بۆ بیرکردنەوە!

پاش دەرۆژان، شەکەت و برستلێبڕاو، گەیشتینە گوندی «پارەزان» و ڕوومان لە ماڵی بەکری حاجی سەفەر کرد. ماڵی پیاوێک کە لە هەر شوێنێک ماڵ و بارەگای هەبووبێت، دیوەخانێکی بۆ پێشمەرگە و ڕێبواران گەرم کردووە. ئەوان، خێزانێکی گەورە و ماڵێکی ئاندە و دەست و دڵئاوەڵا بوون کە لە ئەداری و دەستکورتیی ئەوێ ڕۆژێی «یەکێتی»دا، لەسەر گیرفانی خۆیان و کەسوکاریان، لە ساڵێکدا، سەدان کەسیان دەحەواندەوە و بەڕێیان دەکرد. کافەخان، هەوار، چنار و نیگار خێزان و کچانی بەکر بوون کە ماندوویێتییان ئەدەناسی و وەکو فرفرە لە ماڵدا هەڵدەسووڕان و سفرەیان دەڕازاندەوە.

قادری حاجی حەمەشەریف«د.قادر» کە هاوڕێی دکتۆر هەژار مارف، ئەخۆشخانەیەکیان لە گونددا ئاوەدان کردبوو، ژوورێکی چکۆلەی لە نزیک ئەخۆشخانەکەوە، بە ئێمە بەخشی.

ژوورمان کردە بارەگا و ڕاخەر و پێخەف و قاپوقاچاخمان پەیدا کردن.

بەکری حاجی سەفەر، سالارعەزیز، شێخەلی و من لەگەڵ ٤٠ تا ٥٠ پێشمەرگەیەک، لەوێ دەژیاین و هیچ کارێکی سیاسیمان وەرنەگرتبوو. هەر لەو سەروبەندەدا، مەڵبەندی یەک دامەزرا و بارەگای لە گوندی حاجی مامەند دانا. مەلابەختیار لێپرسراوی مەڵبەند و بەکری حاجی سەفەریش بوویە لێپرسراوی عەسکەری.

من دڵم بە بارەگا و ئەو برادەرانەیش لە گەڵمدا بوون، خۆش بوو. لە پارەزاندا، خوومان بە خوێندنەوەیەکی چڕ و پڕەوە گرت. سالارعەزیز، کتێبخانەیەکی تا ڕادەیەک باشی هەبوو، ئێمەش کۆمەڵێک کتێبمان لە شارەوە بۆ هات. پارەزانمان کردە مەڵبەندی خوێندنەوە و بەخۆداچوونەوەی فیکری و ڕۆشنبیری و ئەدەبی. خوێندنەوەی ئەدەبیاتی مارکسیزم و دانراوەکانی «لینین»مان سەرلەنوێ تاووتو کردنەوە. لەو واقیعەی بزووتنەوەی چەکداریی کوردستان و ئەو فەوزایەی هێزە سیاسییەکانی تێ کەوتبوون، تیور و پراکتیک، بۆ ئێمە پێک ئەدەهاتنەوە و تا دەهات کەلێن و کەلەبەرە فیکری و سیاسییەکان هەراوتر دەبوون.

بنکەکانی ئێمە لەپارەزاندا، لانە و داڵدەی ئەو تێکۆشەر و پیشمەرگانە بوو کە کێشەی فکرییان لەگەڵ کۆمەڵەدا هەبوو. کەسانێک هەبوون، چەند ساڵان پێشمەرگە بوون، بڕوایان بە کۆمەڵە لەق بوو، نەیاندەویست شاخ بەجێ بهێڵن و تەسلیم بە دەوڵەت ببنەوە. لای ئێمە، لانەیەکی ئارامیان

دەبینییەوە. مەفرەزەکەی من، لە هەندێک کاتدا، بەشێکیان ئەندامی کۆمەڵە نەبوون و بڕواشیان بەو ڕێبازە نەبوو. ئیسانیش کەسانی چەپ، دڵسۆز و تێکۆشەر بوون و لە هەموو شەڕێکدا، وەک هەر پێشمەرگەیەک ئامادەییان هەبوو. حاجی ئەنوەر، کەسێک بوو لەو تێکۆشەرانە کە ساڵانێک، پێشمەرگەیەکی لێوەشاوە و چەپێکی بانچەپ، لە پارەزان و ناوچەکانی دیکەش، لەگەڵ ئێمە پێشمەرگە بوو. کەمالی دەروێش عارف، مامۆستایەک بوو کە من لە ساڵی ١٩٧٦دا، لە سلێمانی ناسیم، ئەوسات زیاتر لە بیری پاسۆکەوە نزیک بوو، دواتر کەوتبووە ڕیزەکانی کۆمەڵە و ببووە پێشمەرگە. ئەویش، هەرزوو گومان و دڵەڕاوکێی فیکریی لا دروست بوو و بە جێی هێشتین.
بەکرموحەمەد، ناسراو بە دکتۆرنەبەز، پێشمەرگەیەکی وریا و چەپێکی هەڵسووڕاو بوو کە چەند ساڵێک لەگەڵ ئێمە، چ لە پارەزان و چ لە شوێنەکانی دیکە، پێشمەرگە بوو، پاشتر بوویە کادرێکی دیاری نێو ڕەوتی کۆمۆنیست و پاشتریش، حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاری. لەو پێشمەرگانەی لە پارەزان پێکەوە بووین، مامەحەمە(حەمەی حاجی حەمەکەریمی گێڵدەرەیی)، عەبدولی حاجی حەمەشەریف، جەزای مام غەریب، ئاسۆ ڕەحیم (حەمەی ئەورەحیم)، کەریمی حاجی عەلی، نەبەزی شێخ جەمال و زۆری دیکەش.

جێگیربوون و بوونی ماڵێک بۆ ژیان و پشوودان، بۆ منێک کە ساڵانێک بوو لە ماڵان و مزگەوتاندا دەحەوامەوە و سێژەمە لە دەرگای جووتیارانمان دەدا، لە ڕووی دەروونییەوە کارکردێکی پۆزەتیڤی هەبوو...
+ پووری گیان میوان ڕادەگرن؟!
_ فەرموون باوکەکەم، ماڵی خۆتانە!
_ جا میوانیش ڕانەگرین،چی بکەین!
_ هەرچیمان هەیە هی ئێوەیە، ئێمە خاوەنماڵ نین!
_ پیاومان لە ماڵ نییە!
+ پیاومان ناوێت، ئێمە برای تۆین!
_ حاشا، من برای دەرۆزەکەرم نین!
+ پووری گیان! بۆ هەموو ژەمێک نان و ماست؟
_ یەک ڕۆژ ژەمبوێری بکەن، ژەمی دووەم کەڵەشێرتان بۆ دەکوژمەوە!
+ ئەم هەموو ئەرکەتان بۆ کێشاوە، دایە گیان!
_ بخۆن دایکتان کوێر بێت، کەمن بم! ئاخۆ چەند ساڵە، دایکی خۆتان نەدیوە!

+ پێخەفێکمان ئەدەنێ؟
_ ئادەی ئافرەت، پێخەفی باشیان بۆ بێنە!
_ پێخەفی پێشمەرگە، لەسەر کولانەی مریشکەکانە، خۆتان برۆن بیبەن!

چەند گوناه بوون، ئەو خێزانە جووتیارانەی نەیاندەتوانی ژەمێک بە تەنیا و بۆخۆیان پێکەوە نانێک بخۆن، پاش ماندووبوونی رۆژانە، پێکەوە رابکشێن و وەنەوزێک بدەن. چ سەخت بوون ئەو زستانەشەوانەی لە دەرگەی مالآنمان دەدا و لە شیرینخەودا، تازەزاوایەکمان لە ئامێزی نۆبووک دەردەکێشا و بۆ تاقیکردنەوەی مەترسیی رێگا، وەپێش خۆمانمان دەخست. من، هەمیشە لە توانا و حەوسەڵە و خۆڕاگریی خەڵکی گوندەکانی کوردستان سەرسام بووم. ئەو خەڵکە چ وزە و توانایەکیان هەبوو!
قۆناغی داساکان و جێگیربوون لە بارەگادا، ئەو ئازارە دەروونیانەیان کەم کردنەوە.

***

بەفر دێت دەتوێتەوە و شاخ و کێوان خاڵخاڵ دەبن. کانییەبەهارە ئاوزێم دەبن و دەڤەری شاربازێر بە گوڵومول دەخەملێ. مەفرەەی هێزە جیاوازەکان بە ناوچەکەدا دێن و دەچن. جارێ رێککەوتنێکی قرچۆک لە نێواندا هەیە. هێزی پارتی و سۆسیالیست لە شاربازێردان و حیزبی شیوعی بارەگایان لە گوندی حاجی مامەند، بە تەنیشت بارەگای مەڵبەندی یەکێتییەوە، داناوە. برینەکان پەترۆکەیان نەبەستووە و چەقۆی دەستی هەر لاسارێک، دەکارێت هەڵیاندەداتەوە.
نەبوونی رێککەوتنێکی ستراتیژی و بەرنامەیەکی کاری هاوبەش لە نێوان هێزەکاندا، ئەگەری تێهەڵچوونەوە و یەکترداپاچین بەهێز دەکەن.
لە شارەزوورەوە، تێکهەڵچوون لەگەڵ سۆسیالیست روو دەدات. لە شابازێر، لە بۆسەیەکی هەڵەدا، جەزای عەلی کاتب، بە دەستی هێزەکانی یەکێتیی دەکوژرێت. پارتی، لە «کۆپانان»، مەفرەزەیەکی یەکێتی دەخاتە بۆسەوە و دەیانکوژێت. ئێمە، چەندجاران لەگەڵ مەلابەختیار کۆبوونەوە دەکەین و لە هەوڵی ئەوەداین
ئاگرەکە سەرتاسەر نەگرێتەوە و سنووردار بکرێت. مەلابەختیار هەوڵ دەدات و دواجار بە ئەنجامێک ناگات. ناوداران و کەسایێتیی ناوچەکە دەنێردرێن بۆ لای پارتی، بەڵکو ناوچەکە چۆڵ بکەن، تا بە چارەسەرێک دەگەن. دووربکەونەوە... بێئەنجامە!
یەکێتی، هێز کۆ دەکاتەوە و لە شەڕێکی خوێناویی دووڕۆژەدا، هەموویان ئاودیوی سنوور دەکات. لەو شەڕەدا، ئێمە بەشدارییمان تێدا نەکرد و بە نیگەرانییەوە لە شەڕی براکانمان دەڕوانی. ئەم شەڕە،

هەموو کوردستان دەتەنێت و لە «قڕناقا و پشتئاشان» بە قەسابخانەی براکان، کۆتایی دێت!
لە حاجی مامەند، بە هەوڵی هەموولایەک و حیکمەتی مەلابەختیار و ئاوەزی بەهادین نووری، حیزبی شیوعی، بێ خوێنڕژتن، بۆ قەرەداخ دەپەڕنەوە.
پاییز دێت و شەڕی ئێران/ئێراق، لە کوردستاندا کڵپە دەستێنێت. شاربازێڕ، لە نێوان ئاگری شەڕدا دەسووتێت و هێزی یەکێتی وەختە لە مەنگەنە بدرێت. دەوڵەت، گوندەکان تۆپباران دەکات و چەندین پێشمەرگە و هاوڵاتی دەکوژرێن. ڕەوشەکە لە ڕووی سیاسییەوە ئاڵۆزە و یەکێتی لە ئەنجامی سیاسەتەکانی خۆیدا، دەکەوێتە دۆخێکی دژوارەوە.
هەر ئەو هاوینە، کۆمەڵە، کۆنفرەنسە ناوچەییەکان، بۆ خۆسازدان بۆ کۆنفرەنسی سێهەم، دەبەستێت.
من، نامەیەکم لە جەمال تاهیرەوە پێ دەگات. نامەیەک پڕ لەهاندان بۆ بەگەڕکەوتنەوە و وەلانانی هەر ناکۆکییەک و بەگەرمی بەشداریکردن لە کۆنفرەنسدا.
ئێمە، بە هەموو قوورساییەکمانەوە، دەمانەوێت بەشداری لە کۆنفرەنسدا بکەین. من، بابەتێک دەنووسم لەمەڕ«کێشەی کورد لە نێوان واقیع و خەیاڵدا»، لە کۆنفرەنسدا دەبێتە جێگای مشتومڕ و زۆرترین دەنگ وەکو نوێنەری هەڵبژاردە بۆ کۆنفرەنس، وەردەگرم.

شەڕی نێوان هێزەکان بەردەوام و خوێناوییە. تیرۆر دەگاتە شارەکان و هەندێک لە کادر و کۆنەلێپرسراوانی پارتی، لە سلێمانیدا تیرۆر دەکرێن. یەکێتی، لە «دەنگی شۆڕشی ئێراق»ەوە، بێگوناهی خۆی لەو کارانە ڕادەگەیەنێت و پەردەپۆشیان دەکات. دۆخەکە مەترسیدارە و ئێمە زیاتر بێهیوا و نیگەران دەبین.

## مفاوەزات، دەروازەیەک بۆ دەربازبوون

لە سەرەتای پاییزدا، لەژێر تۆپبارانی ئێراق و پێشڕەویی هێزی ئێراندا، بەرەو «چنگیان» و پاشان دۆلی جافەتی ڕۆیشتین. ئەوێ دەمێ، مەلابەختیاریش دەستی لە لێپرسراوێتیی مەڵبەند بەردا و بەکری حاجی سەفەر جێگای گرتەوە.

ماوەیەک بوو، دەنگوباسی موفاوەزات بەسەر زارانەوە بوو. دەنگۆ، بوویە حەقیقەت و وەفدی یەکێتی، لە خۆشناوەتییەوە، بەرەو بەغدا بەڕێ کەوت!

ئێمە، پەڕینەوە بۆ قەرەداخ و بنکەیەکمان لەوێ دانا.

موفاوەزات، دەرکەی بۆ چوونە شار و بە کەسوکارشادبوونەوەی، لێ کردینەوە.

موفاوەزات، بۆ ئێمە پشوودانێکی جەستەیی بوو، دەروازەیەک بوو بۆ دەربازبوون لە قەیرانێکی سیاسی کە یەکێتیی تێی کەوتبوو!

من و خوێنەر، لە موفاوەزاتدا پشوویەک دەدەین و لە بەرگی دووەمی «ئەزموون و یاد»دا، لەوێ ڕا پێک دەگەینەوە و چەندساڵێکی دیکەش پێکەوە دەبین.

## فەرهەنگی ناوەكان:

* هیدایەت، پێشمەرگەیەكی كۆمەڵە بوو كە تەنیا دوو ڕۆژ پێش ئەو ڕووداوە، بە مەبەستی تیرۆر كردنی هاوكارێكی بەعس بە ناوی (ئەحمەدی مورادخان)، لە بازاڕی هەڵەبجەدا نارنجۆكێكی تەقاندەوە. ئەم كارە بوویە هۆی كوشتنی كەسێكی بێتاوان بە نێوی (ئەدهەم شێخ فەرەج) كە كارمەندی دەسگای كشتوكاڵ بوو، كەچی خودی تاوانبارەكە سەلامەت دەرچوو.

* حەمەسەعیدەسوور «دكتۆررەزا»، لە پێشمەرگەكانی یەكەمین مەفرەزەی سەرەتای شۆڕش، كادری كۆمەڵە، لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان، ساڵی ١٩٧٨ بە دەستی هێزەكانی «ق م»، لە بناری سوورێن، بەدیل گیرا و پاشان ئیعدامیان كرد..

* حاجی چاوشین، كادری كۆمەڵە، تەبەری تایبەتی نێوان سەركردایەتی و هەرێمەكان و ڕێكخستنی شار، لە سۆنگەی گورجوگۆڵی و توانای ڕێگابڕینی لە ڕاهبەدەریدا، بە «كۆپتەری شۆڕش» ناسرابوو. ساڵی ١٩٧٩ لە گەڵ سیروان تاڵەبانیی فەرماندەی هەرێمی پێنج و چەند كادر و پێشمەرگەیەكی تر، لە بناری قەرەداغ بە دەستی جاشەكانی «حەمەخانی حاجی دارا» شەهید بوون.

* شێخەلی: «مەحمود عەبدولەحمان / خولەكەشكۆڵ»، كادری پێشكەوتووی كۆمەڵە، لێپرسراوی یەكەمین مەفرەزەی چەكدار لە دەستپێكی بزووتنەوەی چەكدارانەی پاش هەرەسدا. ئەندامی سەركردایەتیی كۆمەڵە، لە ساڵی ١٩٧٨دا لە هەكاری بەدیل دەگیرێت و لە ساڵی ١٩٧٩دا لە زیندان هەڵدێت. لە ساڵی ١٩٨٥دا تا ساڵی ١٩٨٨، وەكو یەكێك لە سەركردەكانی ئالآی شۆڕش، لە زیندانی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستاندا زیندانیی دەبێت و پاشتر ئازادی دەكەن، ساڵی ١٩٨٩، وەكو پەنابەر دەچێتە وڵاتی سوید، ساڵی ١٩٩٦ دەگەڕێتەوە نێو ڕیزەكانی یەكێتی و دەبێتە جێگری لێپرسراوی مەكتەبی پەیوەندییە نیشتمانییەكانی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان، لێپرسراوی دەزگای شەهیدان و پاشتر خانەنشین دەكرێت.

* فەرەج تریفەیی: ئەندام و فەرماندەی مەفرەزەی كۆمەڵە، جوتیارێكی خوێندەواری خەڵكی گوندی»تریفە«ی نزیك هەڵەبجە بوو. لە ساڵی ١٩٧٧دا بوو بە پێشمەرگە و لە كۆتایی ١٩٧٨دا، لە بۆسەیەكی جاشاندا، لە نێو شاری هەڵەبجەدا شەهید بوو. شەهید فەرەج پیاوێكی ئازا، بەوەفا و لێهاتوو بوو. توانست و شێوەی هەڵكەوتنی ئەندامەكانی لەشی، خەسڵەتی پارتیزانێكی زرنگیان پێ بەخشیبوو.

* غەفور دەرەشیشی: ئەندامی كۆمەڵە، فەرماندەی مەفرەزە، بەورە و پیاوی ڕۆژی تەنگانە، قسەخۆش

و حازربەدەم. ئەو جوتیار بوو، لە پێشمەرگەکانی ساڵی ١٩٧٦ بوو. ئەو لەریزەکانی یەکێتیدا، تا پلەی فەرمانده‌ی کەرت سەرکەوت. لە ساڵی ١٩٨١دا و لەشەڕێکی نێوان یەکێتی و پارتیدا، لە گوندی ناوگردان کوژرا..

غەفوور هەمیشە دەیگوت: کورد کاتێک سەردەکەوێت، کە تۆ کچێکی خەڵکی گوندی «بۆیین» ببینیت، پانتۆڵێکی چارلستۆنی لە پێدا بێت و بە عەرەبی گۆرانی بڵێت. بۆیین، گوندێکی دورەدەست، چەپەک، کەمئاو و دواکەوتوو بوو. ئەو، ئەوەی بە مەحاڵ دەزانی. لەم ساڵانەدا، برادەرێک گوتی: من، دوێنێ لە گەڕەکی «ئەکالا»ی ستۆکهۆڵم، لە ماڵی ژنێکی بۆیینی بووم. من گوتم: تەواو! ئاواتەکەی غەفوور، جێبەجێ بوو!

* مەحمودی حاجی فەرەج

ئەندامی کۆمەڵە، فەرمانده‌ی مەفرەزە، کەرت، تیپی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە هەورامان و سنووری هەرێمی یەک. کەسێکی ئازا و دیار لە ناوچەی هەڵەبجەدا. ئەو لە عەشیرەتی کۆکۆییە و بنەماڵە و خێڵەکەی بە گشتی لە رۆژانی دووکەرتبوونی بزوتنەوەی کورددا، لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیدا بوون و دەیان گەنجیان لەو پێناوەدا کوژران. مەحمود، هاوڕێی نزیک و خۆشەویستی سەردەمی منداڵی و پێشمەرگایەتیی من بوو. ئەو ساڵی ١٩٨٤دا، لە خۆشناوەتی شەهید بوو!

* حەمەئاوات شێخ سدیق: خەڵکی شاری هەڵەبجە، دەرچووی پەیمانگای تەندرووستی لە بەغدا، ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان/ باڵی مەکتەبی سیاسی لە هەفتاکاندا. پاش هەرەس، بووەتە ئەندامی کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینی کوردستان. سەرەتای ساڵی ١٩٧٨ بووەتە پێشمەرگە لە هەورامان.

پاش بەناچاری تەسلیمکردنەوەی، ساڵی ١٩٨٠ جارێکی تر هاتەوە نێو ریزی هێزی پێشمەرگە، بەڵام لاقەکانی بە جۆرێک سەقەت ببوون کە هەرگیز نەیتوانی کاری ئاسایی پێشمەرگایەتی بکات و لە نەخۆشخانەی سەرکردایەتی کاری دەکەرد. لە ساڵی ١٩٨٤ دا، لە سەروبەندی موفاوەزاتی یەکێتی/ بەعسدا، بە رەزامەندی سەرکردایەتی و لەبەر خراپی باری تەندرووستیی، لە شار مایەوە.

کە ئاڵای شۆڕش درووست بوو، ئەو یەکێک بوو لە کادرە سەرەکییەکانی ناوشار. لە ساڵی ١٩٨٥دا، جارێکی تر هاتەوە دەرەوە و لە گوندی (زێوێ)ی کوردستانی ئێران نیشتەجێ بوو و ئەندامی ئەڵقەی ناوەندی ئاڵای شۆڕش بوو.

لە ساڵی ١٩٩١دا، بە تەنیا و پێش تێکەڵاوبوونی «ئاڵا» و حیزبی زەحمەتکێشان، ئەم پەیوەندیی کردووە بە زەحمەتکێشانەوە. ساڵی ١٩٩١چووەتە سوید و وەکو پەنابەر لەوێ ژیاوە. ئێستا ئەندامی سەرکردایەتیی حیزبی زەحمەتکێشانە.

* تۆفیق رەحیم / تۆفیقی رەعنا/ حاکم کامەران
ساڵی ١٩٧٥ پەیوەندیی کردووە بە ریزەکانی کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینی کوردستانەوە.
ساڵی ١٩٧٦ یەکێک بووە لەو حەوت کەسەی کە یەکەم مەفرەزەی چەکداریان لە کوردستاندا درووست کرد و جاری هەستانەوەی بزووتنەوەی چەکدارییان دا.
ساڵی ١٩٧٧ لە هەلومەرجێکی نادیاردا تەسلیم بە رژێم بویەوە. لەسەرەتادا وەکو دیلێک لەقەڵەمیان دا و دوومانگێک لە زینداندا مایەوە و پاشان وا دەرکەوت کە پێش گرتنەکەی پەیوەندی لەگەڵ موخابەراتدا هەبوە و بەدیلگیرانەکەی جۆرێک لە رێکەوت بووە.
تۆفیق، لە یەکەم رۆژی گیران یان تەسلیمبوونەوەیدا، بەپێی ئەو زانیاریانەی دەست ئێمە دەکەوتن، ناوی ئەنوەر حەمەئەمینی دابوو کە ئەوکات لێپرسراوی کۆمیتەی کۆمەڵە بوو لە شاری هەڵەبجە. ئەنوەر، لەیەکەم ساتەکانی گرتنیدا تێکەوت و ناوی ئەندامانی کۆمیتەکەی خستەڕوو و زۆربەیان دەستگیر کران. ئەنوەر، پاش رۆژێک لە هەڵویستی خۆی پەشیمان بوویەوە و نکوڵی لە زانیارییەکانی خۆی کرد..
ئەنوەر، یەکێک بوو لەو پاڵەوانانەی کە بە درێژایی ئەشکەنجەدانی بێوێنەی بەعس، لە گرتووخانەکانی سلێمانی و هەینەی کەرکوکدا، خۆی راگرت و هەتا حوکمی ئیعدامیان دا و ئیعدامیشیان کرد لەسەر هەڵویستی جەسوورانەی خۆی سوور بوو. ئەنوەر، یەکێک بوو لە قارەمانە کەموێنەکانی کۆمەڵە لە زیندانی موسڵدا و نموونەی ورەبەرزی و خۆڕاگری بوو. نامەکانی ئەنوەر کە لە زیندانەوە نووسیبوونی، پاشتر وەکو نامەی قارەمانێکی خۆڕاگر، لە بڵاوکراوەکانی ئەو سەردەمی کۆمەڵەدا، بڵاو کرانەوە.
تۆفیق، ئەگەرچی ناوی زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵەی لە شاری هەڵبجە و شارەزوور و هەورامان دەزانی، وەلێ جگە لە ئەنوەر، کەسی دیکەی بە گرت نەدا. تۆفیق، جگە لەوەی کە هاورێی کۆمەڵە بوو، هاورێی زیندەخۆشەویستی من بوو..
تۆفیق، بوویە فەرماندەی مەفرەزی ئیستخبارات و لە شەڕی پێشمەرگەدا دریغیی نەدەکرد، کەچی لە ئاستی هاورێیەتی و خزمایەتیدا، چەندی بۆ کرابا، کارئاسانی بۆ ئەوهاورێیانەی کۆمەڵە و ئەو پێشمەرگانە دەکرد کە رۆژانێک هاورێی ئەو بووبوون! ساتێ تۆفیق لە شاخ بوو و حاکمی یەکەمین مەفرەزی چەکدار بوو، مەفرەزەیەکی کۆمەڵە، ئامۆزایەکی تۆفیقیان بە تۆمەتی بە بەعس خزمەتکردن، ئیعدام کرد. زۆربەی بۆچوونەکان لەسەر ئەوە رێک بوون کە کوشتنی ئەو ئامۆزایەی ( کە ئەو بە بێتاوانی دەزانی)، هۆکاری سەرەکیی تەسلیمبوونەوەی ئەو بوویێت.
تۆفیق، لەساڵی ١٩٨٧دا و لە گەرمەی خۆپیشاندانە خوێناوییەکانی شاری هەڵەبجەدا، رۆڵی جوامێرانەی

ئژ بە هێزەکانی بەعس بینی و پاش شکستهێنانی راپەرینەکەش، هاتە ئێران و پەیوەندی کرد بە ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە. ئێستاش هەر پێشمەرگەی ئەو حیزبەیە و لە هەولێر دەژی.

ئەحمەدگریانەیی: ئەندامی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان و لە پێشمەرگەکانی سەرەتای بزووتنەوە چەکدارییەکە. ئەحمەد جوتیارێکی گوندی گریانە بوو، ژن و منداڵی هەبوو، پیاوێکی ئازا و بە هیمەت و کوڕی تەنگانە بوو. پیاوێکی هێمن و لەسەرخۆ و بەنیدارە، شارەزا و خەمخۆری هەموو مەفرەزەکان بوو. وەکو باوکی رۆحیی هەموو پێشمەرگەکان دەبینرا. لە سێبەری ئەودا، هەستمان بە ورە و خۆراگری دەکرد. بە داخەوە تەمەنی زۆر کورت بوو. ئەو، لە پاییزی ١٩٧٨دا، بوویە قوربانیی شەڕی نێوخۆ و بەئاسانی جێی هێشتین!

موحەمەدسەعیدئەحمەد «شاهۆ»: دەرچووی ئامادەیی کشتوکاڵ لە سلێمانی، ئەندام و کادری کۆمەڵە، لە مانگی سێی ١٩٧٨دا لە گەڵ حەمەئاوات پێکەوە و چەند رۆژێک پێش من هاتنە شاخ. شاهۆ، لە هاتنیدا بڕی ٣٥٠٠دیناری کۆمەڵەی هەرەوەزیی کشتوکاڵی هێنایە شاخ کە بۆ ئەو سەردەمەی بزووتنەوەکە، چەردەپارەیەکی زۆر بوو. زۆر کەلێنی پڕ کردەوە. شاهۆ، وەکو هەموومان، کۆمەڵەیەکی دەمارگیربوو. کەسێکی ئازا بوو، بەڵام کەمێک دەمارکرژ و یەکدندە. من بە پێی تێگەیشتنی ئەو سەردەمەم لە شۆڕش و رۆڵی کۆمەڵە، هەمیشە پشتگیری شاهۆ بووم لە پێشکەوتن و جێکەوتنیدا. پێم خۆش بوو، ئەو ببێتە فەرماندەیەکی دیاری پێشمەرگە و هەوڵم بۆ دەدا. هەتا سەرەتای هەشتاکانیش کادرێکی کۆمەڵە بوو، جێگای دڵخۆشی.

شاهۆ و من، لەساڵانی سەرەتادا، هەمیشە پێکەوە بووین. ساڵانی پاشتر، لە سۆنگەی گرفت و کێشەکانی نێو کۆمەڵە، لێک دابڕاین.

شاهۆ، ئێستاش هەر لە کوردستان دەژی و پاشی راپەڕین، چەندین پلەی جیاوازی لە دەسەڵاتی حکومەتی هەرێم «ئیدارەی سلێمانی»دا وەرگرتووە.

مەلابرایم: ئەندامی کۆمەڵە و فەرماندەی مەفرەز بوو. تەمەنی پێشمەرگەیەتیی کورت بوو. لە ساڵی ١٩٧٩دا، لە شەڕێک لەگەڵ جاشەکاندا، لە شارەزوور شەهید بوو..

سدیق گریانەیی: پێشمەرگەیەکی وریابوو. پێش بە پێشمەرگەبوونی، کاری قاچاخچییەتی دەکرد. لەو بوارەدا، بۆ پەیداکردنی خۆراک و پێویستی سودمان لێ وەر دەگەرت. پاش کوژرانی ئەحمەدگریانەیی، بە چەند مانگ تەسلیم بە رژێم بوویەوە..

_ تاهیر عوسمان «م. سەرکەوت»: دەرچووی خانەی مامۆستایان، ئەندام و کادری سەرەتای کۆمەڵە،

ساڵی ١٩٧٦هاتبوویە شاخ و وەکو کادری کۆمەڵە و یەکێتی کاری دەکرد. کەسێکی بەورە و خۆڕاگر بوو. ماوەیەک لێپرسراوی نێوچەی هەڵەبجەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو. پاشان لە دەسگای نێوەندی دارایی یەکێتی کاری دەکرد. ساڵی ١٩٨٥لە گەرمەی کێشەکانی دەروونی کۆمەڵە و یەکێتیدا و پاش زیندانکردنی ئێمە، ریزەکانی یەکێتیی جێ هێشتن و رۆیشتە ئەورووپا. ئێستاش لە وڵاتی سوید دەژی.

عەلی شامار: کرێکارێکی ناوچەی خانقین بوو. ساڵی ١٩٧٧ هاتبوویە شاخ، ئەندام و کادری کۆمەڵە بوو، خۆڕاگر و ئازابوو، رابەری سیاسی بنکەی هەورامانی کۆمەڵە بوو. پاشتر بوویە لێپرسراوی زیندانی نێوەندی لە سەرکردایەتیی یەکێتی. بە درێژایی ئەو ساڵە سەختانە لە ریزەکانی یەکێتیدا مایەوە. پاش راپەڕین ، قایمقامی خانەقین بوو. ئەو بەدرێژایی بیست و پێنج ساڵ هەرگیز سۆرانییەکی درووست و پوخت فێر نەبوو! کەسێکی دڵسۆز و پاک و لە خۆبوردوو بوو.

دڵسۆزی حەمەی سان ئەحمەد «دڵسۆزی رەیس»:

خەڵکی تەوێڵە، ساڵی ٩٧٨هاتە شاخ و بوویە پێشمەرگە لە هەورامان. تەمەنی پێشمەرگەیتیی دڵسۆز کورت بوو. کۆتایی ساڵی ١٩٧٩ گەڕایەوە ژێر دەستی رژێم. ئێستاش بەڕێوەبەری شارەوانیی تەوێڵەیە.

وەستا ئەنوەر «ئەنوەر عەبدولڕەحمان»:

کادری سەرەتایی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان و لێپرسراوی کۆمیتەی هەڵەبجە. ساتێ ئیبراهیم حەسەنی لێپرسراوی رێکخراوی «رەنجدەران» لە رێگەی گەڕانەوەیدا لە شاخەوە بۆ شار، دەستگیر کرا، وەستائەنوەری بەگرت دا. وەستائەنوەر لە زیندانەکانی بەعسدا، بوویە پاڵەوانێکی ئەفسانەیی لە خۆڕاگرتندا. وەک دەیانگێڕایەوە، هەموو سەریان قاژقاژ کردووە و شارەزەردەوالآیان تێ بەرداوە. وەستا ئەنوەر، تا دواهەناسەی لەبەردەم درندەیی بەعسدا هەرەسی نەهێنا!

ئەنوەرحەمەئەمین«هیوا»: گەنجێکی جوانخاس و پیاکەوتوو. لە هەفتاکاندا بۆ خوێندن چووبوویە وڵاتی سوریا و لەوێ پەیوەندی بە کۆمەڵە و یەکێتییەوە کردبوو. پاشی دەستگیرکردنی وەستائەنوەر، ئەنوەر لێپرسراوی کۆمیتەی شنروێ بوو. ساڵی ١٩٧٧، بەعس، ئەنوەری دەستگیرکرد. ئەنوەریش نموونەی خۆڕاگریی نێو زیندانەکانی بەعس بوو. نامەکانی کە لە زیندانەوە نووسیبوونی، لەسەر زاران بوون. ساڵی ١٩٧٨لە زیندانی موسڵ شەهید کرا.

کەمال شاکیر: خەڵکی هەڵەبجە، برینپێچ، کادری دیاری حیزبی شیوعیی ئێراق/ قیادەی مەرکەزی، ئەندام و کادری کۆمەڵە لە نێوەڕاستی هەفتاکاندا. کەمال، ساڵی ١٩٧٩، لەگەڵ ماڵومناڵیدا هاتنە شاخ، کەسێکی خوێندەوار و هۆشار بوو. سەرەتا لە لیژنەی نێوچەی هەڵەبجە کاری دەکرد، پاشان

چوویە بنکەکانی سەرکردایەتی و لە دەسگاکانی ئەویدا دەست بەکار بوو. دواتر بوو بە جێگری فەرماندەی تیپ و پاشان سەرتیپ لە ناوچەی شارەزوور و هەورامان. پاشی راپەڕین، ئەندامی مەڵبەندی شارەزووری یەکێتی بوو یان جێگری فەرماندەی مەڵبەند. ئێستا لە کوردستان دەژی و ئەندامی فەرماندەیی هێزی یەکێتییە.

* مەلارەسوڵ، رەسوڵی حەمەی سەلیم، خەڵکی گوندی پریس، لە عەشرەتی ئەورۆڵی، دەرچووی ئامادەیی پیشەسازی، ئەندامی چالاک و هۆشیاری کۆمەڵە، کادرێکی شارەزا و لێهاتووی نێو جەماوەر بوو.

لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی پێشوودا، بە دەستی جاشەکان شەهید بوو.

* عومەر چاوجوان و رۆستەم: دوو برا و دوو گەنجی جوانخاس و دوو پێشمەرگەی کردە و چاوەترس بوون. ئەوانیش لە عەشرەتی ئەورۆڵی بوون. ئەم دوو برایە بە دوای یەکدا و لە ماوەیەکی کورتدا، لە ساڵی ٩٨٤ _ ٩٨٥دا شەهید بوون.

* حوسەین مەجیدمەلاحامید: ئەندامی کۆمەڵە و فەرماندەی کەرت، گەنجێکی ئازا و جوامێر، بەرێز و رەوشتبەرز، زرنگ و کەمدوو. ئەو، لەو پێشمەرگانە بوو کە لە «هەکاری» ئاودیوی سنووری سوریا بوو. لە سوریاوە، بە تورکیادا بۆ کوردستان گەڕایەوە. ئەو هاوڕێی منداڵی و خەباتی من بوو. ساڵی ١٩٧٩، لە گوندی هاوار شەهید بوو.

* شێخعەلیی سەید قادر:ئامۆزا و هاوزام بوو. شێخعەلی، ساڵی ١٩٧٩بوو بە پێشمەرگە و ماوەی ساڵێک لەگەڵ ئێمەدا بوو. ئەو، هەرزوو تووشی جیاوازیی فیکر و تێڕوانین لەگەڵ کۆمەڵەدا هات و پەیوەندیی بە ریزەکانی کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێرانەوە کرد و تا ساڵی ١٩٨٤پێشمەرگەی ئەو حیزبە بوو. پاشتر لە شەڕێکی نێوان کۆمەڵە و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێراندا، بە بریندارى، لە ناوچەی «ئەوسود»، لە سەنگەرێکدا سووتا بوو.

* شێخ کەمالی شێخ رەشید: کەسایەتییەکی ناودار و دەرکەوتووی ناوچەی هەڵەبجە، پیاوێکی نیشتمانپەروەر و بە درێژایی بزووتنەوەی سیاسیی کورد، لایەنگری شۆڕش و بارزانی بوو. ئەو، پیاوێکی بەدەسەڵات و خاوەندیوەخان و نانبدە بوو. شێخ کەمال، لە سەرەتای بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلوولدا، لە ناوچەی هەڵەبجەدا، رۆڵی بەرچاوی هەبوو. ئەو، لە سەردەمی جەلالی و مەلاییدا، ساتێ هەموو ناوچەی هەڵەبجە کەوتە ژێر کۆنترۆڵی جەلالییەکان، هەرگیز پشتی لە بارزانی نەکرد.

ساڵی ١٩٨١، ساتێ من، بۆ چارەسەری نەخۆشی، لە تاران بووم، هێزێکی یەکێتی چووبوونە عەبابەیلێ و شێخ کەمالیان گرتبوو و لەگەڵ خۆیان هێنابوویانە شارەزوور. پاش دوو ڕۆژ، سەرۆکهۆزەکانی ناوچەکە ڕۆیشتبوون و ئازادیان کردبوو. من، کە هەواڵەکەم بیست، زۆری پێ دڵگران بووم، ئاخر شێخ کەمال، جگە لەوەی کەمێک لایەنگری پارتی بوو، ئیدی دیوەخانەکەی ماڵی پێشمەرگەی هەموولایەک بوو. لە سەرکردایەتی، مامجەلال، مەسەلەکەی لەگەڵدا باس کردم. من گوتم: کارێکی خراپیان کردووە، نەدەبوو سووکایەتیی بە شێخ کەمال بکەن، ئەو شیاوی ڕێزگرتنە. مامجەلال، گوتی: ئەو کەمێک دژی ئێمەیە، بەڵام من فەرمانم داوە ئازادی بکەن. ئامۆزاکانم، تا ئەم ساڵانەی دواییش، لە من زویر بوون. ئەوان لایان وا بوو، من ئاگاداری ئەو مەسەلەیە بووم، لە کاتێکدا من لە دەرەوەی کوردستان بووم و چ ئاگایەکم لێی نەبوو.

*سوارەی سیخ: ئەو لەشکرە هیندییەی بەریتانیای گەورە بوو کە لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا، بۆ داگیرکردنی ئێراق هێنرابوو.

* ئەمیربۆیینی: گەنجێکی هەڤدەساڵان، ساڵی ١٩٧٨ پێشمەرگە بوو، ئازا، بزێو و سەرەڕۆ، پاشتر تەسلیم بوویەوە و لە شاردا، لە ئەنجامی سەرەڕۆییدا، دەستێکی لە دەست دا. ئەو، ئێستا لە وڵاتی سوید پەنابەرە.

* فەتاح ئێناخی: گەنجێکی ئازا و پیاکەوتوو، لە عەشرەتی ئێناخی، لە ساڵی ١٩٧٧ەوە پێشمەرگە بوو. لە هەشتاکاندا تەسلیم بوویەوە و پاشان کوژرا.

* فەتاحی حاجی ئەولە: فەتاحی حاجی عەبدوڵای هەورامی، لە بنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەر و دانیشتووی «تەوێڵە»، ئەندامی ڕێکخستنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو.

* موحەمەد ئەحمەد «حەمەبچکۆڵ»، هاوڕێی منداڵیی من، لە خێزانێکی شۆڕشگێڕ، عەلیی برای، قارەمان و لە شەهیدەکانی سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول بوو. لە کۆتایی شەستەکاندا، ئەوان بە خێزانەوە «مەلایی» و ئێمەیش «جەلالی» بووین.

* حەمەعەلی فەتاح: پێشمەرگەیەکی وریا، ئازا و ڕۆحسووک، قسەخۆش و لەبەردڵان، چەندمانگان

پێشمەرگەی هەورامان و پاشتر خۆی گوازتەوە بۆ سەرکرنایەتی. ئە و لە ساڵی ١٩٨٠دا، لە ناوچەی کۆیە شەهید بوو.

* جەمالی عەلی باپیر: کادری کۆمەڵە و فەرماندەی هەرێمی چواری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان. جەمال، فەرماندەیەکی لێوەشاوە و چالاکی هێزی پێشمەرگەی یەکێتی بوو، بە داخەوە لە ئەنجامی شەڕی نێوخۆ و لە تێکهەڵچوونێکدا لەگەڵ شێرکۆی شێخعەلیی سەرکردەی سۆسیالیستدا، هەردووکیان پێکەوە بوونە قوربانی. جەمال و شێرکۆ، دوو هاوڕێ و دوو لێپرسراوی سەر بە دوو گرووپی برا دووژمنەکان بوون، لۆژیکی شەڕی براکان خوێنیانی تێکڵاو کرد.
* عەلی شێعە: خەڵکی شاری سنە و بە مێرمنداڵی هاتبووە ناوچەی هەڵەبجە و بە جووتیاری خۆی پێگەیاندبوو. ئەو، لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلوولدا، لەگەڵ شێخ حەمەئەمینی شێخ عەبدوڵادا، پێشمەرگە بووە، لە پێشمەرگە سەرەتاییەکانی یەکەم دەستەی چەکداری کۆمەڵە بووە، لە ساڵی ١٩٧٨دا، لە هەکاری دیل دەکرێت و ماوەی ساڵێک لای پارتی زیندانی دەبێت. ئەو، لە ساڵی ١٩٧٩دا، لە ناوچەی سەقز، لە شەڕەکانی دژ بە پاسداران و کۆنەپەرستانی ناوچەکە، شەهید کرا.

* سەیفەدین هاواری: کادرێکی زیرەک و بەهیمەتی کۆمەڵە بوو. ئەو ساڵی ١٩٧٨، بووە پێشمەرگە و پاشتر کادرێکی جەماوەریی ناوچەی شارەزوور بوو. سەیفەدین، بە دەستی تایەر مۆریاسی و کەسێکی دیکە کە هەردووکیان پێشمەرگەی یەکێتی بوون و پەیوەندییان بە موخابەراتەوە کردبوو، لەگەڵ کادرێکی دیکە بە ناوی جەلیل «سوارە»، نزیک زەڕایەن، شەهید کران.
* سەیوان علی ڕەزا هاواری: کادرێکی زیرەکی کۆمەڵە و جێگری فەرماندەی کەرت لە هەرێمی یەک. ئەو، لە سۆنگەی ناڵەباریی تەندروستییدا، ساڵی ١٩٨١، گەیشتە ئەورووپا و پاشان لە ڕووسیا، خوێندنی بەرزی خوێند و ئێستاش لە وڵاتی سوید دەژی.
* فاتیح شێخ حەیدەر:
لەم گێڕانەوەیەدا، باسێک لە فاتیح ئەکراوە. فاتیح، گەنجێکی جوانخاس، ڕۆشنبیر، شاعیر و ئەندامی کۆمەڵەی مارکسی_ لینینی کوردستان بوو. من ساڵی ١٩٧٥ و پاشی هەرەس، فاتیحم ناسی و لە نزیکەوە هۆگری بووم. من، لە زانکۆ دەمخوێند و ئەو کرێکاریی دەکرد. ئێمە، ڕۆژانە یەکترمان دەدیت و قسە و باسمان لەسەر کۆمەڵە و چارەنووسی داییندە دەگۆڕینەوە. فاتیح، شیعری دەنووسین و سەلیقەیەکی ئەدەبیی جوانی هەبوو. ڕۆژێک فاتیح، نامەیەکی مامۆستا هێمنی نیشان دام کە وەڵامی نامەیەکی خۆی بوو لەمەڕ هەڵسەنگاندنێکی ڕەخنەیی دیوانی «تاریک و ڕوون»ی هێمن.

هێمن، پەسنی وردبینیی فاتیحی دابوو و ڕەخنەکانی سەلماندبوون.
فاتیح، چەندمانگان پاشی وەشاخکەوتنی یەکەم مەفرەزەی کۆمەڵە، پەیوەندیی پێوەکردن و بوویە پێشمەرگە. تەمەنی پێشمەرگەیێتیی فاتیح کەم بوو. ئەو، بەرەبەیانێک، لە ئابڵوقەی هێزێکی بەعسدا، بۆ گوندێکی شارەزوور، بوویە یەکەمین شەهیدی پێشمەرگەی کۆمەڵە و شۆڕشی «نوێ».

# ئەزموون و یاد

## بەرگی دووەم

## ١٩٨٣ - ١٩٨٨

## ئاڵای شۆڕش و حیکایەتەکانی زیندان

## پشکۆ نەجمەدین

پێشکەشە بە:
عەلیی مامە حەمە،
ئەو پێشمەرگە زیندانییەی لە دۆزەخی ئەنفالدا، جێی نەهێشتم!

**ئەوەی بیرەوەریی نەبێت، نە خودای بیردەکەوێتەوە و نە تاریکایی خودایی.**

**(ئۆرهان پاموک، لە ڕۆمانی((من ناوم سوورە)) دا)**

## پێداچوونەوەی بەرگی یەکەم

بەرگی یەکەمی ئەزموون و یاد کە لە مانگەشەوێکی نیسانی ١٩٧٨دا، حیکایەتەکانی خۆی دەست پێ کرد. خوێنەری بە کۆلانە خوێناوییەکانی سەردەمێک لە مێژووی کارەساتە مەینەتبارەکانی ئێمەدا پەلکێش کرد و توشی جۆرێک لە حەپەسان و شۆک و پاشتریش نیگەرانیی کردن. لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٣دا پشوویەکی پێ دان و دەرفەتێکی بۆ منیش سازان تا هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵمژم، گوێ لە ترپەی دڵی خۆم و تەپەی پێی گەڕانی خوێنەر و ریتمی ئاراستەی خوێندنەوەکانیان بگرم.
ئەزموون و یاد، خۆشبەختانە، ئاوڕێکی جیددی لێ درایەوە. بە ئاراستەی جیاوازدا خوێنرایەوە. هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوەی قووڵ و بەپێزی لەسەر کران، کەلێن و کەمایسی و غەفڵەتەکانی دەستنیشان کران.
گێڕانەوەکانی بەرگی یەکەم، زیندووکردنەوەی رووداوگەلێک و خوێندنەوەی ئاڵوگۆڕە سیاسی و فیکری و رێکخراوەییەکانی نێو دەروون و دەرەوەی کۆمەڵەی رەنجدەران و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و سەردەمێکی سەختی بزوتنەوەی سیاسی و چەکداریی کوردن لە دید و تێگەیشتنی تایبەتی منەوە، دەشێت کەسانی دیکەش خوێندنەوە و ڕا و بۆچوونی خۆیانیان لە دید و گۆشەنیگای خۆیانەوە هەبن. هەر کەسیش لە بینین و تێفکرینی خۆیدا بۆ شت و دیاردەکان ئازادە.
ئێمە، لە ماوەی ٢٥ تا ٣٠ ساڵی ڕابردوودا، مێژوویەکمان بەرهەم هێنا و هەرکەسێکیشمان، هێندەی قورسیی ڕۆڵی خۆی، پشکێکی لە خولقاندنی ئەو مێژووەدا، بە چاک و خراپییەوە پێ دەبرێت. ئەوساش، ئەقڵەکان و کاراکتەرە بزێوەکان، بۆ تێگەیشتنی دیاردەکان و خولقاندنی رووداوەکان، جیاواز بوون. هەر بۆیە، ئێستاش جیاوازیی خوێندنەوەکانمان بۆ ڕابردوو و پێشهاتەکانی، کارێکی ئاساییە و بگرە یەکدەنگی و هاوبیرییمان، دەشێت نالۆژیک و نادرووست بن.
من، لە سۆنگەی خوێندنەوەکانم بۆ ئەو بابەت و نووسیانەی لەسەر بەرگی یەکەم نووسران، ئەو کورتەنامانەی بۆم نێردران، ئەو زەنگانەی لە هاوڕێ و هاوکارەکانی ئەوێ ڕۆژێمەوە بۆم لێ دران، ئاوڕدانەوەم لە هەندێک رووداو، ڕۆڵ و ماندووبوونی تێکۆشەرانێک کە یادەوەرییم بۆ تیشک لەسەرخستنیان، بە هانامەوە نەهاتبوو، بە ئەرکی ئەخلاقی و پرەنسیپی نووسینی خۆم دەزانم.
* چوونەشاخی من و دەستپێکی ژیانی پێشمەرگەیێتیم، هاوزەمانی کارەساتی هەکاری بوو. هیچ رووداوێک هێندەی کارەساتی هەکاری، لەسەر هێزی سیاسی، چەکداری و رێکخراوەیی یەکێتی کاریگەر نەبوو.
ئەو سەرکردە، کادر و پێشمەرگانەی ئەو هاوینە شوومە، لە ناوچە جیاوازەکاندا هەڵدەسووڕان و

هەوڵێکی فەرهادئاسایان بۆ خورتکردنەوەی یەکێتی و بارکردنەوەی بارە گلاوەکە دەدا، دەشێت پشکێکی گەورەیان لە سەروەرییەکانی ئەو مێژووە بەر بکەوێت. ناوهێنانی کەسەکان، دەشێت لە غەفڵەتم بخات و نەتوانم ڕۆڵی تەواوی ئەو سەرکردە، کادر و پێشمەرگانە بنرخێنم و ناوی هەموویان تۆمار بکەم، بەڵام تەواوی ئەو کەسانەی لەو ڕۆژگارە ناستەنگەدا لە شاخ و شاردا، لە ڕیزەکانی کۆمەڵە و یەکێتیدا تێدەکۆشین، لەم بازنەی بەرزنرخاندنەدا جێگایان دەبێتەوە.

* من لە ساڵانی کۆتایی نیوەی دووەمی هەفتاکانی سەدەی پێشوودا، بەشی زۆری کار و هەڵسووڕانی پێشمەرگەیێتی و ڕێکخراوەییم لە ناوچەکانی هەورامان، شارەزوور و شارباژێردا بوون. ئەو ڕۆژگارانە، چ بۆ ئەنجامدانی کاری پێشمەرگانە و چ بۆ سەرپەرشتی و هەڵسووڕاندنی ئەرکە ڕێکخراوەییەکانی کۆمەڵە، سەخت و پڕ مەترسی بوون.
لە بەرگی یەکەمدا، باسم لە هەوڵ و هیممەتی زۆرێک لەو کادر و ئەندام و پێشمەرگانەی کۆمەڵە کردووە کە ڕۆڵی گرنگ و بەرچاویان لە هەستانەوە و خورتکردنەوەی ڕێکخستنە گورزبەرکەوتووەکانی کۆمەڵەدا هەبووە و ئێستا بوونەتە «سەربازی ون». ئەو گەنجە خوێنگرم و چاونەترس و شێردڵانەی لە شاردا و لە فەزای پڕ ترس و تۆقاندنی بەعسدا، ڕۆژ و شەویان بۆ سازدانەوەی ڕێکخستنەکان و هاوکاریکردنی پارتیزانەکانی کۆمەڵە لەسەر یەک دانابوون، گەلەک بوون. من لەم بەشەی «ئەزموون و یاد» دا و هێندەی چاوی یادەوەرییەکان هەتەر بکات، هەوڵ دەدەم بە «فلاش باک» و لە سات و شوێنی شیاودا بەسەریان بکەمەوە و تۆزی زەمەن، لەسەر ئەرک و ماندووبوونی ئەوان کەسان بتەکێنم.
* ئەلبوومی وێنەکان کە لە پاشکۆی بەرگی یەکەمدا دانراوە، ناوی هەندەک لە کەسەکان بە هەڵە نووسراون، داوای لێبووردنیان لێ دەکەم.
وێنەی ژمارە«٣»، یەکەم کەسی لای چەپ، «حەمەئاوات» نییە و «ئیبراهیمی شێخ ساحێب»ی عەبابەیلێیە.
وێنەی ژمارە«٧»، کەسی سێهەمی لای چەپ «فەرەج زۆراب_ سامان» نییە و شەهید سەیفەدین هاوارییە.
* لە ڕێڕەوی گێڕانەوەکانی بەرگی یەکەمدا و لە هەندێک جێگادا، دەشێت مێژوو یاخود شوێنی ڕووداوێک، ناوی کەسێک، پلە و ئاستی بەرپرسیارێتیی بەرپرسێک بە هەڵە نووسرابن، هیچ مەبەستێکیان لە پشتەوە نییە و تەنها دووریی زەمەن و لێڵیی بینینەکانن کە ئاڵوگۆڕیان بە ناو، شوێن و ڕووداوەکان کردوون.
* دەبێ ئەوەش بڵێم کە هەندەک بابەت و ڕووداو، برووسکەئاسا لە گێڕانەوەکانی مندا دەرکەوتوون

و ورینەکانیانم لە سێبەری دێرەکاندا، بۆ خوێنەری بەئاگا بە جێ هێشتوون. هەندێکی دیکەش. زیاتر لە گەورەیی خۆیان تیشکیان لەسەر دراون. ئەمەیان دەشێ کەڵێنێک بێت و من پاشتر درکم کردبێت.

* * *

## لە دەروازەی بەرگی دووەمدا

لە پێشەکیی بەرگی یەکەمدا، جەختم لەسەر ئەوە کردبوو کە نووسینەوەی یادەوەرییەکانی من، هەوڵێک نییە بۆ نووسینەوەی مێژووی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و یەکێتیی نشتمانی کوردستان. نووسینەکە، لە سۆنگەی میتۆدی نووسین و خەسڵەتە تایبەتەکانی خۆیەوە، لە هەواری زانستی مێژوونووسیندا، جێ ناکەوێت. بۆ بەرگی دووەمیش، دەشێت هەمان بۆچوون درووست بێت، ئەمیش نووسینەوەی مێژووی «ئاڵای شۆڕش» نییە، بەڵکە گێڕانەوەی یادەوەرییەکانی منە لە بازنەی ململانێکانی نێو دەروونی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و ڕۆڵی سەرکردە و کادرە دیارەکانی نێو ڕەوتە جیا و دژبەیەکەکانی، لە ئاژوواندنی ململانێکاندا، بە ئاڕاستە و ئاقارێکی نەخوازراودا و پاشتر خولقاندنی دۆخێکی ڕێکخراوەیی و سیاسیی، کە بە ناچاری، بەرەو دامەزراندنی «ئاڵای شۆڕش» و جیابوونەوە سەری کێشا!

نووسینەوەی مێژووی ئاڵای شۆڕش، پرۆسەیەکی پێچەڵپێچ و فرەلایەن و ئاڕاستەیە. لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیەکی قووڵ و فراوانی گەرەکە. کۆکردنەوەی زانیاری و فاکتی زیاتری پێ دەوێ و بۆ ئەنجامدانی وەها کارێک، گەرەکە کەرت و پاژە جیاوازەکانی مێژووی ئەو پرۆسەیە کۆ بکرێنەوە کە لە شاخ و شار و ئەورووپادا خولقێنراوان و پاشتر لە چوارچێوەی کارێکی ئاکادیمیانەدا دابڕێژرێنەوە.

من، تەنها ئەو حیکایەتانەی «ئاڵای شۆڕش»دەگێڕمەوە کە خۆم لە درووستکردنیاندا، بە هاوکاریی هاوڕێکانم، ڕۆڵم لە خولقاندنیاندا گێڕاوە، لەنێویاندا ژیاوم، ئازار و ئەشکەنجەم لێ بینیون و ڕۆحیان بریندار کردووم!

پاساوی ئەم کارەیشم، ئەوەیە کە من لە وردینەکانی کار و هەڵسووڕانی کادرانی ڕێکخستنەکانی نێوشار، ئاگادار نیم و نازانم لە ماوەی حەوت ساڵ کار و خەباتی ڕێکخراوەیی ئەواندا، کارەکان چلۆن بە ڕێوە چوونە و کێن ئەو کادرانەی چاک و خراپ، ڕێکخستنەکانیان ڕێبەری کردوون! پاش پەلاماری یەکێتی و زیندانیکردنی ئێمە، ئیدی نێوەندی کار و هەڵسووڕانی «ئاڵای شۆڕش» دەکەوێتە ئەودیوی سنوور و گوندی«زێوە» دەبێتە مەکۆی ڕێبەریکردنی چالاکییە سیاسی و ڕێکخراوەییەکانی ئەم ڕێکخراوە. من، لە زینداندا و دوور لە «زێوە» و ڕووداوەکانی، مافی ئەوەم نییە حیکایەتەکانی ئەوان بخولقێنم و بیاننووسمەوە. ئەمە، دەشێ ئەرکی کادران و تێکۆشەرانێکی دیکە بێت کە لەوێدا ژیاون و خۆیان خولقێنەری ڕووداوەکانن!

حیکایەتەکانی زیندان، ناتوانن گێڕانەوەی هەموو حیکایەتەکان بن. کتێبێک، هەر چەندیش قەبە و گران بێت، توانای هەڵگرتنی هەگبەی ئازار، نیگەرانی، خەم و دڵەڕاوکێیەکانی زیندانییەکی نییە و

ناتوانێت حیکایەتی مەینەتی و مەرگەساتەکانی، بۆ نێوە بگێڕێتەوە!
تۆ کە «حیکایەتەکانی زیندان» دەخوێنیتەوە، ئەودالی فیکر، سیاسەت و هەڵوێست مەبە، چونکە ئەو بابەتانە ئێستا لە لۆچێکی مێژوودا خەوتوون. بەڵکە شوێنپێی ترپەی دڵی من بکەوە، لە ساتەوەختی وێنەگرتنی پرۆسەی تێکشکاندنی «کبریا»ی ئینسانەکان و ئاژنکردنی ڕۆحیان! تۆ، لە بازنەی بەهاکانی ئازادی و شۆڕشدا، لە کردەی بێبەهاکردنی ئینسان بڕوانە!
تۆ ببینە، چۆن ڕک و کینەی ئایدۆلۆگیی کوێر و نابینا، هەموو سنوورەکانی مۆراڵی خەبات و سیاسەت دەسڕێتەوە و چۆن هاوڕێ و هاوخەباتی خۆت، لە تێکشکاندن و زەلیلکردنی تۆ لەززەت دەبا و سەرکەوتنی خۆی، لە گزگلکردنی تۆدا دەبینێت!
من، لە نووسینەوەی وێنەکاندا، لە وێنەگرتنەوەی کاراکتەر و ڕەفتار و هەڵسووکەوتی کەسەکاندا کە پارچەیەک بوون لە خودی خۆم و لە هەوڵی وێرانکردنی ڕۆحمدا بوون، ئازارێکی زۆرم کێشاوە.
زیندووکردنەوەی ڕووداوەکان پاشی ٢٥ساڵان، نیگەرانیان کردووم و دەیان شەو گینگڵیان پێ داوم و لەژێر مۆتەکەی ئەواندا، شەوانم بە ڕۆژان گەیاندوون، بەڵام هەرگیز هێڵێک لە ڕک و کینە نەیتوانیوە لە چنینی حیکایەتەکاندا، جێگایەک بۆ خۆی بکاتەوە!
من، قسەکردن لەسەر حیکایەتەکان بە ناپێویست دەزانم. فەرموو خۆت بۆ نێو گەلەریی وێنەکان وەژوور کەوە، دڵنیام وێنەیەک دەستی زەینت دەگرێت و دەبێتە چراوگێک بۆ ڕۆشنکردنەوەی ناخی تاریکی زیندانەکان، لەوێدا لە ڕۆح کڵۆڵی زیندانییەکان بڕوانە!

پ. نەجمەدین
ئاپریلی ٢٠١٠ سوێد

## مفاوەزات شتێکی بۆ گوتن پێ نییە

ئێوارەیەک لە ئێوارانی مانگی ئۆقامبەر، لە «دۆڵەڕووت»ەوە، هاوڕێی هێزێک، وەڕێ کەوتین و لەگەڵ بوولێڵدا، لە تەنیشت «باخی بەختیاری»یەوە ڕێگای«سلێمانی_ تاسلوجە»مان پسکەپسک و پێشمەرگانە بڕی و بۆ «کۆسەی چەم» پەڕینەوە.

لە کۆسەی چەم، پشووماں دا و پاشی ناخواردن، بەرەو هەزارمێرد هەڵگەڕاین و ئیدی ناوبڕی گوندەکانی قەرەداغ بووین. لەوێ ڕا، گوند بە گوندی گەیاندین و پاشی دوو ڕۆژان لە گوندی «سێوسێنان»، بنەمان لێ خست و بنکەیەکمان ئاوەدان کردەوە.

دەستەی نوێنەرایەتیی یەکێتی بە مامجەلالیشەوە لە بەغدان و ئێمەش لە کوێقولاغی هەر سرتە و هەواڵێکی مفاوەزاتدا ڕۆژەکان بەسەر دەبەین.

من لەسەر مفاوەزات و وردەکارییەکانی ئەو بابەت و مەسەلانەی لەسەر مێزی گفتوگۆی نێوان بەعس و یەکێتیدا، مشتومڕ و قسە و باسیان لەسەر کراون، شتێکم بۆ گوتن پێ نییە. من و زۆریک لەو هاوڕێیانەی لەگەڵ ئێمە بوون، نەک هەر بە گفتوگۆ لەگەڵ بەعسدا دڵخۆش و هیوادار نەبووین، بگرە بێ پێچوپەناش دژ بووین.

مفاوەزات، دانووستاندنی نێوان دوو هێزی نەیار و دژە بۆ پێکهاتن لەسەر چارەسەری کێشە و گرفتگەلێک و سازاندنی زەوینەیەک بۆ باڵادەستبوونی دیالۆگ و لەگۆڕنانی زەبر و توندوتیژی. بەرهەم و ئەنجامەکەیشی بۆ هەر لایەکیان لەسەر تەرازووی هێز و ئەزموون و لێزانیی گەمەکەرەکان وەستاون. بەعس، ئەگەرچی دوو ساڵ بوو، جەنگی لەگەڵ ئێراندا هەڵگیرساندبوو، دیسانیش هێز و تواناى خۆی لە دەست نەدابوو، لە حاڵەتێکدا نەبوو کە کورد یاخود یەکێتی مەرجەکانی خۆی بسەپێنێت. ئەمە جگە لەوەی لە پرانسیپەکانی فیکر و ڕوانینی بەعسدا بۆ کورد و دۆزەکەی، شتێک بە ناوی دیالۆگ و دانووستاندن بۆ چارەسەری ئەو کێشەیە نەبوو. «مامە عەلەڕەش» لە کۆبوونەوەیەکدا گوتبووی:(ئێوە بێژن، دەکرێ لە قوونی ئێرەکەر هەنگوین دەربهێنن؟ دە وەخوا لە قوونی بەعسیشدا مافی کورد دەرنایەت!)

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لە ئەنجامی سیاسەتە کورتبینەکانی لەمەڕ ئێران، درێژەکێشانی شەڕی خوێناویی لەگەڵ «جود» و بەرتەسکبوونەوەی ناوچەکانی حەوانەوەی، مفاوەزات بۆ ئەو، کارێکی ناچاری و جۆرێک بوو لە مانۆڕی سیاسی. جا ئەو مانۆڕە چۆن گوزەرا و چەند لەسەر یەکێتی کەوت، قسەوباسێکی دیکە هەڵدەگرێ.

مفاوەزاتی ساڵی ۱۹۸۳ی نێوان یەکێتی و بەعس، ئەگەر نۆخ و هەلومەرجی ئەوێ رۆژێی کوردستان و ئێراق و بزووتنەوە سیاسی_ چەکدارییەکی لێ وەدەرنێی، گەوێک بوو لەو زنجیرە گفتوگۆ و دانوستاندنەی نێوان سەرکردایەتیی بزووتنەوەی کورد و حکومەتەکانی ئێراق. لە درێژایی سەرهەڵدانی ئەم بزووتنەوە چەکدارییەدا. لای سەرکردایەتیی سیاسیی کورد، مفاوەزات و گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی ئێراقدا، هەمیشە ستراتیژ بووە نەک تاکتیک. بزووتنەوەی رزگاریخوازیی گەلی کورد لە کوردستانی ئێراقدا، لەپاش تێکشکاندنی حوکمدارێتیی مەلیک مەحموددەوە، ئیدی بزووتنەوەیەک بووە لە پێناوی «مانەوە»دا نەک «رزگاربوون»!

باسکردن لە میکانیزمی بەرێوەچوونی مفاوەزاتی ۱۹۸۳_۱۹۸٤ کە زیاتر لە ساڵێکی خایاند و دیان دانیشتن و گفتوگۆی نێوان وەفدی یەکێتی و بەعسی گەرەک بوو، بۆ من کە نە ئەندامی وەفد بووم و نە لە نزیکەوە ئاگاداری باسوخواست و دانوستاندنەکان بووم، کارێکی نەشیاوە.

خوێنەرانی تامەزرۆی رووداوەکانی ئەو رۆژگارەی کوردستان و تاسەباری زانینی وردینەی ئەو باس و بابەتانەی کە جێگای مشتومر و لێدوانی بەعس و سەرکردەکانی یەکێتی بوون، دەتوانن بۆ کتێبی (خولانەوە لە ناو بازنەدا «دیوی ناوەوەی رووداوەکانی کوردستانی عێراق ۱۹۸٤_۱۹۸۸») ی نەوشیروان مستەفا ئەمین بگەرێنەوە.

نەوشیروان مستەفا، کەسی دووەمی نێو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و بەشداربووی چالاکی بەشێک لە دانیشتنەکانی نێوان وەفدەکانی یەکێتی و بەعس بووە. ئەو، لەو کتێبەدا، زۆرێک لەو بابەت و دەکۆمێنتانەی بڵاوکردووەنەتەوە و خوێنەری زیرەک و کۆڵەری بەناوەز، دەتوانن کاریان لەسەر بکەن و بیانتۆژن.

مفاوەزات، زەمەنێک بوو بۆ پشوودان و بەشارشادبوونەوە. کۆمیتەکانی کارڕێکخستن و هەماهەنگی، لە نێوان بەعس و یەکێتیدا، لە شارەکاندا دروست بوون. کاری ئەم کۆمیتانە، جۆرکردنی شێوازی هاتوچۆی پێشمەرگە بوو بۆ شارەکان و چارەسەرکردنی ئەو کێشەی و گرفتانە بوون کە لە نێوان هێزی پێشمەرگە و دەوڵەتدا دەخولقان.

مفاوەزات، نە لە دەستپێکدا و نە لە بەردەوامیی خۆیدا، پێکداهەڵپژان و شەڕی نێوان هێزی پێشمەرگە و مەفرەزەی جاشانی بنبڕ کردن. لە شارەکاندا و لەسەر رێگای نێوان شارەکاندا، مەفرەزەی جاشان بە ئاگاداری دەسگا موخابەراتییەکانی بەعس، بۆسەیان بۆ کادر و پێشمەرگەکانی یەکێتی دەنایەوە، کەم نەبون ئەو پێشمەرگانەی لە رۆژگاری مفاوەزاتدا شەهید بوون.

بە درێژایی دوادووەمانگی ساڵی ۱۹۸۳ و ساڵی ۱۹۸٤، هاتوچۆی وەفدی یەکێتی بۆ بەغدا و وەفدی دەوڵەتی ئێراق لە ئاستێکی بەرزدا بۆ «سورداش» درێژەیان هەبوو، بەڵام وا پێ دەچوو، خاڵە ناکۆکەکان و جیاوازییەکانی دید و تێگەیشتنی هەردوولا، لەسەر چۆنییەتی گەیشتن بە رێگاچارەیەک

بۆ سەرکەوتنی مفاوەزات، هێند زۆر بوون کە ئاسۆیەکی ڕۆشنییان لێ نەدەکەوتنەوە.
لە زەمەنی مفاوەزاتدا، ئەگەرچی یەکێتی بە جۆرێک، لە هەوڵی ئاشتبوونەوەدا بوو لەگەڵ «جود» بە گشتی و «حشع» بە تایبەتی، بەڵام ئەو هەوڵانە ئەزۆک دەرچوون و هیچ بەرهەمێکیان لێ نەکەوتنەوە.
جود، مەسەلەی مفاوەزاتی لە بواری ڕاگەیاندن و پروپاگەندەدا، وەکو کارتێک بۆ دژایەتیی یەکێتی بەکار دەبرد و جەنگی ڕاگەیاندن، هاوشانی پێکدادان و شەڕ، لێرە و لەوێ درێژەی هەبوو. خەڵکی کوردستان و بەتایبەت لایەنگرانی یەکێتی، بە مفاوەزات دڵخۆش بوون. نەورۆزی ساڵی ١٩٨٤ی سورداش و کۆبونەوەی دەیان هەزار خەڵک و گوێگرتنیان لە وتاری مامجەلال لەمەڕ مفاوەزات و چاوەڕوانییەکانی، نیشانەی ماندووبوونی خەڵک لە شەڕ و سادەیی تێگەیشتنیان بوو بۆ سیاسەت و دۆزی کورد!
وڵاتانی دراوسێ، ئێران و سوریا لە سیاسەتی یەکێتی و پرۆسەی مفاوەزاتی لەگەڵ بەعس، تووڕە و نیگەران بوون. ئێران، ساڵێک زیاتر لە سۆنگەی سیاسەتی یەکێتی، دەرهەق بە بزووتنەوەی کورد لە ڕۆژهەڵاتدا و پشتگیریکردنی بۆ هێزەکانی «حدکا»، پەیوەندییەکانی لەگەڵ یەکێتی ئاڵۆز و دوژمنکارانە بوون. سوریا، کە لانکەی دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو، لە مفاوەزات قەڵس و نیگەران بوو.
تورکیا، جووڵە دیپلۆماسییەکانی لەگەڵ ئێراقدا چڕتر کردنەوە و لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە مفاوەزات بە هەوارێک نەگات، کورد پشوویەکی پێدا بێتەوە و بە کەچەمافێک بگات.
مفاوەزات، دەریچەیەکی بۆ ئێمە کردەوە تا ناکۆکییەکان و گرفتەکانی دەروونی کۆمەڵە و ململانێکان، بە ئاسانی، بۆ نێو ڕیزەکانی ڕکخستنەکانی نێوشار بگوێزینەوە و کاریان لەسەر بکەین.
دواکۆنفرەنسی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، لە سەروبەندی مفاوەزاتدا بەڕێوە چوو. لە هەلومەرجێکدا وێرای کێشە و ناکۆکییە لەنارابووەکانی دەروونی کۆمەڵە و ئیشکالاتەکانی سیاسەتی یەکێتی، ئەوا مفاوەزاتیش بۆ خۆی وەکو گەورەترین قەیرانی سیاسیی یەکێتی، ئاستی ململانێکانی باڵاتر دەبرد.
ساڵی ١٩٨٤ و لە ڕۆژگاری مفاوەزاتدا، کێشەی خوێندکاران لە زانکۆکانی هەولێر و موسڵ، لەسەر مەسەلەی پۆشینی بەرگی «جەیشی شەعبی»، لەگەڵ دەسگاکانی بەعسدا تەقییەوە. لە سلێمانی، خۆپیشاندان دروست بوو، شەڕ و پێکدادان لە نێوان خۆپیشاندەران و جەیشی شەعبیدا کوشتاریان لێ کەوتنەوە. هێزی پێشمەرگەی یەکێتی، پشتی خۆپیشاندەرانیان گرت و ژمارەیەک جەیشی شەعبییان کوشت. بەعس، بۆ کەمکردنەوەی شکۆی یەکێتی، هەمیشە کێشە و هەڵای دەنایەوە. هەر لە بەردەوامیی مفاوەزاتدا، بەعس دەیویست درێژە بە ترس و تۆقاندن بدات. لەو ڕۆژانەدا ژمارەیەک سەربازی

هەڵاتووی لە شاری سلێمانیدا گوللەباران کردن.
خوێندکارانی زانکۆکان، هیوایان بە یەکێتی بوو تا تەوقی بەرگی «جەیشی شەعبی»پۆشینیان لە مل داماڵێت. نوێنەرانی خوێندکاران هاتنە سورداش و لەگەڵ سەرکردایێتیی یەکێتی گفتوگۆیان کرد.
یەکێتی، نەیتوانی کارێکیان لەو بوارەدا بۆ بکات.

مفاوەزات و توێژاڵێک لە حشع

حیزبی شیوعیی ئێراق، وەک هەر حیزبکی دیکە، مێژوویەک لە ململانێی ناوەکی و توێژاڵ و تەڵەزم لێکەوتنەوە تێپەڕاندبوو. خەباتی شاخ و کاریگەریی ڕووداو و پێشهاتەکانی ئەو ڕۆژگارە ڕۆڵیان لە خەستکردنەوەی کێشە فیکری و سیاسییەکانی دەروونی «حشع»دا وازی کرد و ناکۆکییەکانی نێوان ئیقلیمی کوردستانی حیزب و کۆمیتەی نێوەندی ئاڵۆزتر کردن.
سەرەتا، عەبدوڵای مەلافەرەج «مەلاعەلی» کە کادرێکی دێرین و ماندووی ئەو حیزبە بوو، لەگەڵ تۆفیقی حاجی و چەند کادر و پێشمەرگەیەکی تر، پەیوەندییان بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە کرد و هاتنە شار.
تۆفیق، هاوسەفەری شێخعەلی و لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکدا، لەنێوان دووکان و سلێمانیدا، لە بۆسەی جاشان کەوتن. تۆفیق و پێشمەرگەیەک بە ناوی (هێرش عەلی)، شەهید بوون.
مەلاعەلی، بە هەوڵی بەهادین نووری (بە پێی گێڕانەوەی بەهادین نووری بۆ من، لە دیدارێکدا لە وڵاتی سوید)، پاش چەند ڕۆژێک گەڕایەوە شاخی «سووریێن» و پەیوەندی بە حیزبەوە کردەوە.
بەهادین نووری، کە خۆی لە ئەنجامی ناکۆکییەکانی لەگەڵ سیاسەتی رەسمیی حشع، ماوەیەک لە دەستبەسەریی لە ناوچەی بادینان بەسەر بردبوو، وەک خۆی بۆی گێڕامەوە، بە تەنیا لە بادینان هەڵاتبوو و خۆی گەیاندبووەوە ناوچەی هەورامان و لە هاوینی ١٩٨٤دا، لە حشع جیابوویەوە و رەوتێکی سیاسی و ڕێکخراوەیی نوێی دامەزراند. مەلابەختیار و من، لەگەڵ چەند کادرێکی یەکێتی، لە سورداشەوە و چووینە گوندی «تەکییە»، سەردانی بەهادین نووریمان کرد و بەخێرمان هێنا. «تایپ و ڕۆنیۆ»یەکمان بە دیاری بۆ برد.

## کۆنفرەنسی سێی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، هاوینی ١٩٨٤، مێرگەپان

لێرەدا، لە تەختایی مێرگەپاندا و ڕێک لەو شوێنەدا کە پیرەمەگروون قامەتی بڵندی خۆی کردوەتە قەڵغانی پاراستن و زنارەکانی بە چاوی تیژ و دنیادیدەیی خۆیانەوە لە هەموو ڕوداوەکان دەڕوانن و دەبنە شایەتی مێژووی ئێمە. ساباتێکی هێندە دریژ و پانوپۆڕ کە جێگای دانیشتن و حەوانەی سێسەد کەسێک فەراهەم بکات، چێ کراوە.

لەسەر «کانیسێو»، چەند خێمە هەڵدراون، ٢٨٧ نوێنەر و ١١ میوان و چاودێر و دەیان پێشمەرگە، پۆل پۆل، بە ئۆتۆمبێل دەگەنە هەواری کۆنفرەنس، ئەم ساباتە بۆ سێ ڕۆژان دەبێتە گۆڕەپانی ئاڵۆزترین و توندوتیژترین قسەوباس و مشتومڕەکانی دواهەمین وەلێ چارەنووسسازترین کۆنفرەنسی کۆمەڵە.

لێرەدا، کرمی ناکۆکیەکان گەورەتر دەبن، بیر و بۆچوونە ناکۆکەکان دژ بەیەک دەوەستنەوە، هاوڕێکان شمشێری داپاچینی فیکر و بینینە جیاوازەکان ساو دەدەن، درز و قەڵشتەکان هەراوتر دەبن و دەستەکان بۆ یەکتەربەربان و ماڵئاواییکردن زەوینەسازی دەکەن.

وردینەی ڕووداوەکان، ڕووبەڕووبوونەوەکان، هەڵوێستەکان و بڕیارەکانی نێو ئەم کۆنفرانسە، بۆ چارەنووسی دیاردە و دەرکەوتەکانی پاشتر و سەرجەمی چارەنووسی پێکهاتە و سیاسەتی کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانی و کارەکتەرەکانیان، هێند گرنگ و کاربڕ بوون، مۆرکی خۆیان بە سەرجەمی ڕەوتی فیکری و سیاسیی ئەم بزووتنەوەیەوە نا و بەشێکی گرفت و کێشەکانی ئەم ڕۆژگارەی یەکێتی (ئێستا مانگی ئاگۆستی ٢٠٠٩یە و کێشەی کۆمپانیای وشە و لیستی گۆڕان،ستراکتۆری یەکێتیی هەژاندووە)، لەوێڕا سەرچاوە دەگرن.

نیوەڕۆژی یەکەمی کار و دانیشتنەکان، وتاری میوانان و ڕاپۆرتی گشتیی ناوەندی کۆمەڵە و هەڵبژاردنی لیژنەی سەرپەرشتیکردن و بەڕێوەبردنی کارنامەی کۆنفرەنس بوو.

وتاری مامجەلال، چڕوپڕ و سەراپای دۆخە سیاسییەکەی لەخۆ گرتبوو. ئەو جەختی لەسەر بەردەوامیی مفاوەزات و گوشینی تا دواچۆڕ کرد و هاوزەمانیش خستنەگەڕی پرۆسەیەکی ئاشتەوایی نێوان هێزە سیاسییە دژبەرەکانی کوردستانی، وەکو پێشنیازێکی زۆرگرنگ خستەڕوو. دکتۆر قاسملۆی ڕەحمەتی و ئیبراهیمی عەلیزادە، لە دیدی خۆیانەوە، دۆخی سیاسییەکەیان شەنوکەو کرد و پاشان ماڵئاواییان کرد. مامجەلال، هەموو ڕۆژەکە لە کۆنفرەنسدا مایەوە و لەسەر وردینەی شتەکان بۆچوون و شیکردنەوەی خۆی دا. بەشێکی قسەکانی مامجەلال لەسەر بەرنامەی لایەنی دووری کۆمەڵە و مەسەلەی دیموکراتیی شۆڕشگێر بوو کە دژی وەستایەوە. ئەو، لەو ڕوانگەیەوە مافی قسەکردنی لەسەر

سیاسەت و ستراتیژی کۆمەڵە، بە خۆی ڕەوادەبینی کە ئەو لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵە بووە، خۆی وازی لە کۆمەڵە نەهێناوە و کۆمەڵەش بە هیچ بڕیارێک ئەوی دەرنەکردووە. ئەو، بەو ئەرگومێنتانە، ڕووبەڕووی ئەو کادرانەی کۆمەڵە دەبوویەوە کە پێیان وا بوو، مامجەلال لە دەرەوەی کۆمەڵەیە و بۆی نییە لە وردینەی سیاسەت و سەرخەتە فیکرییەکانی کۆمەڵەدا قسە بکات!
مامجەلال، لە هەڵسەنگاندنی هێزی پێشمەرگەی یەکێتیدا، بێهیوایی خۆی لەو هێزە خستە ڕوو، بە شرەخۆر و تاڵانچی ناوبێری کردن. ئەو، نموونەی شەڕی «بێتواتە»ی هێنایەوە و هەموو لێپرسراوەکانی بە دز، لەقەڵەم دان. ئەو، بە شیعرە ناودارەکەی شاعیری عەرەب، موزەفەر ئەنواب، ئاماژەی بەو لێپرسراوانە کرد و گوتی:(هیچ کامێکتانی لێ نابوێرم...)، ئەمە لەشکری هۆلاکۆیە نەک لەشکری ڕزگاریی کوردستان! من، بە چاوانی خۆم، «سەلاجە و موجەمیدە»م بە کۆڵی مەسئولەوە بینیوە! من، ئەم لەشکرەم هەیە، بۆیە ناچارم درێژە بە مفاوەزات بدەم!

## کۆنفرەنسێک تژی لە توندوتیژی!

لە رۆژی دووەمی کارەکانی کۆنفرەنسدا، ساباتەکە بۆنی خوێنی گرتبوو، رووخسارەکان کینە و رکیان لێ دەباری و تۆنی دەنگی سەرکردە و کادرەکان، ترس و نیگەرانییان دەبەخشییەوە.
نەوشیروان مستەفا و گروپی زیندان، پێشوەخت بڕیاریان دابوو کە لەم کۆنفرەنسەدا، کێشە فیکری و رێکخراوەییەکانی دەروونی کۆمەڵە، بەلادا بخەن و تەرازووی هێزی دەسەلاتیش، بە جۆرێک بە لای خۆیاندا سەنگدار بکەن کە پاش کۆنفرەنس، لە مەیدانی پراکتیکدا، دەنگی جیاواز و ئۆپۆزیسیۆنی ناو کۆمەڵە، خەفە بکەن و سیاسەتی رەسمیی لە کۆنفرەنسدا داڕێژراو و پەسەندکراوی کۆمەڵە، بچەسپێنن و بسەپێنن.
پێداچوونەوەی بەرنامەی کۆمەڵەی لە کۆنفرەنسی پێشوودا پەسەندکراو، کرایە چەقی مشتومڕ و ئەمیش کێشەی «هەڵویست»ی بۆ نێو جەرگەی ململانێکان کێش کرد و فەزای لێدوانەکانی بە جۆرێک بارگاوی کرد، وەخت بوو هەر لەوێدا بە بنبەست و دابڕان بگەین و کارەساتی لێ بکەوێتەوە!
«هەڵویست» چی بوو؟
لێکۆڵینەوەکی رەخنەگرانەی فیکری و سیاسی، لەمەر بەرنامەی کۆمەڵە و بە قەڵەمی مەلابەختیار نووسراو و بە نهێنی چاپکراو، چەند مانگێک پێش وادەی کۆنفرەنس، بە نێو ریزەکانی کۆمەڵەدا، لە شار و شاخدا، لە تەواوی کوردستاندا، بڵاوکرابووییەوە یاخود بڵاومان کردبوویەوە!
ئەم ناميلكەیە، کۆبەندی دید و تێڕوانینەکانی ئێمەی لەمەڕ فیکر و تاکتیک و ستراتیژی کۆمەڵە، لە خۆ گرتبوو.
گرۆی نەوشیروان مستەفا و زیندان، فەزای کۆنفرەنسیان کردە دادگای لێکۆڵینەوە و هەوڵدان بۆ ئاشکراکردنی نووسەری لێکۆڵینەوەکە و ئەو کادرانەی کۆمەڵە کە بەرپرسیاربوون لە پەخشکردن و بڵاوکردنەوەی لە ریزەکانی رێکخستندا!
چەند کادرێک تۆمەتبارکران، لە شوێنەکانی خۆیان دەرهێنران و لەسەر سەکۆی بەڕێوەبردنی کۆنفرەنسدا، لە تەنیشت یەکدییەوە، وەک تاوانباران، وەستێنران و بە پرسیار و لێکۆڵینەوە، بە گیروگاز هێنران! کادرەکان، ئەگەر یادەوەرییم یارمەتیم بدات، حاجی مەمۆ، خەلیل دەۆکی، هێدی، سدیق رەنجبەر، کاکەڕەش و مەهدی کاوانی بوون.
دەنگە خوێناوییەکان، فەزای کۆنفرەنس تەی دەکەن و دەبێژن:
_ هەق وایە، کۆنفرەنس لە کۆمەڵە دەریان بکات و پاشان دادگای حزبییان بۆ دابنرێت!

_ ئەمە جۆرێکە لە خیانەت و دەبێت توندترین سزا بدرێن!
_ وێنەی ئەو شەهیدانە دەبینی کە لە پشتسەری لیژنەی بەڕێوەبردنەوە هەڵواسراون! هەقە هەر یەکێکیان لە نێوان دوو وێنەدا هەڵبواسرێت!
وای خودای من! چی قەوماوە؟ باشترین و ماندووترین کادرانی ئێمە، تەنها لە سۆنگەی خوێندنەوە و بڵاوکردنەوەی نامیلکەیەکدا، سەرکردە و دەسەڵاتی دەسەڵاتداری کۆمەڵەکەیان، بەنیازن ئیعدامی شۆڕشگێرانەیان بکەن! پەخشکردنی نامیلکەیەک کە بینینێکی دیکە و تێگەیشتنێکی جیاوازی بۆ فیکر و سیاسەتی کۆمەڵە لە خۆ گرتووە، خۆ ئەمە بانگەشەی ئاشبەتاڵ و خۆوەدەستەوەدانی نەکردووە، بە باڵای مفاوەزاتدا هەڵینەداوە، داوای کودەتا و هەڵگەڕانەوەی نەکردووە، ئاڵای جیابوونەوەی هەڵنەکردووە، سووکایەتی بە هیچ سەرکردە و کادرێکی کۆمەڵە و یەکێتی نەکردووە! ئەمە چ میتۆد و میکانیزمێکە بۆ پشتشکاندنی بۆچوونە لێکنەچووەکان و خویناویکردنی ململانێکان؟!
کێشەکان تا دێن ئاڵۆزتر دەبن، بارۆمەتری زەبر هەڵدەکشێت، درووژاندنی ئیعدامکردنی وریای وەهاب، بە فەرمانی سکرتێری کۆمەڵە و بە نهێنی جێبەجێکردنی بە دەستی جەبار فەرمان، فەزای کۆبوونەوەکان زیاتر لێڵ دەکات.
دکتۆر هەژار مارف و داواتی شێخ جەناب و چەند کادری تر، ڕەخنەیان ناراستەی نەوشیروان کرد و داوای ڕوونکردنەوەی هۆکار و چۆنییەتی ئیعدامکردنی «وریا»یان لێ کرد و بە شەهیدوریا، ناویان برد. ئەوان، جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە بۆ ڕێکخراوێکی مارکسیست لینینیستی وەک کۆمەڵە، کاری نەکردە و تاوانێکی گەورەیە، بێ ئاگاییکردن، بە نهێنی کادرێکی خۆی ئیعدام بکات!
نەوشیروان، وەکو سکرتێری کۆمەڵە و بەرپرسی یەکەم، دەچێتە سەر سەکۆی قسەکردن و وەرام دەداتەوە:
_ بەڵێ کوشتوومانە! ئەو شەهید نییە، بەڵکە خایینە! ئەو، نامە و نهێنیی کۆمەڵە و شۆڕشی بە نەیارانی ئێمە داوە. وریا، ئەگەر زیندوو بێتەوە، جارێکی دیکەش ئیعدامی دەکەینەوە!
من، وریام چەند ڕۆژێک پێش بزرکردنەکەی، لە گوندی «حاجی مامەند» دیت و بۆ یەکەمجار ناسیم. وریا، باسی ئەوەی بۆ کردم کە لە ناوەندی کۆمەڵەوە داواکراوە و بەو مەبەستەش لە شارەوە هاتووە. ئەو گوتی: ناوێرم بچم! داوای هەندەک نامەی ناوەندی کۆمەڵەم لێ دەکەن کە پێشتر بۆیان ناردووم.. ئەو نامانە بۆ من گرنگن و پەیوەندییان بە چارەنووسمەوە هەیە! ئاخر خۆ من خەڵکم بۆ باوکم نەکوشتووە.. من، خەڵکم بۆ کۆمەڵە و شۆڕش کوشتووە و تەنها بەڵگەیەکیشم، نامەکانن!
من، ئێستا کە ئەم یادەوەرییانە دەگێڕمەوە، کۆپیی تەواوی ئەو نامانەم دەست کەوتوون و لە ئارکیڤی خۆمدا پاراستوومن. نامەکان، بە مۆری سەرکردایەتیی نێوخۆی کۆمەڵەوە نووسراون و بەشێکیان

فەرمانی ئیعدامکردنی هەندەک لە نەیارانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیان لە نێو شاری سلێمانیدا تێدایە کە وریا جێبەجێی کردوون، یاخود لە ڕێگای وریاوە جێبەجێ کراون.
ئەوسات، یەکێتیی نیشتمانی، بە فەرمیی، بێئاگایی خۆی لە تیرۆرکردنی ئەو کەسانە دەربڕی. ئێمە و لەنێو ئێمەشدا، مەلابەختیار، لە سەروبەندی پەرینەوەی شەڕی براکان، لە شاخەوە بۆ شار، بە ئاشکرا نیگەرانی و ناڕەزایی خۆمان لەمەڕ ئەو دیاردەیە دەربڕی. ساڵی ١٩٨٣، ساتێک مەلابەختیار بە نامێری بێتەل، لەسەر ئەم مەسەلەیە، لەگەڵ مامجەلال قسەی دەکرد و ناڕەزایی دەردەبڕی، من لە تەنیشتییەوە وەستابووم. مامجەلال دڵنیای دەکردەوە کە ئەو وەکو سکرتێری گشتیی یەکێتی، ئاگای لەوە نییە و ئەگەر ساتێکێش ئەوە بە بەڵگەوە دەربکەوێت کە ئەم کاری تیرۆرانە، کاری یەکێتییە، ئەوا جانتاکەی هەڵدەگرێت و کوردستان بەجێ دەهێڵێت.  قسەکەی مامجەلال، چەند درووستە و چەند گومان هەڵدەگرێت، ئەوە تەنها کەسێکی وەکو نەوشیروان مستەفا، ئەگەر بەڵگەیەکی نووسراوی لا بێت، دەتوانێت تیشکی لەسەر بنێت و ساغی بکاتەوە!  ئەم هەڵویستەی ئێمە، لە نێو یەکێتی و کۆمەڵەدا و لە دید و تێڕوانینی سەرکردایەتییەوە بۆ پێگە و شوێنی ئێمە (بەتایبەت پێگەی مەلابەختیار)، لەسەرمان کەوت و لە کۆنفرەنسدا و پاشتریش، باجەکەیمان دا!
من، بڵاوکردنەوەی نامەکان لەم کتێبەدا، بە کارێکی زێدە و ناپێویست دەزانم. بەڵام ئەگەر کەسێک نکۆڵییان لێ بکات، ئەوجا دەکۆمێنتەکان دێنە پەیڤین.

ساباتەکە، هەرا و ژاوەژاوی تێ دەکەوێت. فەزاکە بە جۆرێک دژوار و تەنگەلانە، دەڵێی هاکا تەقییەوە! پشووبدانێک بۆ خاوکردنەوەی دۆخە گرژەکە پێشنیاز دەکرێت.
لەو سەروبەندەدا، نەوشیروان زللەیەک لە کادرێک بە ناوی «گۆران» دەدات و لە کۆنفرەنسی وەدەر دەنێت. مەلابەختیار، بە توڕەیی و حەماسەتەوە، بە نەوشیروان دەڵێ: تۆ مافی ئەوەت نییە زللە لە کادر بدەیت و لە کۆنفرەنسی وەدەرنێیت! حەمەتۆفیق(کادری دەرکەوتووی کۆمەڵە و زاوای نەوشیروان مستەفا)، لەگەڵ مەلابەختیاردا لییان دەبێتە هەرا و پەلاماری مەلابەختیار دەدات! دەستیان ناگاتە یەکدی و لێک جودا دەکرێنەوە.. لەم حاڵەتە ناجۆرەدا، کۆبوونەوە دەست پێ دەکاتەوە.
مەلابەختیار، دەچێتە سەر سەکۆی قسەکردن. نەوشیروان لە بەشی دواوەی ساباتەکەدا دانیشتووە. من، لە ڕیزی بەردەم ڕیزەکەی نەوشیرواندا، لەسەر کورسییەک دانیشتووم و بە نیگەرانییەوە گوێ لە مەلابەختیار دەگرم.
مەلابەختیار: هەق نییە فەزای کۆنفرەنسەکە بەم ئاڵۆزی و توندوتیژییە بەڕێوە بچێت.. هەڕەشەکردن و کادردەرکردن لە کۆنفرەس، لە کەس قەبووڵ ناکەین.. چاسوورکردنەوە و تۆقاندن نامانترسێنن..

ئێمە کە شۆڕشمان دەست پێ کردەوە و لە ڕووی بەعسدا وەستاینەوە، بەعسمان لە پیلاوەکانمان نزمتر دەبینی.. ئیستاش هەڕەشە و گوڕەشە، نە لە «تۆ» و نە لە هیچ کەسێک قەبووڵ دەکەین!

نەوشیروان، لەجێگای خۆیەوە: تۆ تەکەتولت کردووە!

مەلابەختیار: هەر من نا.. تۆ و ئەم کاک فەرمیدونەش تەکتولتان کردووە و تەکەتولتان هەیە..

نەوشیروان، لەبەرخۆیەوە: هەقە ئەوانەی :«هەڵویست»یان بڵاوکردووەتەوە، لە تەنیشت وێنەی ئەو شەهیدانەوە هەڵبواسرێن!

شێخ دارای شێخ موحەمەد، ئەندامی کۆنفرەنس و لە تەنیشتی منەوە: لۆقەنتەخانەمان داناوە!

مەلابەختیار: بۆچی کۆنفرەنس، مەسەلەی ئیعدامکردنی شەهیدشەهاب یەکلا ناکاتەوە، هەموو نهێنییەکان لای ئەم کاک «فەرمیدون»ەن!

کاکەعەبە، لە کادرانی زیندان، دەیەوێت قسە بکات..

مەلابەختیار: تۆ دەمت داخە! تۆ لە زینداندا ئیعترافت کردووە!

مەلابەختیار، سەکۆکەی جێ هێشت و لە ساباتەکە وەدەر کەوت..

نەوشیروان لەبەرخۆیەوە گوتی: مەرج بێ ئەم دڕکەت لەژێرپێ دەربهێنم!

بەدوای مەلابەختیاردا، بەشێکی نوێنەرانی کۆنفرەنس، بەرەودوا، چوونە دەرەوە. لە کۆی ٢٨٧ نوێنەری بەشداربوو، ١٢٧ ئەندام کۆنفرەنسیان بەجێ هێشت و پرۆتستۆی دۆخەکەیان کرد. حەمەی عەتییە، سەدوبیست و هەشتەمین نوێنەر بوو کە بە خێراییەکی زۆر، لە بەشی پشتەوەی ساباتەکەوە، بەرەو دەرگاکە تاوی دا و لەبەردەرگاکەدا، لێوانێک ئاوی نۆش کرد و بە هەمان خێرایی، بۆ شوێنی خۆی گەڕایەوە و نوێنەرانی ئەبڵەق کرد. حەمە، ئەمجۆرە کڵاوکردنەسەرخەڵکەی هەبوو.

دیارە کە ئێمە زۆرینە نەبووین، بەڵام کەمینەیەکی بەهێز بووین. کارەکانی کۆنفرەنس وەستا. لە دەرەوەی ساباتەکە، کادرەکان، کۆمەڵ کۆمەڵ دانیشتن و قسەوباسیان کرد. نەوشیروان، مێرگەپانی بەرەو سورداش بەجێ هێشت!

چەندکەسێک گوتیان: هەق وایە ئێمەش لێرە بڕۆین..

مام ڕۆستەم: هەر سەیارەیەک لێرە بڕوات، بە فیشەک تایەکانی دەتەقێنم!

مەحمودی حاجی فەرەج: هەرکەسێک تەقە لە سەیارەی ئێمە بکات، من بە فیشەک مێشکی دەتەقێنم!

ئاوا ژەنراڵەکانیشمان بەسەر دوو بەرەدا دابەش بووبوون!

ئێمە، چەند کادرێک لەگەڵ مەلابەختیاردا، لە خێمەیەکدا کۆوە بووین و لە هەوڵی دۆزینەوەی دەریچەیەکدا بووین بۆ دەربازبوون لە تەنگژەکە. ملازم عومەر، ئازادهەورامی، بەکری حاجی سەفەر، مستەفاچاوڕەش، قادری حاجی عەلی، دلێری سەید مەجید و بەشێک لە نوێنەرە دەمامکدارەکانی شار،

لە نیگەرانیی دۆخەکەدا، لە هاتوچۆیەکی بێپسانەدا بوون.
ئەم تەنگژە و کێشمەکێشەی نێو کۆنفرەنس، بێ بەشداریکردنی دوو لە ڕێبەرانی ڕەوتەکەی ئێمە دەگوزەران، ئەوانیش: سالار عەزیز و مامۆستا جەعفەر بوون.
ئەوان.. تا کۆنفرەنسی یەکەمی کۆمەڵە، ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە و مەکتەبی سیاسیی یەکێتی بوون. م. جەعفەر، پاش ئەو کۆنفرەنسە، کوردستانی جێ هێشت و لە ئەڵمانیا نیشتەجێ بوو، بەڵام لە دۆخەکە خەمسارد و دابڕاو نەبوو. سالار عەزیز، لە گەرمەی مفاوەزاتدا (لە ڕاستیدا دژی گفتوگۆی بەعس و یەکێتی بوو)، لە ڕێگای بەغداوە و بە کەڵکوەرگرتن لە کەشی مفاوەزات، لەگەڵ هاوسەر و منداڵەکەیدا، چوونە ئەوروپا و لە سوید گیرسانەوە. دوابینینی من لەگەڵ سالاردا، شەوێکی سەرەتای ساڵی ١٩٨٤ بوو، لە ماڵی برایەکی ئەو، لە سلێمانی. ئەوشەوە، هەندەک قسەوباسمان کردن و دوابڕیاری خۆیی پێ گوتین:
من ناتوانم لەم دۆخەدا بژیم. من دەچمە ئەوروپا، بە هیوای ئەوەی مفاوەزات بە لایەکدا بکەوێت.. ئەگەر سەری گرت و ئەنجامێکی هەبوو، ئەوا من ناگەڕێمەوە و ئەوسات قسەیەکم دەبێت، ئەگەریش فەشەلی هێنا و شەڕ دەستی پێ کردەوە، ئەوا من لە ئێرانەوە یاخود لە سوریاوە، دەگەمەوە لاتان و درێژە بە کاری خۆمان دەدەین..
کادرەکان، پەیتا پەیتا دەهاتنە خێمەکە و ڕا و بۆچوونی خۆیان دەخستنە ڕوو، هەندێکیان پێیان وابوو، ئەمە فرسەتە و هەڵویستوەرگرتنی کاربڕ و یەکجارەکی بۆ جێهێشتنی کۆنفرەنس، کۆنفرەنسەکە شکست پێ دەهێنێت و ئەوجا دۆخێکی دیکە دێتەپێشەوە کە دەشێ بە قازانجی ڕەوتەکەی ئێمە بکەوێتەوە.
زۆرینەی ئێمە، بە هاوکاری و ڕێنمایی و هەوڵی ئەو برادەرانەی کە پێشتر باسم کردن و پەرۆشی پاراستنی یەکێتیی ڕێزەکانی کۆمەڵە بوون، ئەوباڵی دۆزینەوەی ڕێگەچارەی پێکگەیشتنەوە و پێکەوەهەڵکردن بووین. ئێمە و هەموو ئەو هاوڕێیانەی هەڵویستمان وەرگرتبوو، ویڕای چەندین کادری دیکەش لە ئاستی سەرکردایەتی و لە خوارەوەی ڕێکخستنیشدا، جگە لە ڕەوتێکی نارازی بە کۆمەڵێک سەرخەتی فیکری و سیاسیی جیاواز لە دووباڵەکەی دیکەی نێو کۆمەڵە، شتێکی تر نەبووین. واتە، ئێمە هیچ ئامادەکارییەکمان بۆ دابڕان و جێهێشتنی کۆمەڵە و یەکێتی نەکردبوو و پلانێکی وەهاش لە بەرنامەی ئێمەدا نەبوو. ئێمە، هەوڵ و کۆشانمان بۆ ململانێیەکی هێمن و دیموکراتییانە بوو لە دەروونی کۆمەڵەدا، کە زەوینەی چەسپین و جێکەوتنی نۆڕینەکانمان بڕەخسێنێت. ترسی لاسەنگبوونی دەسەڵات لە نێوەندی بڕیاری کۆمەڵەدا، وەک ئەوەی لەم کۆنفرەنسەدا، ئەوشیروان و گرووپەکەی دیکە، بۆی تێدەکۆشان، ترسێکی بینراو بوو و نیگەرانی دەکردین، دیسانیش وەهای

لێ نەدەکرین. دەستبەرداری کۆمەڵە و مێژووی کۆمەڵە ببین. نابەرپرسانە مامەڵە لەگەڵ دۆخە چارەنووسسازەکەدا بکەین و هەڵویستی بانچەپی و منداڵانە وەربگرین.
ورد و درشتی دۆخەکە و چۆنییەتی گرژبوونی ململانێکان، بە مامجەلال دەگەیشتنەوە و لە سووریاشەوە، چاودێریی کێشەکان و ئەگەرەکانی دەکرد. مامجەلال، گەڕایەوە مێرگەپان و لەگەڵ نەوشیروان مستەفا و مەلابەختیار و بەشێک لە سەرکردەکانی کۆمەڵەدا دانووستاندن و گفتوگۆی کرد. دۆخەکە مەترسیدار بوو و ئەگەری قووڵبوونەوەی کێشەکان و لێکەوتنەوەی دەرئەنجامی خراپی هەبوو. بەتەنگەوەهاتنی مامجەلال بۆ پاراستنی یەکڕیزیی یەکێتی و پەرۆشیی بەشێکی زۆری کادرانی هەردوو ڕەوتە ناکۆکەکە بۆ گەیشتن بە ڕێگەچارەیەک بۆ دەربازبوون لە تەنگژەکە، زەوینەی جۆرێک لە لێکگەیشتن و بەرچاوڕوونییان ساز کرد.
ئێوارێ، پاشی شێوکردن، دەستەیەک لە ئەندامانی کۆنی سەرکردایەتی و کادرەکان، بۆ دانیشتن و گفتوگۆ لەگەڵ نەوشیروان مستەفا و سەرانی گرووپەکەی تر، ساز کرا.. ئازادهەورامی، ملازم عومەر، بەکری حاجی سەفەر، دلێری سەید مەجید، قادری حاجی عەلی، مستەفاچاوڕەش، عومەر فەتاح و خەسرەوخاڵ (بە ڕووداپۆشراوی)، مامۆستا موحسین و من (دەشێ کەسانی دیکەشمان لەگەڵ بووبن و من لە بیرم کردبن). ئەم دەستەیە، بۆ ماوەی کاتژمێرێک زیاتر، لەژێر ساباتەکەدا، لەگەڵ نەوشیروان مستەفا و فەرەیدون عەبدولقادر و ڕەنگە کەسانی دیکەشی لێ بووبن، دانیشتین و گفتوگۆمان کرد. ئاکامی گفتوگۆکان، بە ئاقارێکی باشدا ڕۆیشت.. نەوشیروان مستەفا، بۆ بەیانی و لە دەستپێکی دانیشتنەوەی کۆنفرەنسدا، بارە گرژ و ئاڵۆزەکە خاو بکاتەوە، کەشێکی هێمن بخولقێنێتەوە، مەسەلەی دانگاییکردن و سوکایەتیپێکردنی «هەڵویست»، دوا بخرێت و بدرێتە دەست سەرکردایەتیی نوێی کۆمەڵە و هیچ میتۆدێکی زبر و توندوتیژئامێز، دەرهەق بەو مەسەلەیە بەکار نەبرێت.
ڕۆژی سێهەم، بەڕێوەبردنی کارەکان، ڕێچکەی ئاسایی خۆی وەرگرتەوە، چەند لیژنەیەک بۆ دووبارەنووسینەوەی بەرنامەی کۆمەڵە و ئەخشاندنی ئەو بڕگە و دەستەواژانەی کە پاش بێنەوبەرەیەکی زۆر لەسەریان ڕێک کەوتبووین، سازکران. هەندەک لە کادرەکان(حاجی ئومێد، حەمەئاوات، شێخ دارا، کاکەڕەش، دکتۆر هەژار و دکتۆر حەسان)، بە ئۆرە قسەیان لەسەر دوارەشنووسی بەرنامە کرد و ڕایانگەیاند: ئەوان، لە بەرگەوە بۆ بەرگ، بەرنامەکەیان قبووڵ نییە!
دەقی پرۆژەی مفاوەزاتیش، بۆ خۆی بابەتێکی دیکەی پڕ گێچەڵ و ناکۆکی بوو. لەو پرۆژەیەدا، پەرەگرافێک هەبوو کە ئێمەی بە ئێراقچی تۆمەتبارکراو، دژی بووین و کوردستانچییەکانیش لەگەڵ بوون. مانای تێکستەکە بە کوردی وەها بوو: کوردستانی ئێراق، بەشێکی لە جیانەهەتووی خاکی ئێراقە و گەلەکەیشی بەشێکی لە جیانەهاتووی گەلی ئێراقە!

دواکاری بەرنامەی کۆنفرەنس، پرۆسەی هەڵبژاردنەوەی سەرکردایەتیی کۆمەڵە بوو. ئەم پرۆسەیە، لە مێژووی کۆنفرەنسەکانی کۆمەڵەدا، هەرگیز بێ کێشە و گرفت، بە ئەنجام نەگەیشتبوو. کۆنفرەنس، بڕیاری دا، سیستەمی ڕێژەی ٥١٪ی کۆی دەنگەکان، بۆ بوون بە ئەندامی سەرکرِدایەتی، لەبەرچاو بگیرێت. لێرەدا، تەنها ژمارەیەکی کەمی کاندیدەکان، دەنگی پێویستیان هێنا و دەنگەکانی مەلابەختیار، لەژێر ئەو ڕێژەیەوە بوو. دەنگەکان، ئەوەیان نیشان داین کە کۆمەڵە بووتە دوو بەرەی جیاواز و پرۆسەی دەنگدانەکە، هێزی فراکسیۆنەکانمان پێ دەڵێت!

بارەکە، دیسانەوە ئاڵۆزە! هەندەک لە سەرکردە بەسەنگەکانی کۆمەڵە کە بەرژەوەندیی کۆمەڵە و دۆخە سیاسییەکەیان لەبەرچاو دەگرت، نیگەران بوون و پێیان وا بوو، ئەم میتۆدەی هەڵبژاردن و ئەنجامەکەی، خزمەت بە کۆمەڵە ناکات و کێشەکان قووڵتر دەکاتەوە. ملازم عومەر و ئازادهەورامی، گوتیان: ئەم دەنگدانە بێویژدانییەکی گەورەیە و نوێنەرانی کۆنفرەنس، ناتوانن چارەنووسی کۆمەڵە ببینن.. ملازم عومەر، وەک پرۆتێست، ساباتەکەی جێ هێشت!

هەوڵەکان بۆ دەربازبوون لە تەنگژەکە چڕ کرانەوە. دەنگە تووڕەکان، داوای هەڵبژاردنەوەیان دەکرد و فشاریان بۆ کۆنفرەنس هێنا!

نەوشیروان، هەستی کرد، کارەکە بەو شێوەیە بە ئەنجام ناگات و لەگەڵ ملدانی بۆ دووبارەهەڵبژاردنەوەی سەرکردایەتی، پێشنیازی ئەوەشی کرد، سیستەمی ٥١٪، وەلا بنرێت و تەنها ژمارەی دەنگەکان لە سەرەوە بۆ خوارەوە، هەتا ژمارەی پێویست لە ئەندامانی سەرکردایەتی هەڵدەبژێردرێن، حیساب بکرێن. هەڵبژاردن کۆتایی هات و ئەندامانی ئەسڵیی کۆمیتەی سەرکردایەتی هەڵبژێردران!

سەرکردە هەڵبژێردراوەکان:

نەوشیروان مستەفا

ملازم عومەر عەبدوڵا

فەرەیدون عەبدولقادر

ئازادهەورامی

کۆسرەت ڕەسوڵ

جەبارفەرمان

مەلابەختیار

کۆمیتەی سەرکردایەتی، پێویستی بە چەند ئەندامێکی یەدەک هەبوو.

نەوشیروان مستەفا، ئەم کادرانەی کاندید کردن و خۆیشی هەڵیسەنگاندن و پەسنی دان:

حەسەن کوێستانی
عومەرفەتاح(دەمامکدار)
خەسرەوخاڵ(دەمامکدار)
دلێر ئەحمەد شوکری(دەمامکدار)
قادری حاجی عەلی
حەمەتۆفیق
دوو دواکاندیدی لیستەکە، ئەو هەڵبەسەنگاندن.
من، لەلایەن هاورێیانی خۆمانەوە، کاندید کرام و کەمال شاکیر، ئەرکی هەڵسەنگاندنەکەمی لە ئەستۆ گرت. من، چەند دەنگێکی زیاترم گەرەک بوو، تا ئەو پۆستە وەرگرم.. لە ناخەوە پێم خۆش بوو کە سەرنەکەوتم!
لە بەردەم کۆنفرەنسدا، مەلابەختیار، سوێندی بە گۆڕی کاک ئارام خوارد کە چیدی ئەو ناچێتەوە کۆمیتەی سەرکردایەتیی کۆمەڵە. ئەو، ئەگەرچی لە پراکتیکدا، وەهای کرد و تەنیا لە یەکەم کۆبوونەوەی سەرکردایەتیدا، بەشداریی کرد، دیسان نەدەبوو ئەو سوێندە بخوات و پاشتر دژی خۆی بەکاری بهێنێ! ئەو، لە فەزایەکی دەروونیی خراپ و هەڵچوون و توورەبووندا، هەڵەیەکی گەورەی کرد.
ئەمە وێنەکانی کۆنفرەنس بوون، ئەو وێنانەی بۆ ساڵانێکی زۆر، ڕەنگ و هێڵکارییەکانیان، لە هزری هاورێ ئەیارەکاندا، کاڵ نەبوونەوە و لە پێشهات و ڕووداوەکانی ساڵانی دواتردا، ئەکتیڤانە ئەخشیان هەبوو!
بەشێک لەم وێنانە، نیگاری لاسەنگبوونی هاوکێشەی دەسەڵاتی گرووپەکانی نێو کۆمەڵەن. تێکچوونی هاوسەنگیی نێوان پێگە و دەسەڵاتی فراکسیۆنەکان، بە ناچاری سەر بۆ میتۆد و ڕێبازی دیکەی ململانێ دەکێشێ و هەندەک دیاردە و دەرکەوتی حیسابێۆنەکراو دەخولقێنێ.
هونەری ڕاگرتنی باڵانس، لە ململانێی سیاسی و ڕێکخراوەییدا، هونەرێکە، سەرکردەی زانا و بەئەزموون پێویستییەتی. ئەوشیروان، نەیویست یاخود نەیزانی ئەو باڵانسە ڕابگرێت، ئیدی پرۆسەکە ئاراستەیەکی دیکەی وەرگرت و پێش هەر لایەک، خودی کۆمەڵە لێی زەرەرمەند بوو.
کۆنفرەنس بە ئەنجامێکی چاوەڕواننەکراو، کۆتایی هات. ئێمە گەڕاینەوە و سورداش و چەند ڕۆژێک ماینەوە، چەند کۆبوونەوەی خۆمانەمان چێ کردن. پاشی شکست، تاوتوێی دۆخەکەمان کردەوە. کۆبوونەوەکان، لە بارەگای مەلابەختیار، شێخەعلی و شەوێکیش لە ماڵی ملازم عومەر، سازدران. دەبوو چاوەڕێی کۆبوونەوەی سەرکردایەتیی هەڵبژێردراو بکەین، تا بزانین پۆست و کارەکانی کۆمەڵە و یەکێتی چۆن دابەش دەکرێن.

# میوانی مامجەلالین

ماڵی مەمجەلال، لە سەروبەندی مفاوەزاتدا، لە سورداش، لە یەکێک لەو خانووانەدا بوو کە دەوڵەت پێشتر درووستی کردبوون. رۆژێک، دلێری سەیدمەجید، پێی راگەیاندین کە بۆ ئێواری، شێخعەلی، موحسین عەلی ئەکبەر، خۆی و من میوانی مامجەلالین. ئێمە تێگەیشتین کە میوانداریەکە، بۆ ئەوەیە مامجەلال را و بۆچوونی ئێمە لەسەر رووداوەکانی نێو کۆنفرەنس و ئەنجامەکانی بزانێت و لە ئیدی ئێمەوە، مەزەندەی ئایندەی کێشە و گرفتەکانی نێو کۆمەڵە بکات، ئەم میوانداریە، دەشێ جۆرێک لە دڵدانەوەی ئێمەش بێت وەکو کادرانی دەرکەوتووی نێو رەوتێکی کۆمەڵە کە بە جۆرێک لە کۆنفرەنسدا، شکستی خوارد بوو!

باخچەکەی ماڵی مامجەلال، رازاوە و دڵرفێن بوو. لە نێوەندی چیمەنێکی پاراوی بەرەوەنەقدا، مێزێک رازێنرابووەوە و چەند کورسی لە دەوری دانرابوون. مێزەکە، لە مەزە و خواردنی مگێزهێنەر تژی بوو، دوو قاپ ویسکیی زۆر باشی لەسەر بوون و لەژێر مێزەکەشدا، چەند قاپی دیکە کەوتبوون.

مامجەلال، خۆیناسا و بە رێزێکی زۆرەوە، بەخێری هێناین، پێک تێ کران، قسەوباس لە دۆخی مفاوەزات و رەوت رووداوەکانەوە رێچکەی گرت و لە دۆخی کۆمەڵە و رووداوەکانی کۆنفرەنس و ئەنجامەکانیدا، چەقی بەست.

مامجەلال، جەختی کردەوە کە ئەو، لە هەوڵی راگرتنی باڵانسی نێو لایەنەکانی یەکێتی و رەوتەکانی نێو کۆمەڵەدا دەبێت، دابەشکردنی پۆستەکانیش، بە جۆرێک دەبن کە هەموو لایەنەکان پێی قایل بن و لەم قۆناغە ناسکەدا، هەموولایەک لە هەوڵی خورتکردنی ریزەکانی کۆمەڵە و گەشەپێدانی یەکێتیدا بین.. با ناکۆکییەکان و ململانێکان، بە ئاراستەیەکدا بچن، هەم جیاوازییەکان و هەم یەکێتیمان بپارێزین.

مامجەلال، هەم خۆی قسانی دەکردن و هەم را و بۆچوونی ئێمەی دەپرسی. ئێمە، دەبوو زۆر ئەخۆینەوە و وەئاگا بین.. پاشی خواردنەوە و قسەکردن، ئیدی بۆ سەر خوانی ئێوارەمان گواستەوە و خواردنێکی بەتامان خوارد.

## پۆستەکانی یەکێتی و کۆمەڵە
## دابەش دەکرێن و دەسگای نوێ دادەمەزرێن!

ئێمە هێشتا لە سووریاشین. هەفتەیەک تێدەپەڕێت و کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتیی کۆمەڵە و پاشانیش سەرکردایەتیی یەکێتی دەست پێ دەکەن.
ئێمە بڕیارمان وابوو، لە هەر دەسگایەکدا کارمان پێ بسپێرن، بە مەرجێک بوار و هەلی کارکردنمان بۆ بڕەخسێت و بە کادرانی دەرەوەی ڕەوتی خۆمان شەتەک نەدرێین، کار بکەین. مەلابەختیار، پێی وا بوو، ئەگەر دەسگای ڕاگەیاندنی کۆمەڵەی پێ بسپێرن یاخود بە لێپراسراوی مەڵبەندی یەک یان دووی یەکێتیی دابنێن، بێ گرفت ڕازی دەبێت و ئەگەریش نا، ئەوا بێ کار و مەسئوولیتی فەرمیی دەمێنێتەوە.
دابەشکردنی پۆستەکان بە جۆرێک کەوتەوە، مەلابەختیار، شوێنێکی دڵواخوازی پی ڕەوا نەبینرا. سەرکردایەتیی نوێی کۆمەڵە، کە گرووپی نەوشیروانی تیا باڵادەست بوو، پۆستە گرنگەکانی بە شێوەیەک دابەش کردبوو، کە زەمینە بۆ لاوازکردنی ڕەوتی ئێمە و هەر دووزمیەکی دیکەی دەرەوەی تێڕوانینی ئەوان، بڕەخسێنێت.
دەسگا نوێیەکانی کۆمەڵە، دەسگای ڕێکخستن و دەسگای ڕۆشنبیری بوون و چوار ڕێکخراوەکەی کۆمەڵەش، ئاڵوگۆڕیان تێدا کرابوون.
فەریدوون عەبدولقادر، لێپرسراوی دەسگای ناوەندی ڕێکخستن و هەر یەک لە عومەرفەتاح، دلێرئەحمەدشوکری، حەمەتۆفیق، حەسەن کوێستانی و موحسین عەلی ئەکبەر ئەندامی ئەو دەسگایە بوون.
ئازادهەورامی، لێپرسراوی دەسگای ڕۆشنبیریی کۆمەڵە و ڕێکەوت عوسمان، دکتۆرخەسرەوخاڵ و من، ئەندامانی دەسگاکە بووین. من، بڕیارەکەم بە خۆشحاڵییەوە قبووڵ کرد و پێم وابوو کارکردن لە دەسگایەکی ڕۆشنبیریدا، بە سەرپەرشتیی ئازادهەورامی، دەرفەتێک لە بواری نووسین و کارکردندا بۆ من دەڕەخسێنێت. من، کە هۆگری هاوڕێیەتیی ئازادهەورامی بووم و وام دەبینی، ئەو پیاوە، لێوانلێوە لە هەستی جوان و بینینی مرۆڤدۆستانە، کەسێکی واقیعبین و سەرکردەیەکی ڕۆشنبیرە.
شێخەعلی، لێپرسراوێتیی ڕێکخراوی دووی کۆمەڵەی پێ سپێردرا و قبووڵی کرد. ئاسۆی شێخ نووری، شاخەوان عەباس و عەبدولڕەزاق، هەر کام بە لێپرسراوی ڕێکخراوێکی کۆمەڵە دانران.
جەبارفەرمان بۆ لێپرسراوی مەڵبەندی یەک، قادری حاجی عەلی بۆ مەڵبەندی دوو، کۆسرەت ڕەسوڵ

بۆ مەڵبەندی سێ و ئارای شێخ جەلال «خەتی گشتی» بۆ لێپرسراوێتیی مەڵبەندی چوار دانران.

مەکتەبی عەسکەری، ڕێک خرایەوە و ملازم عومەر، وەکو پێشتر لێپرسراوی بوو. چەند کادری عەسکەریش، بۆ هاوکاریکردنی دانرابوون.

دەسگاکانی دارایی، ڕاگەیاندن و دەسگا کۆمەڵایەتییەکانی یەکێتیش، لە نوێڕا دانرانەوە و فراوانتر کران.

دیارە ئیدی بە شێنەییش، سەرکردایەتیی نوێی کۆمەڵە، گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕێکی بەرچاوی لە تەلاری ڕێکخراوەیی کۆمەڵەدا کرد. لێپرسراوی کەرتەکان و پۆلەکانی ڕێکخستن، جێگۆڕکێیان پێ کران، لادران، نزم و بەرز کرانەوە. ئەم ئاڵوگۆڕانە، تەلار و پێکهاتەی هێزی چەکداری یەکێتیشی گرتەوە. فەرماندە و سەرتیپەکان ئاڵوگۆڕیان پێ کران. لە ڕیزەکانی خوارەوەی ڕێکخستندا، لە شاخ و لە شارەکاندا، نیگەرانییەک لای هاوڕێیانی کۆمەڵە دروست بوو. لێپرسراوە نوێیەکان، لە تەلاری ڕێکخستن و لە پێکهاتەی دەسگاکانی مەڵبەندەکان و تیپەکاندا، کەوتنە دەربەڕاندنی ئەو کادر و هاوڕێیانەی کۆمەڵە، کە پێیان وابوو، لەگەڵ سیاسەتی گشتیی کۆمەڵەدا ناکۆکن و لە کۆنفرەنسدا. ڕا و بۆچوونی جیاوازیان هەبووە و لەسەر ئەو مەسەلانەی پێشتر باسم لێوە کردن، هەڵوێستیان وەرگرتووە.

ئەو هاوڕێیانەی، لەسەر مەسەلەی «هەڵویست» لە کۆنفرەنسدا تۆمەتبار کرابوون، دەسگای ناوەندی ڕێکخستنی کۆمەڵە، لیژنەیەکی بۆ لێکۆڵینەوە و سزادانیان دروست کرد، یەک یەک بانگران. لێکۆڵینەوەیان لەتەکدا کرا و بە جۆرێکیش سوکایەتییان پێ کرا. ئەوان، لە ڕەوشێکی خراپدا دەژیان.

پاش کۆبوونەوەی سەرکردایەتیی کۆمەڵە، ڕەوشەکە باش نەدەگوزەرا و ئێمەش، دەبوو کارێک بکەین.

## کۆبوونەوەیەکی گرنگ و چارەنووسساز

مەلابەختیار، پێشنیازی کۆبوونەوەیەکی تایبەتی کرد. کۆبوونەوەیەک لێبڕاوانە قسەوباسەکانمان چڕ بکاتەوە و پلانێک بۆ کارکردن و نەخشەیەک بۆ دەرچوون لە قەیرانەکە دابڕێژێت.
لە سووریداش و لە بارەگای شێخەعلی، مەلابەختیار، ملازم عومەر، ئازادهەورامی، شێخەعلی، م.موحسین و من دانیشتین و بۆ کاتژمێرێک زیاتر، شەنوکەوی دۆخەکەمان کرد، هەموو ئەگەرەکانمان خستنە بەر باس و کۆڵینەوە..
بۆچوونی ئازاد هەورامی و ملازم عومەر، جەختکردن بوو لەسەر کارکردن لە چوارچێوەی کۆمەڵە و یەکێتیدا و هەوڵدان بۆ یەکخستنی هەموو تواناکان، بۆ چارەسەری قەیرانەکە و پشتبەستن بە دیالۆگ و قەناعەتپێکردنی نەوشیروان وەکو کەسی یەکەمی ناوەندی کۆمەڵە و برادەرانی دیکەش، تا دۆخەکە هێمن بکرێتەوە و رێگا لە بەردەوامبوونی ئەو کار و کردەوانە بگیرێت کە دەشێ ببنە مایەی زیاتر ئاڵۆزبوونی کێشەکان و دڵڕەنجاندنی هاوڕێیانی کۆمەڵە و کەنارخستنیان.
ئێمە، مەلابەختیار، شێخەعلی، م. موحسین و من، پێمان وا بوو، کێشەکە زۆر لەوە ئاڵۆزترە و سەرکردایەتیی کۆمەڵە و نەوشیروان، بێباکانە و لێبڕاوانە پاکسازیی ریزەکانی کۆمەڵە دەکەن.. دەبێت بیر لە شێواز و رێگاچارەی دیکە بکەینەوە. ساتێ ئێمە بە کۆمەڵ، لەسەر میتۆد و میکانیزمێکی کارکردن رێک نەکەوتین، ملازم عومەر و ئازادهەورامی ماڵئاواییان کرد و ئێمەیان بە تەنیا بەجێ هێشت! ئەوان، جیاوازتر دۆخەکەیان دەبینی. هەندەک لە هاوڕێیانی ئێمە، هەڵویستی نەرمی ملازم عومەر و ئازادهەورامییان وەها لێک دەدایەوە کە قەیران و کێشەکان، هێشتا پێگەی ئەوانیان لاواز نەکردووە و دۆخەکە بۆ ئەوان مەترسیی نییە، بەڵام رووداوەکانی ساڵی پاشتر و هەڵویستی ئەوان لەمەڕ مامەڵەی زەبرنامێزی یەکێتیی بەرانبەر ئاڵای شۆڕش، ئەو بۆچوونەی بەتاڵ کردەوە!
ئێمە، سەرلەنوێ دەستمان بە گفتوگۆ کردەوە و ئەنجام بەوە گەیشتین:

* پەیوەندیی هاوڕێیانەی نێو کۆمەڵە، بە جێگایەک گەیشتووە، کەلێن و قەڵشتەکانی گەورە و فراوانن، مەودداکان، پڕ ناکرێنەوە و ئەڵقە لێکپچڕاوەکان، لێک هەڵناپێکرێنەوە!
* بەرنامەی کۆمەڵە و ئەوەی لە کۆنفرەنسدا پەسەند کرا، خەسڵەت و سیماکانی رێکخراوێکی مارکسیست لینینیستی تێدا نەماوە و کۆمەڵە دێت جیاوازییەکانی خۆی لە نێو یەکێتیدا بزر دەکات.
* بێناکامیی مفاوەزات و بێهودەیی شەڕی نێوخۆ، دەبێت لە دیدێکی دیکەوە بخوێنرێنەوە و هەوڵ بدەرێت، دەرووێکی نوێیان لێ بکرێتەوە.
* زیندووکردنەوەی ئوسووڵ و خەسڵەتە بنەڕەتی و رەسەنەکانی نێو کۆمەڵە. پێویستیان بە شێوازێکی

دیکەی خۆڕێکخستنەوە و دووبارەهۆشیارکردنەوەی هاوڕێیانی کۆمەڵە هەیە.
ئێمە، ئەم چوار کادرەی کۆمەڵە، لە سووریاش و لە ژوورێکی بارەگای شێخەلیدا، دەستمان لە نێو دەستی یەکدی دا و پەیمانمان بۆ جێبەجێکردنی ترسناکترین و پڕمەسئولیەتترین بڕیار دا. ئێمە، ئەم چوار کەسە، گاڤێکمان بۆ دەستپێکی پرۆسەیەک هاوێشت کە پاشتر کارەساتێکی گەورەی بۆ خۆمان و بۆ خەڵکی دیکەش، لێ کەوتەوە!
ئەم کۆبوونەوەیە، ئەم هەنگاوە، پاشتر بۆ هەوارێکی سیاسیی و ڕێکخراوەیی بردین کە بە تۆپزی، ناوی «ئاڵای شۆڕش»ی لێ نرا.
ئەگەر ئەم کۆبوونەوەیە نەبا، ئەگەر ئەم چوار کەسە، تەواوی دنیا و سیاسەتمان لە دووتوێی ئەو ئەگەر و بۆچوونانەی خۆماندا، نەبینیبا، ئەگەر وردبینتر و بە نەفەسێکی درێژترەوە لە قەیرانەکەمان ڕوانیبا، ئەگەر کەمێکی دیکە پشتمان بە زەمەن بەستبا و ڕەوتی ڕووداوەکانمان بە ئایندەیەکی نزیک سپاردبا، ئەم هەڵویست و هەنگاوەی ئێمە، سەری بۆ درووستبوونی «ئاڵای شۆڕش» نەدەکێشا!
ئێرە، ئەم ژوورەی بارەگای شێخەلی، مەکۆی تەرووکاندنی گەڕا فیکری، سیاسی و ڕێکخراوەییەکانی ڕەوتێک بوو کە خۆشمان، ئەوسات، بەرچاوڕوون نەبووین و لە ئاکام و چارەنووسی بێ ئاگا بووین.
ئەگەر ئێمە، ئەو دید و تێڕوانینەمان بۆ کێشەکان نەبوایە و ئەو بڕیارەمان وەرنەگرتایە، ئەگەر مەلابەختیار، وەکو سەرکردەیەکی دیار لە ڕەوتەکەدا، لە یەکێتی و کۆمەڵەشدا، کاربڕانە بەشێکی گەورەی کار و چالاکییەکانی لە دۆخە نوێیەکەدا، لە ئەستۆی خۆی نەنایە، دەشیا، لێرەو لەوێ، چەند ئەندام و کادرێک، کۆمەڵەیان جێ هێشتبا، بۆ ئەورووپا ڕۆشتبان، ئەڵقەی چکۆلەیان لە کۆمەڵە دابڕیبا، بەڵام هەرگیز ڕێکخراوێک بەناوی «ئاڵای شۆڕش»، بەو سەنگ و قورساییەی خۆیەوە، دانەدەمەزرا.
من، ئێستا کە بە دیدێکی ڕەخنەگرانەوە، لە ڕووداوەکانی ئەوێ ڕۆژێ و لە پرۆسەی «ئاڵا» دەڕوانم و دەیانخوێنمەوە، پێش هەر کەس و لایەنێک، ڕەخنە لە دید و ئاوەزی خۆم، بۆ بینین و لێکدانەوەی سیاسەت دەگرم.
ئەو ڕووداوانەی وەدەرکەوتن و ئەو سیاسەتانەی پاشتر لە ئاکامی بیرکردنەوەی ئێمە کەوتنەوە، ئێمە بە تەنها لێیان بەرپرسیار نەبووین. ئێمە، تەنها لایەنێکی هاوکێشەکە و فاکتەرێک بووین، لە خولقاندنی ڕووداوەکاندا.
سرکرتێری کۆمەڵە، دەسگای ڕێکخستن، کادرانێک لە ڕێکخراو و کەرتەکاندا، هەندێک لە ژەنراڵەکانی کۆمەڵە کە فاکتەرەکانی ڕک و تۆڵەسەندنەوە، دەیانبزووواندن، زیاتر لەوەی کە لۆژیکی کێشەکان

ببینن. هەر هەموویان لایەنی بەسەنگ بوون، لە ئاژوواندنی کێشە و ململانێکاندا، بەرەو هەڵدێری دووکەرتبوون و لێکدابڕان.
لە هەموو کوردستاندا و بە تایبەت لە دەڤەرەکانی هەولێر (کە حاجی مەمۆ، وەکو کادرێکی دێرینی کۆمەڵە و لێپرسراوی سەرەکیی ڕەوتی ئێمە لەوێ. هەڵسووڕانی جیددی و نەپساوی هەبوو)، سیاسەتی پاکسازییەکان، بۆ ڕەدوونان و تەنگپێهەڵچنینی کادرەکان، بە ئاستێک گەیشتبوو کە هەندێک لە کادرانی سەر بە ڕەوتی ئێمە، پەنایان بۆ بارەگاکانی سەرکردایەتی هێنابوو، یاخود پەنایان بۆ ناوچەکانی دەسەڵاتی «حشع» بردبوو!

## بڕیارەکانی کۆبوونەوەکە:

* ئێمە و ئەو کادرانەی دیکە کە کار و لێپرسراوێتیمان وەرگرتووە، لە کارەکانی خۆماندا بەردەوام بین. مەلابەختیار، بڕیاری دا، ماڵ و بارەگای خۆی، لە سووریاشەوە. بۆ «زرگوێز»، بگوێزێتەوە.
* کەوتنەگەڕ بۆ بەسەرکردنەوەی هاورێیانی کۆمەڵە لە هەموو دەڤەر و ناوچەکاندا.
* ڕێکخستنەوەی ڕێکخستنەکانی ناوشار، لە ناوچەی هەولێر حاجی مەمۆ و لە سلێمانیش، لە پلەی یەکەمدا مەلابەختیار و پاشانیش شیخەعلی و من، کارەکان هەڵسووڕێنین.
* مەلابەختیار، پەیوەندی لەگەڵ ڕێکخستنەکانی ئەورووپا، بەتایبەت سالارعەزیز و م.جەعفەر بگرێت، بەو پێیەی ئەو، چەندمانگ پێشتر سەفەری بۆ ئەورووپا کردبوو، هەموو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و یەکێتیی بینیبوون.
* نووسین و بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەیەکی نهێنی بە ناوی «نامانامەی تیوری»، بۆ دانانی بەرنامەیەکی تیوریی هۆشنکردنەوەی هاورێیانی کۆمەڵە و لە نوێڕا ژیاندنەوەی پرەنسیپە فیکرییەکانی مارکسیزم و دیراسەتکردنەوەی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد و مێژووی شۆڕشەکانی کوردستان.
ئاوا، لەژێر کارکردی بەرتەسکبوونەوەی فەزای ئازادیی بۆچوون و ڕادەربڕین لە ڕیزەکانی کۆمەڵەدا، ئێمە خەریکین ڕەوتێکی فیکری و سیاسیی ڕێک دەخەین، بێ ئەوەی خۆمان درکی پێ بکەین، چەند هەنگاوێک لە ڕێکخراوبوون نزیک دەکەوینەوە و هەرگیزیش پێشبینی ئەوە ناکەین، کە ئەم پرۆسەیە، بۆ شوێنێکی نادڵخوازمان دەبات. لە نائاگایی هەر یەکێک لە ئێمەدا، خاڵێک یاخود ئامانجێک هەبوو. ئەم ئامانجەش، ڕەنگە ئەوە بووبێت، ئەگەر بە تۆکمەیی خۆمان ڕێک بخەینەوە، دەرکەوتنی باڵی چوارەم لە یەکێتیدا، ببێتە ئەمری واقیع و ئەمەش دەروازەیەک بێت بۆ تێپەڕاندنی قەیرانەکە. ئێمە، هەرگیز ئەم بۆچوونەمان، بە ئاشکرا و لە نێوان خۆماندا، باس نەکردبوو، دیسانیش وا هەست دەکەم، بە جۆرێک، کارمان بۆ ئەم ئامانجە دەکرد.

ئەگەر، کارکردن بۆ جیابوونەوە لە کۆمەڵە و ماڵئاواییکردن لە یەکێتیی نیشتمانی، لەو دۆخ و هەلومەرجەدا، لای هەندەک کادری چەپڕەوی ڕیزەکانی خوارەوە، ئاگێندایەک بووبێت، ئەوا ئەم بیرۆکەیە، هەرگیز بە هزری ئێمەی بەشداربووانی ئەم کۆبوونەوەیەدا، گوزەری نەکردبوو!

## سەفەرێک بەرەو سەرەتای یادەوەرییەکان

ئێستا، ڕۆژێکە لە ڕۆژانی کۆتایی پاییزی ١٩٨٤. ئێمە، لە دوو ئۆتۆمبێلی لاندکرۆزەردا، لە سلێمانییەوە بۆ گوندی «عەبابەیلێ». بە ڕێگاوەین. شێخعەلی و پێشمەرگەکانی دەستەکەی، حەمەناوات، شێخ دارای شێخ موحەمەد، من و هەندەک لە پێشمەرگەکانی دەستەکەم، تەختایی شارەزوور شەق دەکەین و بە دڵی لێوانڕێژ لە حەسرەت، بەرەو زێدی خۆمانی دەئاژووین.

ئێوەی خوێنەرانی بەرگی یەکەمی «ئەزموون و یاد»، ئەگەر دەستپێکی گێڕانەوەکانتان لە یاد مابێت، من، لەو سەرەتای دەستپێکەدا، لە مانگەشەوێکی تیشکباری لێوانلێو لە بۆنی قەرسیل و ئاوەنیای تازەهەڵچوودا، هاوڕێی شێخعەلیی هاوزا و ئامۆزام، یاریی بە خەرمانەی مانگ دەکەین و ئەرم و لەسەرخۆ، دڵ لە ڕۆشنایی تژی، لە پێدەشتی هەڵەبجەوە، بەرەو عەبابەیلێ بەڕێوەین.

ئەو گەنجە باڵابەرزە، گەنمڕەنگە، برۆئەستوورە، بە دوو چاوی هەنگوینییەوە کە بە زەریا دەچوون و بە دڵێکەوە کە جگە لە ئەڤین و خۆشەویستی، شتێکی دیکە لەوێدا جێگای نەبوو، چەند کاتژمێرێکە لە نێو گۆڕێکدا، لە هەمان گۆڕستاندا کە ئێمە، شەش ساڵ پێش ئێستا، پێکەوە گۆڕەکانمان بەسەردەکردنەوە، بە جەستەی خوێناوییەوە، ڕاکشاوە!

دوێنێ، لە سووریاش، لە کابینەکەی دکتۆرسەردار تاڵەبانی، دانیشتبووین و کەسێک هەواڵەکەی بۆ هێناین.. شێخعەلی، لە سەنگەرێکدا، لە بەرزاییەکانی «پەروینی»ی نزیک شارۆچکەی «نەوسود»، لە پەلامارێکی هێزەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بۆ سەر هێزەکانی کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران، بریندار بووە و پاشتر سەنگەرەکەیان سووتاندووە و ئەویش بە زامداری، جەستەی بووەتە سووتماک! وای چ هەواڵێکی سەخت بوو!

ملازم عومەر، لێی گێڕابوومەوە کە من بچمە ماڵی ئەو، تا لەوێ چەند ساتێک بۆ پرسە و سەرەخۆشی دابنیشین.

لە ماڵی ملازم عومەردا، دانیشتین و دۆست و هاوڕێکان هاتن و بۆ ڕێزگرتن لە گیانی هەڵفڕیوی شێخعەلی و دڵدانەوەی من، چەند ساتێکمان بەڕێ کردن.. پاشتر، دوو ئۆتمبێلیان بۆ ساز کردین و لە سووریاشەوە، ئەم سەفەرەمان ڕێک خست!

دواجار، کە بە دیداری شێخعەلی گەیشتم، چەند مانگێک پێش ئەم هەواڵە بوو. ڕۆژێک لە سلێمانی و لە ماڵی «خاڵۆخالید»م، شێخعەلی هات و نانی نیوەڕۆمان پێکرا خوارد. ئەو، تەندروستیی باش نەبوو، باسی ئەوەی بۆ کردم کە بڕیارە برادەرانی کۆمەڵە، بۆ چارەسەری ئازارێک کە لە بڕبڕەی

پشتیدا سەری هەڵدابوو. بینێرنە ئەورووپا.
شێخعەلی. لە هەواڵی ئێمە و کێشەکانی نێو کۆمەڵەی ڕەنجدەران و یەکێتیی پرسی. من. ورد و درشتی ئۆخەکە و بەرنامەی خۆمانم بۆ باس کرد. ئەو گوتی: ئۆخەکەتان باش نییە و ئێوە لەبەردەم مەترسییەکی گەورەدان!
گوتم: بۆ وەهای دەبینی؟
گوتی: ئەوەی ئێوە دەیڵێن، لە یەکێتیدا جێ ناکەوێت و سەرناگرێت.. ئێوە کەمئەزموونن و لە مامجەلال و ئەوشیروانی نابەنەوە.. دەبێت زۆر وریا بن!
باران، نم نم بەسەر شارەزووردا دەبارێت. لە پەنجەرەی ئۆتۆمبیلەکەوە، بۆنی خاکی بارانپرژێنکراو. خانەکانی هەست لێوانلێو دەکات. ئەمە. پێ دەچێت بارانی پەڵە بێت، بارانی ژیان تێکەڕانی دانەوێڵە کە پاشی چەند مانگی دیکە، کۆڕپە دەبێت، هەراش دەبێت و بە دەم شنەباوە، کەروێشکە دەکات. بەڵام ئیدی هەرگیز من لەگەڵ شێخعەلیدا، لەژێر تریفەی مانگەشەوێکدا، بە نێو گیاوگوڵی تا چۆکان هاتووی دەشتی هەڵەبجەدا. بە سەمایەکی شێتانەوە، بە دڵێکی پڕ لە هیوای شۆڕشەوە، بەرەو «عەبابەیلێ» هەڵنافڕین و لە «ناوشەخس»دا وچانێکی بۆ ناگرین، گۆرە بێنازەکانی هاوڕێیانی تەمەنی منداڵیمان. بەسەر ناکەینەوە.
وای شێخعەلی! مەرگی تۆ. بەشێکی زیندووی بوونی منی وێران کرد. ئێستا ئەوی دەمێنێتەوە، تەنیا وێنەکانی نێو ئەلبوومی یادەورییەکانن.. وێنە ڕەنگینەکانی ژیانی منداڵیمان.. بەیانیان. دەهاتمە بەرماڵتان، بە دەستە لاوازەکانی منداڵیمەوە، پاڵێکم بە دەرگا ژەنگاوییەکەتانەوە دەنا، وەژوور دەکەوتم.. چ ماڵێک بوو؟ تەنیا ژوورێک و پشتێرێکی تاریک بە ساپیتەی زۆر نزم و ڕۆژنەیەکی نایلۆن تێگیراوەوە. ناوی ماڵی «مامۆ قادر»مان لێ نابوو. ئێوە، باوک و دایک و دوو خوشک و دوو برا، لەو خانووە پەرپووتەدا ژیانتان دەکرد کە شیاوی گوزەرانی ئینسان نەبوو.. نا نەبوو.. کە من دەهاتم. تۆ جارێ لە نێو پێخەودا، ڕا نەبووبوویت.. دایکت، دەیگوت: عەلی هەستە..عەلی نیوەڕۆیە و «زەمینەدین» بە جێت دێڵێ.. تۆ. بە نابەدڵی هەڵدەسایت، دووجاران خۆت دەکێشایەوە. شڵپێک ئاوت لە رووخسارت وەر دەدا. شەرواڵی بە پینەداپۆشراوت هەڵدەکێشا، پارووەیەک نانی وشکت، بە چایەکەوە دەخوارد، کتێبەکانت لە بنهەهەنگڵت دەنان. پێڵاوە لاستیەکە دڕاوەکانت لە پێ دەکردن و لە ماڵ دەردەپەڕین. لە پشتی دانەواکەی «شێخ «ساحێب»ەوە. بە تاشەبەردەکاندا، هەڵدەگەڕاین. بۆنی نانی گەرمی تەنوور، ئاوی لە دەممان دەهێنا، بە هەنگاوی منداڵانە و بە بێ پاڵتۆ و لەژێر باراندا، بە بەر ماڵی« شێخ برایم» و «شێخ حامید»دا سەر دەکەوتین. لەتیف و سەلاح، وەگەڵمان دەکەوتن. سەلاح دەیگوت: ئەمشەو کفتەی خرمان بوو. دوو کفتەیچم پێ بڕیا.. ئێمە بە درێژایی ڕێگای

قوتابخانە، بیرمان لە کفتە خڕەکان دەکردەوە و ئاواتمان بۆ کفتە دەخواست و ئیرەییمان بە سەلاح دەبرد. حەمەساڵەی شیخ موحەمەد، لە چەمەوە سەردەکەوت، شاهۆی مامۆ حەیەر پێمان دەگەیشتەوە، حەمەڕەشیی هۆمەر دەگەیشت. هەموومان پێکەوە، هەندێک پۆشتە و هەندێکیشمان پەڕپووت و جلوبەرگ پیناوی، خۆمان بە حەوشەی قوتابخانەدا، دەکرد.. زەنگی ڕیزبوون لێی دەدا.. ئێمە هەمیشە دەستەسڕمان بیر دەکرد یا خود هەر نەمانبوو، نینۆکمان دریژ و پشتدەستمان چڵکن و قەڵەشاو.. مامۆستا شێخ حەمەتۆفیق، بە ڕاستەکەی دەستییەوە، زیرەی لە پشتدەستمان هەڵدەستاند.. پۆلی سارد و تەزیوی دەرسخوێندن.. مامۆستا «کەمال کوردە»، ئەو مامۆستایەی هێندەی چوار زەلامان دەبوو، بە زەبری تف و مشتەکۆڵە، ڕێزمانی کوردیی فێر دەکردین.. مامۆستاحاجی، دە فلسی لە هەر قوتابییەک دەسەند کە ڕۆژی پێشوو، لە مزگەوت نەبوو بێت و لە پشتی خۆیەوە، نوێژی بە جەماعەت نەکردبێت. ئێمە نە نوێژمان کردبوو، نە دەفلسەکەیشمان پێ بوو، ئیدی دەستەکانمان لەژێر داردا دەیانزیڕاند.. چەند گوناه بوون دەستەکانمان!

بە بەردەم گوندی «گردەنازێ»دا ڕەت دەبین. ئەمبولانسێک بە خێراییەکی زۆرەوە بەرەو ڕوومان دەیناژوویت. ئەمە ڕەنگە هەمان ئەمبولانس بێت کە سێ ساڵ پێش ئەم چرکەساتە و لە ڕۆژێکی مانگی یونیی١٩٨١دا، بە خێراییەکی زیاترەوە، بە بەردەم ئەم گوندەدا تێپەڕیبێت.. گەنجێکی گەنمڕەنگی چاووبرۆ قەترانیی جەستە لە خوێنشەلاڵ، لەوێدا ڕاکشێنراوە، دەستەکانی بە کەلەپچە، بە لێواری ئەو تەختەی لەسەری کەوتووە، شەتەک دراون. دوو جاش و دوو سەربازی هێزی تایبەت، لە چواردەوری دانیشتوون و ئێشکی دەگرن. گەنجی ئەنگێوراوی دیل، لە نێوانی ئاگایی و زیندەخەوندا، وێنەکانی چەند ڕۆژ پێشتر، وێنا دەکاتەوە.. فەرماندەی مەفرەزەکە دەڵێ: تەنیا چوار پێشمەرگە، هێمن تۆ.. سیانی دیکەش، «جیایان دەکاتەوە«.. دەچینە هەڵەبجە.. ئەم ئێوارە بەڕێ دەکەوین، خۆتان ساز دەن، نان هەڵگرن و مەتارەکانتان پڕئاو بکەن.. وێنەکان، هەندێکجار ڕوون و ناوناوەش تەڵخ و تاریک، لە هزری «هێمن»دا بە یەکدا دێن.. هێمن لە پێشەوە، ماسوولکەکانی پتەو مینا ماسوولکەی جەستەی پڵنگ، چاوەکانی تیژ و دووربین، دڵی بەهێز و لێوانلێو لە خۆشەویستیی خاک و خەڵک، لە دامێنی باڵانبۆوە، دادەگەڕێن و بەرەو «کوڵەبۆز» و «کانیشێخ»، بە وریایی پێشمەرگەوە دەڕۆن.

قسنەکەی کانیشێخ، دەبێتە ئەو دۆزەخەی خودا لە قورئاندا باسی لێوە دەکات. چەکەکان، گڕ دەبارێنن و باڵای ئەم پڵنگانە گڕ دەدەن. هێمن، هەست دەکات هەردوو لاقی سڕن و هەڵی ناگرن. هاوڕێکانی لەژێر ئاگربارانەا، پاشەکشە دەکەن و جەستەی «هێمن»یان، پێ دەرباز ناکرێت.

جاشەکان نزیک دەبنەوە. هێمن، هاوار دەکات. تەقە مەکەن! خۆم وەدەستەوە دەدەم.. جاشان دێنە پێشێ. هێمن، فیشەکی پێ نەماوە، دەست بۆ نارنجۆکەکەی دەبات. ئەڵقەکەی ڕادەکێشێ و هەوای دەدات.

گڕی نارنجۆک، عەرشی ئاسمان دەلەرزێنێ. « بژی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان!» هێمن، هاوار دەکات و هاواری پڕ لە ورەی ئەو، عالەمێک بە خەبەر دێنێ. سەرلەنوێ، گوللەی مەرگ دەبارێن. هێمن، هەست دەکات، جەستەی بێهەست و بەنج بووە.. هێمن لەخۆ دەچێت.. چاوی ڕەشکەوپێشکە دەکات.. ساپیتەی ژوورەکە، دەسووڕێت.. دکتۆر و برینپێچەکان دەناسێتەوە.. نەخۆشخانەی هەڵەبجەیە.. ڕەشەی ساڵحەی سەرەکجاش و بەڕێوەبەری ئاسایش، دەیانەوێت، قسەی لێ دەربهێنن..هیچ نابیستم، وەرنە پێشتر.. نزیکتر دەبنەوە... هێمن، ناوچاوییان بە تف سواخ دەدات.. هێمن، ئیدی کەڕ و لاڵە، نە هیچ دەبیستێ و نە قسان دەکات!

ئێستا، لەم ئەمبولانسەدا، بە دەستشەتەکدراوی، ڕاکشاوە.

لەژێر ئەم ڕیزەدارچنارە شۆخ و بەڕەونەقەدا، لە نێو ئاودرێکی بالآزەلامدا، لە پشت تووترکە چڕ و شەخەڵەکانەوە، کە پەڵەگوڵەبەرۆژەیەکی هێشتا گوڵنەگرتوو، لە جادەکەیان جیا دەکاتەوە، لوولەی چەند چەکێک چاوەڕێی ئەم ئەمبولانسە دەکەن. فەرماندەکەیان دەڵێت: ئامادە بن! باش سێرە لە تایەکانی بگرن.. تەنها تایەکان و بەس.. ئەمبولانس، وەک ئەوەی سووسەی ئەمانی کردبێت، بە خێرایی گوللە تێدەپەڕێت و ئاگری چەکی هاوڕێکانی هێمن، ئاگرپرژێنی دەکەن.. دەک دەستمان بشکێ، ئەرێوەڵا! فەرماندەکەیان وای گوت. هێمن، هەستی بە چزەی گوللەیەک لە جەستەیدا کرد.. بزەیەک وەسەر لێوانی کەوت و لەبەر خۆیەوە گوتی: چ خەم! با «دە»ش لە بانی «نۆ» بێت.

هێمن، لە نەخۆشخانەی سەربازیی سلێمانی، لە خواردن مان دەگرێت و پاش چەند ڕۆژان، لە سۆنگەی سەختیی زامەکانی و برسێتیدا، گیان بە هیوا و ئامانجەکانی دەسپێرێت!

مزگەوت جمەی دێ. تازییەکاران، دەستە دەستە، دێن و دەڕۆن. من، بە پێوە و لە ڕیزی لای خوارەوە، لەنێو ئامۆزاکان و کەسوکاردا، وەستاوم. ئامۆزاکان، جارێ لە من لالووتن و وێنەی دەستگیرکردنی دووساڵ پێشتری «مامۆکەمال»یان لە لایەن یەکێتییەوە، لە هەزردا کاڵ نەبووەتەوە!

لە مزگەوت دەردەچم و لەسەر سەکۆی بەردەم دووکانی «عوسمانی مەلاعلی» دەوەستم. دووکانی «جەبار» سەرنجم بۆلای خۆی کێش دەکات.

جەبار، لە نێوەندی دووکانەکەیدا وەستاوە و منداڵان، یەک و دوو، دێن و شیرینی دەکڕن. جەبار دەیگوت: هەرکەسێک لە پۆلی سێی ناوەندی دەربچێت، ئیدی هەتا دەبێتە «مامۆستا»، من لێرە، لەم دەفتەرەدا، لاپەڕەیەکی بۆ دەکەمەوە و دەتوانێت بە قەرز شت ببات و پاشان کە بوویە مامۆستا، قەرزەکانم بداتەوە! ئەو لاپەڕەیە، تا چەند ساڵیش هەر دەما و سپی نەدەبوویەوە. کەبابخانەکە ئەماوە.. مامۆکەمال، دوو چارەکەدینار دەداتە من و شێخەعلی.. دوو نەفەر کەباب ئاوا دەکەین و بە ئیشتیبایەکی بێوێنەوە، بە سماق و توورەوە، نۆشیان دەکەین.. من دەمەوێت، دەست و دەمم بشۆم..

شێخەلی، دەستم دەگرێت و دەڵێت: با دەستمان نەشۆین.. با بۆن و تامی کەبابەکە، ماوەیەک بمێنێتەوە، ئاخر ئێمە مانگی چەند جار دەتوانین کەباب بخۆین؟ قسەکەی ڕاست بوو، منیش وەهام کرد!

لە دووکانەکان دەڕوانم.. دووکانی ئەوڕەحمانی ڕەزییە، ڕەشەی بابە، مەلاعەلی، قەسابخانەکەی شێخ جەلال و ئەولاتر دووکانی حاجی حەمەساڵەحی عارف و پاشتر حاجی حەمەتۆفیقی برای.. لەوسەری پردەکەی بەردەم کانیی ژنانەوە، دووکانی حاجی حەمەساڵەی سۆفی بوو. ئەم گوندەی ئێمە، شارەدێیەک بوو، بڕوا بکەن.شارۆچکەیەک بوو بۆ خۆی.. دە تا دوانزە دووکان. دوو چاخانە. دوو سەرتاشخانە، گەرماوێکی ئێجگار گەورە و جوان.. شەوانی ڕەمەزان و دۆمینە و «بیستویەک» و هەڵاوبگرەی خەپە، ڕەحیم، مەحمودی سەید قادر، شێخ حوسەینی مامۆ حەسەن، کەمالی ئەحمەدی خەرامان، فوئادی لالۆ ئەنوەر و قادری مام ڕەمەزان.. چاخانەکە، بە دووبەش دابەش کرابوو.. بەشی خوارەوەی، تایبەتی شێخان بوو، بەشەکەی دیکەی، جێگای دانیشتنی چینی خوارەوەی گوند بوو. گاڵتە و جەفەنگ و تەشقەڵەکردن بە مامۆڕەمەزانی پیر و بەگۆڵمەزڕاهاتوو، تا پارشێوان، درێژەیان هەبوو.

پردی خوارەوە، «سەرحەوز» و دووکانەکان بە بەری ئەوبەرەوە دەبەستێتەوە.. لەسەر ئەم پردە، جەنگی مەغلوبە ڕووی دا.. من، چوار پێنج ساڵان بووم.. زۆرینەی خەڵکی ئاوایی و هەندەک ماڵەشێخانیش، بەرەی حیزبی شیوعی بوون. شیوعییەکان، هەر ڕۆژی پێشتر، کوتەک و تەیاخیان ساز کردبوون و لە دووکانەکاندا ئامادەیان کردبوون.. تەلاری «نەقابە« پڕ کرابوو لە خرکەبەرد. جەنگ بەرپا بوو.. خەڵکی گوند لە گژ یەکدی ڕاچوون.. تێڵا و کوتەکی پێشوەخت ئامادەکراو، لە دووکانەکان دەرهێنران.. لە سەربانی نەقابەوە، «سەرحەوز» بەردەباران کرا.. پاچ و چەقۆ و مقەست بوونە ئامرازی شەڕ.. دەست و سەر شکان، گوێچکە بڕدران.. ژنان، هێزی بزێوی شەڕەکە بوون.. ئەختەرخانی ژنی مامۆ حەیدەر و باجی عاسمی ژنی سەیدقادر، گاڵەیان کرد.. ئەم باجی عاسمە، پیاوێک بوو بۆ خۆی، بە شەرواڵ و دەمانچەوە، چەندجارم بینیبوو.. دایکم و ژنانی دیکە، چواردەوری مامۆشێخ کەمالیان گرتبوو، دەیانویست دەمانچەکەی لێ بسەنن تا قەتڵێ نەکات.. دەمانچەکەیان لێ سەند.. مامۆشێخ کەمال، خۆی گەیاندە تەلارەکەی خۆی و ماڵی شیوعییەکانی دایە بەر گوللەی برنەو.. قیامەت هەستا.. پۆلیس، لە هەڵەبجەوە گەیشتن. ژنانی شیوعی، پۆلیسیان بەردباران کرد و سەری چەند پۆلیس، خوێناوی بوون.. ئێمەی منداڵ، دەگریاین و دەمانزووڕاند. دواجار، دۆخەکە کۆنترۆڵ کرا.. وێنەی مامۆحەیدەر کە سەروچاوی پێچرابوو و بە سواری ئەسپێکەوە، بۆ هەڵەبجەیان دەبرد، لە زەینمدا کاڵ نەبووەتەوە!

ئێوارە، تازییە چۆڵ کرا و بۆ ماڵی مامۆکەمال سەرکەوتین. ساتێ لە مزگەوت وەدەر کەوتین، نیگایەکم لە باخەکەی مامۆقادر گرت. من و شێخعەلی، لەم باخەدا گەورە بووین و تەمەنی منداڵیی خۆمانمان، لێرەدا تێپەڕاند. بەهاران، لەنێو گژوگیا و گوڵاڵەسوورەی تا کەمەر هاتوو، ڕاکەڕاکەمان کرد، گوڵمان چنین، تۆڵەکە و گۆزروانە و ترشۆکەمان هەڵکەندن و مامۆژن «توبا»، بۆمانی سوورکردنەوە. هاوینان، لەژێر دارهەنجیرەڕەشەکەی پشت کانییەکەی «باخچە»، خۆڵەپەتێ و حەمامۆڵکێمان کردن. هەنارمان ڕنین، هەناری «مەلەسی» و «حەمەساڵەخانی»مان کۆوەکردن و لە گێونیمان نان، هەناری ترشمان داکوتین و بە دیار مەنجەڵی وەقوڵپەکەوتووی ڕووبەهنارەوە، کورکەمان کرد. لەسەر هەنجیر و هەڵووژە وەشەڕ هاتین، یەکیمان گەوزاند و هەر زووش ئاشت بووینەوە. پاییزان، وەک قەلەموون، لەسەر پشتی «پیکاب»ی لە هەناربارکراو، سوار بووین و ڕۆشتینە سلێمانی و لە گەراجی «ئەسحابەسپی»، پاش فرۆشتنی فەردەهەنارەکان، نان و کەبابێکی خۆشمان خوارد. وای شێخعەلی! ئێستا تۆ لە یادەوەرییەکانی مندا، هەموو سەردەمەکانت بەزاندوون و لە ترۆپکی جوانیی خۆتدا، دەمدوێنی.

بە دوو پلە، بۆ سەرپردەکە سەردەکەوین. لای چەپی ئەم پردە، کانیی ژنان و لەسەر بانی کانییش، ماڵی بابەگەورە، هەمان ماڵێک کە من شەش ساڵ پێشتر و لەژێر تریفەی مانگی هاوینەشەوێکدا، بە پسکەپسک، سەرکەوتمە سەربان و بە ڕووخساری فریشتەئاسای دایکم، شاد بووم.

ئاوڕێک لە لای ڕاستی پردەکە دەدەمەوە، ئاوی کانییەکە، بە هەمان گوڕ و لرفەی جارانییەوە، سەرەوخوار بازرە دەبێ و لە بەردە گەورە سەوز و سوورەکانی بناغە و بنچینەی گەرماوەکە هەڵدەپژێ.. ئەم نیوەدیوارە لە قسڵ و بەرد دروستکراوە چەندساڵان خۆڕاگرەی بەر زەبری لافاو کە کەڵەوەکێشی لەگەڵ زەمەندا دەکات، کانیی یادەوەرییەکان دەتەقێنن و وێنە ڕەنگینەکانی منداڵیی من، لە هەزرمدا زیندوو دەکەونەوە. وێنەکان، پاڵپاڵێن دەکەن و ئەم وێنە، لە دوای ئەوی دی، خۆی دەناسێنێتەوە..

دایکم، بوخچەیەکی سورمەی گوڵگوڵیی لە بنهەنگڵ ناوە، من بە هەنگاوی منداڵانەی خۆمەوە، لە دوی دەڕۆم. گەرماوەکە، لە ژن ژاوەی دێ و جوڕنەیەکی بەتاڵ بۆ ئێمە نەماوەتەوە.. دایکم، جلەکانم لەبەر دادەکەنێت و خۆیشی هەروا دەکات.. لە سەکۆی ژووری ساردەوە، دادەبەزین و چەند هەنگاوێک، ئیدی هەڵم و هاڵاو، بۆنی سابون و ئارەقە، دەنگ و هەرای ژنان لە خۆیانمان دەپێچن و دەچینە نێو دنیای پڕ نهێنییەکانی حەمامی ژنان.. تەختی حەمامەکە، بەردڕێژە، ساف و لووس وەک شووشە، گەرم وەکو پەنگر. بەردە داخبووەکان، زیرە لە ژێرپێم هەڵدەستێنن.. لەگەڵ باجی نەفییەدا، دەبینە هاوجوڕنە.. جوڕنەکان، لەسەر هێڵێکی بازنەیی دابەش بوونە، لە بەردەم هەر دانەیەکیشیان، زیاتر

لە ژنێک دانیشتوون و منداڵێک یان زیاتریان لە ئامێزی خۆیاندا دانیشاندووە و بەلفکە و سابوون خەریکیانن. بەلوعەکان، تەنها ئاوی گەرم دەڕژێننە نێو جووړنەکان و بۆ ئاوی سارد، ژنان بە سەتڵ، ئاو لە ئەنباری ساردەوە دێنن. سەر و ڕووخسارم، کەف دایاندەپۆشێت و چاوەکانم دەکزێنەوە و بە دەستانم دەیانپروێنم. ژنەکان، بە نێو گەرماوەکەدا دێن و دەچن و لەشولاری ڕووتیان، لە نێوانی پەنجەکانمەوە، شەپۆل دەدەن و لە قووڵایی هزرمدا دەخەون. ژنەکان، بە جەستەی ڕەنگاوڕەنگیانەوە، بە باڵای کەڵەگەت و مامناوەندی و چکۆلەیانەوە، بە مەمکۆڵەی تازەخۆگرتوو، توند وەکو بەرد، یاخود پێگەیشتووی بە شێوەی هەنار و هەندێکیش سیس و داچەکیو بە وێنەی لفکەکانی دەستیان. ژنان، دەجووڵێن و شۆخەکانیان، جامۆڵکەیەکیان بە نێوڕانیانەوە گرتووە.. ئەم وێنانە، دەیان پرسیاری شەرمێون لە هزری منداڵانەی مندا دەخەوێنن و تەنها تەمەنی پاشتر و لە شوێن و زەمەنی جیاتردا، وەرامەکانیان لە خەو ڕا دەبن!

لە دیوەخانی مامەشێخ کەمال دادەنیشین. ئێستا دووساڵێک دەبێ، مامەشێخ کەمال بە ڕەحمەت چووە. پوورەفاتمە، وەکو جێنیشین و گەورەی بنەماڵە، لەسەر کورسییەکەی مامەکەمال دانیشتووە و ئێمەش لەسەر کورسی یاخود لەسەر مافوور، لە دیوەخانین..

لە پەنجەرەی دیوەخانەوە، لە سەکۆ و حەوزەکە دەڕوانم.. تیشکی گڵۆپەکان، لەسەر سینگی حەوزەکە چینە دەکەن و چەپکەتیشکێک بە ڕەنگی پەلکەزێڕینە، بەرەو نیگاکانی من بەرەواژ دەبنەوە و لەگەڵ ڕەنگی ئاڵتوونیی گەڵاکاندا ئاوێتە دەبن.. مامۆکەمال، لەسەر کورسییەکەی و لە کەناری حەوزەکە دانیشتووە.. ئێمە دێین و سڵاوی لێ دەکەین.. مامۆستا شاهۆ و پێشمەرگەیەک و من، دادەنیشین و پێشمەرگەکانی دیکەش، لە دەوری تەلار دابەش دەکەین..

_ من، لە سەرکردایەتی بووم.. مامجەلال، سڵاوی لێ دەکردیت، گلەییشی هەبوو.. ئەو، چاوەڕێی هاوکاریی زیاتری ئێوە دەکات.. ڕاپۆرتەکان لەسەر ئێوە و هەڵویستی ئێوە لە ئاست پێشمەرگەکانی یەکێتی، باش ناڵێن و باش نانووسرێن!

_ من، دریغیم نەکردووە.. ئێوە خۆتان باش دەزانن.. هەندەک لە مەسئول و پێشمەرگەکانی ئێوە، بیر لە وەزعی ئێمە ناکەنەوە.. ئەوان، بە ڕۆژی نیوەڕۆ دێنە نێو دێ.. ئاخر ئێوە دەتانەوێت حکومەت، ئەم ئاواییە وێران بکات.. منیش قەڵس دەبم و قسە دەکەم.. هەندەک لە خەڵکی ئاوایی، کۆنەقینیان هەیە و لە ڕێگای ئێوەوە جێبەجێی دەکەن و گێچەڵ بۆ من دەنێنەوە.. ئێوە بە قسەی مناڵومەزم دەکەن!

ئەوشەوە، قسەوباسمان زۆر کردن. مامۆکەمال زوێر بوو، من نیگەرانتر بووم و لە ناخەوە، بەو جۆرە گفتوگۆیە کە بە ناچاری، لەگەڵ مامدا دەمکرد، بێتاقەت بووم.

ڕۆژی دواتر، ماڵئاوایی دەکەین، عەبابەیلێ جێ دەهێڵین و بەرەو سووریاش دەگەڕێینەوە.

## «کانیتوو»،
## بنکەیەک بۆ دەسگای رۆشنبیری و دەستپێکێک بۆ ئاشنابوونی نووسین

رێگایەک، لە پشتی شارۆچکەی «دووکان»ەوە، بەلای راستدا، بە بالآی زیدەکەڵەگەتی چیایەکدا سەردەکەوێت و لە سەر پانتایی دووندی چیاکە، ماوەیەک بە نێو زناراندا، پێچاوپێچ دەکشێ و پاشان بەرەو دۆڵێکی ئێجگار قووڵ دادەکشێ. لەسەر دووندی قەرەسەرد، رابوەستە و تا چاو هەتەر بکات هەڵروانە، بە ئاقارێکدا، هەموو ولآتی کۆیە و بە لایەکی دیکەدا، هەموو بەهەشتی پشدەر و بەولاتردا، دۆڵی جافەتی و دوورتریش مەلبەندی سلێمانیت لێوە دیارە. بەعس، وەکو خودای زەمانە، دەستی بە ئێرەش را گەیشتووە و چەندین رەبایەی هەڵتۆقاندووە.

ئێمە، کەریم عوسمان، کامەرانی برای، ئاسۆرەحیم، من و چەند پێشمەرگەی دیکە، لە پیکابێکی دووکابینەدا، بە بالآی چیاکەدا، شۆڕدەبینەوە و بە مەبەستی گەیشتن بە کانیتوو و سازدانی بنکە و بارەگای دەسگای رۆشنبیریی کۆمەڵە، بە رێوەین. ئازادهەورامی و پێشمەرگەکان، پێشتر گەیشتوون. خەسرەوخاڵ و رێکەوت عوسمان و کادرەکانی تر، پاشتر دەگەن.

ئەم رێگایە، بە نێوشارۆچکەی «بنگرد»دا تێدەپەڕێت و دەکاتە شارەدێی «مەرگە».

مەرگە، گوندێکی دێرین و سەوز و ئاودار، لە بناری چیای «ئاسۆس»دا هەڵکەوتووە و شەڕ لە گەڵ شەنگیی خۆیدا دەکات.

مەرگە، چەند بنکە و بارەگای یەکێتیی لێ دامەزراون. جادەکە، پێچاوپێچ بە دۆڵی «مەرگە»دا، بە نێو چرگەن و رەزاندا، بەرەو «ئاوەژێ» هەڵدەکشێ. نەوشیروان مستەفا، لەمێژە، بارەگا و ماڵی خۆی لێرە داناون. کەمێ ژوورتر لە ئاوەژێ، دەسگای دارایی یەکێتیی لێ چێ کراوە و پاشتریش «سێروانە»، دەبێتە هەواری مامجەلال و مەکتەبی عەسکەری.

لە چەند مانگێکدا و لە ئاهومێدیی مفاوەزاتدا، ئەم دۆڵە دەبێتە سەنتەری رێبەریکردنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.

جادەکە، لە نێو رەز و باخانی کانیتوودا، خۆی بە سەختیی گاشەبەردەکانی بناری ئاسۆسدا دەکێشێت و دەکوژێتەوە!

لە دواهەواری بناردا و لە نێو رەز و باخاندا، لە ئامێزی ئاسۆسدا، خانوومان بۆ ماڵ و بارەگا چێ کردن. بارەگای دەسگای رۆشنبیری، ماڵی ئازادهەورامی لە تەنیشتییەوە، ئەولاتر هۆڵێکی گەورە و چەند ژوور بۆ خولی پێگەیاندنی کادرانی کۆمەڵە و حەوانەوەی پێشمەرگە، میوانخانە، توالێت و

گەرماو، سەرووتر چەند ژوورێک بۆ ئەو کادرانەی خێزاندار بوون. لە ماوەیەکی کەمدا، کۆمەڵگەیەکی گچکەمان بنیات نا بوو.
ئەرکی دەسگای ڕۆشنبیریی کۆمەڵە، ئامادەکردن و چاپکردنی گۆڤاری «کۆمەڵە» و نووسین و وەرگێڕانی بابەتی تیوری بوو. لەمەڕ ئەو مەسەلانەی لەگەڵ شۆڕش وشۆڕشگێڕی، پەیوەندیان هەبوو. پاشتریش سازدانی خولێک بۆ بەرزکردنەوەی توانستی تیوریانەی کادرانی کۆمەڵە کە لە سەرجەمی بەشەکانی ڕێکخستن، لە ناوچە جیاکانەوە دەهاتن و مانگێکی دەخایاند.
سەرکردە و کادرە باڵاکانی کۆمەڵە، لە بوار و بابەتی جیادا، دەرسیان دەوتنەوە. لەوانیش، ئەوشیروان مستەفا، مامجەلال، ئازادهەورامی، حەمەتۆفیق، فەرەیدون عەبدولقدر، کاکەئەمین، ڕێکەوت عوسمان، خەسرەوخاڵ، من و کەسانی دیکەش. من، بە چەند بەش، مێژووی بزووتنەوەی نێونەتەوەیی کرێکارانم، لەو خولەی پەروەردەکردنی کادرانی کۆمەڵەدا، بە کادرەکان گوتەوە.
من، بۆ یەکەمجار، نامیلکەیەکم لەمەڕ «بزووتنەوەی کرێکاری و ڕیڤیژینزم» نووسی و وەکو پاشکۆی گۆڤاری کۆمەڵە بڵاوکرایەوە. پاشتر لەگەڵ کاری وەرگێڕان خەریک بووم. ئەو زستانەمان لە «کانییتوو» بەڕێ کرد. سەرەتای ساڵی ١٩٨٥، ئیدی گوریسی مفاوەزات دەهات ڕێڕێ دەبوو. بەرەو پسان دەڕۆیشت. لە هەندەک ناوچەدا، وردەشەڕ دەستی پێ کرد و کوشتنی مامەڕیشەی بە دوادا هات. هێزەکانی یەکێتی، لە شەڕێکی کتوپڕ و بەرنامەڕێژکراودا، هەموو بەرزاییەکانی «چەرماوەند» و سەربازگەی «شەدەڵ»ەی پاککردنەوە. دۆڵی مەرگە و بناری ئاسۆس، ئامانجی تۆپبارانی سەختی هێزەکانی دەوڵەت بوو. ئێمە، بۆ خۆپاراستن، سەنگەر و حەشارگەمان درووست کردن و دکتۆرخەسرەوخاڵ، هەر کون و حەشارگەیەکی بەناوی کادرێکەوە ناو دەنا. بەتایبەت ئەوانەی کە کەمێک دابوێر بوون و شەوانەش کونەکانی خۆیان جێ نەدەهێشت!
سەرەتای ئەو ساڵە، لە تۆپبارانێکدا، «حەمەی فەرەج»ی هەڵەبجەیی کە تێکۆشەرێکی دێرینی بزووتنەوەی چەکداریی کورد بوو، بریندار بوو، دکتۆرەکان بە ئامێری زۆر سەرەتایی، لە نێو باخەکانی کانیتودا لاقێکیان بڕییەوە و من شاهێدی پرۆسەی ژاننامێزی ئەو نەشتەرگەرییە بووم. شێرکۆ بێکەس، پاشتر، شیعرێکی بە ناوی «گۆرەوی» بۆ ئەو لاق لەدەستدانەی حەمەی فەرەج نووسی.
شەڕ گەرم دەبێ، تیشکی مفاوەزات، وێڕای ئەوەی پراوپڕە لە بێهیوایی، جارێ دووزەیەکی دێ. بەشێکی ئەو کادر و پێشمەرگانەی کە هیوایەکی گەورەیان لەسەر مفاوەزات هەڵچنیبوو، لێرە و لەوێ، بە پۆل دەگەڕانەوە لای بەعس و هەندێکیشیان، هەر بەو گوڕ و تینەی شاخ و پێشمەرگەیتی، لە سەنگەری بەعسەوە، دژایەتیی شۆڕشیان دەکرد. هەر ئەو ڕۆژگارانە، هەندێک لە کادرانی ڕەوتی ئێمە

کە ململانێی نێو کۆمەڵە ماندووی کردبوون و ئاسۆیەکیان بۆ چارەسەری کێشەکان نەدەبینییەوە، لە ڕەشبینی و بێهیواییدا، لە ڕێگەی ئێرانەوە، ڕوویان لە ئەورووپا کرد.
یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە قەیرانێکی قوڵدا دەژیێ، مفاوەزات هیچی لێ سەوز نابێت، پەیوەندییەکان لەگەڵ ئێران و سوریادا، خراپن، پرۆژەی ئاشتبونەوەی گشتی لەگەڵ «جود» بە ئاکامێک نەگەیشتووە، نێوخۆی یەکێتی «بە تایبەت لە نێو ڕێکخستنی کۆمەڵەدا» شپرز و ئاڵۆزە، کادرانی کۆمەڵەی ناڕازی لە سیاسەتەکانی کۆمەڵە و یەکێتی، سەرکۆنە و سەرکەوت دەکرێن، تەنگیان پێ هەڵدەچنن، ئازوگوێزیان پێ دەکەن، هەڵیاندەسپێرن و بنچاویان دەخەن، زویریان دەکەن و دەیانەڕەنجێنن!
کادرانی کەرت و پۆلەکان، کادرە عەسکەرییەکان، نامە بۆ ئێمە دەنووسن، دێنە بارەگاکانمان، سکاڵا دەکەن و داوای ڕێنمایی دەکەن.
کۆمەڵە و یەکێتی، لەو تەنگژەیەدا، لەبری ئەوەی لە هەوڵی جێبەجێکردنی سیاسەتێکی ئەقڵانیدا بن بۆ یەکخستنەوەی ڕیزەکانی کۆمەڵە و بە ئەقڵ و لۆژیکێک کار بکەن کە کێشەکانی نێوخۆ چارەسەر بکەن، بە ئاڕاستەی نواندنی زەبرێکی دوولانەدا هەڵدەسووڕان، زەبرێک دژ بە هێزەکانی دەوڵەت کە هەم بەعس بە مفاوەزاتێکی بەرهەمدار ناچار بکات و هەمیش بە جود و ئێرانی نیشان بدات کە هێشتا یەکێتی خاوەنی هەمان هێز و توانستی پێش مفاوەزاتە. ئاڕاستەیەکی دیکەی ئەم سیاسەتە زەبرئامێزە، ڕووی لە پاکسازیی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بوو لە هەر ڕەگەز و دەنگێک کە لە دەرەوەی سیاسەتی ڕەسمیی کۆمەڵەی پاش کۆنفرەنسی سێ بوون.

مەحمودی حاجی فەرەج، سەرتیپێکی جوامێر و بزێوی یەکێتییە لە ناوچەی هەڵەبجە. ئەو، پاش تێپەڕاندنی کێشە و قەیرانێک لەگەڵ یەکێتی و زیندانیکردنی لەلایەن جەبار فەرمانەوە، ئەمشەو لە کانیتوو میوانی ئێمەیە و بڕیارە لەگەڵ ئەو هێزە گەورەیەی کە ئەوشیروان ڕێبەرایەتیی دەکات، بچێتە دەڤەری هەولێر و خۆشناوەتی.
مەحمود، سکاڵا دەکات و زووخاوی کێشە و ململانێکان هەڵدەڕێژێت..
_ ئێوە هیچتان لەدەست نایەت و ناتوانن هیچ بگۆڕن! من لەمە زیاتر خۆم پێ ڕاناگیرێت! من کە لەم سەفەرە دێمەوە، دەبێت ئێوە هەمووشتێکتان یەکلا کردبێتەوە!
_ کێ دەڵێت تۆ لەم سەفەرە دەگەڕێیتەوە؟
_ با.. دەگەڕێمەوە.. ئەو گوللەیەی بڕیارە من بکوژێت، جارێ درووست نەکراوە! ئێوە شتێک بکەن و من ناوچەی هەڵەبجە کۆنترۆڵ دەکەم. ئێوە نازانن من چیم بە کاک ئەوشیروان وت!

_ لە کوێ؟ چیت گوت؟
_ لە کۆبوونەوەکەی «گوڵان»، ئەو هەواڵی جموجوڵ و کارەکانی ئێوەی پرسی..
_ ئێ..
_ جەلال کولکنی، گوتی ئەو برادەرانە، فیکری ئێراقچی بڵاودەکەنەوە. پێشمەرگە دەروخێنن! ئەگەر تۆ فەرمان بدەیت، من هەموویان چەک دەکەم! منیش گوتم: ئەوانە جگە لەوەی هاورێی منن، باشترین کادرەکانی کۆمەڵەن، هەتا من بمێنم، پیاو نییە ئەو کادرانە چەک بکات!
_ کاک مەحمود! کێشەکە کوشتن و چەککردن نییە.. ئێمە کێشەی فیکری و سیاسییمان هەیە و دەبێت پشوومان درێژ بێت.
_ من کێشەی فیکر و سیاسەت نازانم.. من قبووڵ ناکەم ئەوی ئێمە خوێنمان بۆ رژتووە و بۆی ماندوو بووین، خەڵکی تر بیخوات! با بگەرێمەوە، ئەوسا دەزانم چی دەکەم!
مەحمود رۆیشت و جارێکی دیکە نەگەڕایەوە. مەحمود، لە شەرێکی گەورەدا، لە ناوچەی خۆشناوەتی، تەنها یەک گوللە نێوچەوانی سمیبوو! پێ دەچێت ئەو گوللەیە بووبێت کە تایبەت بۆ کوشتنی ئەو درووست کرابێت!

# هەوڵێک بۆ لێکگەیشتن

کێشەکانی دەروونی کۆمەڵە دەهاتن ئاڵۆزتر دەبوون، تارماییی ترسێک لەماڵەکانی کۆمەڵە و یەکێتیدا دەرکەوتبوو. تا دۆخی ڕێکخستنەکان گرژتر دەبوو، هەوڵ و چالاکییەکانی ئێمەش بۆ مقاوەمەتی فەزای پڕ لە فەوزای ئەو دۆخەی سەرکردایەتیی نوێی کۆمەڵە دەیخولقاند، دەچوونە سەرێ.
ئازاد هەورامی و ملازم عومەر، هەمیشە سەرگەرمی وتووێژ بوون لەگەڵ نەوشیروان و مامجەلال و لە هەوڵی خاوکردنەوەی گرژییەکان و دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەکدا بوون. ئەوان پێشنیازی ناردنی وەفدێکیان بۆ قەرەداخ، بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ مەلابەختیاردا، بۆ ناوەندی کۆمەڵە و مامجەلال کردبوو.
ئازادهەورامی، حامیدی حاجی خالید، مام ڕۆستەم، وەهاب، م.موحسین و من، ئێوارەیەک چووینە بارەگای نەوشیروان مستەفا لە ناوەژێ و شەومان لەوێ ڕۆژ کردەوە. ئەو شەوە قسەمان لەسەر ڕەوشەکە کرد، هەم گوێمان لە نەوشیروان گرت و هەمیش سەرنج و تێبینییەکانی خۆمانمان باس کردن. ڕۆژی پاشتر، لە ناوەژێوە بەڕێ کەوتین و دوو شەو پاشتر لە جادەی سلێمانی ـ تاسلووجە، بۆ بەری بازییان پەڕینەوە. ئێمە و هێزەکە، گونداوگوند، بەرەو گوندی قازانقایە چاین کە بڕیار بوو مەلابەختیار لەوێ ببینین و قسەوباسی لەگەڵ بکەین.
لە ڕێگادا و لەگەڵ حامید قسەوباسێکی زۆرمان کرد. من، دۆخەکەم لە دیدی خۆمانەوە، بۆ حامید باس کرد و تیشکم خستە سەر کێشە و گرفتەکانی کۆمەڵە و مەترسییەکانی بەردەوامبوونی بارە ئاڵۆزەکە.
حامید گوتی: هەر چییەکی ئێوە دەیڵێن دورووستە و من دەیسەلمێنم، بەڵام تۆ دەزانی وەزعی من چییە. من، کۆشێک ماڵومنداڵ و عەشرەتم هاوە کۆڵۆ، کۆڵێ شەهیدم بۆ یەکێتی داگە! ئەم حەشاماتە بە یەکێتی بەخێو دەکرێت نەک بە ئێوە. ئەو ڕاستی دەکرد. پاش چەندساڵان، ئەم بۆچوونەی حامید، لای من بوویە هێڵکاریی ئەم وێنە شیعرییە:

((لە شەڕی نێوان «با» و پەپوولاندا، من لە سەنگەری «با»دا دەوەستم
با هەموو حەقیقەتەکانیش لەسەر باڵی پەپوولە بن!
ئەی نابینی:
کۆڵی کڵفەت
کۆڵی شەهید
کۆڵی ژن و

کۆڵی دوژمن بە کۆڵمەوەن!))

لە گوندی قازانقایە، لە دیوەخانی ماڵێکی ئاندە و خانەداندا، لەگەڵ مەلابەختیار کۆبووینەوە، چەند کادری کەرتی ڕێکخستنی بازییان، لەوانیش ئاواتی شێخ جەناب ئامادە بوون. قسەوباسەکان درێژەیان کێشا، بەڵام خاڵێک بۆ پێککەیشتن و لێککەیشتن نەبوو. مەلابەختیار داخوازییەکی تایبەتی بۆ گەڕانەوە و دەستبەکاربوونەوە لە کۆمیتەی سەرکردایەتی نەبوو، بەڵام جەختی لەسەر بەردەوامبوونی هەوڵەکان بۆ سڕینەوەی ئەو فەزا ئاڵۆزەی کە ئێمە پێمان وا بوو، باڵی باڵادەستی نێو سەرکردایەتیی کۆمەڵە، بە مەبەست و پلان خولقاندبووی، دەکرد.

دووسێ ڕۆژێک لە بازیان و قەرەداغ ماینەوە و پاشان من لەگەڵ مەفرەزەیەک، بۆ بەسەرکردنەوەی کادرانی ڕەوتەکە و ڕێکخستنەوەیان، بەرەو ناوچەی هەڵەبجە، بە ڕێ کەوتم.

لە هەڵەبجە، بە نهێنی، بەشێک لە کادرەکانم دیتن و قسەوباسمان لەسەر دۆخە نوێیەکە و ئەگەرەکانی داهاتوو کرد.

ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە هەڵەبجە، بەهێز و ئاکتیڤ بوون. هەڵەبجە، هەمیشە لانکەی بزووتنەوەی چەپ و یاخیبوون بووە. لە ساڵی ١٩٦١ و دەستپێکی بزووتنەوەی ئەیلوولدا، یەکێک لە مەفرەزە سەرەکییەکان، بە لێپرسراوێتیی «مامۆستا شێخ حەمەئەمینی شێخ ئەوڵا»، لە دەڤەری هەڵەبجە و چیای شنروێ بوو. ساڵی ١٩٧٦، یەکەمین دەستەی چەکداری کۆمەڵە، بە سەرپەرشتیی «شێخ عەلی»، لە هەڵەبجەوە وەشاخ کەوتن.

## دۆڵی جافەتی،
## بنکەی سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

هاوینی ١٩٨٥، بارەگاکانی سەرکردایەتیی کۆمەڵە و یەکێتی، بەرەودوا. بۆ دۆڵی جافەتییان گواستەوە. دەسگای ناوەندی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیریی کۆمەڵە، لە باخەکانی «هەڵەدن»دا، تاوڵمان هەڵدا و هاوسێی دەسگای ڕێکخستنی کۆمەڵە بووین کە فەرەیدوون عەبدولقادر سەرپەرشتیی دەکرد و ئەندامەکانیشی عومەرفەتاح، حەسن کوێستانی، م.موحسین و دلێری ئەحمەدشوکری بوون. مامجەلال لە یاخسەمەر جێگیر و نەوشیروان لە بەرگەڵوو و دەسگاکانی دیکەش لە نێوان بەرگەڵوو و سەرگەڵوو و یاخسەمەردا، بارەگایان دامەزراندن.

ئەو هاوینە، مەلابەختیار لە قەرەداغ، شێخ عەلی لە گوندی قەمچۆغە و من لە هەڵەدن، سێکوچکەیەکمان بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانمان دروست کردبوو. حەیدەر موحەمەد کە پێشمەرگەیەکی بە تەمەن منداڵی مەفرەزەکەی شێخعەلی بوو، پۆستبەرێکی گورجوگۆڵی نێوانمان بوو. ئازادهەورامی، هەمیشە دەیگوت: ڕۆژێک لەنێوان ئەم مقەڕانەدا، ئەم حەیدەرە بگرن و گیرفانەکانی بپشکنن، هەموو سروترتان ئاشکرا دەبێت و کارەسات دەقەومێ!

ئازاد و من، جگە لە سەرکردە و بنکردەیی، پەیوەندییەکی ڕۆحیمان پێکەوە هەبوو. ئەو پیاوێک بوو، ئەدەکرا هیچشتێکی لێ وەشێریت. ئەو، جگە لە بەرژەوەندیی کۆمەڵە و شۆڕش، بیری لە شتێکی دیکە ئەدەکردەوە.

ساتێ کێشەکان، بەرەو دووڕییانی لێکدابڕان دەبزووان، من لەسەر داوای مەلابەختیار، ئەم دیالۆگەم لەژێر چادرەکەی خۆیدا، لەگەڵ ساز کرد..

ـ کاک ئازاد، تۆ دۆخەکە چۆن دەبینی؟

ـ زۆر خراپ!

ـ منیش دەزانم زۆر خراپە، بەڵام چی بکەین؟

ـ هەرچییەکی بکەین، نابێت بهێڵین کار بەرەو جیابوونەوە بڕوات!

ـ هیچ دەرفەتێکیان بۆ نەهێشتووینەتەوە! تۆ ئاگات لە دۆخی ڕێکخستنەکانە؟ تۆ دەزانیت چی بە هاوڕێکانمان دەکەن؟

ـ بەڵی ئاگام لێیە.. بەڵی دەزانم کارکردن لەم فەزایەدا و لەم سەرکردایەتییەدا زۆر سەختە، بەڵام دیسانیش دووکەرتبوون کارەساتە.. بۆ هەموومان کارەساتە!

_ من خۆیشم بڕوام بەجیابوونەوە نییە و زۆریشی لێ دەترسم.. من هیوادارم کار بەو شوێنە نەگات، بەڵام ئەگەر ناچارکراین و دەرفەتێک نەمایەوە، تۆ هەڵویستت چی دەبێت؟

_ من.. نە لەگەڵ ئێوە دەبم و نە لەگەڵ کەس.. من سەری خۆم هەڵدەگرم و دەڕۆم! ئەزانی بۆ بڕوام بە جیابوونەوە نییە؟

_ نا

_ ئێمە، بە یەککگرتوویی ئەمە حاڵمانە کە هەیە! کۆمەڵە کە کرۆکی یەکێتییە، ببینە! تۆ کێ جیا دەکەیتەوە؟ حیزبی مارکسیی عەیار ٢٤، بەم کەرەستەیە و لە شاخ و لە بزووتنەوەی چەکداریدا، درووست نابێت! تۆ ناتوانیت شتێک لە کۆمەڵە باشتر، بە جیابوونەوە لە کۆمەڵە، درووست بکەیت! جگە لەوە، بۆچی پێت وایە، کارکردن لەگەڵ کاک سالاردا، لە کارکردن لەگەڵ کاک نەوشیرواندا خۆشتر و ئاسانترە! ئەی کاک بەختیار و کاک سالار! ئەوان چۆن پێکەوە هەڵدەکەن و دەسازێن؟ ئێمە وا خەریکە دەساڵێک لەم بزووتنەوەیەدا پڕ دەکەینەوە و تا ئێرەمان هێناوە.. لێگەڕێن با تا کۆتایی بکەیەنین و یەک چارەنووسمان هەبێت! ئەگەر شکستمان خوارد، با هەموو پێکەوە بین. ئەگەریش بە مەنزڵێک گەیشتین و دەستمان لە چەک و شاخ بوویەوە، ئەوسا هەر کەس و حسابێک بۆ خۆی دەکات!

ئێستا، پاشی ٢٤ساڵ لەم گفتوگۆیەی نێوان ئازادهەورامی و من، زۆر ئەستەمە بڵێم: دەبوو چیمان کردبا! بەڵام دەتوانم بڵێم: بۆچوونەکانی ئەو پیاوە وردبین و ژیرە، بەشێکی زۆر لە ڕاستییەکانیان لەخۆ گرتبوون.

# کۆبوونەوەی فراوانی گوندی سێوسێنان

لە ناوەڕاستی هاوینی ١٩٨٥دا، کۆبوونەوەیەکی فراوان و زۆر نهێنمان بۆ بەشێک لە کادرە سەرەکییەکانی ڕەوتەکە، لە گوندی سێوسێنانی قەرەداغ، ساز دا. ئەمە، یەکەمین کۆبوونەوەی ئێمە بوو، بۆ خۆسازدان و شکڵپێگرتنی ڕەوتێکی سیاسی_ فیکری لە نێو کۆمەڵەدا، تا بە شێوازێکی تر و لە ئاستێکی تردا، ململانێکە بەڕێوە ببات و ڕێڕەوێک بۆ ئایندەی ڕەوتەکە بدۆزێتەوە.
کۆبوونەوەکە، بە نهێنی و لە ماڵی عیمادئەحمەددا کە ئەوسات لێپرسراوی کەرتێکی ڕێکخستنی کۆمەڵە بوو لە گەرمیان، بەڕێوە چوو.
مەلابەختیار، شێخعەلی، م.موحسین، ئاسۆعەلی، ڕووناک شێخ جەناب، عیماد ئەحمەد، ئەحمەدنیزامەدین و نوێنەرێکی دەمامکدار لە ڕێکخستنەکانی شارەوە، پشکۆنەجمەدین و ڕەنگە دوو تا سێ کادری دیکەشی لێ بووبن، بەڵام دڵنیام کە ژمارەمان لە ژمارەی پەنجەکانی دوو دەستان تێنەدەپەڕی.
لەو کۆبوونەوەیدا، ئەوەی وەرچەرخانی گرنگ بوو، دانانی کۆمیتەیەک بوو وەکو ئەڵقەی ناوەندی، بۆ سەرپەرشتیکردنی کاروباری ڕەوتەکە و وەکو دەستەیەکیش بۆ نووسین و چاپ و بڵاوکردنەوەی گۆڤارێکی تیوریی تایبەت بە بابەتە فیکری و سیاسییەکان. لە کۆبوونەوەکەدا، لەسەر ناوی گۆڤارەکە ڕێک نەکەوتین، بەڵام کار و بابەتەکانمان دیاری کردن و دابەشمان کردن.
ئەندامانی ئەڵقەی ناوەندی ئەمانە بووین:
مەلابەختیار، م.موحسین، شێخعەلی، پشکۆنەجمەدین و حاجی مەمۆ (کاکەباس کە خۆی نەیتوانیبوو ئامادەی کۆبوونەوەکە ببێت)

لم يعد الصمت ممكنا

چیتر بێدەنگیی مومکن نییە!

ناونیشانی بڵاوکراوەیەکە، م.جەعفەر و سالار عەزیز، وەکو دوو ڕێبەری دیاری ڕەوتەکە و بە هاوکاریی بەشێک لە کادرانی کۆمەڵە، لە دەرەوەی وڵات بڵاوی دەکەنەوە و جاڕی جیابوونەوە لە کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەدەن. ڕاگەیاندنی ئەم بڵاوکراوەیە و نواندنی ئەم هەڵوێستە، لە زەمەنێکدایە، ئێمە لە هەوڵی دۆزینەوەی چارەسەرێکداین بۆ کێشەکان لەنێو تەلاری یەکێتیدا و لە خراپترین حاڵدا، لە هەوڵی ئەوەداین وەکو ڕێکخراوی چوارەم لەنێو یەکێتیدا و بێ ئەوەی ماڵی یەکێتی بەجێ بهێڵین، بە ئامانجێک بگەین.

ئەم بڵاوکراوەیە، ئێمەی تووشی سەرسوڕمان کرد و یەکێتیشی لەبەردەم ترسێکی چاوڕاونکراودا، هێشتەوە. سەرکردایەتیی یەکێتی و کۆمەڵە، وەخۆ کەوتن و بارەکە گرژتر بوو. م. جەعفەر و سالارعەزیز، ماوەیەک پاش ڕاگەیاندنی ئەم هەڵویستە، گەڕانەوە ئێران و لە سنوور نزیک کەوتنەوە.
زمانی تێکستەکە زبر و تێماکەی بۆ یەکێتی، جەرگبڕ بوو. ئەم تێکستە، هەموو ئەو سیاسەتە نەشیاوانەی یەکێتیی بەسەر کردبوونەوە کە لە ساڵانی ڕابردوودا، یەکێتی، جێبەجێی کردبوون. شەڕی نێوخۆ، مفاوەزات، تیرۆری شارەکان، گوماندرووستکردن لەمەڕ شەهیدکردنی کاک ئارام، فەزای تۆقاندنی نێو ڕیزەکانی یەکێتی و کۆمەڵە، ڕەگەزە سەرەکییەکانی ئەم بڵاوکراوەیە بوون.

# ڕووبەڕوو لەگەڵ مامجەلالدا

م. موحسین، دلێری سەیدمەجید و من، ڕۆژانە پێکەوە بووین و هەمیشەش لە چارەنووسی دۆخەکە، قسانمان دەکردن و بیرمان لێ دەکردەوە.
دلێر گوتی: مامجەلال دەیەوێت م.موحسین و تۆ ببینێت و لەمەڕ ئەم دۆخەی ئێستا و کێشەکانی نێو کۆمەڵە و یەکێتی قسەتان لەگەڵ بکات.
لە هەڵەدنەوە و گەیشتینە بەرگەڵوو. مامجەلال لە ماڵی ئەرسەلان بایز بوو کە ئەوسات لێپرسراوی دەسگای ڕاگەیاندنی یەکێتی بوو.
مامجەلال، دلێر، م.موحسین و من، لەژێر خێمەیەکدا دانیشتین. مامجەلال ڕووی پرسیاری لە ئێمەیە..
_ دەتوانن وێنەیەکی ئەم دۆخەم بدەنێ و سەرنجەکانتان لەمەڕ قووڵبوونەوەی کێشەکان باس بکەن؟
م.موحسین و من، بە نۆرە قسەمان کرد و من گوتم:
پێم وایە، هێشتا چارەسەر بۆ کێشەکان هەیە و ئەگەر جەنابتان هەوڵ بدەن و لەگەڵ کاک نەوشیروان قسە بکەن، ڕێگاکان بۆ دەرباز بوون دانەخراون!
مام گوتی: کاک نەوشیروان چی بکات؟
_ کاک نەوشیروان دەتوانێت زۆر شت بکات.. ئەم فەزایەی نێو کۆمەڵە ئاوەڵاتر بکات، دەست لە تەنگپێهەڵچنین و بنچاوخستنی کادرەکان، بە تایبەت لە ناوچەکانی هەولێر، هەڵبگرن و سوکایەتییان پێ نەکەن!
مام گوتی: دووکەرتبوون لە کۆمەڵەدا ڕوو دەدات؟ ئێوە دڵنیام بکەن! دەبێت یان نا؟
من گوتم: پێشمەرگە نەخوێندەوار و عەشایەرەکانی ناو یەکێتی، ساتێ جۆرێک ناهەقییان بەرانبەر دەکرێت یاخود سووکایەتییان پێ دەکرێت، دەچنەوە لای دەوڵەت و دەبن بە جاش. پێشمەرگە و کادرەکانی کۆمەڵە، ساتێ زۆریان بۆ دەهێنرێت، بیر لە جیابوونەوە و دەرچوون لە یەکێتی دەکەنەوە! ئەگەر دۆخی ناوخۆی کۆمەڵە چاک بکرێت، پێم وا نییە جیابوونەوە ڕوو بدات!
مامجەلال گوتی: من هەرچیم پێ بکرێت لەگەڵ کاکەنەوە، دەیکەم و هەوڵ دەدەم چارەسەرێک بدۆزینەوە، بەڵام ئێوە وردتر قسەم بۆ بکەن! ئێستا مامۆستا جەعفەر و کاک ساڵار هاتوونەتەوە ئێران و ئاڵای جیابوونەوەیان هەڵکردووە.. مەلابەختیار، ماڵی گرتووە و لە تەکیە ئاڵای دژایەتیی

هەڵگرتووە.. لە شارەکاندا، ناڕەزایی هەیە و بڵاوکراوەیەک چاپ و بڵاودەکرێتەوە و دێتە نێو ریزەکانی هێزی پێشمەرگەش! پەیوەندیی نێوان ئەمانە چییە و ئەم وەزعە بە کوێ دەگات؟

ئێمە گوتمان:

کاک سالار و مامۆستا جەعفەر، لە دەرەوەن، پەیوەندییان لەگەڵ ئێمە هەیە. بەڵام ئێمە لەگەڵ هەڵوێست و کرداری ئەواندا نین.

لە ڕێکخستنەکانی شاردا، کێشە و ناڕەزایی هەیە و ئەوان بڵاوکراوەکان دەردەکەن. ئێمە دەیانناسین و لە هەوڵی ئەوەداین کۆنترۆڵیان بکەین و بە ئاڕاستەیەکدا بیانبەین، بەرەو جیابوونەوە سەر نەکێشێت. ئێمەش، جەنابتان دەزانن کە کێشەکانمان چین و دەمانەوێت چۆنیان چارەسەر بکەین!

مامجەلال گوتی: ئێوە دڵنیام بکەن کە مەلابەختیار، لەگەڵ کاک سالار و م.جەعفەردا نییە و بۆ جیابوونەوە کار ناکات.. من، مەلابەختیارم پێ گرنگە! دەنا کاک سالار و م.جەعفەر لە دەرەوەن و لە دوورەوە شتێکیان پێ ناکرێت. بەڵام مەلابەختیار لێرەیە. مەلابەختیار دینەمۆیە و ئەگەر بچێتە نێو کارەکەوە، ئەوا زەرەرمان لێ دەدات. ئێوە، مێژوویەکتان لە کۆمەڵە و یەکێتیدا هەیە، تواناتان هەیە و خوێندەوارن.. ئێوە، ئەگەر دەست لەم ململانێیە هەڵگرن، شایستەی سەرکردایەتیی یەکێتین!

مامجەلال، لە مەترسی و ئاڵۆزیی دۆخەکە دەگەیشت. ئێمە دەمانویست وێنەکە پارچەپارچە بکەین و وەهای نیشان بدەین کە گرووپەکان، ئەگەرچی پەیوەندییان پێکەوە هەیە، دیسانیش بیرکردنەوە و ئەدای سیاسییان جیاوازن و یەک بەرنامەیان بۆ چارەسەری کێشەکان نییە. لە ڕاستیشدا هەر وەها بوو.

ئەو سەردەمە، مامجەلال، تازە کاتی بۆ بینینی کادرەکان دانابوو، واتە بۆ ئەوەی مامجەلال ببینیت، دەبوو پێشوەخت کات وەربگریت. ئەو، بە ئێمەی گوت، ئێوە لە هاتنتاندا بۆ لای من، ئازادن و چۆن بۆ بارەگاکانی خۆتان دەڕۆن، ئاواش دەتوانن بۆ لای من بێن.

پاش ئەم کۆبوونەوەیە، هەم ئێمە و هەم برادەرەکانی تریش، لەگەڵ مەلابەختیار پەیوەندییمان گرت و بەڵێنی دا، بێتە سەرکردایەتی و لەگەڵ مامجەلال گفتوگۆ بکات و پاشتر پەیوەندی لەگەڵ سالارعەزیز و م.جەعفەر بگرێت، یاخود سەردانیان بکات.

# ڕژاێتیی بانچەپ

جگە لە جیاوازییەکانی تێڕوانینی ڕەوتی ئێمە، بۆ فیکر و ئەدای سیاسیی کۆمەڵە و یەکێتی، ئەوا لە شارەکانی کوردستانیشدا، شەپۆلێکی بزووتنەوەی چەپ سەری هەڵدابوو. درێژەکێشانی شەڕی ئێران ــ ئێراق و بڵاوبوونەوەی سەدان خوێندەوار، وەکو سەربازی هەڵاتوو لە گوندەکاندا، جموجوڵێکی فیکری و سیاسیی لە نێو هێزی پێشمەرگە و ناوچە ڕزگارکراوەکاندا، خولقاندبوو. ئەم دۆخە، بە یەکانگیربوونی لەگەڵ قەیرانەکانی خودی یەکێتیدا، هێندەی تر، کێشەکانی بۆ یەکێتی و کۆمەڵە خەست دەکردەوە.

ناوەندی کۆمەڵە، بڕیاری دا، زنجیرەنووسینێک لەمەڕ دەرخستنی ماهییەت و ئامانجەکانی بزووتنەوەی چەپ «یاخود بانچەپ، وەک ئەوەی کۆمەڵە دەیبینی»، لە گۆڤاری کۆمەڵەدا، بڵاو بکرێتەوە. چاپ و بڵاوکردنەوەی گۆڤاری کۆمەڵە، ئەرکی دەسگای ناوەندی ڕۆشنبیریی کۆمەڵە بوو کە من لەوێدا ئەندام بووم.

سەرکردە و کادرە خاوەنقەڵەمەکانی کۆمەڵە، لەوانیش ئەوشیروان مستەفا، فەرەیدوون عەبدولقادر، ئازادهەورامی، ئەرسەلان بایز، خەسرەوخاڵ، ڕێکەوت عوسمان و کادرانی دیکەش، وتار و لێکۆڵینەوەیان لەو بوارەدا نووسین و بڵاویان کردنەوە.

مەلابەختیار، بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو وتار و بۆچوونانە، بە نهێنی کتێبێکی نووسی و لەژێر ناوی (ڕژاێتیکردنی بانچەپ یان بزووتنەوەی کۆمۆنیستی؟)دا، بڵاوی کردەوە. ئەم کتێبەی مەلابەختیار، هێندەی تر سەرکردایێتیی باڵادەستی کۆمەڵەی شڵەژان و نیگەرانی کردن!

لە دەسگای ڕۆشنبیریی کۆمەڵەدا، ئێمە کۆمەڵێک کادر بووین، وێڕای جیاوازیی فیکر و بۆچوونمان، وەکو خێزانێک کارمان دەکرد و لە فەزایەکی پڕڕێز و خۆشەویستیدا دەژیاین. ئازادهەورامی، تەنیا ئەندامی ناوەند و لێپرسراوی دەسگا نەبوو، بگرە فریشتەیەک بوو کە بە خەمی هەموومان ڕا دەگەیشت و هاوسەنگیی پەیوەندییەکانی ڕادەگرت. د. خەسرەوخاڵ و من، لە سەرەتادا، لە یەک خێمەدا دەژیاین، پیاوێکی خۆشقسە و دەمبەنوکتە و ڕێزدار بوو. کێی دیکەش لەوێ بوون؟ ڕێکەوت و خێزانەکەی، هەڵکەوت عەبدوڵا و گەلاوێژی هاوسەری، خێزانی شاسواری کە پێکهاتبوون لە سیامەند و مەهدییەی هاوسەری، شنۆی خوشکی کە پاشان دەبێتە هاوسەری ئازادهەورامی و قەدەر تەمەنێکی کورت بە ژیانی هاوسەرییان، ڕەوا دەبینێت! فاروقی شاسواریی براگچکەیان، ئەم خێزانە بەشێکی کاری چاپ و چاپخانە چکۆلەکەی دەسگایان، لە ئەستۆی خۆیان نابوو.. کەریم عوسمان کە ساڵی

پێشتر لە وڵاتی ئەمساوە گەڕابووەوە کوردستان، کامەرانی برای کەریم کە پێشمەرگەیەکی دێرین و جوامێر بوو، وەستا فەرمان و سەربەست هەورامی، خاڵەحەمە کە کەمتەمەن و خاڵی هەمووومان بوو، ئاسۆڕەحیم، هێمن، کرمانج محەمەدنووری تۆفیق، ئامانج، هەڤاڵ، سەلاح شێخ سدیق، سامال، یاسین، بەهادین حاجی بەکر، دکتۆرنەریمان، ئومێد و چەند پێشمەرگەی دیکەش، هەنگاوسا کاریان دەکرد.
لە بارەگای مامجەلاللدا

## ئەزموونی فەلەستینییەکان لەبەرچاو دەگرین!

لە یاخسەمەر، بە نێوقەدی چیاوە و لەسەر کانیناوێکی سازگار، مامجەلال، ماڵ و بارەگای خۆی چێ کردن. م.موحسین و من. چەندجارێک سەرادنی مامجەلالمان کرد و گفتوگۆمان لەمەڕ کێشەکان کرد. لە یەکێک لەو دیدارانەدا، مامجەلال باسی لە ئەزموونی خۆی لە ململانێ و دووکەرتبوونی بزووتنەوەی سیاسیی کوردستاندا کرد و ئەزموونی کارەساتباری نێوەڕاستی شەستەکانی وەکوو نموونە هێنایەوە.. نابێ ئەو ئەزموونە دووپات بێتەوە.. دەبێ هەوڵ بدەین، هیچکەس و گرووپێک، ماڵی یەکێتی بە جێ نەهێڵێت.. چەترەکە فراوان دەکەین و کەڵک لە ئەزموونی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی فەلەستین وەردەگرین.. یەک هێزی پێشمەرگە و چەند ڕێکخراوی سیاسی.. من، بیر لەمە دەکەمەوە!
ئەو بۆچوونەی مامجەلال، ئێمەی دڵخۆش کرد و دەرووبەکی بۆ دەربازبوون لە تەنگژەکە لێ کردینەوە. من، بە نامە ئەم هەڵوێستەی مامجەلالم بە مەلابەختیار گەیاند.
من، پێم وا بوو، ئەمە بۆچوونێکی پراگماتیکیی گونجاو بوو، بەڵام لە زەوینەی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا، چەندە دەکرا بە کردەوە جێبەجێ بکرێت، ئەمەیان جێگای نیگەرانیی ئێمە بوو.
ئێمە، لە دڵەڕاوکێیەکی زۆردا دەژیاین و م.موحسین زیاتر ڕەشبین بوو. دیارە، منیش کەمتر نیگەران و ڕەشبین نەبووم، بەڵام کەسێک بووم، زیاتر لەسەر هەست و سۆز کارم دەکرد، پاشگەزبوونەوە و دەستبەرداربوونی برادەرەکانم پێ قووت نەدەچوو. هیچ شتێک لەوە کارەساتتر نییە، کە دەستپێشخەران و هەڵسووڕاوانی ڕەوتێکی سیاسی، لە دەستپێکی کاردا، دوودڵ و نیگەران بن و بەرچاوڕوونییەکیان نەبێت.
م.موحسین، نەیتوانی چیی تر لە دڵەڕاوکێدا بژیێ و زۆری نەبرد، خۆی ساخ کردەوە و لە ڕەوتەکە و ئەندامێتیی ئەڵقەی ناوەندی، پاشەکشێی کرد! هەندەک لە کادرکان، ئەم هەڵوێستەی ئەویان، بە ترسنۆکی لەقەڵەم دا و پێیان وا بوو، لە چرکەساتی چارەنووسسازدا، جێی هێشتووین. ئازادهەورامی، ملازم عومەر، دلێر و من، لە هەرکەسێکی دیکە زیاتر، لە م.موحسین نزیک بووین و ئاگاداری دۆخی دەروونی و سیاسیی ئەو بووین، بۆیە مەسەلەکە هێندەی سەروکاری لەگەڵ قەناعەتی فیکری و سیاسیی ئەودا هەبوو، هێندە پەیوەندی لەگەڵ ترسنۆکیدا نەبوو!

## مەلابەختیار بۆ ئێران و شێخەلی بۆ هەولێر!

سەرەتای پاییز، مەلابەختیار، گەیشتە دۆڵی جافەتی و پاش گفتوگۆ لەگەڵ مامجەلال و سەرکردایەتیی کۆمەڵە، بڕیاری دابوو، بۆ بینینی سالارعەزیز و م.جەعفەر و ئەو کادرانەی تر کە هەندێکیان لە ئەورپاوە گەڕابوونەوە و هەندێکی تریشیان، لە سۆنگەی چڕبوونەوەی ململانێکاندا، کوردستانیان جێ هێشتبوو، سەفەری ئێران بکات.

شێخەلیش، هەمانکات، بە نهێنی و بە کەڵکوەرگرتن لە پێناسەیەکی ئێراقیی خۆی، بۆ بەسەرکردنەوەی کادرانی ڕەوتەکە، بە هاوکاریی ڕەوف چاوجوان«مامۆستا عادل»، سەفەری هەولێری کردبوو. ڕەوف، یەکێک لە کادرە هەڵسووڕاوەکانی ڕەوتەکە بوو کە لە ڕێکخستنی شاری سلێمانیدا، ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو.

لە سەرگەڵوو، لەگەڵ مەلابەختیاردا و بە ئامادەیی م.موحسین و دلێر، پاشتریش دووقۆڵی، قسەمان کرد و پلانمان وابوو، کە مەلا، هەوڵی جیددی لەگەڵ ئەو برادەرانە بدات تا بگەڕێنەوە ئەورووپا و کێشەکە بەرەو هەڵدێری لێکدابڕان نەبەن و ئێمەش نەخەنە بەردەم هەڵبژاردنی ئەگەری جیابوونەوە.

سەفەری مەلابەختیار، شتێکی لە دۆخەکە نەگۆڕی، دانیشتن و گفتوگۆکانیان، لە سۆنگەی تێگەیشتنی جیاوازیانەوە بۆ بەلاداکەوتنی ململانێکان، بەشوێنێنێک نەگەیشتبوون.

مەلابەختیار گێڕایەوە: زۆرم هەوڵ لەگەڵ دان، مەترسییەکانی دۆخەکە و هەلومەرجەکەم بۆ باس کردن و ڕا و بۆچوونی کادرەکانی ئێرەشم پێ گەیاندن.. گوتم، هێشتا دەرفەتی چارەسەر لە نێو تەلاری یەکێتیدا ماوە، ئەگەر جیاببینەوە، ڕاستەوخۆ دەکەوینە بەرەی «جود» و دەبینە بەشێک لە شەڕی ناوخۆ کە یەکێک لە کێشەکانی ئێمە، دژایەتییکردنی شەڕی نێوخۆ و دابینکردنی ئاشتبوونەوەیە.. ئێمە، نامیلکەیەکمان لەسەر «بێهوودەیی مفاوەزات، شەڕی نێوان یەکێتی و جود، شەڕی بێهوودەی کۆمەڵە و دیموکرات» نووسیووە! ئەوان، تەواو پێچەوانەی ئێمە بیر دەکەنەوە و پێیان وایە، یەکێتی لە قەیراندایە و ئێستا کاتی یەکلاکردنەوەیە. ئەوان پێشنیازیان بۆ کردم، سەرکردایەتیی پارتی ببینم یاخود نامە بۆ ئیدریس بارزانی بنووسم، بەڵام نەمکرد.

سالارعەزیز، پاشتر بۆی گێڕامەوە، کە مەلابەختیار، دژی جیابوونەوە نەبووە و لەگەڵ ئێمە هاودەنگ و هاوڕا بووە، بەڵام لەسەر کات و ساتەکە، لەگەڵ ئێمەدا نەبووە!

م. جەعفەر، پاش ئەم سەفەرەی مەلابەختیار، زۆر لە ئێران نەمایەوە و گەڕایەوە ئەورووپا. ئەو، ساڵانی دواتر، بۆی باس کردم کە دۆخەکەی لە نزیکەوە بینیوە، تێگەیشتووە، پرۆسەکە بەو کەرەسە و بەو بینینە جیاوازانەوە، بە شوێنێنێک ناگات و بێهیوا بووە.

## ئێمە و کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی ئێران

کۆمەڵەی ڕەنجدەران و کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران، لە دەستپێکی کار و خەباتەوە، پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان لە هەموو ئەو بوارانەدا هەبوو کە پێویستیان بە هاوکاری و هاوخەباتی هەبوون. من، لە بەرگی یەکەمی «ئەزموون و یاد»دا، قسە و باسم لەمەڕ پەیوەندییەکان، لە سەردەمە جیاکاندا کردووە.

ئێستا کە کێشەکانی ئێمە لە دەروونی کۆمەڵەدا، دەهاتن ئاڵۆزتر دەبوون، هاوڕێیانی کۆمەڵەی زەحمەتکێشان، لە نزیکەوە لێیان بەئاگا بوون و هەوڵیان دەدا، هەم کۆمەک بە ئێمە بکەن و هەم سەرنج و تێبینییەکانی خۆیان بە ئێمە بدەن.

کۆمەڵەی زەحمەتکێشان، کە ئەوسات ڕێکخراوی کوردستانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران بوو، نوێنەری ڕەوتی مارکسیزمی شۆڕشگێڕ بوو لە ناوچەکەدا. فیکر و ڕێبازی ئەوان، کارکردی لەسەر ڕەوتە چەپەکانی کوردستانی ئێراق دانابوو. ئەوان خۆشیان، بەشێکی ئەرک و کاری خۆیان بۆ هەستانەوەی بزووتنەوەی چەپ لە کوردستاندا، تەرخان کردبوو.

ئێمە کە ئاڵاهەڵگری گەشەپێدانی خەسڵەت و پرەنسیپە مارکسیستەکانی نێو کۆمەڵە بووین و بەشێکی ناکۆکییەکانمان لەگەڵ سەرکردایەتیی کۆمەڵەدا، لەم بازنەیەدا، دەبینرا، پەیوەندیی نزیکمان لەگەڵ کۆمەڵەی زەحمەتکێشاندا، کارێکی ئاسایی، بەڵام زۆر نهێنی بوو.

ئێمە، چەندجاران، سەردانی مەکتەبی سیاسیی حیزب و کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵەمان کردبوو، کێشەکانمان لەتەک ئەواندا، تاوتوێ کردبوون.

لە سەردانێکی مەلابەختیار و من، بۆ ئۆردووگای کۆمەڵە لە گوندی «مالوومە»، لەسەر مێزی نانخواردن، لەگەڵ ئەندامانی مەکتەبی سیاسی کۆبووینەوە، بەڵام چ قسەیەکی تایبەتمان لەمەڕ کێشەی خۆمان، لەگەڵ ئەوان باس نەکرد. پاشتر، بە تایبەت، لەگەڵ عەبدوڵڵای موهتەدی «سکرتێری کۆمیتە ناوەندی»، لە ماڵی ئەودا، کۆبووینەوە و وردینەی دۆخەکەمان باس کرد. ئەو نەیشاردەوە، کە بە چاوی پڕ هیواوە، لە ڕەوتی ئێمە دەڕوانێ و دیسانیش نیگەرانییەکانی خۆی پەنهان نەکرد. ئەو، پێی وا بوو کە دەبێت زۆر وریا و وردکار بین، دەنا تووشی بەڵایەک دێین. ئەو، ئامادەیی بۆ هەموو هاوکارییەک «لە سنووری توانای خۆیاندا و زۆر بە نهێنی»، نیشان دا. یارمەتییەکانی کۆمەڵە بۆ ئێمە، لە سەرەتای کاردا، تەنیا بواری پێداویستییەکانی چاپ و چاپخانەی گرتەوە کە من زۆر بە نهێنی، پێی ڕا دەگەیشتم.

## پاییزی دەستلێکبەردان

پاییز، لە نێو جوانییە سیحراوییەکەی خۆیدا، بۆنی کارەساتێکی بۆ ئێمە هەڵگرتبوو! لەگەڵ کزەبای ئێواران و خەزانی پرچی ڕەزان و ڕەنگگۆڕینی وێنەکانی سرووشتی کوێستاناندا، ڕەنگی نەخشەڕێگای ئێمە بۆ چارەسەکردنی کێشەکان و دەربازبوون لە تەنگژەکە، بێ ویست و ئارەزووی ئێمە، دەهات تاڵخ و مژاوی دەبوو.

سۆران مەحمود، کادرێکی کۆمەڵە و ساڵانی پێشتر، لە دەستەی تایبەتی سالارعەزیزدا، پێشمەرگە بوو، لەسەر سنوور و لە ڕێگای گەڕانەوەیدا لە ئێران، کۆمەڵێک نامەی لێ دەگیرێت و خۆیشی زیندانیی دەکرێت.

نامەکان، پێ دەچوو بڵاوکراوەشیان لە نێودا بوو بێت، بۆ ئێمە هاتبوون، ئیدی مامجەلال و مەکتەبی سیاسی، شپرز و نیگەران دەکات و بەو بڕیارە دەگەن کە دەبێت کێشەکە لەگەڵ مەلابەختیار و ئێمەدا، یەکلا بکەنەوە.

مەلابەختیار، دێتەوە دۆڵی جافەتی. ڕۆژی ١٢ی نۆڤامبەری ١٩٨٥، لە یاخسەمەر و لە بارەگای تایبەتی مامجەلال، شێخعەلی و مەلابەختیار، لەگەڵ بەشێک لە مەکتەبی سیاسیی یەکێتی و سەرکردایەتیی کۆمەڵە، کۆ دەبنەوە.

مامجەلال، نەوشیروان مستەفا، فەرەیدون عەبدولقادر، ملازم عومەر، ئازادهەورامی و ڕەنگە کەسی دیکەشی لێ بوو بێت، لەگەڵ مەلابەختیار و شێخعەلیدا، بۆ ڕێککەوتن لەسەر ڕێگاچارەیەک، کە هەمان ئەو ڕێگاچارەیە بوو، پێشتر مامجەلال، ئاماژەی پێ کردبوو، پێک دێن.

کورتەی ڕێککەوتنەکە:

((ڕەوتی ئێمە، لە درێژەی ململانێکانی خۆیدا لە دەروونی کۆمەڵەدا و لە ئاست سیاسەتی سەروەری سەرکردایەتیی کۆمەڵەدا، دەروویەک بۆ پێکەوەژیان و بەردەوامبوونی ژیانی ڕێکخراوەیی نابینێتەوە و هەموو هەوڵەکان بە بنبەست گەیشتوون. بۆ پاراستنی یەکرێزی و یەکپارچەیی تەلاری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و ڕێگرتن لە هەر دووکەرتبوون و جیابوونەوەیەک کە زیان بە بزووتنەوەکە بگەیەنێت، دەکرێت وەکو ڕەوتێکی سەربەخۆ خۆی ڕێک بخات، بەرنامەیەک بۆ خۆی دا بنێت و ناوێک بۆ خۆی هەڵبژێرێت و وەکو باڵی چوارەم، لە چوارچێوەی یەکێتیدا، پاش ڕێککەوتن لەسەر پلاتفۆرمێکی سیاسی، درێژە بە خەبات و تێکۆشانی خۆی بدات. واتە، سەربەخۆیی ڕێکخراوەیی خۆی و یەکێتیی هێزی پێشمەرگەی یەکێتی بپارێزێت. ئێمە، پێویستمان بە زەمەنێکی یەکمانگی

دەبێت. تا کۆنفرەنسێک ببەستین و هەموو ئەو کارانەی کە بۆ ڕێکخستنەوەی ڕەوتێک پێویستن، ئەنجامیان بدەین.. یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، هاوکارییمان بکات و گرفت و کێشەمان بۆ دروست نەکات))

ئەمە، ئەو ڕێککەوتنە زارەکییە بوو کە لە نێوان یەکێتیی نیشتمانی و نوێنەرانی ئێمەدا، لەو ڕۆژەدا و لە بارەگای مامجەلالدا، لەسەری پێک هاتبوون. لەوەدا، کە ئەم ڕێککەوتنە، لەسەر کاغەز نەنووسرابوو. کەس و هیچلایەک واژۆی خۆی لەسەر دانەنابوو، ڕێکەوتنێکی وەها گرنگ و چارەنووسساز، بە دەکۆمێنت نەکرابوو، کەمئەزموونی و نەشارەزایی نوێنەرانی ڕەوتی ئێمە و لێزانی و شارەزایی مامجەلال و سەرکردەکانی یەکێتی، دەنوێنێت! پەیمان و ڕێککەوتنێکی سیاسیی زارەکی و نەنووسراو، دەشێت لە هەر سات و شوێنێکدا، لێی ژێوان ببیەوە و نکۆڵیی لێ بکەیت.

ڕۆژی پاشتر، پێشمەرگەیەک هاتە هەڵەدن و نامەیەکی مەلابەختیاری بۆمن هێنا. مەلابەختیار، لە نامەکەدا دەڵێت: لەگەڵ «م.س»، ڕێککەوتووین و پلانێکمان بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکان داناوە. تۆ لەگەڵ پێشمەرگەکان، وەرن بۆ گوندی مالومە و لە بارەگای شێخەعلی یەکتر دەبینین!

ئازادهەورامی، بەندە، سەلاحی شێخ سدیق، ئاسۆڕەحیم، کامەران عوسمان، بەهائینی حاجی بەکر و چەند پێشمەرگەی دەسگا، پاش ئەوەی من ماڵئاواییم لە برادەرانی دیکەی دەسگا کرد، بەرەو مالومە ڕۆیشتین.

دۆخێکی ناسایی بوو. سەرکردە و لێپرسراوەکان، لە هاتوچۆ و جموجوڵدا بوون، ڕووخسارەکان شێواو و نیگاکان زۆر شتی چاوەڕواننەکراویان دەردکاند. گوندی مالوومە، لە پێشمەرگە و کادرە عەسکەرییەکان، جمەی دەهات.

کادر و لێپرسراوەکانی ڕەوتی ئێمە، لەوێ و لە چاوەڕاونیی هەنگاوی داهێندەدا، چاوەڕێ بوون. لەگەڵ مەلابەختیار، دلێری سەیدمەجید، شێخەعلی و ئازادهەورامیدا دانیشتین. ئازاد، خەمبار و پەشۆکاو بوو. ئەو پێی وا بوو، ئەوە دوایین دیدار و دواساتی ماڵئاوییە لەگەڵ ئێمەدا. دلێر، کە دڵبەندی و هاوڕێیەتییەکی چەندساڵانی لەگەڵ مەلابەختیاردا هەبوو، یاخود وەک هەندەک لە برادەرەکان دەیانگوت، «مەخزەنی ئەسراری مەلابەختیار»بوو، ڕەزامەندیی مامجەلالی وەرگرتبوو و بڕیاری دابوو لەگەڵ ئێمەدا، بۆ ناوچەی قەرەداخ بپەڕێتەوە.

کاتمان کەم و کارەکان ئێجگار زۆر بوون. ئێمە دەبوو ئاگاداری لێپرسراوان و کادرانی خۆمان، لە هەموو دەڤەرەکاندا بکەین و ڕێکخستنەکانی ناوشاریش لە پێشهاتە نوێیەکە، ئاگادار بکەینەوە.

نامەکان دەنووسران و بەهەموو ئاقارێکدا ڕەوانە دەکران. ئەو سەرتیپ و کادرە سیاسی و عەسکەرییانەی لەو ناوە نزیک بوون، لە دستپێکی کاردا ئاگادارکرانەوە، لەوانیش(جەمالی حەمەی

خواکەرەم، جەلالی حەمەی محە، بابەتاهێر، ئاراسی حەمەلاو، ئەبەز(«مەحمودی جگەر»، فەریدون پێنجوێنی) و زۆری دیکەش، تا وەخۆ کەون و خۆیان ساز بکەن.
جەمالی حەمەی خواکەرم و من، دوو سێ ڕۆژێک پێشتر، بە نهێنی و لەگەڵ چەند پێشمەرگەی تایبەت و جێگای متمانەدا، ماشینێکمان برد و لە دەراوی دۆڵێکی کەوانەی ئۆردووگای «کۆمەڵە»دا، نزیک گوندی مالوومە، چەند کلاشینکۆف و «بی کەی سی»یەکمان بار کردن و بردمانە بارەگاکەی جەمال لە گوندی «بالخ». ئێستا، نازانم داخۆ، ئەو چەکانە، کۆمەک بوون و لە کۆمەڵەمان وەرگرتن، یاخود چەکی تیپەکەی «جەمال» بوون و لای ئەوان دانرابوون.. نازانم!
ئێوارێ، ماڵئاواییمان لە ئازادەورامی و هەموو ئەو پێشمەرگە و کادرانە کرد کە بەشێکیان، لە دڵدا، لەگەڵمان بوون و بە پێی لۆژیکی سیاسەت و دۆخە تایبەتەکە، دەبوو لە سەرکردایەتی وەمێنن. بۆ شارباژێر وەڕێ کەوتین.
لە شارباژێر، لە گوندی «گوورگەدەر»، بارگەمان لێ خست و بە نیاز بووین، چەند بنکەیەکی بچووک لە شارباژێر دامەزرێنین و پاشان بەرە و قەرەداغ، بۆ سازکردنی تەدارەکی کۆنفرەنسێک، بڕۆین.
کە ئێمە شارباژێرمان جێ هێشت و لەژێر باڵی تاریکیدا، لە جادەی نێوان سلێمانی_ عەربەت پەڕینەوە، هێزێکی گەورەی یەکێتیش بە فەرماندەی شەوکەتی حاجی موشیر و هاوڕێیی دەستەیەک لە کادرانی باڵا، لەوانیش(مام ڕۆستەم، سامان گەرمیانی، وەهاب، حامیدی حاجی خالید و شێخ جەعفەر)، هەمانکات پەڕینەوە. یەکێتی، ئێمەی دڵنیا کردبوو کە هاتنی ئەو هێزە بۆ ناوچەی قەرەداغ و سپاردنی فەرماندەییەکەی بە «شەوکەت»، بۆ ئەوەیە، جەبارفەرمان کە لێپرسراوی مەڵبەندی یەکە و ئەیاری پلەیەکی ڕەوتی ئێمەیە، ئەو ماوەیە چ کێشەیەکمان بۆ ساز نەکات و تا ئەوکاتەی ئێمە کارەکانمان جێبەجێ دەکەین، جەبار هیچکارە دەبێت و «شەوکەت» کە کۆمەڵە نییە و لەگەڵ ئێمەدا کێشەیەکی نییە، هەمەکار و لێپرسراو دەبێت.
هێزەکەی یەکێتی و لێپرسراوەکانی، دەیانویست جۆرێک لە دڵنیایی و خاتەرجەمی بە ئێمە ببەخشن، بەڵام نیگاکانیان شتێکی دیەکەیان پێ دەگوتین.

لە «چەمی سمۆر»، ئێمە و هێزەکەی یەکێتی، بە ڕێکەوت یەکمان گرتەوە. ڕووخساری هەندەک لە لێپرسراوەکان تووڕە و پڕکینە و شەڕیان لێ دەباری، جەلال کوڵکنی کە ئەوسات، فەرماندەی کەرت یاخود جێگری فەرماندەی یەکێک لە تیپەکان بوو، بە ڕووی مەلابەختیاردا هەڵشاخا و بێ پەردە گوتی: ئەگەر لە یەکێتی جیاببنەوە، خراپتان بەسەر دێنین.. هەر کەسێک لە یەکێتی جیا ببێتەوە، ئێمە کەللەسەری دەتەقێنین!

ئاوا.. لە دۆخی خەباتی شاخ و فەزایەکی پڕ لە زەبر و توندوتیژیدا، کارەکتەری مرۆڤەکان دەگۆڕدرێن و جیاکردنەوەی مەرزە سیاسی و ڕێکخراوەییەکان، دەکارن هەموو مەرزەکانی مرۆڤبوون و مۆراڵی هاوڕێیەتی بەزێنن. بەهاکانی خەبات و تێکۆشانی هاوکۆیی چەندین ساڵە، جێگا بۆ دڕندەیی و یەکترسڕینەوە چۆڵ بکەن. من، تێگەیشتم، کە سەرکردایەتیی کۆمەڵە، چۆن بەشێک لە کادرەکانی خۆی، بە ڕک و کینە، بەرانبەر ئێمە بارگاوی کردوون و وێنەی دوژمنێکی ڕاستەقینەی لە ئەقڵ و ناخی ئەواندا سەوز کردووە. ئێمە، جگە لە خۆشەویستی بۆ هاوڕێ و هاوخەباتەکانمان و سووربوونمان بۆ پاراستنی ئەو چوارچێوەیەی ساڵانێکی درێژ بوو خوێنمان بۆ ڕژتبوو، بیرمان لە وەها بەرخوردێکی زەبرئامێز نەکردبووەوە!

بە دۆڵی قەرەداخدا، بەرەو گوندی «نەوتی» بە ڕێ کەوتین و لەوێ، لە ماڵی «نووریی شێخ مستەفا» کە کادرێکی سەر بە ڕەوتی خۆمان بوو، وچانمان گرت.

ڕۆژی دواتر، ڕۆشتینە سێوسێنان و لە ماڵی بەکری حاجی سەفەر میوان بووین. ئەو ڕۆژە، هەمووشت و هەمووکەس ناناسایی دەهاتنە پێشچاو!

پرۆسەکە، بۆ زۆرینەی کادر و لێپرسراوەکان، بۆ دۆست و هاوڕێکانمان هەزم نەدەکرا.. هەمووکەس، چاوەڕوانی کارەساتی دەکرد، ئێمە نەبێ.

بەکری حاجی سەفەر، هاوڕێ و خەمخۆری لێبڕاوی ئێمە و لە هەمووومان بەئەزموونتر، مەترسییەکانی بۆ باس کردین و نیگەرانییەکانی خۆی بۆ دەربڕین. ئێمە گوتمان: کارەکە، جگە لەم ئەنجامە چارەیەکی دیکەی نەبوو.. مامجەلال و مەکتەبی سیاسی، بەڵێنیان پێ داوین، لێمانگەڕێن تا کارەکانمان تەواو دەکەین، کۆنفرەنس دەگرین، ناوێک بۆ ڕەوتەکە دەبینینەوە و بەرنامەیەک بۆ پێکەوەژیان، لە چوارچێوەی یەکێتیدا، پێشکەش بە مەکتەبی سیاسیی یەکێتی دەکەین!

مامۆستا عومەر حەمەساڵح، لە شارەوە، نامەیەکی بۆ من نووسیبوو. ئەو ئاگاداری کردبووین کە هەواڵیان هەیە، یەکێتی پەلامارمان دەدات و دەبێت وریا بین و خۆمان لە زەبری هێرشی هێزی پێشمەرگە، وەلا خەین!

من، نامەیەکم بۆ نووسی و دڵنیام کرد کە ئێمە بە نیازی جیابوونەوە و شەڕ، کار ناکەین و ئەگەریش وەهابوو، ئێمەش هێزمان هەیە و دەتوانین بەرگری لە خۆمان بکەین! ڕاستییەکی وەها نەبوو. ئێمە، هیچ پلانێکی شەڕ و بەرگریمان نەبوو.. ئێمە، لەبەر ڕۆشنایی دید و بۆچوونەکانی خۆمان، لە دڵەوە، بڕوامان بە بەڵێنەکانی یەکێتی کردبوو.. ئەگەر وا نەبا، لە شاربازێڕەوە، نەدەهاتینە قەرەداخ و لە قوڵایی دەسەڵاتی یەکێتیدا نیشتەجێ نەدەبووین. لە شاربازێڕەوە، دەمانتوانی بەرەو سنوور بڕۆین، یاخود دەکرا هەموو هێزەکانمان، لە هێزی یەکێتی جیا بکەینەوە، کە سەدان پێشمەرگە

بوون، لە شارباژێر، بنکە و بارەگای خۆمان چێ بکەین! ئێمە، ئەزموونی جیابوونەوەی پێشتری هێز و باڵەکانی دیکەمان لە یەکێتی، دیتبوو. ئێمە بینیبوومان، بزووتنەوەی سۆسیالیست، چۆن لە ساڵی ۱۹۷۹دا، ماڵئاوایی لە یەکێتی کرد، پاشتر حەمەی حاجی مەحمود، چۆن شارەزوور و بناری «سوورێن»ی هەڵبژارد.. بەڵی دەمانزانی.. بەڵام نەماندەویست!
لە گوندی تەکیە، ماڵ و بارەگای مەلابەختیار، بوون بە نێوەندی هەڵسووڕانی کارەکان و کادرەکان لە هەموولایەکەوە، بۆ وەرگرتنی ڕێنمایی و دابەشکردنی کارەکان گەیشتن. ژمارەی ئەو کادر و لێپرسراو و پێشمەرگانەی لە بازنەی ڕەوتی ئێمەدا هەڵدەسووڕان، سەدان و بگرە چەند هەزارێک دەبوون و لە سەرتاسەری ناوچەکانی کوردستاندا بڵاو بوون. ئێمە، لە هێزەکانی پاراستنی سەرکردایەتی و لە نێو دەستەکانی پارێزگاریکردنی خودی مامجەلال و نەوشیروان مستەفاشدا، ئەندام و لایەنگرمان هەبوون.
ئەو چەندڕۆژە کەمەی لەتەکیە بووین، وێڕای هەڵسووڕاندنی کارە گرنگەکان، پەیکێکی تایبەتیشمان بۆ ئێران، بۆ ڕوونکردنەوەی دۆخەکە بۆ سالارعەزیز و برادەرەکانی ئەوێ نارد.. یاسین موحەمەد حەسەن (مەلایاسینی هەڵەبجەیی)، کادری دیاری کۆمەڵە، ئەو ئەرکەی لە ئەستۆ گرت. مەلایاسین، لە گفتوگۆیەکی کورت و سەرپێیدا، پێی گوتم: ئەم کارە زۆر بێسەروبەر دیارە و من لە ئەنجامەکەی زۆر نیگەرانم!
من گوتم: منیش نیگەرانم.. منیش نازانم بە کوێ دەگەین، بەڵام کارێکە و تا ئێرەمان هێناوە. هەر دەبێت بە شوێنێکی بگەیەنین! مەلا، بە دڵەڕاوکێ و ناخێکی پڕ گومانەوە، بەرەو ئەودیو، بەڕێ کەوت.
گۆڤارەکەی لە کۆبوونەوەی «سێوسێنان» بڕیاری لێ درابوو، لەژێر چاپدابوو. ناولێنانی ئەم گۆڤارە، لە کۆبوونەوەکەدا نەبڕایەوە و بۆ دیاریکردنی ناوێک، ئێمەیان سەرپشک کردبوو. ئێمە، پاش بێنەوبەرە و لێکدانەوەی چەند ناوێکی وەکو (ئاڵای زەحمەتکێشان «ئازە»، ئاڵای کۆمۆنیزم «ئاکۆ» و ئاڵای شۆڕش «ئاش»، لەسەر ئەمەی دواییان گیرساینەوە و وەکو زیندووکردنەوەی بڵاوکراوەی «ئاڵای شۆڕش» کە شەهیدئارام لە ساڵی ۱۹۷۷ و ۱۹۷۸دا، لە قەرەداخ چاپ و بڵاوی کردبووەوە، ڕێک کەوتین. من، ئێستاش، پیاسەیەکی بەرماڵی مەلابەختیارم لە «تەکیە»، لە بیرە کە پێکەوە، ئەو ناوە گریمانانەمان تاوتوێ دەکردن.
ئێوارەیەک، لەژێر تیشکی ئەرخەوانیی زەردەپەڕدا، لەگەڵ دلێردا، پیاسەمان دەکرد. دلێر گوتی: من پێم وایە، ئێوە زۆر درەنگ کەوتن.. ئێوە، بۆ قەرەداخ جێ ناهێڵن و ناگوێزنەوە بەری شارباژێر.. ئێوە، هەڕەشەکان دەبیستن و بەشێک لەو برادەرانە، وەکو ڕۆستەم و وەهاب و حامید، کە لای

پێشمەرگەکانی خۆتان و لە ماڵی کاک بەکربا. قسەی توند دژی ئێوە دەکەن. بۆ ئەوەیە کە ئێوە بیبستنەوە و لە نیازیان تێبگەن.. هەندێکیان پێیان خۆش نییە کە ئێوە تێک بشکێن و دووچاری کارەسات بێن! کاک بەختیار چاوەڕێی چی دەکات؟

من گوتم: منیش هەر وەهای تێدەگەم. کاک بەختیار، چاوەڕێی چاپبوونی گۆڤارەکەیە. ئەم ئێوارەیە تەواو دەبێت و شەو، بەرەو شارباژێر دەڕۆین.

ئەو گوتی: ئەم «ئایسکرا»یە، ئەگەر چاپ نەبێت چی دەبێت؟ ئەم گۆڤارە تووشی بەڵایەکتان دەکات.. هەموو قسەوباس و هەڵسوکەوتەکانی لێپرسراوانی هێزەکە و چرکردنەوەی ئەم هێزە زەبەلاحە، ئاماژەیەکی خراپن، چەند زووتر بەڕێ بکەون، درەنگە!

دوانێوارەمان بوو لە «تەکییە»، بێستوونی مەلاعومەر، دلاوەری ئەحمەدمەجید، عەلی شامار و زۆر کادری دیکەمان لابوون و هەموویان هەستیان بە مەترسییەکە دەکرد.

لە نیوەشەودا، هەموو هێزەکەمان جگە لە مەفرەزەیەکی بچووک لە دەستکەی مەلابەختیار، ڕەوانە کرد و خۆشمان بڕیارمان وەها بوو، کاتژمێری ٦ی بەیانی، بە دوو ئۆتۆمبێل، شوێنیان کەوین و بۆ خۆلادان لە هەر پەلامارێکی هێزەکەی یەکێتی کە هەموو لایەکیان تەنی بوو، ناوچەکە جێ بهێڵین!

## پەلامار لە گزنگدا

شەوێکم لەگەڵ خەونی بزرکاو و زیندەخەوندا بەسەر برد. لە سپێدەدا، لە دەرێ را، هەرا و هەنگامەیەک پەیدا بوو. ئێمە کە بێدار بووین و دڵەراوکێ بواری خەوتنی نەدابوین، لە جێگادا ڕاست بووینەوە. لە پەنجەرەکانەوە، لە دەرێمان ڕوانی و ئیدی تێگەیشتنی دۆخەکە، هیچ زرنگییەکی نەگەرەک بوو.

ـ وەرنە دەرێ! بێ چەک وەدەرکەون! بە نیازی دەستگیرکردنەوە و بەرگری بن، بارەگاتان بەسەردا دەڕوخێنین!

چواردەوری بارەگاکە، تەنرابوو، چەکەکان ئامادە و ئارپیجییەکان لەسەرشان و ڕوو لە دەرگا و پەنجەرەکان بوون.

پێشتر، مەفرەزەکە و هەندەک کادریان لە بارەگایەکی پشتەوەدا چەک کردبوون.

من، دەرگاکەم بە ئەسپایی کردەوە، چەند پێشمەرگە کە چەکەکانیان ڕوو لە من بوون، هاواریان کرد: وەرە دەرەوە! غەریب هەڵەدنی، «بی کەی سی»یەکی ئاراستەی دەرگاکە کردبوو. من گوتم: دێین بەڵام پەلە مەکەن، با خۆمان کۆکەینەوە. دەرگاکەم داخستەوە. من، چوومە ژوورەکەی مەلابەختیار. ئەو، لەسەر تەختی خەوتنەکەی دانیشتبوو، دەستەکانی لە نێو جانتاکەدا، نامە و کاغەزەکانیان ئەمدیوئەودیو دەکردن، وەک کەسێک لە دۆخێکی وەها چاوەڕوانەکراو بکەوێت. کەمێک پەشۆکابوو، بەڵام کۆنترۆڵی لە دەست نەدابوو. هەندەک لە نامەکانی جیاکردنەوە و ڕووناکی خێزانی، لە دەستی وەرگرتن و بۆ لایەکی بردن. مەلا، جانتاکەی هەڵگرت و لە هۆڵەکەدا، بە دلێری گوت: کاک دلێر، تۆ بڕۆ دەرەوە و بڵێ تا گفتی سەلامەتیمان نەدەنێ، وەدەر ناکەوین.. بڵێ: متمانەمان بە حامیدی حاجی خالید و کاک وەهاب هەیە.. با ئەوان بێن و لەگەڵ ئەوان دەچینە دەرەوە. دلێر، ڕۆیشت و پاش کەمێک لەگەڵ حامید و وەهاب، هاتەوە. مەلابەختیار، پاش ١٠ساڵ و منیش پاش ٨ساڵ، بۆ یەکەمجار، بە بێ چەک، لە بارەگایەک وەدەرکەوتین و هاوڕێکانی خۆمان، دیل و دەستبەسەریان کردین. هەمانرۆژ و ڕەنگە هەمانکاتیش، قادری حاجی عەلی و چەند پێشمەرگەیەک، لە گوندی «مالوومە»، بە ڕێزەوە، شێخەلی کە لێپرسراوی یەکەم مەفرەزەی چەکداری دەستپێکردنەوەی شۆڕشی نوێ بوو، چەک دەکەن و لەگەڵ خۆیان دەیبەنە بارەگای تایبەتی نەوشیروان مستەفا!

بە سەدان پێشمەرگە، لە گوندی تەکییەدا بوون و هەموو خەڵکی گوند، لەسەربانەکانەوە، لە ئێمە و لەو کارەساتەیان دەڕوانی.

ساتێ ئێمە وەدەرکەوتین، جەبار فەرمان، لە سەربانێکی بەرزەوە، وەکو ژەنراڵێکی سەرکەوتوو،

نیگای دەکردین. شەوکەتی حاجی موشیر، ڕۆستەم و سامان گەرمیانی، بزەی سەرکەوتن لەسەر لێوانیان نەخش بوو، سەرکەوتنی پلانێک کە بەڵێنیان بە نەوشیروان مستەفا و مەمجەلال دابوو، وەک چنرابوو، جێبەجێی بکەن.

لە چاوانی حامید و وەهابدا، نیگەرانی و جۆرێکیش لە شەرم دەبینران. وەهاب، هەرگیز لە ڕەوتی ئێمە نزیک نەبوو. کەچی وێنەی ئەو پیاوانەی کە تۆوێک لە شەهامەت لە ناخیاندا سەوز بووە و مامەڵەی نەیارە فیکری و سیاسییەکانیان، جوامێرانە دەکەن، ئاوا ڕەفتاری دەکرد. دیارە، شەهامەتی حامیدیش، لە هی ئەو کەمتر نەبوو.

سواری ئۆتۆمبێلیان کردین و بەڕێ کەوتین. بۆ کوێ؟ ئیدی ئەوە ئێمە نین بزانین یاخود مافی پرسیارمان هەبێت! ژەنراڵەکان، بە ئامێری بێتەل، لەگەڵ مامجەلال و نەوشیرواندا لە پەیوەندیدا بوون و فەرمانیان لەوانەوە وەردەگرت.

ماوەیەک نەبوو بەڕێ کەوتبووین، لە ڕێگادا و نزیک گوندی «کۆشک»، بە هێزەکەی خۆمان گەیشتینەوە، کە چەند سەعاتان پێش خۆمان ناردبوومانن. ئۆتۆمبیلەکان وەستان. پێشمەرگەکان سەنگەریان گرت. شەوکەت و ژەنراڵەکانی یەکێتی، هاواریان کرد کە دەبێت چەکەکانیان دابنێن و خۆیان تەسلیم بکەن، ئەگەر وەها نەکەن، ئەوا ژیانی مەلابەختیار لە مەترسیدایە.. هەرکەسێک دەست بۆ چەک بەرێت، من مەلابەختیار دەکوژم! شەوکەت، کە مەلابەختیاری لە بەردەمی خۆیدا ڕاگرتبوو، وەهای گوت. پێشمەرگەکانی ئێمە، هەندێکیان دەیانویست سەرکێشی بکەن و مل نەدەن، ئاخر زۆر ستەمە، تۆ چەندساڵان پێشمەرگە بیت و ئێستا هاوڕێکانی دوێنێت، چەکت بکەن! ڕەنگە لەوە ئەستەمتریش، ئەوە بێت کە کەڵەوەکێشی بکەیت و ڕووی چەکت لە هاوڕێیانی خۆت بکەیت!

مەلابەختیار، فەرمانی پێ کردن تا چەکەکانیان دابنێن و کارەسات نەقەومێت. هەندەک لە پێشمەرگەکان، هاتنە ژێر بار و هەندێکیان نا!

من، بە شەوکەتم گوت، مۆڵەتم بدە بگەمە لایان، تا ڕازییان بکەم و چەکەکانیان دابنێن.. من، ڕۆشتم و پێم گوتن: ئەگەر ئێوە، تەقە بکەن، ئیدی کارەسات دەقەومێ و هەمووومان دەکوژرێین! کارەکە بە کاڵەڕەقی، بە شوێنێک ناگات.

چ دۆخێکی سەخت و تاڵ بوو! زۆرینەی کورد، شەهامەت و پیاوەتی لە چەکدا دەبینێت. زۆرن ئەوانەی لە نێوان چەکدانان و مەرگدا، مەرگ هەڵدەبژێرن! ئێمە وەهامان نەکرد و زۆرکەسیش بە ترسنۆک ناوبێریان کردین!

مەنزڵیان گەیاندە «ئاوایی حەمەی کەرم» و لەماڵی شێخ مستەفای باوکی شێخ جەعفەر، دایانبەزاندین. گوند لە پێشمەرگە ژاوەی دەهات. پێشمەرگەکان، بەشێکیان ئەندام و کادری ڕەوتی ئێمە بوون کە بە

چاوانی پڕ حەسرەتەوە، لێیان دەڕوانین و لە دڵەوە سەرکۆنەیان دەکردین.
هەواڵی دەستگیرکردنی ئێمە و پرۆسەی پاکسازیی «ئاڵای شۆڕش»، هەموو کوردستانی گرتەوە.
لە هەموو ناوچەکان، لە نێو هێزی پێشمەرگە و ڕێکخستنەدا، راوەدوونان، گرتن، لێکۆڵینەوە و سوکایەتیپێکردنی ئەندامان و کادرانی ئێمە، دەستی پێ کرد. زۆر پێشمەرگە و کادر و لێپرسراویان چەک کردن، هەندێکیان گرتن و پاشتر ئازادیان کردن، هەندێکیان ناچارکران تەسلیم بە بەعس ببنەوە. زۆریان ڕێگای سنووریان لەبەر نان و بە تۆپزی بۆ ئێران نێردران. هەندەک لە سەرتیپ و فەرماندەی کەرتەکان، لەگەڵ پێشمەرگەکانیان، فریای خۆیان کەوتن و بە چەکەوە، خۆیان گەیاندە سوورێن و پاشتر پەیوەندییان کرد بە بنکەکانی «ئاڵا»وە، لەسەر سنوور. فەرەیدوونی حەمەساڵەح، جەمالی حەمەی خواکەرەم، جەلالی حەمەی مجە، شێخ حوسەینەسوور و زۆری دیکەش، کە سەرتیپ و لێپرسراو بوون، پاش بیستنی هەواڵی گرتنی ئێمە، خۆیان گەیاندە سەرسنوور. بابەتاهیر و ئاراسی حەمەلاو، کادری عەسکەریی چەندساڵە و دیاری یەکێتی بوون، کە سووکایەتییان پێ کردن و هەوڵی چەککردنیان دان، تەسلیم بە بەعس بوونەوە!
ئاسۆ عەلی و ئەو کادر و پێشمەرگانەی لە تەکیە زیندانییان کردبوون، لە شەودا، فرسەتیان هێنابوو، هەڵاتبوون و خۆیان گەیاندبووە سەرسنوور.
دۆخەکە تەواو شێوا.. ئەم بڕیارە نادرووستەی کۆمەڵە و یەکێتی، ئەوەی کە ئێمەیان وەکو باڵی چوارەم لە چوارچێوەی یەکێتیدا قەبووڵ نەکرد و خراپترین ڕێگاچارەیان هەڵبژارد، پاشی کارەساتی هەکاری، گەورەترین گورز بوو کە لە یەکێتییان وەشاند! ئەگەر جیابوونەوەی «حەمەی حاجی مەحموود» و دروست چارەسەرنەکردنی کێشەکەی، لە ساڵی ۱۹۸۰دا، تەنیا لە ناوچەی شارەزوور و شارباژێردا قەتیس بوو، ئەوا خراپ مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەی ئاڵای شۆڕشدا، هەموو کوردستانی گرتەوە و تەلاری ڕێکخستنەکانی لە شاریشدا، شەق کرد!
ئەو شەوە، دیوەخانی شێخ مستەفا، لە ژەنراڵانی سەرکەوتووی یەکێتی و لێپرسراوەکان جمەی دەهات. ئێمە جارێ هەر وەکو دوو دیلی ڕێزلێگیراو مامەڵەمان لەتەکدا دەکرا، لە لای سەرەوەی دیوەخان دانیشێنرابووین. لە دیوەخاندا قسەوباس گەرم بوو. مەلابەختیار، بە چڕی و بە گەرمی، باسی لە جیاوازییەکانی ئێمە و ئەوان دەکرد و لە دیدی ئێمەوە، رەخنەی لە فیکر و ئەدای سیاسیی کۆمەڵە دەگرت. ئێمە، جەختمان لەسەر ئەوە دەکردەوە، کە ئەم بڕیارە و ئەم هەڵوێستەی کۆمەڵە، سیاسەتێکی کۆمەڵەکوژییە و بە زیانی یەکێتی و بزووتنەوەکەش تەواو دەبێت. مامۆستەم کە لە پایینی دیوەخان و لەسەر کورسییەک دانیشتبوو، پێکێک ویسکیی بەدەستەوە، لاقرتیی بە بۆچوونەکانی ئێمە دەکرد.

## هەنگامەیەک لە ئاوایی حەمەی کەرەم

ئەمەوئێوەرۆی ڕۆژی دواتر، لە تەختایی بەردەم ماڵی شێخ مستەفادا کۆوەبووین. تا بەرەو ناوچەی «بازیان»مان بگوێزنەوە. شەوکەت گوتی:
_ کاک بەختیار، تۆ لەو ئوتۆمبێلەدا سوار بە!
_ با کاک دلێریش لەگەڵ من سوار بێت.
_ نەخێر، ئەو بۆی نییە.. ئەو دەبێت لە شوێنێکی تر بێت
_ کاک دلێر، وەرە لای من! مەلابەختیار وا دەڵێ.
دلێر، دەچێتە لای مەلابەختیار و شەوکەت پەلی دلێر دەگرێت و دایدەبەزێنێت.
_ منیش سوار نابم، ئەگەر دلێر لەگەڵ من نەبێت!
_ تۆ دەبێت لەوێ سوار بیت! من بەزۆر سوارت دەکەم.. تۆ دیل و زیندانییت.. تێگەیشتیت!
مەلابەختیار دادەبەزێت و شەوکەت پەلاماری دەدات. مەلا، بەرپەرچی شەوکەت دەداتەوە و بە یەکدا هەڵدەشاخێن.. شەوکەت قسەی سووک و بازاڕی بە مەلابەختیار دەکات.. مەلاش پەلاماری شەوکەت دەدات..
دەیان پێشمەرگە، میللی چەک ڕادەکێشن.. هیچ دیار نییە کێ دەیەوێت تەقە لە کێ بکات.. کێ مەلابەختیار دەکوژێت و کێیش شەوکەت و ژەنراڵەکانی دیکە.. ئاخر پێشمەرگەکان دووبەشن و چەندین لێپرسراوی جاربەزە و بەئەزموونی هەردوولا، لەوێدا هەن.. ئەگەر یەک فیشەک بتەقێت، ئیدی گۆمێ خوێن دەڕژێت.. من، لە حەسرەتا نەک لە ترسا، هەموو گیانم دەلەرزێ! بەکری حاجی سەفەر، وەهاب و حامید و لێپرسراوە خەمخۆرەکانی دیکە، کۆنترۆڵی دۆخەکە دەکەن، مەلابەختیار و شەوکەت لێک جیا دەکەنەوە و گرژییەکە خاو دەکەنەوە.
ئەو هەڵویستەی شەوکەت لە هەمبەر مەلابەختیار، کارێک بوو، هەموو کەسێک نەیدەتوانی بیکات.. ئەمە، جگە لە ڕک و کینە و کەمفرسەتی بۆ تۆڵەسەندنەوە، شتێکی دیکە نەبوو. ئاخر، دەکرا کار بەو جێگایە نەگات و شەوکەت وەها مامەڵە لەگەڵ کەسێک نەکات کە ساڵانێک هاوڕێ و سەرکردەی بووە.. جوامێرترین پیاو، ئەو مرۆڤانەن کە لە کاتی دەسەڵاتداریی خۆیان و نسکۆ و نووچدانی هاوڕێکانیاندا، ڕێزیان لێ دەگرن. شەوکەت، دەیتوانی بە سەنگینی و حورمەتەوە، ئەو ئەرکەی پێی سپێردرابوو، جێبەجێی بکات و وەها ڕەفتارێکیش نەنوێنێت.
بۆ ئێواری، بە گوندی «قازانقایە»یان گەیاندین. لە نێوەندی گونددا، کادر و پێشمەرگەکان ئەبڵەق و

لە دیمەنی ئێمەیان دەڕوانی. ئاواتی شێخ جەناب، لە سەیارەکان هاتە پێشێ و بە دەنگی بەرز و ڕوو لە شەوکەت، بە تەوسەوە گوتی: سەد ئافەرین.. دەستتان خۆش بێت، «قوات خاسە»کانتان، هێنان! شەوکەت، قسەیەکی زبری بە ڕووی ئاواتیشدا کێشا!

ئەرکی شەوکەت، لە بارەگای تیپی ٥٧ی سەگرمە، تەواو دەبوو. ئیدی بە پێی فەرمانی فەرماندااران، حەمەغەریب»ئازاد»ی سەرتیپی سەگرمە، ئەرکی گەیاندنی ئێمەی بۆ بارەگای سەرکردایەتی، لە ئەستۆ بوو!

ساتێ شەوکەت و ئازاد ئەرک و ئۆبالی خۆیانیان ئالوگۆڕ کرن، شەوکەت و هێزەکەی ئێمەیان بەجێ هێشت. بەکری حاجی سەفەر و دەستەکەی بەرەو سەرکردایەتی ڕێ کەوتن و دلێریش هاوڕێی ئەوان ڕۆیشت. سەفەری بەکری حاجی سەفەر، بۆ سەرکردایەتی، بۆ بینینی مامجەلال و سەرکردایەتیی کۆمەڵە و ئەو هاوڕێیانەی دیکە بوو کە دەکرا پێکەوە کارێک بکەن و خەمێک لە کێشەکە بخۆن. ئێمەش لای خۆمانەوە، پێمان وا بوو، جارێ فرسەتێک ماوە و هەوڵ و کۆششی ئەو هاوڕێیانە دەکارێت، بارە گلاوەکە، لە نیوەدا باربکاتەوە و وا بکەن مامجەلال و ئەوشیروان مستەفا، هەڵویست و پلانی خۆیان بۆ چارەسەری کێشەکە بگۆڕن!

بەشێکی ئەو کادر و پێشمەرگانەی کە لە قەرەداغ و گەرمیان، هێزەکانی یەکێتی چەکیان کردبوون و زیندانیان نەکردبوون، وەکو عیمادئەحمەد و کەریم عوسمان و زۆر پێشمەرگەی دیکەش، ئەوانیش هاوڕێی بەکری حاجی سەفەر، بەرەو سەرکردایەتی، ڕۆیشتبوون.

دوو شەوان لە گوندی «خاوێ» و لە بارەگای تیپی سەگرمە، دوو میوانی دەستبەسەر بووین. ئازاد، وەها مامەڵەی لەتەکدا کردین و ڕێزی لێ دەگرتین، ئێمە هەست بە دیلییەتی خۆمان نەکەین. لە بارەگای کەرتی پاریزگاریی تیپەکە، کوڕێک بە ناوی شێخ مەحمود، فەرماندەی کەرت بوو. جێگرەکەی ئەندامی ڕەوتی ئێمە بوو. بە درێژایی شەوکە، ئێمە لەمەڕ فیکر و سیاسەتی کۆمەڵە و کێشە و گرفتەکان، قسەمان بۆ ئەوان و پێشمەرگەکان کرد و ئەوانیش، هاوڕامان بوون و قسەکانیان دەسەلماندین، کەچی ساتێک کار دەگەیشتە سەر ئەوەی هاوکاریمان بکەن و دەربازمان بکەن، شێخ مەحمود، دەیگوت: ئەگەر بتانەوێت بمکوژن ئامادەم، بەڵام هەرگیز خیانەت لە کاک ئازاد ناکەم! ئێوە، لە ئۆبالی کاک ئازاددان و منیش هەرگیز کارێ ناکەم، کاسەکە لە سەری ئەودا بشکێت. ئەوشەوە، ئێمە زۆرمان گوت و ئەویش هەموو شتێکی لێ دەبیستین، تەنیا ئازادکردنمان نەبێت.

شەوی دووەم، حەمامیان گەرم کردبوو. مەلابەختیار گوتی، من دەتوانم لە وەختی خۆشووشتندا دەرباز بم، تۆ چی دەڵێی؟

من پێم وابوو کە دەتوانێت، دیسانیش کارەکەم لێ ئەستەم کرد و گوتم: هەم لە بەردەرگا و هەم لە

پشتی گەرماوەکەوە. پاسەوان نامێنێ و دەربازبوونت سەخت دەبێت. من، وەهام لێک دەدایەوە کە هەڵاتنی مەلابەختیار، مەترسیی بۆ ژیانی من و شێخعەلی دەبێت و ئەگەری ئیعدامکردنمان لەلایەن ئەوشیروان و سەرکردایەتیی کۆمەڵە و یەکێتییەوە، ئەگەرێکە، چانسێکی زۆری جێبەجێکردنی هەیە.

## کاروانێک بە دوو دیلەوە، لە دۆزەخی بۆسەیەکدا!

دەمەوئێوارەی رۆژی پاشتر، کاروانی« ئازاد»، بۆ گەیاندنی ئێمەی دیل، بۆ بارەگاکانی سەرکردایەتی، لە دۆڵی جافەتی، بەڕێ کەوت.

لە گوندی «خاوێ»وە، بەرەو دەربەندی باسەڕە و پاشتر رووەو دەشتی بازیان جماین. لە گوندێکی بازیاندا، دوو ئۆتۆمبێل چاوەڕوانمان بوون. مەفرەزەیەک لە پێشەوە، بەرەو جادەی گشتیی نێوان سلێمانی و بازییان رۆیشتن و ئێمەش، بە ئۆتۆمبیلەکان نزیک جادەکە بووینەوە و پاشان بۆ بەری ئەوبەر پەڕینەوە.

بە دۆڵێکی تەنگ و رووتەندا، رێ دەکەین و بەرزاییەکانیش، رەبایەی بەعسیان لەسەر هەڵتۆقیون. سەربازەکان، هەستیان بە جموجوڵ و پەڕینەوەی هێزەکە و تێپەڕبوونی ئۆتۆمبیلەکان کردبوو.. تۆپباران دەستی پێ کرد.. سەربازەکان دابەزیبوونە سەر گردۆڵکەکان و دۆڵەکەیان وەبەر دەسترێژ دا.. ئێمە، لە بن گابەردەکاندا خۆمان حەشار دا.. ئازاد، فەرمانی بە پێشمەرگەکان دا، تەقەنەکەن و بێدەنگ بن.. گوللەتۆپەکان نزیک دەکەوتن و پارچەگوللە و تەڵاشەبەرد و زیخ و چەو، بە سەرماندا دەبارین، بە نێو دووکەڵ و گوللەبارانەدا، قوتار بووین و چەند کیلۆمەتر ئەولاتر، سواری ئۆتۆمبیلەکان بووینەوە و گوندی «باخ»مان کردە مەنزڵی پشوودان.

لە دیوەخانی ماڵی شەهید «شەماڵ»دا،ماندوویێتیمان دەرچوو.. مەلابەختیار، پێی خۆش نەبوو، براکانی شەهیدشەماڵ بیناسنەوە.. ناهەقیشی نەبوو..

لە گوندی «باخ»ەوە، بەرەو ئاقاری گوندی «زێوێ» و بناری پیرەمەگرون، بردینیان و لە نیوەشەودا، لە زێوێ بووین.

لە بەربەیانی رۆژێکی ساردی پاییز، بە باڵای پیرەمەگروونەدا، هەڵگەڕاین و بۆ نیوەرۆژ، لە ترۆپکی پیرەمەگروونەوە، بە دیلییەتی، لە سلێمانی و دەوروبەریمان روانی! نانی نیوەرۆمان بردە گوندی «قزلەر» و بۆ ئێوارێ، لە گوندی «یاخسەمەر»، لە بەردەم بارەگای مامجەلالدا، لە پرسگەدا، رایان گرتین و چاوەڕێ بووین.

لەسەر داوای مامجەلال، مەلابەختیاریان بۆ بینینی ئەو برد. یەکتربینینی مامجەلال و مەلابەختیار، دەشێت بۆ دووەمیان زۆر سەخت و ئازارێکی رۆحتەزێنی هەبووبێت. ئاخر زۆر سەختە، تۆ ساڵانێکی دوور و درێژ، لە ئاستەنگترین ساتەکاندا، هاوڕێ و هاوخەباتی سکرتێری گشتیی نیمچەبەرەیەکی سیاسی بێت و سەدانجار، لە خۆشی و ناخۆشیدا، پێکەوە ساتەکانتان گوزەراندبێت

و ئێستا بە دیلکراوی، رووبەروو، پێکەوە دابنیشن! دیدارەکە، زۆری نەخایاند و پاش نیوسەعاتێک، مەلابەختیاریان هێنایەوە و پێکەوە، بردینیانە بارەگای پرسگەکەی مامجەلال و لە دیگەرانییەکی بێوێنەدا، شەومان بە رۆژ گەیاند.
پرسگە، چەندسەد مەترێک لە دامێنی ماڵ و بارەگای مامجەلالدا چێ کرابوو، لەوێدا، ئەو پێشمەرگانە دەژیان کە ئەرکی پاراستنی مامجەلالیان پێ سپێردرابوو. ئەم بارەگایە، لە نێو دڵی شاخەکەدا هەڵکەندرابوو.. ژوورێکی گەورە و فراوان بە ئەندازەی ١٠مەترێک درێژ و ٤مەتر پان دەبوو. ئێمە، لە بەشی.سەرەوەدا جێگامان پێ درا و پێشمەرگەکانیش، لای خوارەوە دادەنیشتن و لە دەرەوە و لە بەردەرگاکەدا، چادر، بۆ سازکردنی خواردن هەڵدرابوو.
رۆژی دوایی، هاورێ و دۆستەکانمان بەرەودوا سەردانیان کردین و لەوانیش، ملازم عومەر، ئازادهەورامی، بەکری حاجی سەفەر، مستەفاچاورەش، دلێری سەیدمەجید، رووناکی شێخ جەناب(هاوسەری مەلابەختیار) و زۆرێک لەو کادر و هاورێیانەی کۆمەڵە کە «ئاڵا» دەبوون و لەبەردەم ئەو سیاسەتە زەبرنامێزەی کۆمەڵە و یەکێتیدا، دەبڵەق مابوون و پێیان ناخۆش بوو.
ئەم سیاسەتە چەوتەی یەکێتی، نارەزاییەکی زۆری لای کادرانی کۆمەڵە و «شۆرشگێران»یش دروست کرد و ژمارەیەکی بەرچاو، پاش ئەوەی سەردانی ئێمەیان دەکرد، وەکو پەرچەکردارێکی هەڵویستنواندن، دژ بە کرداری دژەدیموکراتییانەی نەوشیروان و مامجەلال، کوردستانیان بەجێ هێشت و بەرەو ئێران رۆیشتن و پاشتر، روویان لە ئەورووپا کرد.
مەلابەختیار گوتی: نووسینی نامەیەک بۆ روونکردنەوەی دۆخەکە بۆ هاورێیانی رێکخستنەکانی شار و دیاریکردنی چەند ناوێکیش تا لە ئاناماددیی ئێمەدا، سەرپەرشتیی کاروبارەکانی «ئاڵا»، بکەن، کاری ئێستایە.
مەلابەختیار، بە ناوی ئەڵقەی ناوەندی رۆشنبیریی «ئاڵا»وە کە سیانمان (مەلابەختیار، شێخەعلی و من دیلکرابووین، حاجی مەمۆ، لە ناوچەی هەولێرەوە خۆی دەرباز کردبوو، مامۆستا موحسینیش، مانگێک پێشتر خۆی کشاندبووەوە)، نامەکەی نووسی و لەو کادرانەش کە دەبوو ئەو ئەرکەیان لە ئەستۆدا بێت و شیرازەی رێکخستن و پێشمەرگە دەربازبووەکان رێک بخەن، تا ئەو جێگایەی یادەوەرییم برِ بکات:
حاجی مەمۆ، عیمادئەحمەد، ئاسۆعەلی، کەریم عوسمان بوون کە دەبوو بە گەیشتنیان بۆ بنکەی ئەودیوی سنوور، لەگەڵ سالارعەزیز، مامۆستا جەعفەر و مامۆستا سەلام عەبدولڵا، پێکەوە ببنە لیژنەیەکی سەرپەرشتی و ئەوی لە دۆخێکی وەهادا پێویستە، ئەنجامی بدەن.
رۆژانی سەرەتای دەستگیرکردنمان، کەسانێکی زۆر دەهاتنە دیدارمان و جارێ دەرگاکانی دنیای

دەرەوەیان لەسەر کڵۆم نەدابووین، هەر بۆیە ناردنی نامەکان، کارێکی زەحمەت نەبوو..

پاش دەستگیرکردنی بەشێک لە سەرەکان، ئیدی یەکێتی، قۆڵی بۆ پاکسازیکردنی ڕیزەکانی خۆی، لێ هەڵماڵی.

نەوشیروان مستەفا و مامجەلال، خۆیان سەرپەرشتی پرۆسەی پاکسازییەکەیان دەکرد و کادرانی کۆمەڵە، جێبەجێیان دەکرد. ئەم پرۆسەیە، هەموو ئەو کادرانەی کۆمەڵەی دەگرتەوە کە تەنها سووکەگومانێکیان لێ کرابا یاخود پەیوەندیی کەسەکی و دۆستانەیان لە گەڵ ئێمە هەبایە. بەشێک لەو کادرانە. بۆ سەرکردایەتی بانگ دەکران و ئەو دوو زاتە، خۆیان لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکردن و زۆربەیان ناچار دەکردن کوردستان بەجێ بهێڵن، یاخود لە بارەگایەکدا لێی دابنیشن و لەژێر چاودێریدا ژیان بگوزەرێنن. ئەم پرۆسەی پاکسازییە، دەیان و بگرە سەدان تێکۆشەری چەپی گرتەوە کە هیچ پەیوەندییەکیان بە ئێمەوە نەبوو. ئەوان، دژی ڕژێم بوون و لەژێر چەتری دەسەڵاتی ئێمەدا، لە شاخ پێشمەرگە بوون یاخود لە گوندەکاندا دانیشتبوون و خۆیان لە ئاگری شەڕی ئێراق/ئێران، بەدوور گرتبوو! هەندەک لە کادرە عەسکەرییەکانی یەکێتی، فشاریان بۆ ئەو سەربازهەڵاتووانەش دەهێنا کە لە گوندەکاندا دانیشتبوون و ئەدەبیاتی مارکسیستییان دەخوێندەوە..

سەرکردایەتیی کۆمەڵە، بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوچەی سەرکردایەتی و پوچەڵکردنەوەی هەر هەوڵێک کە بۆ دەربازکردنی ئێمە بدرێت، هێزێکی گەورەی لە ناوچەی گەرمیانەوە، بۆ سەرکردایەتی هێنابوو، بە بارێکی دیکەشدا، سەرگەرمی کۆکردنەوەی هەموو کادر و لێپرسراوەکانی کۆمەڵە بوو کە جارێ ئامانجەکەی بۆ ئێمە ڕوون نەبوو.

# زنجیرەکان لە دەستەکان دەناڵێنن

ئێوارەیەکی سارد و باران بە لێزمە دەباری، پاشی نانخواردنی ئێوارە، دوو پێشمەرگە منیان ئاگادار کردەوە، خۆم ئامادە بکەم و لە دەرەوە چاوەڕێم دەکەن. من، هەستام و خواحافیزیم لە مەلابەختیار کرد و لە پرسگە وەدەرکەوتم. لە دەرەوە، شۆڕش حاجی و دوو پێشمەرگە وەریان گرتم.

_ مامۆستا! دەبێت دەست و چاوت ببەستین!

_ پێویست دەکات؟

_ بەڵێ.. فەرمانمان پێ دراوە.

دەستەکانم لە پشتەوە شەتەک دران و بە جامەدانییەک چاویان بەستم. شۆڕش و پێشمەرگەیەک، لە هەردوو لاوە باڵیان گرتم و لەسەر گردەکەوە، بەرەو نشێو پەلکێشیان کردم. لە دۆڵەکەدا، دەنگی ماتۆڕی ئۆتۆمبێلێک تێی گەیاندم کە بۆ جێگایەکم دەبەن. منیان لە پێشەوە دانیشاند و «شۆڕش» لە تەکمەوە سوار بوو. ئۆتۆمبێلەکە جولا. من هیچم نەگوت. شۆفێرەکە کە من نەمدەبینی، گوتی: یەکێتی، لەسەر شووشە، تەقلە بە فیل لێ دەدات و ناشهێڵێت شووشەکە بشکێ! من گوتم: ئێمە کەروێشک بووین و فیل نەبووین! ئاوەها لە نێوان دوو هاوڕێی خۆمدا، بە دیلی دانیشێنرابووم. من هەستم بە چ ڕک و کینەیەک بەرانبەریان نەدەکرد، بگرە هەمان خۆشەویستیی جارانم بۆ ئەوان هەبوو. ئەوان چۆنیان بیر دەکردەوە؟ نازانم! من لە سۆنگەی داپۆشینی بیناییمدا، نەمدەتوانی هەستی ئەوان لە چاوانیاندا بخوێنمەوە!

بە چاوی داپۆشراوەوە، هەستم دەکرد، ئۆتۆمبێلەکە بە هەورازێکدا سەردەکەوێت. چەند خولەکێک و ماشینەکە وەستا و منیان دابەزاند و دەست و چاوانیان کردمەوە.. بارەگایەک بوو بە نێوقەدی چیایەکەوە، کە لە پشتی گوندی «یاخسەمەر»دا هەڵکەوتبوو. واتە زۆریان دوور نەخستبوومەوە و مەسەلەکە تەنها لێکهاوێرکردنی من و مەلابەختیار بوو.

ئەمە بارەگای بەشێک لەو پێشمەرگانە بوو کە بۆ پارێزگاریی سەرکردایەتییان هێنابوون. من، جگە لە «وەستاعەبدول» کەسی دیکەیانم نەدەناسی. ئەوان تەواو نوێ و نەناسراو بوون.

ڕۆژی پاشتر، پێش نیوەڕۆژ، ئازادهەورامی و مستەفاچاوڕەش سەردانیان کردم. ئەوان لە دۆخەکە بێزار بوون و لە چاوانیاندا، گلە و گازندەم دەخوێندەوە.. وەک ئەوەی بڵێن: بۆ وەهاتان کرد تا کار بەم جێگایە بگات؟! دیسانیش، هەردووکیان، بە جۆرێک قسەیان دەکرد، وەک ئەوەی بیانەوێت ئارامییەک بە من ببەخشن.

من، گوتم: رەوشەکە گۆڕاوە و خراپ دەبینم.. پێشتر، بەمجۆرە ڕەفتاریان لەگەڵ نەدەکردین!
ئەوان گوتیان: دەڵێن مەلابەختیار هەوڵی دەربازبوونی داوە! ئێمە هەرچییەکمان بۆ سووککردنی دۆخەکە پێ بکرێت، لە هەوڵداین.
دازاهەورامی کە پێش ڕووداوەکە، زۆرمان گفتوگۆ کردبوو، هەرگیز وای دەرنەخست کە ئێمە هەڵە بووین و بۆچوونەکانی ئەو درووست بوون.
پاش نیوەڕۆژ، کاک عەینەدینی برام، شێخ خالیدی خاڵم و براژنم هاتنە سەردانم. ئەوان، پێش ئەوەی بێنە لای من، مامجەلالیان دیبوو. مامجەلال پێی گوتبوون: هەرگیز چاوەڕێم لە پشکۆ نەدەکرد وەها هەڵویستێک بگرێت و خیانەتمان لێ بکات. ئەو لای من، جێگایەکی تایبەتی هەبوو.. کارەکان لە دەست سەرکردایەتیی کۆمەڵەدان و ئەوان بڕیاری کۆتایی دەدەن!
کەسوکارم، پەشۆکابوون و توشی شۆک هاتبوون. لە چاوانی براژنمدا، دنیایەک حەسرەت و پەژارەم دەخوێندەوە.. لە سەرەتای چوونەشاخمدا، ئێوارەیەکیان لە ئەشکەوتان وەدەرکەوتین و بۆ نانخواردن چووینە گوندی «بۆیین». لە ماڵێکدا کە خاوەنماڵەکە ناوی «مەجیدبۆیینی» بوو، پشوومان دا و پاشتر نامەیەکم نووسی بۆ براژنم و بەهەمان پیاودا کە بڕیار بوو سبەی بۆ شار بچێت،ناردم. لە نامەکەدا، تەنها ویستبووم هەواڵ و دەنگی سەلامەتیی خۆم بگەیەنم. لە کۆتاییدا ئەم کۆپلەشیعرەی «هێمن»م نووسیبوو:

کوردەواری، ئەی وڵاتە جوانەکەم!
ڕۆڵەکەم، خێزانەکەم، باوانەکەم!
ئەی ئەوانەی قەت لەبیرم ناچنەوە
ئێستا بمبینن ئەری دەمناسنەوە؟

ئەوسات، پێم وابوو، شەهیدبوون لە شۆڕشی درێژخایەندا، مەودای بینینەوەی خۆشەویستانم نادات..
هەر نەبێت بینینەوەی من لە زیندانی هاوڕێیانی خۆمدا، شتێک بوو، هەرگیز پێشبینی نەدەکرا.
ئێوارە، تۆپبارانێکی خەست دەستی پێ کرد، لە چرکەیەکدا، چەندین گوللەتۆپ دەتەقینەوە. هەموو پێشمەرگەکان و منیش، لە حەشارگەیەک خۆمان پەستاوت کە پێشتر بۆ خۆپاراستن، لە شاخەکەدا هەڵکەندرابوو. شەو، بە مەبەستی دەستبەناوگەیاندن، داوای چوونە دەرەوەم کرد. دوو پێشمەرگە، منیان بردە دەرەوە و تەنها مەترێک لە پشتسەرمەوە وەستان و چەکەکانیان سوارکردن. خرەی ڕاکێشانی میلی چەکەکانیان، هەستێکیان لا درووست کردم کە بەجێهێنانی پێویستییەکەیان لە بیر

بردمەوە.. زۆر ئەستەمە، دوو چەکدار بە چەکی سوارکراوی دەستیانەوە، لە پشتتەوە بوەستن و تۆ بتوانیت خۆت خاڵی بکەیتەوە..

هەموو زیندانییەک، دەبێت ئازار و نیگەرانی بچێژێت، ئەمە یاسا و ڕێساکانی زیندانە، بەڵام سەختترین ئازارەکانی ئازادی لێزەوتکردن، خولقاندنی نیگەرانییە ڕۆحییەکانە کە لایەنی بەرپرس، لە ڕێگای زیندانوان و ئێشکچییەکانی زیندانەوە، جێبەجێی دەکات.

شەو تا بەیانی و بە درێژایی ڕۆژەکە، تۆپباران، وێنەی ئەو بارانەی بە لێزمە چەند ڕۆژان بوو دەباری، ورووتی ئەدا، بۆیە ناچار، بە هەمان ئۆتۆمبێل و بە دەست و چاوی بەستراوەوە، منیان بۆ شوێنێکی دیکە گواستەوە.

ژێرزەمینێک بە درێژایی ٢٠مەتر و پانایی چوار مەتر، لەنێو گوندی یاخسەمەر و تەنیشت ماڵ و بارەگای فەرەیدون عەبدولقادر، دەرگاکەیان کردەوە و بە چەند پلەیەک، دایانبەزاندمە خوارێ. حەشارگەیەکی تاریک و کونبڕ، لە سووچێکدا، پارچەڕاخەرێک و لێفە و دۆشەکێک ڕاخرابوون و چرایەکش بە نیوەمردوویی دەگڕا.. زرمەی تۆپان دەهات و من ترسێکم نەبوو.. نیوەشەو، ساتێ تۆپباران خەست و خەستر بوو، ئیدی هەم پێشمەرگەکان و هەم بەشێک لە خەڵکی ئاوایی، بۆ خۆپاراستن، خۆیان لە حەشارگەکە خزاند و منیشیان لە تەنهایی ڕزگار کرد.

ڕۆژی دوایی، گرمەی تۆپان بڕا، دەرگەیان کردەوە و مارف کە لێپرسراوی دەستەکەی فەرەیدوون بوو، وەژوور کەوت و گوتی: مامۆستا میوانت هاتووە، فەرموو با بڕۆین. لە دەرەوە، چاوانم ڕەشکەوپێشکەیان دەکرد و بۆ چەندساتێک هیچم نەبینی، پاشتر چووینە ماڵی فەرەیدون. چنووری خوشکەزام، لە سلێمانییەوە هاتبوو، بە قورگی پڕ هەنیسکەوە، باوەشی پێدا کردم و لە تەنیشت ئەودا دانیشتم. فەرەیدون خەریکی ڕیشتاشین بوو. ئەو بەدەم ڕیشتاشینەوە، قسانی دەکرد و باسی لە مەترسیی ئەو دۆخە و ئەو کارەی دەکرد کە ئێمە خولقاندبوونمان یاخود خۆیان پێیان خۆش بوو کە ئەنجام وا بشکێتەوە. چنوور، چوون دڵگەرم بوو، لە ئاست قسەکانی فەرەیدوندا زۆر توڕە و ڕەق بوو.. فەرەیدون، باسی فیلمێکی بۆ گێڕاینەوە، گوایە ساڵانێکی زۆر پێشتر دیتبووی.. کورتییەکەی بەسەرهاتی دەسەڵاتدارێک بوو کە بەناچاری برایەکی خۆی دەکوژێ و لە باخچەی کۆشکەکەیدا، لە گۆڕی دەنێت و هەموو ڕۆژێک بەیانیان، چەپکەگوڵێک لەسەر گڵکۆکەی دادەنێت. فەرماندەکە دەڵێت: من ناچاربووم براکەم بکوژم، چوونکە بەنیاز بوو دەسەڵاتم لێ وەرگرێت، هەموو بەیانییەکیش بە جوانترین گوڵەوە، کڕنووشی بۆ دەبەم، چوونکە خۆشەویستترین کەسم بوو.. ئەمەیە شەڕی دەسەڵات! فەرەیدوون، دەیویست بێژێ: ئێوە هاوڕێ و برا خۆشەویستەکانی ئێمەن، بەڵام مەترسیتان لەسەر دەسەڵاتی ئێمە دروست کردووە، بۆیە دەبێت بە ناچاری بتانکوژین!

چنوور، تێی گەیاندم کە نامەی ڕێکخستنی شاری پێیە و دەبێت بیگەیەنێت. من، وەهام دەبینی کە هیچ بوارێکی تێدا نییە و چەندین جووت چاو، چاودێریی هەڵسوکەوتمان دەکەن. چنوور، گوێی پێ نەدا و نامەکەی بە بەرچاوی هەموویانەوە، لە گیرفانم ناخنی. من، ناچار بووم، داوای ڕۆشتنە توالێت بکەم. توالێت لە حەوشەکەدا بوو.. لە توالێتەکەدا، نامەکەم دەرهێنا، وەلێ بواری خوێندنەوەیم نەبوو.. دەستم لە گیرفانم گێڕا، بازنەیەکی بچکۆلەی لەزگەی داوییم بە دەستەوە هات. نامەکەم بە لەزگە، بە داوکەڵمەوە چەسپ کرد و هاتمە دەرێ.

پاشی تەواوبوونی دیدارەکە، گەڕاندمیانەوە ژێرزەمینەکە و بە گەیشتنم پاسەوانەکە گوتی: جلەکانت داکەنە، بە پێوە بوەستە! گۆرەوییەکانت و هەرچیت هەیە لەسەر زەوییەکەیان دابنێ.. چۆنی گوت، وەهام کرد.. دەستی بە لەشمدا هێنا و هیچی نەدیتەوە. لە گیرفانمدا، نامەیەکی دیتەوە کە چنوور لەگەڵ ئەو نامەیەدا هێنابووی و من دەمزانی کە نامەیەکی ئاساییە، بۆیە لە گیرفانمدا دامنابوو.. ئەو نامەکەی برد و ڕۆیشت، کە گەڕایەوە، زۆر داوای لێبووردنی کرد. چونکە نامەکە شتێکی تایبەت بوو بە ژیانی خۆم، نەک بە سیاسەت و ئاڵای شۆڕش. پاشتر، نامەکەی ڕێکخستنی شارم کردەوە کە بە درێژی هەموو ڕووداو و گۆڕانکارییەکانی شار و شاخیان بۆ نووسیبووم و باسیان لە هەوڵ و چالاکییەکانی خۆیان کردبوو.. نامەکە زۆر ڕەق بوو، بەیاننێکیان لەسەر ڕوداوەکە بڵاوکردبووەوە لێوانلێو لە توندوتیژی.. دیارە لە هەلومەرجێکی وەهادا، نەدەکرا نەرم و نیان بن، بەڵام دەکرا سیاسییانەتر بنووسرادا.

هێشتا ڕۆژانی سەرەتای ژیانی زیندانە و ڕووداوەکانی دەرەوەی زیندان ڕوون و داساکاو نین. من، وەکو زیندانییەک، جارێ تامەزرۆی پێداویستییەکانی ژیانی دەرەوەی زیندان نیم.. جارێ نەبوونی ئاو، هەتاو، هەوای ئازاد و خۆراک، نەبوونەتە چەقی بیرکردنەوە و هەراسانیان نەکردووم، بگرە بیرکردنەوە لە نەگەری پێشهات و ڕووداوەکان و ئاراستەی سەرکێشانی دۆخەکە، ڕووگەی تێهزرین و ماکی نیگەرانییەکانی منن.

## تەختی خەو لە نێو ئاودا!

شەوێک، دەرگای ژێرزەمینەکەیان کردەوە، دوو پێشمەرگە، فەرمانیان پێ دام تا هەستم و لەگەڵیان وەدەرکەوم. یاخسەمەر، لە بێدەنگیدا خەوتبوو. باران بە لێزمە دەباری، تەقینەوەی گوللەتۆپێک، ئاوبەناو، ئارامیی گوندی دەشێواند و بۆنی باران و باروت، خانەکانی ناخیان تژی دەکردن. لە گوند دەرچووین و بە ئاراستەی بارەگای پرسگەی مامجەلادا، سەرکەوتین. لە تەنیشت پرسگەکەوە، لەبەردەم دەرگایەکدا وەستاین کە چەند پێشمەرگە، پاسەوانییان لێ دەکرد. من، پێشتر ئەو دەرگایەم نەدیتبوو. یاخود شوێنێکی تایبەت و تازەدرووستکراو بوو کە لە دڵی شاخەکەدا هەڵکەنرابوو. پاسەوانێک دەرگاکەی کردەوە و منی بردە ژوورەوە و دەرگاکەی کلیل کردەوە.. شێخعەلی و «ئەبەز»م دیتن کە لەسەر دوو چەرپا دانیشتبوون و بە بینینی من هەستان و بەخێریان هێنام. ئەبەز، سەرتیپی یەکێتی بوو. لەسەر نامەیەک کە شێخعەلی بۆی ناردبوو و هاورێیەکی خۆی نێوەڕۆکی نامەکەی بە سەرکردایەتی گەیاندبوو، گومانیان لێ کردبوو و بۆ زیندانیان هێنابوو.

ناو زیندانەکە، گۆماوێک بوو بۆ خۆی، ئاو هەتا نیوەی پێی تەختی خەوتنەکان هاتبوو. دیارە، دانانی ئەو تەختانەش بۆ خەوتن، هەر لە سۆنگەی ئاوەکەدا بوو. زیندانەکەیان لە گردەکەدا هەڵدرپیبوو. زەوییەکە ئاوزێم و لەو ساڵە تەڕ و پڕبارانەدا، کانیلەکان تەقیبوون.

ئەو شەوەمان لە نێو زیندانەئاودا ڕۆژکردەوە و بۆ بەیانی، بۆ بارەگای پرسگەکەیان گواستینەوە.

بە درێژایی ڕۆژەکە، هەرسێکمان، لە بارەگای پرسگەکەدا پێکەوە بووین. ئەوێ، فراوان و گەرمتر بوو، لەگەڵ پێشمەرگەکاندا، بواری قسە و دەمەتەقێمان هەبوو، کەسانێکمان دەدیتن کە بە ڕێکەوت یان بۆ خۆپاراستن لە تۆپباران، دەهاتنە ئەوێ.

ئێوارێ، لەژێر باڵی تاریکی و ڕێژنەی باراندا، منیان جیا کردەوە، دەست و چاویان شەتەکدام و دوو پێشمەرگە، بەرودوا، دیسانەوە بەرەو ناو گوندیان گێڕامەوە.

ژوورێکی ئێجگار فراوانی بێڕاخەری پڕ خاشاک و تۆزاوی، تەختێکی خەوتن لە بەشی سەرەوەدا دانراوە، سۆپایەکی نەوت دەگرێ، دوو پەنجەرەی گەورە کە بە نایلۆنێکی زەردباو کونبڕ کراون.. ئەمە دەبێتە زیندانێک و من لێرەدا، چاوەڕێی چارەنووس و ڕووداوەکان دەکەم.

مارف، دێتە ژوورەوە، قۆرییەک چا، پیاڵە و شەکر، بە ڕیزەوە، دادەنێت و دەڵێ: مامۆستا، ئێرە جێگای پێشمەرگەکانی دەستەی کاک فەرەیدوونە، ئێمە لە ژوورەکەی ئەوبەرین، هەرچییەکت پێویست بوو بانگمان بکە.. پێش ئەوەی بخەویت، دێینەوە بۆ لات. ئەو ڕۆیشت و دەرگاکەی قوفڵ کرد.

کاتژمێر دەوروبەری ١٠ی شەو، مارف هاتەوە و گوتی:
_ مامۆستا پێویستت بە دەرەوە هەیە؟
_ بۆ دەستبەئاوگەیاندن.. بەڵێ.
لە ژوورە دەرکەوتین و بە ئالآنێکدا، چووینە کۆڵان. لە کۆڵانەکدا، چەند پێشمەرگە لە ئامادەییدا وەستابوون. مارف گوتی: لێرەدا!
لە ژێر باراندا و لە دڵەڕاوکێ و حاڵەتێکی دەروونیی ئاڵۆزدا، پێویستیی خۆمم جێبەجی کرد. لە ژوورەوە، مارف گوتی: کاتی خەوتنە و دەبێت خۆت ئامادە بکەیت تا دەست و قاچت ببەستین!
گوتم: چ پێویست بە دەست و قاچبەستن دەکات؟!
گوتی: داوای لێبووردن دەکەم، فەرمانم پێ کراوە و من فەرمانی سەرەوەی خۆم جێبەجی دەکەم! ئیدی من لە دۆخەکە گەیشتم و قسەیەکم بۆ کردن نەبوو، یاخود چ قسەیەک پێویست نەبوو.
لەسەر زگ ڕاکشام و مارفیش دەستەکانمی لە پشتەوە بەستن و پاشان قاچەکانیشم.. بە دوو پەتوو داپۆشیم و بە جێی هێشتم.. مارف، دەرگاکەی بە زنجیرێک کڵۆم کرد. لە مێژ بوو مارفم دەناسی. ئەو، پێشمەرگەیەکی ئازا و ڕۆحسووک بوو کە لە شەڕێکدا، چاوێکی لە دەست دابوو. ئەو گەنجێکی قسەخۆش بوو، جگە لەوەی ئەرکەکانی خۆی بەرانبەر بە من، بە باشی جێبەجێ دەکردن، دیسانیش بێڕێزیی پێ نەدەکردم.. ڕەنگە دەست و قاچبەستنی زیندانییەک، خۆی لە خۆیدا هەم بێڕێزی بێت و هەمیش ئازاردانێکی جەستەیی و دەروونی، بەڵام ئەوە ئەو نەبوو کە بڕیار بدات، ئەوە سەرکردایەتی و سکرتێری کۆمەڵە بوون کە بێڕێزییان بە من دەکرد و ئازاریان دەدام.

## مانگرتن و لێکۆڵینەوە

بە دەنگی بادانی کلیل و ڕاکێشانی زنجیری دەرگا، وەئاگاهاتم. مارف بوو کە بە سینییەکی ڕازاوەی بەرچاییەوە وەژوور کەوت. هەنگوین، ماست، کەرە و پەنیر لە ماڵی فەرەیدوونەوە، پاکیزەخانی هاوسەری، بە «مارف»دا ناردبووی و گوتبووی با فەریدوون ئاگادار نەبێت.. من گوتم، بڕیارم داوە، جگە لە ئاو، هیچی تر نەخۆم. مارف گوتی: بۆ مامۆستا مانت گرتووە؟

گوتم: بەڵی مانم گرتووە.

گوتی: بۆچی؟

گوتم: دەست و قاچبەستن و زیندانیکردنی من لەم ژوورە ساردەدا و لەژێر ڕەهێڵەی تۆپباراندا، بێ هیچ لێکۆڵینەوەیەک و بێ ئەوەی بوارم هەبێت لێپرسراوێک ببینم، بێ ئەوەی کەسێک مافی سەردانی منی هەبێت، بێ ئەوەی دەنگم بە کەسێک بگات و وەکو بێچووەپشیلەی چاونەتروکاو، هەر شەوێک لە کونێکم دەشێرنەوە، ئەم دۆخە سەخت و نائاساییە، هیی ئەوەیە مانی بۆ بگریت. مارف گوتی: من ئانەکە جێ دەهێڵم و تۆش ئارەزووی خۆتە.

پاشی کاتژمێرێک، مارف هاتەوە و سینییەکەی چۆن هێنابوو، هەر ئاواش بردییەوە.

چەند ڕۆژێکم لەو ژوورەدا بە ڕێ کردن. شتێک بۆ کاتبەسەربردن نەبوو.. ڕۆژانە، درێژایی ژوورەکەم چەندجاران دەپێوا و هاتوچۆم دەکرد. ئەم ژوورە، ڕۆژگارێک، پۆلی دەرسخوێندنی قوتابیانی گوند بووە. پەنجەرەکان، تا بڵێی فراوان بوون، بەڵام بە شێوەیەک نایلۆنیان تێ گیرابوو، دنیای دەرەوەت نەدەبینی.. لە لایەکەوە، بە ئاستەم نایلۆنەکەم کون کرد و لە گوندم دەڕوانی.. ئێرە، ڕێک ناوەڕاستی گوندە و لەو کونە گچکە سیحراوییەوە، جموجوڵی خەڵکانی گوند دەبینم.. ئێستا، پۆلێک ژنی ڕەشپۆش دەبینم کە لە گوندەوە، بەرەو بارەگای مامجەلال دەڕۆن.. لە نێو ئەوان ژناندا، خوشک و خوشکەزا، پوور و پوورزاکانم دەناسمەوە. ئەوان هاوڕێی دەیان دایکی شەهید، بۆ سۆراخکردنی ئێمە هاتوون. ڕۆژانی پاشتر، ئەوەم زانیی کە دایک و باوکی پۆلێک شەهید، چوونەتە لای مامجەلال و نەوشیروان مستەفا. ئەوان گوتبوویان: لەبەر خاتری خوێنی شەهیدەکانی ئێمە کە لەگەڵ ئەم لێپرسراوانەدا پێشمەرگە بوون و گیانی خۆیانیان بە کۆمەڵە و یەکێتی بەخشیوە، داوای پاراستنی گیانی ئێمە، لە ئەوان و سەرکردایەتیی کۆمەڵە دەکەن.

ڕۆژانی پاشتر، تۆپبارانی بەعس، بە جۆرێک چڕ بوو، ژیانی هەموولایەکی لە مەترسیی خستبوو.. لێپرسراوان و پێشمەرگەکان، کاتێکی زۆریان لە حەشارگەکاندا بەسەر دەبرد.. گوللەتۆپەکان، لە

دەوروبەری زیندانەکەی مندا دەتەقینەوە و زیندان لە بۆنی باروت، ڕەنگی دووکەڵ، هاتوهاواری ژنان و زیرەی مندالانی هەترەشچوو، تژی دەبوو.. پێشمەرگە و پاسەوان لە دەرێ نەبوون و هەموو خۆیان لە ژێرزەمینەکان توند کردبوو.. بانگی پاسەوانم دەکرد و وەرامێک نەبوو.. ئەو ڕۆژانە، خراپترین باری دەروونیم هەبوو.. دەروونێک، لێوانلێو لە ترس و دڵەڕاوکێ و تۆقاندن! چ سەختە، تۆ دەساڵان، لە دژوارترین دۆخی کوردستاندا پێشمەرگە و کادر بیت، دەیان هاوڕێت لەگەڵ تۆدا شەهید بووبن، دەیان جار لە مەرگ گەڕابیتەوە و قەدەر بۆ ئەوەی بە زیندوویی هێشتبێتیەوە تا لە زیندانی سەرکردەکانی خۆتدا، بە گوللەتۆپێکی بەعس بکوژرێیت!

دۆخەکە ئارام و زرمەی تۆپان بڕا.. من، نزیکەی دوو هەفتەم لەو ژوورەدا گوزەراندبوو کە شەوانە و لە کاتی خەوتندا، دەست و قاچم بە حورمەتەوە، شەتەک دەدران!

ڕۆژێک ئیبراهیم جەلال، بە ڕێکۆردەرێکەوە وەژوور کەوت و گوتی: من، بە فەرمانی ناوەندی کۆمەڵە، لێکۆڵینەوەت لەگەڵ دەکەم. من گوتم: فەرموون ئامادەم.

برایم جەلال، یەک لە کادرە دێرینەکانی کۆمەڵە بوو، وابزانم، ڕۆژگارێک ئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی بوو بوو، بەڵام، پاشتر لە هیچ پلینۆم و کۆنفرەنسێکی کۆمەڵەدا، چانسی هەڵبژاردنەوەی بۆ کۆمیتەی سەرکردایەتی نەبوو. ئەو کەسێکی دڵسۆز و لەخۆبردوو بوو، دوو برای شەهید بووبوون، یەکێک بوو لە نەیارە سەرسەختەکانی ڕەوتی ئێمە، کەچی لە نێو هیچ گرووپ و ڕەوتێکی دیکەی کۆمەڵەشدا، خۆشەویست و لەبەردڵان نەبوو. برایم جەلال، وەکو کەس، پیاوێکی تووڕە و تۆسن و نەیدەتوانی پەیوەندییە کەسەکییەکانی خۆی، لەگەڵ هیچلایەک بپارێزێت، هەر لەم سۆنگەیەشەوە، گرووپەکانی ناو کۆمەڵە، پشتگیرییان لێ نەدەکرد، ئێستا کە ئێمەی نەیارانی خۆی، بە زەلیلی دەبینی، کەیفی ساز بوو.

ئیبراهیم جەلال، بە دوو ڕۆژان و لە دوو دانیشتنی درێژدا، لێکۆڵینەوەی خۆی لەگەڵ مندا ئەنجام دا. کۆی پرسیارەکانی ئەو و وەرامەکانی من، ڕەنگە دوو کاسێتیان پڕ کردبێت. پرسیارەکان، ورد و هەمەجۆرە بوون.. ناکۆکییە فیکرییەکان، کێشە سیاسییەکان، پەیوەندییەکانی ئێمە لەگەڵ حیزب و لایەنەسیاسییەکانی دیکەی کوردستان، پەیوەندی ئێمە و سالارعەزیز و م.جەعفەر، سەرچاوەی داهاتمان، سەرچاوەی چاپەمەنییەکانمان، کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستای ئێران و ڕۆڵی ئەوان لە شکڵگرتنی فیکری و سیاسیی ئێمەدا و زۆر بابەتی دیکەش کە من بە ئاگاییەوە، وەرامم دەدانەوە و ناکۆکیم لە پرەنسیپ و بۆچوونە فیکری و سیاسییەکانی خۆمان دەکرد و بە ورەیەکی بەرزەوە، ڕەخنەم لە هەموو ئەو سیاسەتانەی کۆمەڵە و یەکێتی، لەسەر ئاستی ناوخۆی ڕێکخستن و دەرەوەیدا دەگرت.

من، ساتێ بەوپەڕی نارازیی خۆمەوە، لەو ڕوانگەیەوە کە پێم وابوو لەسەر هەقم، قسانم دەکرد، برایم جەلال هێندەی دیکە قەڵس و تووڕە دەبوو، بە شێوازێک قسەی دەکرد کە سووکایەتیی پێوە دیار بوو.. ئەو گوتی: قسەیەک هەیە دەڵێت: نارازیی من لەو شوێنەوە دەست پێ دەکات کە نارازیی تۆ کۆتایی دێت! من دەمزانی چی دەبێژێ. ئەو، لاقەرتیی بە مانگرتنەکەی من دەکرد و دەیگوت: ئەمڕۆ کرێکارانی کانەبەردەکانی سەرچنار، بڵاوکراوەیەکیان دەرکردووە و پشتگیریی مانگرتنەکانی ئێوە دەکەن.. هاکا هەموو کرێکارانی جیهان خرۆشان! پاشتر گوتی: ئەگەر ئێوە سەرکەوتوو بان، هەموو سەرکردەکانی کۆمەڵەتان، لەژێر ئالآیەکی سووردا، هەڵدەواسین! چ بیرکردنەوەیەکی سەقەت بوو! ئاخر شتێک بە ناوی سەرکەوتن و دۆڕاندن، لە کن ئێمە، بوونی نەبوو. ئاخر ئێمە، نەماندەویست تەلاری یەکێتی شەق بکەین و لێی وەدەرکەوین. ئەمە، ئەو باجە بوو کە ئێمە دەبوو بیدەین.

## پلینۆمی نائاسایی کۆمەڵە و بڕیاری ئیعدامکردنی ئێمە!

ئێوارەیەک لە باران و ساتەوەختێک لە نیگەرانی، فەزایەک تژی لە گرمژنی تۆپباران و هەورەبرووسکە، چرکەساتانێک لە ترس و تۆقاندن، کردەی ڕۆحگوشینی دەست و چاوبەستن، نامێتە دەبن و هەڤرا، بوون و هەستی من دەکرۆژن. من، لە چاوەڕووانیی نادیاردا، بە هزرێکی جەنجاڵەوە، جەستەی دەست و چاو شەتەکدراوم، بێ ویستی خۆم، لە نێوان دوو پێشمەرگەدا دەبزوێنم و دیسانەوە لە کونجێکی بارەگای پرسگەی مامجەلالدا، هەڵدەتروشکێم.

کاتژمێر ۹ی ئێوارە، لە دەرگاوە، دوو کەسی بە من ئاشنا دێنە ژوورێ، حەمەتۆفیق ڕەحیم و جەبارفەرمان و دوو پێشمەرگە بە دوویاندا. بەرەو لای من دێن. من، هەڵدەستم و دەست بۆ حەمەتۆفیق ڕادەدەم و ئەویش دەستم دەگوشێت و بە گەرمی هەواڵپرسینم دەکات. من، دەمەوێت هەمان ڕەفتار لەگەڵ جەبارفەرمانیش دووپات بکەمەوە، کەچی ئەو، دەستی دەکێشێتەوە و بە دەنگێکی پڕ لە کینەوە، فەرمانی دانیشتنم پێ دەدات! حەمەتۆفیق، تەنها دەمانچەیەکی پێیە و چەکی هەڵنەگرتووە. جەبار فەرمان، کلاشینکۆفی سازدراو لە شاندا، بە باڵای بەرز و کاسکێتی خوریی سەرییەوە، بە ئەفسەری لێکۆڵینەوەی نێو فیلمی «دکتۆرزیفاکۆ» دەچێت، یاخود من لەو ساتەدا، وەهای دەبینم.

جەبارفەرمان: ئەوی بۆت دەخوێنمەوە، بڕیاری پلینۆمی کۆمەڵەیە و ئێوە وەکو ناپاک حوکمتان لەسەر دراوە و ئیعدام دەکرێن، بەڵام ئەگەر خۆتان وەرامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە و دان بەوەدا بنێن کە خیانەتتان لە کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانی کردووە، هەوڵتان داوە ڕیزەکانی یەکێتی بشێوێنن، پەیوەندیتان بە پارتییەوە کردووە، ناو و ناوبانگی کاک نارامتان بۆ بەرژەوەندیی خۆتان بەکار هێناوە و دژایەتی کۆمەڵەتان پێ کردووە.. ئەگەر ئەم شتانە بسەلمێنن، ئەوا سەرکردایەتیی کۆمەڵە بڕیارەکە دەگۆڕێت و ئیعدام ناکرێن!

جەبار، پارچە کاغەزێکی پێ دام کە ئەو پرسیارانەی تێدا نووسرابوون. من، پرسیارەکانم خوێندنەوە و پێم وا بوو، ملدان بەم مەسەلەیە، مانای واژۆکردنی فەرمانی مەرگی خۆم. ئاخر، ئەو تۆمەتانە زۆر لە ڕاستییەوە دوور بوون. من گوتم: ناتوانم ئەمانە بسەلمێنم.. هیچ نەبێت ڕێگام بدەن مەلابەختیار و شێخەلی ببینم و پێکەوە بڕیارێک بدەین.

جەبار گوتی: ئەوان بە تەنیا بڕیاری خۆیان داوە.

گوتم: من ناتوانم بەتەنیا بڕیار بدەم!

حەمەتۆفیق گوتی: ئەوان کاری خۆیان یەکلا کردووەتەوە.. ئەگەر دەتەوێت، بە گۆڕی شەهیدسەلاح

سوێندت بۆ دەخۆم.. تەنها تۆ ماویت و خۆت مەکە بە قوربانیی شتێک کە نایهێنێت.
گوتم: بڕوا ناکەم! ئەوان کاری وەها ناکەن، منیش ناتوانم..
گوتی: هەرچییەکم پێ گوتیت ڕاستە و ناچار نیم درۆت لەگەڵ بکەم.
جەبار گوتی: یەک کاتژمێر مۆڵەتت پێ دەدەین، یەک کاتژمێر و دێینەوە، ئەگەر وەها نەکەیت، هەر ئەمشەو دەتبەینە سەر جادەی قیر، وەکو خایین و پیاوی بەعس ئیعدامت دەکەین و خیانەتنامەکەشت، لەسەر لاشەکەت جێ دەهێڵین! ئەوان ڕۆیشتن و منیش بە تەنها و وەکو پاڵەوانی ئەو ڕۆمانانەی لە ژووری ئیعدامدا، چاوەڕێی جەللاد دەکەن، لەگەڵ شریتی یادەوەرییەکانی ژیانی خۆمدا، چاوەڕێ بووم.
هەرا و هەنگامەیەک لە نێو گونددا دروست بوو، قیامەت خرۆشا، گەورە و بچووک، بەرەو خوار ئاوایی جمان و ئێمەی منداڵانیش بە دوی ئەواندا غارمان دا.. هەموو دەیانگوت: کوژراوە و تەواو!
_ جەردە ڕووتیان کردووەتەوە، هەموو پارەکەیان بردووە و کوشتوویانە.
_ لەم وڵاتە، کوا پیاوخراپ و جەردە ماون، ڕەنگە دووژمندار بووبێت، دووژمنەکانی فرسەتیان لێ هێناوە و تەواو.
_ کورە دووژمنداری چی، کێ بیستوویەتی ئەورەحمان، زەرەری بۆ مێشوولەیەکیش هەبووبێت!
_ من ئەزانم، من خۆم یەکەم کەس بووم گەیشتمە سەر لاشەکەی.. لەسەر زگ کەوتبوو، ڕێک لە بەردەم «قەڵاتەی یەسوو»دا بوو، زۆری نەمابوو بگاتە هەڵەبجە، دوو گوللەیان پێوە نابوو و تەواو! پارچەکاغەزێکیان لەسەر جەستە خوێناوییەکەی جێ هێشتبوو، لێی نووسرابوو (خایینی گەل و شۆڕش!) من، لە پۆلی دووەمی سەرەتایی بووم، نەمدەزانی «خایین»، «گەل» و «شۆڕش» خەڵکی کام وڵاتن و چ کارەن، بەڵام شتێکم دەزانی، ئەویش «حەمە»ی کوڕی ئەورەحمان بوو، واتە «حەمەی دادە سۆییە» کە هاوپۆل و هاوتەمەنی من بوو. من، بۆ «حەمە» زۆر نیگەران بووم، کە بە کزی و بێباوکی دەمبینی، گەلێکم خەم لێ دەخوارد. ئێستاش نازانم ئەورەحمان بۆ کوژرا؟ کێ بڕیاری ئیعدامکردنی دابوو؟ ئەرێ بەڕاست خایین بوو یان چی؟ لە شۆڕشدا، ناپاکان دەکوژرێن و کەسانێکی پاکیش، بۆ مەبەستی تر و لەژێر پەردەی ناپاکیدا، لەناو دەبرێن!

جەبارفەرمان، لەگەڵ دوو پێشمەرگەی تایبەتی خۆی هاتنەوە. جەبار گوتی: ها.. وەرامەکانت نووسینەوە؟ گوتم: نا.. ناتوانم هیچ وەرامێکی وەها بنووسم. گوتی: ئاخر ئەمشەو ئیعدامت دەکەین! گوتم: ئەوە ناهەقییەکی گەورەیە کە ئێمە بێ دادگاییکردن ئیعدام بکرێین و مافی چ بەرگریکردنێکمان نەبێت، بۆچی دادگامان بۆ دانانێن و ئێمەش داکۆکی لە خۆمان و فیکری خۆمان بکەین؟ ئەو گوتی:

کاتمان بۆ گوێگرتن لەم قسانە نییە.. تازە درەنگە و هەمووشت بەسەرچوو! ئێستا دەنووسیت یان نا؟
گوتم بە تەنها ناتوانم، دەبێت هاورێکانم ببینم. ئەو گوتی: ئارەزووی خۆتە، رووی لە پێشمەرگەکان کرد و پێی وتن: دەست و قاچی ببەستن و هیچ کەسێک بۆی نییە نزیکی بێتەوە و قسەی لەگەڵدا بکات. ئەو وەهای گوت و ژوورەکەی جێ هێشت.
لە کونجێکی ژوورەکەدا، بە دەست و قاچی بەستراوەوە، وەکو شتێکی بێبەها و پۆخڵ گرمۆڵە بووم.
دایکم دەڵێ: پاڵتۆکەت لەبەر بکە و بچۆ بۆ بازاڕ، کیلۆیەک فاسۆلیا، دوو چەپک سەوزە، نیو کیلۆ گۆشت لای حاجی سادق بکڕە و زوو وەرەوە، ئاگات لە خۆت بێت، پارەکە لە نێو دەستتدا توند بگرە و دەستت بخەرە گیرفانی شەرواڵەکەت، تا بزری نەکەیت! پاڵتۆیەکی موشەمای ئێرانی بە ڕەنگی سەوز، باوکم لە لەنگە بۆی کڕیبووم، لەبەر دەکەم و پێڵاوە لاستیکەکان لە پێ دەکەم. لەپێکردنی پێڵاوی لاستیک لە زستاندا، تەزوویەکی سارد لە نووکی پەنجەکانتەوە، تا قوڵایی دڵت هەڵدەکشێ. ئازاری ئەم تەزووی سەرمایە، تەنها ئەو کەسانە دەیناسن کە زستانان جووتێ پێڵاوی لاستیکی ئێرانییان هەبوویێت و لە بەستەڵەکی بەیانیاندا، بۆ قوتابخانە یاخود بۆ کارکردن، لە ماڵ دەرکەوتبن.
لە دەرگای ماڵەوە بۆ سەر شەقامە قیرڕێژەکە، هەر پەنجا مەترێک دەبێت. پەنجا مەتر، بە نێو ئەو گۆماوانەدا کە شەختەیان کردووە و تۆ کە پێیان لەسەر دادەنێیت، سەرەتا خرچەیەک دەکات و پاشان قاچەکانت، تا خوار ئەژنۆت، تەڕ دەبن و ئێژی بە گوێزان قاژیان دەکەن. پێڵاوە لاستیکەکانت، پڕ دەبن لە وڵماو، ئیدی دڵت پێش پەنجەکانت دەرچێت.. خەڵک، تاکوتەرا لەسەر شەقامی کانییەقووڵکە، بەرەو ناوبازار دەڕۆن، هاڕەی هەڵدانەوەی دەرپابەی دووکانەکان، هەستێکی تایبەت لە کن تۆ درووست دەکات.
من، کە لە گوزەری سەوزەفرۆشەکان نزیک دەبمەوە، دۆخێکی نائاسایی دەبینم، ترسێک لە چاوانی خەڵکانی ناوبازاڕدا دەخوێنمەوە و دەبینم کۆمەڵێک لە بەردەم دووکانی «شێخ ساڵەح»دا ئاپوورەیان داوە، منیش کونجکۆڵیی منداڵانەم دەبزوویێت و بەرەو قەرەباڵەخییەکە دەڕۆم، لەنێوان دوو کەسەوە، ڕێگا بۆ جەستەی بچووکم دەکەمەوە و ئیدی شتێک دەبینم کە لە سەرەتادا، لێی حاڵیی نابم، پاشان دەزانم لاشەیەک لەسەر زگ ڕاکشاوە، جلی خاکیی لەبەردایە، جامەدانییەک نیوەی لاشەکەی داپۆشیوە، لەژێر زگییەوە خوێنێکی ڕەش، چۆراگەی بەستووە و لە پایینی پێیەکانیدا، گۆمێکی چکۆلەی دروست کردووە.. ترس دامدەگرێت، تف لە دەممدا وشک دەبێت، بە ئەسپایی دەکشێمەوە و پاشان وەکو شێتان غار دەدەم.. دەگەمە ماڵێ و وەکو لاڵان، بە دەستراوەشاندن، دەمەوێت بۆ دایکمی بگێڕمەوە، کە تەرمێکی لە تەقەی دوێنێشەو بەجێماو، هێشتا لە بازاڕدا کەوتووە. ساڵان ڕۆیشتن و پاشان

تێگەیشتم کە ئەوە تەرمی پێشمەرگەیەک بوو بە ناوی «کەریمی یونس»، بە گوللەی جاشەکانی «ڕەشەی ساڵەحە» کوژرا بوو!

ئێستا من، وێنای لاشەی لە خوێنشەلاڵی خۆم دەکەم کە لەسەر شەقامێک ڕاکشێنراوە و یەکەمین ڕێبواری ئەو بەیانییە، دەیبینێتەوە! لاشەیەک، لەسەری نووسراوە (ناپاکی گەل و شۆڕش!)

## لەبەردەم ئەوشیروان مستەفادا

پاش نزیکەی کاتژمێرێک، پێشمەرگەیەک هات و قاچەکانی کردمەوە و گوتی: هەستە!
من، بێ دەنگ هەستام و پێشی کەوتم. لە ژوورەکە وەدەر کەوتین و هەر سەد مەترێک ئەولاتر، دەرگای ژوورێکی کردەوە. منی پێش خۆی لە ژوور کرد، چرایەکی پێ کرد، سۆپایەکی ئەوتی داگیرساند و گوتی: دانیشە!
ئەو، دووبارە قاچەکانی بەستمەوە، جێی هێشتم و دەرگاکەی قفڵ کرد.
ئەوێ، هەمان جێگا بوو کە چەند ڕۆژ پێشتر و تەنها بۆ شەوێک، منیان بۆ هێنا بوو. ئەوشەوەی لەگەڵ شێخعەلی و خاڵەنەبەزدا، لەسەر ئەو تەختی خەوتنانەی لە نێو ئاودا وەستابوون، پێکەوە ڕۆژمان کردەوە.
ئێستا ژوورەکە چاک کراوە و چ ئاوی لێ نییە.. ژوورێک، دوو مەتر پان و چوار مەترێک درێژ دەبێت. لەبەر تیشکی چراکەدا، پەنجەرەیەکی ئاسن دەبینم کە لەسەر ڕاڕەوێکی زۆر تەسک و تاریکە، دەرگای ڕاڕەوەکەش، دەرگای دەرەوەیە و کلۆم دراوە. واتە ئەمە ژوورێک و ڕاڕەوێکە لە نێو شاخەکەدا، بە تایبەت بۆ زیندانیکردنی ئێمە دروست کراوە و تا بڵێی تۆکمەیە. لە نێو ڕاڕەوەکەشدا، شوێنێکی تایبەت وەکو «توالێت» دروست کراوە کە من ئەمشەو، بە قاچی شەتەکدراوەوە، ناتوانم کەڵکی لێ وەر بگرم. لە ژوورەکەدا، ڕاخەر و پێخەو هەن، بەڵام لە درێژترین شەوی ژیانی مندا، خەو پەیدا نابێت.. لە کارەساتی چارەنووسێک دەڕوانم کە لێم دەڕووانێ و کلۆڵەی یادەوەرییەکانی نزیکەی ٩ ساڵی خەبات و مەینەتییەکانی شاخم لێ دەناڵۆسکێنێ.. دایکم لە دەستپێکی کاردا، گوتی: ئەم کارەی تۆ دەیکەیت، ئەک هەر بە هیچکوێیەک ناگات، سەریشت تێدا دەچێت و منیش ڕەنجبێوەر دەکەیت! دایکم، لە بەردەم بەهێزی و دڕندەیی بەعسدا، ئەقڵی بۆ چارەنووسێکی وەها نە دەچوو، چارەنووسێکی پڕ زەلیلی، بە دەستی هاوڕێ و هاوخەباتەکانی خۆم...
یەکێک لە مانگەکانی کۆتایی ساڵی ١٩٧٥ بوو، لەگەڵ «عەلیی شێخ حەمەساڵەح»ی برازای مامجەلالدا، خوێندکاری قۆناغی دووی کۆلێجی کشتوکاڵی زانکۆی سلێمانی بووین. من و عەلی، لە هەمان بەشی ناوخۆیی زانکۆ دەژیاین. عەلی گوتی: شۆڕش دروست دەبێتەوە، ڕێکخراوێک بە ناوی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دروست بووە و «مامە» و چەند کەسی دیکە دایانمەزراندووە.. ئەمە شتێکی نوێیە، ئاغا و کوێخای تێدا نییە، خوێندەوار و ڕۆشنبیرەکان ڕێبەرایەتیی دەکەن، جووتیاران و هەژارانی کوردستان، هێزەکەی دەبن!

گوتم: هیچی نووسراوت پێیە؟
گوتی: بڵاوکراوەیەک زۆر نهێنە. بەیانی بۆت دەهێنم. منیش لە خزمێکی خۆمم وەرگرتووە و دەبێت بیدەمەوە. عەلی، بڵاوکراوەکەی بۆ هێنام و چەپکێ تیشکی لە ناخمدا چاند.. وا ئێستا، مەشخەڵانی ئەو تیشکی سەرەتایە، پاشی ١٠سالآن، دێت دەمسووتێنێ و وەکو خایین ئیعدامم دەکات..
ماڵی «سەباحی حەمەچاوەش»، لە یەکێک لە کۆڵانە پێچاوپێچەکانی گەڕەکی گاوراندایە.. ئەوان، هاتوونەتە سلێمانی و لە ماڵێکدا کرێچین. من و سەباح، هاورێی منداڵی و خوێندکاری زانکۆین. خێزانی سەباح، بە بنەماڵە، سەر بە حیزبی شیوعی بوون، بەڵام سەباح و سەلاحی براگەورەی، لەو ماڵەدا، کۆمەڵەیان بە من ناساند و لەوێ کتێبەکانی مائۆ، کیم ئایل سۆنگ و جیڤارامان خوێندنەوە. لە ماڵی «حەمەی حەمەساڵەح»دا، لەگەڵ عومەری برابچووکیدا، بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەمان، دەستاودەست پێ کردن، بابەتەکانی کتێبە سوورەکەی «مائۆ»مان، بۆ کوردی وەرگێران و بڵاومان کردنەوە، چەندین ژەم، ساوەر و ترشیاتمان خوارد. دایەحەپسە، دەیگوت: هەر کەسێ ساوەر و ترشیاتی ماڵی ئێمە بخوات، دەچێتە شاخ یاخود بەعس دەیگرێت.. ئەنوەر حەمەمینی شەهید، لە ژوورە بچووکەکەی خۆیدا، بۆ یەکەمجار، پێکێ ویسکیی دەرخوارد دام و باسی ئەوەی بۆ کردم کە چۆن لە «شام» مامجەلالی بینیوە!
ئەمشەو، لەم زیندانەدا، هەستم لای دەنگی دەرگایە و چاوەڕێم، هاکا دەرگا کرایەوە و بە دەست و چاوبەستراوی، پەلکێشیان کردم و لەگەڵ هاڕەی دەستڕێژێکدا، هەموو یادەوەرییەکانم هەڵفرین..
لە چێشتخانەکەی زانکۆدا، بە «عەلیی شێخ حەمەساڵەح»م گوت: لە ساڵوەگەڕی ئیعدامکردنی شەهیدشەهاب و هاورێکانیدا، پۆستکارتێکی جوان چاپ کراوە، ئەگەر چەند دانەیەکت بۆ بهێنم، دەتوانیت بیاندەیتە کەسانی جێگای متمانە و پارەیان لێ وەربگریت؟
عەلی گوتی: من، یەکەم بڵاوکراوەی یەکێتیم پێ دایت، بەڵام ئەمەیان خەتەرە.. دەزانیت چ وەزعێکە و چەند خوێندکار گیراون و بێ سەروشوێن کراون؟! من، یەکێک لە پۆستکارتەکانم دا بە «خاڵەحەمە»م، ئەویش پێنج دیناری ئەو سەردەمەی داپێم کە پارەیەکی زۆر بوو! «یوسف حوسێن»ی هاورێم، پۆستکارتەکانی بۆ من هێنابوون. یوسف، ئەو هاورێیەی من بوو لە زانکۆ، کە پاشتر لەگەڵ مامۆستامەجیدکەریم»غاندی»دا، بەعس دەیانگرێت و ئیعدامیان دەکات. پاش نزیکەی سی ساڵان لە شەهیدبوونی یوسف، من، بەرگی یەکەمی «ئەزموون و یاد»، پێشکەش بە ڕۆحی ئەو دەکەم.
ئەمشەو، دواهەمین شەوی ژیانی «یوسف» لە زینداندا، وێنا دەکەم..
دواهەمین شەوی ژیان و لەگەڵ کازیوەدا، ئیدی ڕووبەڕووی مەرگ دەبێتەوە.
ئەمشەو، من «یوسف»م، براکانم، منیان لە بنی بیرە قووڵەکە هاوێژتووە، نازانم ئاخۆ کراسە

خوێناوییەکم، نیشانی ڕۆحی باوکم دەدەن یان نا؟ من، دەمەوێت لێکچوونەکانی نێوان حاڵەتی دەروونیی دواشەوی ژیانی خۆم و یوسف. لە دوو شوێنی جیادا، لە دوو زەمەنی جیادا، لە پێناوی دوو مەبەستی جیا و هەمانکات لێکچوودا. بدۆزمەوە! وێنەکان، لە زۆر باردا، هاووێنەن و لە هەندەک حاڵیشدا وەها نین.

دەبێت ئێستا کاتژمێر چەند بێت و چەندی شەوگار مابێت.. قرخە و کۆکەی پاسەوانی زیندانەکەم، هەندێکجار، لە گرمژن و ناڵەی تەقینەوەی گوللەتۆپێکدا دەخنکێن.. چزەیەک لە پشتم هەڵدەسێت، وەک ئەوەی مشکێک یاخود سمۆرەیەک بە ددانە تیژەکانی گازم لێ بگرێت. ئەگەر زستان نەبووایە. و تەختی زیندانەکەش چیمەنتۆڕێژ، ئەوا گومانم بۆ مار دەچوو، خۆم بۆ سەر تەنیشت وەردەگێڕم و چزەیەک لە زگم دێت. من، جێگۆڕکێ بە جەستەم دەکەم و گازگرانیش، زیرەکانە، سەنگەرەکانیان دەگوێزنەوە.. ئیدی تێدەگەم کە دوو مشک، لە دەرلنگی شەرواڵەکەمەوە یاخود لە هەر شوێنێکی دیکەوە، دزەیان کردووەتە ناو جلەکانم و نێچیری خۆیان، بە دەست و قاچبەستراوی دیوەتەوە. من و دوو مشکی جاربەزە و چەقاوەسوو، نزیکەی چارەکەسەعاتێک، لە شەڕێکی نابەرامبەردا بووین. دەڵێم نابەرانبەر، چونکە من، جگە لە تەپاوتلکردن، هیچ چەکێکی دیکەم نەبوو. تاکتیکی زیرەکانەی من، بۆ گەیشتن بە ستراتیژی پاکتاوکردنی مشکەکان، تەنها خۆهەڵگێڕانەوەی خێرا و کتوپڕ بوو. جارێک «مامۆستا تایەرعوسمان» گوتبووی: باشترین تاکتیکی شەڕی پارتیزانی، خۆحەشاردان و قەلاچۆکردنی دوژمنە! پێشمەرگەکان گوتبوویان: نا، خۆحەشاردان و هەراسانکردنی دووژمن! ئەم دووژمنانەی من، شانسێکی باشیان هەیە، نە دەستم هەیە بیوەشێنم و نە دەشتوانم خۆم حەشار بدەم. لە کێشمەکێش و بگرەوبەردەی نێوانْ مشکان و مندا، هێزی «من» سەرکەوت و دەسکەوتی نەبەردەکەشم، کەلاکی دوو مشکم تا بەیانی، لە نێو چۆخەکەمدا هەڵگرتن و بەهیوا بووم، سبەی پاداشتێک وەرگرم!
لە ڕۆژنەی زیندانەوە، گزنگی دا و ژوورەکە دەهات ڕەنگی سپێدەی دەگرت. زۆری نەخایاند، دەنگی بادانی کلیل لە کیلۆنی دەرگای ئاسندا، ڕایچەناندم. پێشمەرگەیەک هات و دەست و قاچی کردمەوە، منیش چیرۆکی شەڕی مشکەکانم بۆ گێڕایەوە..
پێشمەرگەکە گوتی: لە ژووری هەم ئاو هەیە و هەم توالێت، دەتوانیت دەموچاوت بشۆیت، پاشتر نان و چات بۆ دەهێنم!
من، سوپاسم کرد، چوومە توالێتەکە، دەبەیەکی نایلۆنی پڕ ئاوی لێ بوو، دەست و ڕووخسارم شتن و ئەویش بە کووپێک چا و نانێکی تەنوورەوە، گەڕایەوە.. من، چایەکەم بێ نان، فڕ کرد و جگەرەیەکم

پێ کرد و پاڵم لێ دایەوە.. ئەورۆژە، تا نیوەڕۆژ کەس دەرگای نەکردەوە. نیوەڕۆ، نانیان هێنا و ڕۆیشتن.

پاش کەمتر لە کاتژمێرێک، پێشمەرگەیەک دەرگای کردەوە و گوتی: کاک نەوشیروان، دێت بۆ لات! گوتم، بەخێر بێت!

نەوشیروان، بە تەنها وەژوور کەوت و دەرگاکەیان پێوە دا. من، هەستام و ئەو گوتی: پێویست ناکات، دانیشە! ئەویش دانیشت..

_ کێشمەکێشی چەندساڵەی نێو کۆمەڵە و یەکێتی، گەیشتە ئێرە.. لێرەدا تەواو! ئیتر بواری هیچ مرۆڤێتیکی تیا نەماوە.. ئێوە شکستتان خوارد و ئێمە سەرکەوتین! ئێوە گەورەترین زەرەرتان لە کۆمەڵە و لە یەکێتی دا و دەبێ باجەکەیشی بدەن!

_ هەر ئێمە بەرپرسیار نین لەوەی ڕووی دا.

_ با.. ئێوە بەرپرسیارن و ئیعدامیشتان دەکەین. ئەوە بڕیاری پلینۆمە و هەموو کادرەکانی کۆمەڵە ئیمزایان کردووە.. جێبەجێکردنی بڕیارەکەشیان بۆ من جێ هێشتووە.. مەگەر خۆتان بتوانن بیگۆڕن و خۆتان ڕزگار بکەن.

_ ئاخر ئێمە چی بکەین؟ بۆ چارەیەکی تر نییە؟

_ هیچ چارەی تر نییە.. ئەوی ئێمە دەمانەوێت دەبێت بیڵێن و بینووسن! پێت وایە کە ئیعدامتان ناکەین و مناوەرەتان لەگەڵدا دەکەین؟ با پێت بڵێم و باش گوێ بگرە! حیزب نەماوە لە کوردستاندا. ئێمە کادر و سەرکردەمان لێ نەکوشتبێت، هەر وەکو ئەوانیش لە ئێمەیان کوشتووە! ئێمە، «عبدولاسوور»مان کوشتووە، بۆچی پێت وایە کە تۆ ناکوژین؟ حیزبەکەی عەبدولاسوور، لە حیزبەکەی تۆ بەهێزترە، عەشرەتەکەیشی لە عەشرەتەکەی تۆ گەورەترە! ئەگەر ڕۆژێکیش، ئێمە سەرنەکەوتین و شکستمان خوارد، ئەوەندەمان دووژمن هەیە تۆڵەمان لێ بکەنەوە. حیزب و عەشرەتەکەی ئێوە، فریای تۆڵەسەندنەوەتان ناکەون!

نەوشیروان، ئەم قسانەی دەکردن، بێ ئەوەی توورەبوونی خۆی نیشان بدات یاخود جۆرێک لە سووکایەتیم پێ بکات (ئەگەر خودی دۆخەکە، سووکایەتیپێکردن نەبێت!) ئەو، پێچەوانەی سرووشتی خۆی، زۆر هێمن و ئارام دەیپەیڤی. من، وەکو لە بەرگی یەکەمی «ئەزموون یاد»دا، لە سەر کەسایەتیی نەوشیروان قسەم کردووە، بێجگە لە یەکەم پێککەیشتنمان، ئیدی لە ماوەی ٩ساڵدا، هەرگیز قسەیەکی توندی لە ڕووی مندا نەکردبوو. گوتم: دەبێ ئێستا من چی کەم؟

گوتی: ڕاپۆرتێکم بۆ دەنووسیت، جگە لە جەختکردن لەسەر ئەوەی کە ئێوە کارێکی خراپتان کردووە و ئەم کارەشتان زەرەری بە کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان گەیاندووە، دەبێت

مێژوویەکی دروستبوونی ئاش، کۆبوونەوەکانتان، ڕێکخستنەکانتان، پەیوەندییەکانتان، گۆڤار و بڵاوکراوەکانتان، ناوی سەرکردەکانتان و کادرەکانی شارەکانتان و هەموو شتێکم بۆ بنووسیت! ئیتر بواری خۆدزینەوە و ئەملاوئەولای تێدا نەماوە!

گوتم: ناتوانم کاک شێخعەلی و کاک مەلابەختیار ببینم؟

گوتی: ئێستا نا..

گوتم: کەی دەبێت ئەم شتانە بنووسم؟

گوتی: تا سبەینێ کاتژمێری ٨ی بەیانی مۆڵەتت هەیە و پاش ئەوە ئیتر تەواو! دەمەوێت وەڵامی یەک پرسیارم بدەیتەوە، ئەمەیان تەنها بۆ خۆمە، شتێکە و من سەری لێ دەرناکەم..

_ فەرموو!

_ ئێمە، چ وەکو کۆمەڵە و چ وەکو یەکێتی، هێزمان هەیە، دەسەلات و پارەمان هەیە، پێم ناڵێی، ئەم هەموو کادرە عەسکەرییەی کۆمەڵە، چۆن شوێن ئێوە کەوتن و پشتیان لە ئێمە کرد؟

من گوتم: لەنێو ڕیزەکانی کۆمەڵەدا، جارێ فیکر و سیاسەت کار دەکەن و گرنگییان ماوە، ناکۆکییەکانی ئێمەش لەگەڵ ئێوە، ناکۆکیی فیکری و سیاسین، جگە لەمە، ئێمە هەوڵمان نەداوە، ئەو کادرانە، لە یەکێتی دوور بخەینەوە..

گوتی: با، بە کردەوە وەهاتان کرد!

گوتم: نەماندەویست وەها بکەین، ڕێگای دیکە هەبوو!

ئەو، بابەتەکەی کۆتایی پێ هێنا و هەستا، لە ڕۆشتنەدەرەوەیدا، گوتی:

سبەینێ هەمووشتێکم دەوێت!

کاغەز و قەڵەمیان هێنا و دەرکەی زیندانیان داخست.

هێشتا ئێوارەیە و شەوێکی دووروردرێژی کۆتایی مانگی دیسامبەری ١٩٨٥م بۆ بیرکردنەوە، نووسین و داخزەلیلکردنی خۆم لە بەردەستدایە.. بیرکردنەوە لە چی؟ لە شۆڕش، شۆڕشێک کە لەوێدا باجی بیرکردنەوە و تێفکرینی جیا و ئازاد، ئیعدامکردن یاخود پاشگەزکردنەوە و ئیعترافپێکردنە. پاکانەپێنووسین، لەژێر حوکمی ئیعدامدا، جگە لە ئیعدامکردنی ڕۆح و دەربازکردنی جەستەیەکی بێزراو، شتێکی دیکە نییە.. باشە، هیچ مەلێ و هیچ مەنووسە، با جەستەت پاکتاو بکەن و ڕۆحت بە ئاسوودەیی بگاتە ئاسمان! بەڵام ڕۆحێک بە نێزەی هاوڕێکانی خۆت، لە جەستەت دەربهێنرێت و بۆ ئاسمان هەڵفڕێنرێت، بڵێی ئاسودە و بەرزەفڕ بێت؟ داخۆ گیانبەختکردن، لە هەموو کاتشوێنەکاندا، هەمان بەها و پیرۆزیی هەیە؟ دەمەوێت بڵێم، داخۆ ئیعدامکردنی من لێرەدا، هەمان بەهای ئیعدامکردنی شەهید»ئەنوەرەکان«ی هەیە کە بەعس ئیعدامی کردن؟ یاخود هاوبەهای خوێنی عەلی عەسکەری و

هاورێکانییەتی کە بە چەکی «پارتی» ڕژێنرا؟ هەموو خوێنەکان، هەمان بەهایان هەیە و ڕۆحەکانیش هەروەها، جا لە هەر کوێدا برژێنرێن و بە هەر دەستێک هەڵفڕێنرێن. بەڵام من کە لە ناخەوە دژی شەڕی کورنکوشتنم و بە کردەوەش، چەندساڵە ئەو کارەم نەکردووە، ئێستا چۆن بە دەستی هاورێکانی خۆم بکوژرێم؟ سەرکردە و کادرەکانی حیزبی سۆسیالیست، چەندیان لە شەڕەکاندا کوژران و پاشان ئەوانەیان مابوون، لەسەر مێزی گفتوگۆ، پارووی چەوریان دەگلاندن! ئەوانەی خۆشمان هەروەسا.. هەموو ئەوانەی لە شەڕی براکاندا کوژارن، وەکو کوژراوانی نێو فیلمەکانی «کاوبۆی» وەها بوون... ئێستا، بۆ منیش، وەکو نەوشیروان گوتی، هەموو گەمە سیاسییەکان کۆتاییان هات.. ئێستا ئیدی دەبێت گەمە لەگەڵ مەرگی خۆمدا بکەم! ئێستا، کۆمەڵەیەک و شۆڕشێک کە من هەموو ژیانی گەنجیی خۆمم پێ بەخشیون، چنگاڵە خوێناوییەکانی خۆیان لە دڵم گیر کردوون و دەیانەوێت ونجڕونجڕی بکەن.. هێشتا هیچم نەنووسیوە، بەڵام پێ دەچێت بینووسم! چی بنووسم؟ نازانم! توانستی هزرین و نووسینم نییە، ناخم لێوانلێوە لە گریان.. هەر بەڕاستی وایە و هیچ شەرمیش ناکەم. من دەزانم، ئەمشەو، بارتەقای هەموو شەوەکانی ژیانم هەنسیک دەدەم و دەگریێم.. ئەوی دەڵێ، گریان بۆ پیاو نەهاتووە، گەورەترین سووکایێتی بە ژن دەکات! بە درێژایی ئەم ساڵانەی پێشمەرگەێتی، ئەگەر گوللەیەکم وێ کەوتبا و کوژرابام، فریای گریان نەدەکەوتم و ئەوسا نەمدەزانی مرۆڤێکی ئازام یاخود ترسنۆک! دەستەکانم دەلەرزن و فرمێسکەکانم، هۆن هۆن دەڕژێنە سەر کاغەزەکەی بەردەستم، کاغەزی نووسینی پاکانە، بۆ سەرکردە و سکرتێری حیزبی خۆم! حزبێک، کە من، دەیان تێکۆشەرم لە پێناوی ژیانی ئەودا، بۆ مەیدانی مردن ناردووە و ئێستا خۆم، لەژێر کێردی خوێناویی دەستی ئەودا، وەکو کارژۆڵە هەڵدەلەرزێم.

دەنووسم، بەڵام جارێ شەوی ماوە.. ئەمشەو کە دەستم ئاوەڵایە، مشکەکان سەروسەکوتیان دیار نییە، چ دوژمنێکی کەمفرسەت بوون دوێنشەو، بە دەست و قاچبەستراوی، گاڵەیان پێ کردم..

تەنیا دەستی «مەحمووی ڕیشسوور»، بریندار بووە. غەفور دەرهێشیشی، لەبەر تیشکی ئاگرەکەدا، بە دەستجوولاندن تێی گەیاندم.. ئێوارە، لە «سیروان»ەوە کردمانە ئەمبەر و لە «تەوەنەوەل»ەوە، شانەوشان، بۆ کووڕەی باڵانبۆ سەرکەوتین.. بە بەرزایی هەموو باڵانبۆ داگەڕاین و یاڵەویاڵ، لە پشتی «بامۆک»ەوە، بەرەو عەبابەیلێ، ملمان نا.. مەفرەزەیەکین حەوت کەس، برسی و تینوو و لەپێکەوتوو، بە نێو دڕکوداڵی نیوارەیەکی پاییزی ١٩٧٨دا، بە هیوای باخەکەی «حاجی سەعی» و ئانوچایەکی گەرم، هەناسەبرکێمانە.. دەگەینە بن پەرژینی باخ و وەبەر ڕێژنەی گوللە دەدرێین و من تەنها پزیسکی گوللەکان دەبینم، گوێیەکانم لە کار کەوتوون.. ئێمە، تەقە دەکەین و پاشتر هەموو چەکەکان کپ دەبن. من، ئاوڕ دەدەمەوە، چ هاورێیەکی خۆم نابینم. لە باخەکە دوور دەکەومەوە و دەچمە ئەو شوێنەی بۆ

حاڵەتی لێکدابڕان دیاریمان کردووە، کەسێک نییە. مەفرەزەیەک، بۆ پاریزگاری و گەیاندنی من، لە ناوچەی ئەورۆڵییەوە بۆ هەورامان. ئاسمان هەڵیلووشین و بزر بوون. لە «زەڵەکێ»ی نزیک گوندی «دەڵەمەڕ»ەوە، بە تەنیا و دەست لەسەر ماشەی چەک، بە پسکەپسک، خۆم دەگەیەنمە «باخەتازە» و تەبارەوتەبار سەردەکەوم و لە دواتەڵاندا، دەروبەری ماڵی شێخ عەبدوڵا، دەپشکنم و سووسەی شتێک ناکەم، دەچمە سەر باسکەکەی نزیک ماڵ و ئێستا نێوانی من و دەرگا ئاسنینەکەیان، تەنها جۆگاکەی «کانییەبەهارێ»یە. لەژێر تیشکی گڵۆپی هەیوانەکەیاندا، دەیانبینم و میوانیان نییە. قەڵەمبازێک و سڵاویان لێ دەکەم. ئەوان کەمێک دەشڵەژێن و دەپرسن بۆ بە تەنهام، منیش چیرۆکەکەیان بۆ باس دەکەم، شێخ عەبدوڵلا دەڵێ: جگە لە «عوسمانی عەلی چەتوون»، چەکداری تر لەم ناوە نییە، عوسمان، لە ئێرانەوە، بە ناوی پێشمەرگەیتییەوە، چەند رۆژێکە لەم باخانەدایە و خەریکی ساتوسەودایە لەگەڵ حکومەت، باش بوو سەلامەت دەرچوون. من، پشوویەک دەدەم، نانی ئێوارە لەوێ دەخۆم، نان و چام بۆ رێگا بۆ دەپێچنەوە و بە وریایی، تفەنگی زامنترازاو لە دەستدا، بە تەنیا و لەژێر چەتری تاریکیدا، دوو سەعاتان رێگا، بەرەو گوندی «رێشاو» دەبڕم و لە بن زەردەمایەکی سەختدا، تیشکی ئاگرێک دەبینم و دڵنیام کە هاورێکانمن، بەرەو لای ئەوان سەردەکەوم، ساتێ نزیک دەبمەوە، دڵم دادەخورپێت، ئەگەر دەنگم بدەن و گوێم لێ نەبێت، یەکسەر تەقەم لێ دەکەن! بێ سرتە و بنەبرەوبنەبەرد، سەردەکەوم.. خۆیانن، لەبەر تیشکی ئاگرەکەدا دەیانناسمەوە و ئەوان لە من بێ ئاگان، ناهێڵم هەست بکەن، کاتێک وەخۆیان دەکەون، ئیدی من هێندە نزیکم، دەمناسنەوە و پێویست بە قسەکردن ناکات. ئەوان چیرۆکێکم بۆ دەگێڕنەوە و من شتێکی دیکە، گازندەشیان لێ دەکەم، بەڵام لە دڵی ناگرم.. ئەوان، پێیان وابوو، من کوژراوم، کەچی ئاوڕیان لە لاشەکەشم نەدابوویەوە. هەندەکجاران، مرۆڤ، لە ترسی گیانی خۆی، پێی ناکرێت ئاوڕ لە هیچ بداتەوە، ئەمەش مانای ترسنۆکی نییە، ئیدی ژیان ئەمەیە.. من، ئەمشەو، لە تەنیایی ئەم زیندانەدا، لە نێوان مردن و ژیاندا، لە نێوان رابردوو و ئاییندەدا، بە تەنیا و بەسەر کاخەزێکەوە کە بڕیارە ببێتە بەڵگەی ترسنۆکیم لە مردن و خۆشەویستیم بۆ ژیانێک کە هیچ خۆشییەکی تێدا نییە، دەگریێم!

وا خەریکە دەنووسم.. دەنووسم و دەگریێم.. دەنووسم و ساتێ پێم وایە، نووسین بەسە، وەکو شێتان سەرم بە دیوارەکەدا دەکێشم، جارێک و دوو جار و تا بەرچاوم رەش دەبێت و بێحاڵ دەکەوم، کەللەم وە دیواردا دەکێشم، حاڵەتی بێحاڵیی چەند دەکێشێ، نازانم! دەنگی کلیلی سوڕێنراو لە دەرگادا، وەئاگام دێنێ، دیسان بەیانییە، بەڵام بەیانییەک کە هەموو شتێکی لە ناخ و بوونی مندا گۆڕیوە! نامەکە دەبەن و پێم وایە، ئیدی ئەوشیروان ئۆخژنی کردووە، هەنگاوی داهاتوو چی دەبێت، دیار نییە.

ئێمە لە ئازار و ئەشکەنجەدانتان بەرپرسیارین
ڕۆژی پاشتر، «وەستاعەبدول» دەرگاکەی کردەوە و گوتی: مامۆستا، با بڕۆین!
_ بۆ کوێ؟
_ ماڵی کاک فەرەیدون!
لە زیندان دەرکەوتین و بە گردەکەدا، بۆ ناو گوند شۆڕبووینەوە، چووینە بارەگایەک لە بەردەم ماڵی «فەرەیدون»دا. ئەنوشیروان مستەفا، فەرەیدون عەبدولقادر و زۆرێک لە ئەندامانی ناوەندی و سەرکردایەتیی کۆمەڵە لەوێ بوون. ئەوان، لە حاڵ و تەندرووستیی من پرسیاریان کرد و جۆرێک لە لوتفیان نواند. ئەنوشیروان گوتی:
هەرچییەکی ڕووی دا، تاوانی خۆتان بوو، ئێستا هەموو شت کۆتایی هات و حەز دەکەم بڵێم، هەر ئازار و ئەشکەنجەیەک درابن، هەر قسەیەکی بەرز و نزم لە رووتاندا کرابێت، لەسەر کەسی حسێب مەکەن و ئێمە بەرپرسیارین، هیچ شتێک بە بێ فەرمان و ئاگاداریی ئێمە، لەگەڵ ئێوەدا نەکراوە، هیچ مەسئول و پێشمەرگەیەک، بێ ڕەزامەندیی ئێمە، هیچ کارێکی لە دژی ئێوە نەکردووە، ئێستا تۆ، سێ ئەڵتەرناتیفت لە بەردەمدایە:
١_ ئەتوانیت بگەڕێیتەوە نێو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و کۆمەڵە، وەکو کادرەکەی جاران کار بکەیت!
٢_ کوردستان بە جێ بهێڵیت و بچیتە ئەورووپا، بەڵێن بدەی کە کاری ساسیی ناکەیت و دژی ئێمە نابیت. ئێمە، کارئاسانیت بۆ دەکەین و یارمەتیت دەدەین.
٣_ لێرە بمێنیت، لە شوێنێک بۆ خۆت دابنیشیت و کاری سیاسی نەکەیت!
گوتم: نە دەمەوێت بگەڕێمەوە نێو یەکێتی و نە دەشتوانم لە کوردستاندا دابنیشم، باشترین چارەسەر، جێهێشتنی کوردستانە و ئەمەیانم پێ باشە!
_ چۆنت پێ خۆشە، وەها بکە، بەڵام ڕۆشتنت بۆ ئەورووپا، کاتی دەوێت و دەبێت ماوەیەک لێرە بمێنیتەوە.
_ : دەمێنمەوە و چاوەڕێ دەکەم.
_ : پێت خۆشە برادەرەکانت ببینیت؟
_ : مەبەستت کاک مەلابەختیار و کاک شێخعەلییە؟
_ : بەڵێ!
_ دیارە زۆرم پێ خۆشە.

_ ئەمشەو یاخود سبەینێ، دەیانهێنن بۆ لای تۆ!

فەرەیدون گوتی: لەمەودوا، هەرچییەکت پێویست بوو، جواب بۆ من بنێرە، هەر پێویستییەک. من، کتێبخانەیەکی باشم هەیە، دەتوانیت هەر کتێبێکت بوویت، قەرزی بکەیت و بیخوێنیتەوە. گوتم: سوپاست دەکەم، ڕەنگە کتێب لە هەموو شت باشتر بێت.

دیدارەکە تەواو بوو، منیان گەڕاندەوە زیندان، دەرگایان داخست و گوتیان: هەر کارێکت هەبوو، لە پەنجەرەکەوە بانگمان بکە.

ئەوشەوەم بە تەنیا لەوێ گوزەراند، شەوێک لەگەڵ خۆهەڵخوراندن و خەونی پچڕپچڕدا، ئاخر، مانگێک زیاتر دەبوو کە من زیندانیی بووم و دڵۆپێک ئاو بەر لەشم نەکەوتبوو، لە بۆنی خۆم هێڵنجم دەهاتێ، ئەسپێ کە ساڵانێک بوو دەستی لە ئێخەم بەردابوو، وا دووبارە، بە جەستەم شاد دەبوویەوە.

# وەک ئەوەی دەمانەوێت

دەمەونیوەڕۆ، بۆ دووەمجار، دەرکەیان کردەوە و مەلابەختیار و شێخەلی، وەژوور کەوتن. ئێمە، پاش زیاتر لە مانگێک لە گوزەراندنی زیندانی تەنیایی و لێکدابڕانمان، یەکمان گرتەوە. ئەوانیش منناسا، خەمبار و دەروونشێواو، هەر کەس و چیرۆکی خۆی گێڕایەوە..

ئیسان دەرگەیان کردەوە، برایم جەلال هاتە ژوورێ و گوتی: بە پێی بڕیاری پلینۆم و فەرمانی ناوەندی کۆمەڵە، دەبێ ئێوە، پێکەوە پاکانە بنووسن و لە ژێرەوە واژۆی بکەن! وای خوای گەورە، دەیانەوێت چ قوڕێکمان پێ بشێلن! ئێمە لە یەکدیمان ڕوانی و کەمێک بێ دەنگ ماین. برایم گوتی: من دەڕۆم و دێمەوە، دەبێت بینووسن! ئێمە، پاش بێنەوبەرەیەکی زۆر، ڕێک کەوتین کە شتێک بنووسین. نووسیمان و ئیمزامان کرد. برایم هاتەوە و لەگەڵ خۆیدا بردی، زۆری نەخایاند هاتەوە و گوتی ئەمە قەبووڵ ناکرێت و دەبێت ئەم دێڕە بگۆڕن، ئەمەیان ڕوونتر بێت، ئەوی دیکەیان وەها نانووسرێت. ئەو، وەکو فەرماندەیەکی سەرکەوتوو کە لەگەڵ دیلی شەڕدا قسان بکات، وەها دەپەیفی. ئەگەرچی ئێمە دڵنیا بووین کە ئەو هیچکارەیە و ئەوە ئەوشیروان مستەفا و ناوەندی کۆمەڵەن، ئێمەیان بە گیروگاز هێناوە.. برایم، جارێکی دیکەش، دەقە دەستکاریکراوەکەی بردەوە و هەمدیس گەڕایەوە. ئەو، لەگەڵ دەستنووسەکەی خۆماندا، دوو تێکستی دیکەی هێنابوون، یەکێکیان بڕیاری ئیعدامکردنمان بوو کە هەر جێبەجێکردنی مابوو، ئەویدیکەشیان، تێکستێکی ئامادەکراو بوو کە تەنها واژۆکردنی ئێمەی گەرەک بوو. برایم بە دەنگێک کە لە سووکایەتی خاڵیی نەبوو، گوتی: کاک ئەوشیروان دەڵێ، بواری فروفێڵ و ئەملاولای تێدا نەماوە، دەبێت ئەم دەقە ئیمزا بکەن، دەبێت وەها بکەن، وەک ئەوەی ئێمە دەمانەوێت!

ڕۆژانی پاشتر، دەقی پاکانەیەک کە لە ژێر حوکمی ئیعدامدا، بە ئێمە واژۆ کرابوو، لە ڕادیوی یەکێتییەوە، خوێندرایەوە، لە بڵاوکراوەکانیدا بڵاوکرایەوە و سەدان نووسخەیان بۆ حیزب و لایەنە سیاسییەکانی کوردستان نارد.

لەم پلینۆمە تایبەت و نائاساییەدا کە بۆ ئاگاییکردنی ئێمە و پڕکردنەوەی جێگا بەتاڵەکانی کۆمیتەی سەرکردایەتیی کۆمەڵە بەسترابوو، ٥٨کادری کۆمەڵە (کە هەر هەموویان هاوڕێی چەندین ساڵەی خەباتی سەختی شاخ و شارمان بوون)، بڕیاری ئیعدامکردنی ئێمەیان واژۆ کردبوو. تەنها کادرێک بە ناوی (عەبدوڵاتۆفیق) کە دوور و نزیک، چ پەیوەندییەکی بە ئێمەوە نەبوو، ویژدانی زیندووی، ڕێگای واژۆکردنی بڕیارەکەی پێ نەدابوو.

برایم جەلال، بوویە لێپرسراوی زیندانی ئێمە. ئەو، دەیتوانی زۆر باشتر لەوەی دەیکرد، مامەڵەی لەگەڵ ئێمە بکردایە، داخەکەم وەهای نەکرد و زووخاوێکی زۆری لە رووی دەروونییەوە پێ چەشتین. ئەو، بە پاسەوانەکانی گوتبوو، ئەگەر بانگمان کردن، وەرامیان نەدەنەوە، ئیدی وا دەبوو، کە بە هەموو هێزی خۆمان، هاوارمان دەکرد (حەرەس، حەرەس)، کەسێک بە دەنگمانەوە نە دەهات، لە کاتێکدا، دوو پاسەوان، شەو و رۆژ، لەودیو دەرگاکەوە وەستابوون!

ئابڵووقەی دیدار و کەسوکاربینین، هەڵگیرا.. رووناکی شێخ جەناب و دلێری سەید مەجید، یەکەمین دووکەسێک بوون، پاش وەرگرتنی مۆڵەت لە مامجەلال، هاتنە دیدارمان و هەندەک هەواڵی دەرەوەیان بۆ هێنایین، ئەگەرچی هەمیشە، پێشمەرگەیەک یان دووان، دەهاتنە ژوورێ و بواری ئەوەمان نەبوو، بەتەنها بیانبینین، دیسانیش، رووناک، هەواڵەکانی شار و دەرەوەی زیندانی پێ گەیاندین، کتێبیان بۆ هێنابووین و خواردنێکی بە لەززەتیش کە دەمێک بوو تامەزرۆی بووین. پاشتر، کەسوکاری شێخەلی و من، لە سلێمانی و هەڵەبجەوە هاتن، ئێمەیان بردە بارەگای پرسگەکە و خزمانی ئێمە چەند کەس بووین، هێندەش پێشمەرگە، بەجۆرێک لە نێوانماندا دانیشتبوون کە بواری گفتوگۆیان نەدەداین.
هەفتە و مانگانمان، لەم زیندانەدا بەرێ کردن و کۆمەڵە و یەکێتی، نەک گفتەکانی خۆیان جێبەجێ نەکردن، بگرە ئێمە دەهاتین بێهیوا دەبووین و وەکو هەر زیندانییەک، بیرمان لە هەڵاتن دەکردەوە.

# بیرۆکەکانی هەڵاتن

تۆ لە کۆشکێکدا زیندانی بیت یاخود لە گۆڕەزیندانێکی وەک ئەوەی ئێمەدا، بیر لە هەڵاتن و دەستخستنەوەی ئازادیی خۆت دەکەیتەوە. ئێمەش، لەگەڵ تێپەڕینی زەمەن و هەراسانبوونمان لە ژیانی زیندان، بیرمان لە ڕێگاکانی هەڵاتن دەکردەوە.

شێخەعلی گوتی: من بیرۆکەیەکم هەیە! گوتمان چییە؟

_ نامەیەک دەنووسین بۆ کاک نەوشیروان و داوای بینینی دەکەین!

_ ئێ باشە، چی لەگەڵ کاک نەوشیروان بکەین؟

_ بوەستن با چوارپەلی قسەکانم بکەونە زەوی!

_ فەرموو!

_ ئەو کە دێت، دیارە تەنهایە، دەمانچەیەکی پێیە یان پێی نییە..

_ باشە

_ وەختێک دێتە ژووری و دادەنیشێ، یەکێکمان هەڵدەستێ و دەرگای زیندان لەدیوەوە دادەخات!

_ ئێ..

_ دووانەکەی ترمان پەلاماری دەدەین و بە پشتێنەکەی خۆی دەست و قاچی دەبەستین.. ئەم چەقۆ تیژ و گەورەیە، لەسەر ملی دائەنێم و ئەوجا دەڵێم، داواکانمان جێبەجێ بکەن!

_ چۆن جێبەجێیان بکەن؟

_ داوای ٣چەک دەکەین، نامەیەک دەنووسین و داوای وەفدێک لە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، کۆمەڵەی زەحمەتکێشان و هەندەک کەسایەتیی ناو یەکێتی کە خۆمان دیارییان دەکەین، ئەوان بێن و بە ئۆتۆمبیلێک، نەوشیروان لەگەڵ خۆمان و وەفدەکەدا دەبەین بۆ شوێنێک کە ژیانمان پارێزراو بێت، ئەوسا کاک نەوشیروان لەو شوێنە ئازاد دەکەین!

ئەم بیرۆکەیە، زیاتر لە کاری ئاجێنتەکانی نێو فیلمە ئەمەریکاییەکان دەچوو.. ئەم پلانە، هەرگیز جێبەجێ نەبوو، چوونکە نەوشیروان، ئامادە نەبوو بێتە دیدارمان!

## بیرۆکەی دروستکردنی کلیل!

وەستاعەبدول، کلیلبەدەستی زیندانی ئێمە بوو. ئەو، پیاوێکی بەڕێز و لە ناخەوە ئێمەی خۆش دەویست. وەستاعەبدول، شەوانە دەهات لامان و هەرچییەکمان پێویست بوایە، دابینی دەکرد. هەندەکجارانیش ڕێگای بە هەندەک پێشمەرگەی دێرین دەدا، کە هاوڕێی خۆی بوون و پێیان خۆش بوو، ئێمە ببینن، لەگەڵ خۆیدا بێنە ژووورێ.

شێخعەلی گوتی: وەستاعەبدول کە دێتە ژووورێ و دادەنیشێت، هەمیشە کلیلەکان لە بەردەمی خۆیدا دادەنێت..

گوتمان: ئێ باشە

گوتی: داوای شتێکی لێ دەکەین کە لە مەقەڕەکەی خۆیان بۆمان بهێنێت، بەڵکو کلیلەکان لێرە بەجێ بهێڵێت.. ئەوە ئەگەرێکی زۆرە، چونکە ئەو تەنها ۲ تا ۳ دەقیقەی پێ دەچێت و کە پاسەوانیش لە دەرەوە هەبێت، ئیدی ترسێکی نییە!

_ ئەی دوای ئەوە؟

_ دوای ئەوە، کار کاری منە و دەزانم چی دەکەم!

شێخعەلی، ڕۆژێکیان بە بیانووی هەواوەرگرتنەوە، داوای چوونەدەرەوەی کرد و کە هاتەوە، تۆپەڵێک قوڕی لەگەڵ خۆی هێنابوو.

_ ئەوە چییە؟

_ ئەسڵی ئیشەکە ئەمەیە.

شێخعەلی، تۆپەڵەقوڕەکەی هەڵشێلا و باش خۆشەی کرد و لە پارچەنایلۆنێکی پێچا، ناوبەناو بە ئاو تەڕی دەکردەوە تا وشک نەبێتەوە. ئەم کارە، دوو تا سێ ڕۆژی خایاند و شەوێک وەستاعەبدول وەژوور کەوت، سڵاوی کرد و دانیشت، قسەوباسمان گەرم کرد و مەلابەختیار داوای شتێکی کرد، وەستاعەبدولیش گوتی بە سەرچاو، هەستا و کلیلەکانی لەبیر کرتن. شێخعەلی، پری دایە کلیلەکان، کلیلی بەهەشتی دەناسی، بە خێراییەکی کەموێنە، کلیلی لە پارچەقوڕەکەدا نوقم کرد و کۆپیی کرد، هەر بەو خێراییەش، کلیلەکەی جوان شت، وشکی کردەوە و لە شوێنی خۆی دایناپەوە. پاش ئەوەی وەستاعەبدول ماڵئاوایی کرد، شێخعەلی، قوڕەکەی دەرهێنا، کەمێک لێی ڕوانی و گوتی: ئەمە کە وشک بوویەوە، ئەوسا لەسەر کاخەزێک، وەکو خۆی ئەخشەکانی ڕەسم دەکەم و کاخەزەکە دەنێرینە شار تا

بە پێی ئەم نەخشە، چەند کلیلێکمان بۆ دروست بکەن، کام کلیل لە کۆپییەکەی ئێمەوە نزیک بوو، کار لەسەر ئەومیان دەکەم.

ـ چۆن کاری لەسەر دەکەیت؟

ـ چرک چرک.. چرک چرک! ئەوەی خولەچەخماخەت لە بیر نییە؟ خولەی چەخماخساز.. شەو تا بەیانی، چرک چرک، کەس نازانێ چی ئەکا.. منیش وەها دەکەم!

شێخ عەلی، وەهای کرد و کۆپییەکەی لەسەر کاغەز، بە «ڕووناک»ی هاوسەری مەلابەختیاردا، نارد بۆ شار و پاش چەند ڕۆژێک، ڕووناک بە چەپکێ کلیلەوە گەیشت و بۆ ناو زیندانی هێنا!

چەپکەکلیلمان لە نێو سەتڵێکی هەنگویندا شاردەوە، شوێنێکی باش بوو.

شەو، کە ترسی هاتنەژووریی پاسەوان نەبوو، چەپکەکلیلمان دەرهێنا و کلیلەکانمان پاک کردنەوە، ئیدی کاری چەخماسازیی مامەشێخ، دەستی پێ کرد.

مامەشێخ، کلیلێک کە لە هەموویان زیاتر لە کۆپییە ئەخشێنراوەکەی ئێمە دەچوو، هەڵبژارد و دوو سێ ڕۆژێک، بە دڕبەنی ئینۆککر، کاری کلیلسازییەکەی بە ئەنجام گەیاند!

ـ ئا ئەمەتا! ئێستا مەگەر هیچ شانسێکمان نەبێت، دەنا ڕێک خۆیەتی، مەگەر پیاوی دزێن، لەگەڵ ئەسڵەکەدا، جیای بکاتەوە!

مەلابەختیار گوتی: من تاقیی دەکەمەوە!

ـ دەبێ کاتێک بیکەیت، باران و هەورەگرمە بێ!

ـ جا کەی هەورەگرمە و چەخماخە نییە!

شەوی دواتر، لە ژێر گرمژنی تۆپبارانا، مەلابەختیار، کلیلی لە کیلۆندا سوڕاند و کلیلەبۆر، کاری خۆی کرد! ئەوجا پێچەوانە سوڕاندییەوە و دەرگاکەی کلیل دایەوە!

ئێمە، بە نۆرە، کلیلەکەمان بە دەستەوە دەگرت و لێمان دەڕوانی..کلیلی کردنەوەی دەرگایەک بەرەو ئازادی!

مامەشێخ، کلیلەکەی لە نێو پێخەوەکەیدا شاردەوە و گوتی: خاوەنی کلیلی زیندانی خۆمانین! ئیدی هەر هەڵبژاردنی کات و پلانی دەربازبوونمان ماوە.. دەبێ چاک بیری لێ بکەینەوە.

# پلانی هەڵاتن

هەواڵی کلیلمان بە ڕێکخستنی شار گەیاند و ئاگادارمان کردن کە ئێمە لە شەوێکی ڕەهێڵە و باراناویدا، لە زیندان هەڵدێین و ئەوان هەر لە ئێستاوە، شوێن و جێگای خۆشاردنەوەمان لە شاردا بۆ دابین بکەن.
شەوێک ئاسمان تەقییەوە، باران و هەورەگرمە گاڵەیان دەکرد. ئێمە، بەرگمان پۆشین، پێڵاومان لە پێ کردن، نانمان لە گیرفانمان نا و چاوەڕێ بووین، لەپڕ، لە دەرێ بوو بە دەنگدان و تێخوڕین. پاشتر ئێمە زانیمان کە لە شارەوە، کەسێکیان ناردووە و وای پیشان داوە کە نامەیەکی گرنگی بۆ مامجەلال هێناوە. ئەمەش بۆ ئەوە بووە کە پێشمەرگە و پاسەوانەکان بخاتە غەفڵەتەوە و سەرگەرمیان بکات، بۆ ئەوەی دەرفەت بۆ دەربازبوونی ئێمە بڕەخسێت، بەڵام ئێمە جۆرێکی ترمان لێک دایەوە و ئەو شەوە، دەرنەکەوتین.
چەند شەوێک پاشتر، هەمان دەرفەت ڕەخسایەوە، خۆمان ئامادەکرد و تەواو. مامەشێخ گوتی: من دەرگاکە دەکەمەوە و یەکەم کەس دەرۆم و ئێوە بە دوامدا وەرن. مەلابەختیار گوتی: نا.. من ئەو کارە دەکەم. من، کە لێپرسراوی یەکەمی «ئاڵا»م. لێرەشدا ئەم بەرپرسیارێتییە لە ئەستۆی خۆم دەنێم و ئەگەر پێیان زانین و تەقەیان لێ کردنین، با من یەکەم کەس بم.
هەستمان بۆ تەپەی پێی پاسەوان ڕاگرت، وەهامان هەست کرد کە پاسەوانەکە بەردەرگاکەی جێ هێشت تا بچێت هاوڕێکەی وە ئاگا بێنێتەوە و جێگۆڕکێ بکەن، ئیتر وەخت بوو. مەلابەختیار، لە پشت دەرگاکەوە وەستا و هەستی خۆی ڕاگرت، کلیلی لە کیلۆندا سووڕاند و دەرگای کردەوە، ملی بردە دەرەوە و میللی چەک ڕاکێشرا! پاسەوان هاواری کرد.. ئێمە گەڕاینەوە ژێر پێخەفەکانمان و مەلابەختیار گوتی:
دەرگاکەتان دانەخستووە، ویستم ئاگادارتان بکەمەوە کە ئێوە لە پاراستنی ژیانی ئێمە بەرپرسیارن.. چۆن ئەوەندە کەمتەرخەم دەبن و دەرگا کلیل نادەن! وەستاعەبدول هات و مەلابەختیار، زیاتر خۆی نیگەران کرد و تۆمەتی داخستنی دەرگای زیندانی لە ئەستۆی ئەو نا. مامەشێخ، کلیلەکەی شاردەوە. ئەوان دەرگاکەیان داخست، بڕوایان کرد یان نا؟ دیارە نا.
بەیانی، ئەبوشەهاب کە ماوەیەک بوو لە جێگای برایم جەلال، لێپرسراوێتیی زیندانی ئێمەی وەرگرتبوو، هات و هەندەک لێکۆڵینەوەی کرد، دیسانیش هیچی هەڵنەکڕاند. ئەبوشەهاب، ئەگەرچی کاری خۆی باش جێبەجێ دەکرد و هەموو ڕێ و شوێنێکی بۆ ئەگەری دەربازبوونی ئێمە داخستبوو،

سەگێکی ڕاهێنراوی لەسەربانی زیندان کردبووە پاسەوان، پرۆژێکتەرێکی بەهێزی دانابوو، بەڵام بە درێژایی ئەو ماوەیە، هیچ سوکایەتییەکی پێ نەکردین، بگرە پاسەوانەکان، لە سەردەمی فەرمانڕەوایێتیی ئەبوشەهابدا، نیان و دلۆڤانتر بوون. ئەبوشەهاب، دەرگایەکی ئەستووری لە پۆڵا درووستکراوی لە شار، بە ڕاپان دا و پاش چەند ڕۆژێک دەرگاکەیان گۆڕی.

ئاوا پلانی هەڵاتن، لە سۆنگەی ئەوەی کە هەمیشە، دوو پاسەوان، یەکێک لە سەربان و ئەوی دی لە بەردەرگادا، ئێشکیان دەکێشا و ئێمە، لێیان بێئاگا بووین، شکستی هێنا!

لە کتێبخانەکەی فەرهیدون عەبدولقادر، هەندەک کتێبم قەرزکردبوون و دەمانخوێندنەوە. یادەوەرییەکانی «پاپلۆنیرۆدا»، ڕۆحی ژەنگگرتوومی خاوێن دەکردەوە و لە دنیای زیندانەوە، بەرەو جوانییەکانی ئازادیی هەڵدەفڕاند. کۆمەڵەچیرۆکی «لەژێر ئاسمانی شەختەدا»ی جاک لەندەن، دنیای ئازار و ژانەکانی مرۆڤی بێچارەیان، لای من قووڵتر کردەوە. من و مەلابەختیار، ئەو کتێبەی «جاک لەندەن»مان بۆ کوردیی وەرگێڕا، بەڵام هەرگیز نەمزانی چارەنووسی بە کوێ گەیشت.

## بەهار و ڕۆژنەیەک بۆ تیشکێکی لەرزۆک

زستانی ١٩٨٦مان لەم زیندانەدا بە بەهار گەیاند و جارێ شتێک لە دۆخی ژیان و چارەنووسی ئێمە نەگۆڕدراوە. سێ کەس، لە زیندانێکی ٢ بە ٤ مەتردا کە ڕۆژی سێ جار دەرکەیان لێ دەکرێتەوە، پاسەوانێک دێت و لە پێویستییەکانیان دەپرسێت. خزم و خۆشەویستانیان، جاروبار، ڕێگایەکی دوور دەبڕن و سەردانیان دەکەن. کادر و سەرکردەکانی هاوڕێیان، ئەوانەی کە لە دۆخ و ژیانی ئەوان نارازین، نایەنە دیداریان و بەشێکیان، دڵیان نایهێنێ، ئەوان لە زینداندا، بە زەلیلی ببینن.
ملازم عومەر و ئازادهەورامی، هەڵویستی جوامێرییان دژ بە بڕیاری دەستگیرکردن و ئیعدامکردنی ئەم سێ هاوڕێیەی خۆیان وەرگرتووە. ملازم عومەر، کە لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری و ئەندامی ناوەندی کۆمەڵەیە، لە هەموو شت وازی هێناوە و لە بارەگای خۆی دانیشتووە. ئازاد هەوارمی، کە ئەندامی ناوەند و لێپرسراوی دەسگای ناوەندی ڕۆشنبیریی کۆمەڵەیە، دەستی لە کار کێشاوەتەوە، کوردستانی جێ هێشتووە و ئەودیوی ئێران بووە. سەرکردایەتیی کۆمەڵە و نەوشیروان مستەفا، نەیانتوانی، کۆدەنگیی هەموو سەرکردە و کادرەکانی کۆمەڵە، بۆ پاساوی بڕیارەکەیان بە دەست بهێنن، دەیان کادری کۆمەڵە، دەیان کادری پزیشکی و ڕاگەیاندن، شۆڕش و کوردستانیان بە جێ هێشت.
لە ژێر فشاری بەشێک لە کادرانی کۆمەڵە و شۆڕشگێڕان، نووسەران و ڕۆشنبیران، کەسایەتییە دیارەکانی کورد لە شارەکاندا، مامجەلال و نەوشیروان مستەفا، بڕیاریان دا، هەلومەرجی ژیانمان بگۆڕن. شێخ جەنابی شێخ نووری، بۆ ئەم مەبەستە هاتبووە سەرکردایەتی و سەردانی ئێمەشی کرد.
بە پێی بڕیارەکە، مەلابەختیار، لەم زیندانەی ئێستاماندا دەمێنێتەوە، ئەگەر بیەوێت، دەتوانێت هاوسەرەکەیشی لەگەڵ خۆیدا بژیێ و پێکەوەی بگوزەرێنن، ڕۆژانە دەرگا ئاوەڵا دەبێت و شەوانە، کاتی خەوتن، دایدەخەن. شێخەعلی، دەچێتە بارەگای مەکتەبی دارایی و هەمان ڕەوشی دەبێ. من، دەگوێزرێمەوە بۆ بارەگای مەکتەبی عەسکەری لە گوندی «گاپیلۆن» و لەوێ دەستبەسەر دەبم.
پێش جیابوونەوەمان، لەسەر ئەوە ڕێک کەوتین، لە درێژەکێشانی دۆخی دەستبەسەریدا، ئەگەر نیازی هەڵاتنمان هەبوو، پەیوەندی بگرین و هەوڵ بدەین، پێکەوە هەڵبێین و کەسمان بە تەنها ئەو کارە ئەنجام نەدات.
لە پشتی گوندی «گاپیڵۆن»ەوە، بە نێوەقەدی چیاکەوە، کانییەک هەیە و ئەستێلێکی گەورەی لە بەردەمدا دروست کراوە. چواردەوری ئەستێلەکە، دارگوێزی بەتەمەن و لە خوارێ ڕا، باخچەی

سەوز و بە ڕەونەقی لێ هەن. لێرەدا، خانوویەکی گەورە، بۆ بارەگا دروست کراوە و پەنجا مەترێک ئەولاتر، ژوورێکی گچکە، دەبێتە زیندانەماڵی من.
ژوورەکە، پاک و ڕووناکە. ڕۆژانە دەرکەی کراوەیە و بە شەوان کلۆمی دەدەن. گەنجێک بە ناوی «مامۆستایاسین»، لە بارەگای مامجەلالەوە، نێردراوەتە ئەوێ و لێپرسراوی کاروباری منە. یاسین، گەنجێکی باڵابەرزی ئەسمەر، بەرێز و خۆشگفتار کە زۆر دڵی من ڕادەگرێ و هەرچییەکم بوێت، جێبەجێی دەکات. ملازم فواد چەلەبی، ئەندامی مەکتەبی عەسکەری و کادری شۆڕشگێڕانە. ئەم پیاوە، تا بڵێی نەجیب و بە ماریفەتە و ڕێزێکی تایبەت، لە من دەگرێ. برایم جەلالیش، هەر لێرەیە و بۆ بنچاوخستنی من، چاوێکی کردووە بە سەد چاو.
لەم دۆخە نوێیەدا، هەم باری دەروونیم باشترە و هەم ئاگاداری هەواڵ و دەنگوباس دەبم. پێشمەرگەیەک لێرەیە و پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ من دروست کردووە. ئەو، دەڵێ، سەرەتا لای حیزبی سۆسیالیست، فەرماندەی مەفرەزە بووە و لە شەڕێکدا بە دیل گیراوە، پاشتر بووەتە یەکێتی و هیچ بڕوایشی پێی نییە. ڕۆژێک هاتە لام و گوتی: من دەمەوێت بۆ ئێران بڕۆم، ئەگەر دەتەوێت لەگەڵ خۆمدا دەتبەم و هەموو ناوچەکە و ڕێگاکانیش شارەزام. گوتم: نا.. من کە هاوڕێی دیکەم هەن، نامەوێت بە تەنها بڕۆم. گوتی: ئارەزووی خۆتە، بەڵام دەکرێت ناونیشانێکم بۆ لای برادەرانی «ئاڵا» بدەیتێ تا ئەوان هاوکاریم بکەن. من، ناونیشانم پێ دا و ئیدی نەمبینییەوە.
ڕۆژێک لە ڕۆژانی مانگی یونیی ١٩٨٦، دایکم، ڕزگاری خوشکەزام، بەرزان و ئەردەڵانی برازام و خێڵان(ئەوسات دوانزەساڵان بوو، کە تەمەنی گەیشتە بیستویەک بەهار، بە ڕووداوی ئۆتۆمبێل جوانەمەرگ بوو)، بۆ دیدارم هاتن. دوو ساڵێک دەبوو دایکم نەدیتبوو. ئەو ڕۆژە و شەوکەیشی لای من مانەوە. ملازم فواد گوتی: ئەمشەو، تۆ و دایکت لە ژوورەکەی مندا بخەون.. پێم خۆش نییە لە دایکت جیابیتەوە. برایم جەلال، زۆری پێ ناخۆش بوو! من، سوپاسی ملازم فوادم کرد. ئەو شەوە، دایکم، وەکو منداڵ، تا بەیانی لە باوەشی کردم و بۆنی پێوە کردم.
بەیانیی ڕۆژی پاشتر، ئازادهەوارمی و چەند پێشمەرگەیەکی دەستەکەی هاتن. ئەوان هاتبوون تا سەیری شوێن و جێگاکە بکەن و لە ئەگەری گواستنەوەی بارەگای مەکتەبی عەسکەری، بۆ گوندی هەڵەدن، ئەوان لەم شوێنەدا، بارەگا دابنێن. ئازاد، بە وردی، هەموو دۆخەکەی بۆ باس کردم. ئەو باسی هەڵویستوەرگرتنی خۆی و پاشان سەفەری بۆ ئێران، بە مەبەستی ڕۆیشتن بۆ ئەورووپا کرد!
_ کاک پشکۆ، نازانیت چ بارێکی خراپ خولقا.. دەکرا وەها نەبوایە.. کەمێک ژیرانەتر بیرمان بکردبایەوە و ڕەفتارمان کردبا، کار بەم جێگایە نەدەگەیشت.. هەموولایەک زەرەری کرد!
_ من، پێم وانەبوو، وەها دەشکێتەوە.. بە هەر حاڵ، ئەوی نەدەبوو ڕوو بدا، ڕووی دا.. دەنگوباسی

ئەودیو و ئەو برادەرانەی ئێمە؟

ـ چی بڵێم! باش نییە، هیچیان بەسەر هیچەوە نییە، بە داخەوە کە وا دەڵێم. بەڵام ئەوە حەقیقەتە، کەس بە کەس نییە، هەمیشە ناکۆکن و شەڕ و هەرایانە.. هەڵویستیان لە ئاست مندا، زۆر خراپ بوو.. من، لە ئیران گیرام، ئەوان نەک هەر یارمەتییان نەدام، ڕەنگە کارەکەیشیان لێ خراپتر کردبم ئەوان، سیاسەت نازانن و بێئەزموونن، پێیان وایە، دەبێت هەموو کەس لەگەڵ ئەوان بێت.. زۆر توند و ڕەقن، سیاسەت بە ڕک و کینە ناکرێت.. با واز لەمەیان بێنین.. خۆت وەزعت چۆنە؟

ـ وەک دەبینی.. خراپ نییە!

ـ چ پێویستییەکت هەیە؟

ـ هیچ، سوپاست دەکەم.. ملازم فواد، درێغیی نەکردووە!

نازادەورامی ڕۆیشت و بۆ دواجار ماڵئاوایی لێ کردم.. ئیدی هەرگیز، ئەو هاوڕێیەی خۆمم نەبینیەوە!

## ئەدیبێک ناهومێد دەکەین!

ڕۆژێک، گەنجێکی گەنمڕەنگ هات و خۆی پێ ناساندم..
_ من، مەوجودسامانم، شاعیر و چیرۆکنووس!
_ بە خێر بێیت، خۆشحاڵم بە ناسینت.
_ دەتوانین لەم سەربانە پیاسەیەک بکەین؟
_ با بیکەین!
بەدەم پیاسەکردنەوە، قسەمان زۆر کرد. ئەو باسی ئەدەب و شیعر و ڕۆمانی بۆ کردم، منیش شتێک لە چیرۆکی خۆمم بۆ گێڕایەوە، پاشتر گوتی: من، بە نیازم بچم بۆ ئەورووپا.. ئاخۆ برادەرانی ئێوە، دەتوانن ڕێنماییم بکەن و کۆمەکم پێ بکەن؟
_ نازانم.. ئاگاداری ڕەوشی ئەوان، توانای ئەوان و پەیوەندییەکانی ئەوان، لەگەڵ ئێراندا نیم!
_ ئێوە دەتوانن چیم بۆ بکەن؟
_ هیچ! تەنها دەتوانیت سڵاوی منیان پێ بگەیەنیت و پێیان بڵێیت، ئەگەر دەکرێ یارمەتیت بدەن.
_ کاک مەوجود، بەرهەمی تازەتان چییە؟
_ من، ڕۆمانێکم نووسیوە و خەریکە تەواودەبێت. بەڵام ئێوە ناهومێدتان کردم!
_ ئێمە بۆ؟
_ چوونکە پاڵەوانەکانی ئێوەن.. هەر سێکتان!
_ نێ..
_ کۆتایی ڕووداوەکانی ڕۆمانەکەی من، ئیعدامکردنی پاڵەوانەکانە، بەڵام ئێوە وەهاتان نەکرد تا ئیعدام بکرێن!
_ یانی پێت خۆش بوو، ئیعدام کرابایێن؟
_ بەڵێ.. بۆ من باشتر دەبوو!
_ من، نەمویست ئیعدام بکرێم.. من، دەمەوێت کۆتایی فیلمەکە ببینم!
لێرەدا، ڕستەیەکی پڕمانای «ئێریش فرێد»ی شاعیری ئەڵمانیم، بیر هاتەوە:(منداڵەکان، بە گاڵتەوە بەردیان لە بۆقەکان دەگرت و بۆقەکانیش بە ڕاستی دەمردن!)

# مەکتەبی عەسکەری لە هەڵەدن

لە سەرەتای هاویندا، بارەگای مەکتەبی عەسکەرییان بۆ گوندی هەڵەدن گوێزایەوە.
لە قوتابخانەی گوندی هەڵەدندا، من ژوورێکی گەورە و رووناکم پێ برا. ژوورەکە، پۆلی دەرسخوێندنی قوتابیان بوو، چیمەنتۆڕێژو دوو پەنجەرەی گەورە، ڕاخەرێک لە سووچێکدا، پێخەو و لانیکەمی پێویستییەکانی ژیان، دابین کرابوون. ژوورەکانی دیکە، جێگای کاری لێپرسراوەکان و ژوورێک بۆ ئامێری پەیوەندیی بێتەل، ژوورێک بۆ پێشمەرگەکان. قوتابخانەکە، حەوشە و حەسارێکی گەورەی هەبوو، لە حەوشەکەدا، ساباتێک چێ کرابوو، پێشمەرگەکان، چوون هاوین بوو، لەوێدا دەحەسانەوە.
من، بە ڕۆژدا، دەمتوانی بچمە حەوشە و لەگەڵ پێشمەرگەکانی بکوژمرێنم.
ئێوارەیەک کە بۆ شیوخواردن لەگەڵ پێشمەرگەکان دانیشتبووم، پێشمەرگەیەکی کەمێک شێتۆکە، لە تەنیشت منەوە، لەگەڵ چەکەکەیدا، یاریی دەکرد و منیش دەمزانی ئەو جۆرە یارییکردنە لەگەڵ چەک، چەندە مەترسیدارە، ویستم بڵێم، کاکە دەسکاریی چەکەکەت مەکە و زرمە هات. گوللەکە، بە پەناگوێی مندا ویزەی کرد و من کەمێک پەشۆکام.. لە ژیانی پێشمەرگەیەتیدا، زۆر بوون ئەو پێشمەرگانەی بەمشێوەیە دەکوژران و وا دەبوو بکوژەکەش دەکوژرایەوە!
ڕۆژێک، دلێری سەیدمەجید سەردانی کردم و لەگەڵ خۆیدا، ڕیکۆردەرێک و چەند کتێبان و قاپێک ئارەقی بۆ هێنابووم! ڕیکۆردەرەکە، ئامێری ڕادیۆشی لە ئێودا بوو، ئەمەیان لە هەموو شت گرنگتر بوو.. کتێب و ڕادیۆ. بۆ زیندانیان، لە نان و ئاویش پێویستترن!
دلێر گوتی: لێرەدا وەزعت باشە و دڵنیام باشتریش دەبێ، ئەگەر خۆتان تێکی نەدەن!
_ مەبەستت چییە؟ بۆ دەبێت خۆمان بیشێوێنین؟
_ مەلابەختیار! پێت وایە ئۆقرە بگرێت و هەڵنەیێ؟
_ چ بڵێم! بڕیار نییە چ کەسێکمان بە تەنها هەوڵی دەرباز بوون بدات!
_ یاخوا وا بێت!
دوو سێ ڕۆژێک، بەسەر دیدارەکەی دلێردا تێپەڕین، شەوێک کتێبم دەخوێندەوە، دەرگا کرایەوە و برایم جەلال و دوو پێشمەرگە، بە پرتاو خۆیان کرد بە ژووردا. برایم جەلال، توورە و پێشمەرگەکان پەشۆکابوون.
برایم جەلال گوتی: هەستە خۆت کۆ بکەرەوە! بیبەنە ژوورەکەی ئەودیو.. ئەو ڕادیۆ و کتێبانەش کۆبکەکەنەوە، بۆی نییە هیچ شتێکی لە بەردەستدا بێت!

بۆ ژوورەکەی ئەوییان بردم. گوتم: چی رووی داوە؟
برایم گوتی: هیچ.. تەنها فەرمانی سەرکردایەتییە! رووی کردە پێشمەرگەکان و گوتی: دەستەکانی بەستن و دەرگاکەیش بە باشی کلیل بدەن! برایم، رۆیشت و لە سالۆنەکەدا چاوەڕێی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی بوو. پێشمەرگەکان، بە شەرمەوە، دەستەکانیان بەستم و دەرگاکەیان کلیل دا و بە تەنها جێیان هێشتم!
سەرجەمی ئەو پێشمەرگانەی لە مەکتەبی عەسکەری بوون، ڕێزیان لێ دەگرتم و ئەو دۆخەیان پێ ناخۆش بوو.. کێ بوون؟ ناوی هەموویانم لە یاد نەماون.. کوڕێک بە ناوی «رەییس»، لەسەر ئامێری بێتەل کاری دەکرد. عوسمان عەسکەری، سەلاح کونجرینیی زاوای سەلاح چاوشین کە «فەرماندەی کەرت»بوو، مامۆستاعومەری پێشمەرگەی بەرگریی میللی، ئەحمەدەڕەش و زۆری تریش کە بە تەنگ ژیانی من و پێویستییەکانمەوە دەهاتن.
شەوێکم لە نیگەرانیدا بە ڕۆژ گەیاند، تێگەیشتنی دۆخەکە بۆ من زەحمەت نەبوو.. مەلابەختیار یاخود شێخعەلی، یەکێکیان دەبێ هەڵاتبێت.. من، چاوەڕێی چارەنووسی خۆم و پەیدابوونەوەی برایم جەلالم!
خۆر، مەترێک زیاتر، ئاسۆی جێ هێشتبوو، برایم بە رووخسارێکەوە لێوانلێو لە غەزەب، هاتە ژوورەوە و گوتی: ئاوەها! ئەو وا لێکراوە، هەڵاتووە..
_ کێ؟
_ خولەکەشکۆڵ.. شێخ ئەڕەماش و
برایم، هەرچییەکی بە زاریدا هات و کە ئەدەشیا بە زاری کەسێکی دیکەدا بێت، لە بەردەم مندا، بە شێخعەلیی گوت و سووکایەتیی پێ کرد. پاشان گوتی: دەی یاڵا هەستە! مامجەلال داوات دەکات..
لە بەشی پێشەوەی ماشینێکدا، لە نێوان شۆفێر و برایمدا، دایاننیشاندم و بەرەو گوندی «یاخسەمەر» بە ڕێ کەوتین.
ئۆتۆمبێلەکە، لە ناوەڕاستی یاخسەمەردا و بەرانبەر ماڵی ئەبوشەهاب، وەستا. برایم، دابەزی و بۆ ساتێک ڕۆیشتە ماڵی ئەبوشەهاب و بە خێرایی و بە رووخسارێکەوە کە لە پێکەنین تژی بوو، گەڕایەوە و گوتی:
_ گرتمانەوە! بە زەلیلی گرتمانەوە!
_ کێتان گرتەوە؟
_ مەلابەختیار!
_ تۆ بە منت گوت، شێخعەلی هەڵاتووە!

_ نا، ئەو نییە، مەلابەختیار ڕای کردبوو بەڵام ئەمشەو گرتوویانەتەوە و ئێستا بە ڕێگاوەیە.. دەیهێنن بۆ ئێرە.. من بە ئەنقەست، گوتم، شێخعەلییە.. وای بەحاڵی!

کەسانێک هەن، بە جۆرێک هەڵسوکەوت و ڕەوتار لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەکەن، تۆ، بۆ شیکردنەوەی کەسایەتیی ئەوان، تەنها دەتوانیت گرێ دەروونییەکانیان ڕاڤە بکەیت.. کاتێک شێخعەلی، چ پەیوەندییەکی بە هەڵاتنی مەلابەختیارەوە نەبوو، ئەدی برایم، بۆ ئەو هەموو سووکایەتییەی لە ئامادەیی خۆیدا، پێ کرد؟! ئەمە، جگە لە گرفتچک و گرێی ئاڵۆزی دەروونێکی ناساغ، هیچی دیکە نەبوو!

لە بەردەم پرسگەی مامجەلالدا، وەستاین و چاوەڕێ بووین.. تەلەفوونیان بۆ مامجەلال کرد و پاش کەمێک، پێشمەرگەیەک تا بەردەرگای ئۆفیسەکەی مامجەلالی بردم، تەقەی لە دەرگاکە دا و خۆی گەڕایەوە..

مامجەلال، لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستا بوو، بەرەو ڕووی من هات و وتی: وەرە دانیشە! من لەسەر کورسییەک دانیشتم و ئەویش دانیشتەوە، جگەرەیەکی ڕۆسمانی دەرهێنا و گوتی: بگرە! گوتم: سوپاست دەکەم، ناکێشم!

_ ئێوە، بەڵێنەکانی خۆتان ئەبرنە سەر.. ئێوە تا کەی دەتانەوێت فێڵ لە ئێمە بکەن؟ ئێوە، هەوڵ دەدەن، لە زینداندیشەوە، دژایەتیی یەکێتی بکەن؟ ئێمە، دۆخی ئێوەمان چاک کرد، لە زیندانەوە بۆ دەستبەسەری و ژیانێکی باشتر... ئینجا درۆمان لەگەڵ دەکەن و مەلابەختیار، لە زیندان هەڵدێت! هەڵات و گرتمانەوە.

مامجەلال، لە بەردەوامیی قسەکانیدا، تۆنەکانی بەرزتر دەکردنەوە و ددانی بە دەربڕینەکانیدا دەنان، دەستەکانی دەجوڵاندن، کڵاوەکەی لەسەری دادەگرت و دووبارە لە سەری دەنایەوە..

_ حەز دەکەم باش گوێ بگریت! بە گۆڕی شەهیدئارام و شەهیدعەلی عەسکەری، ئەوەی کە ئێوە زیندوو ماون و نەکوژراون، تەنها من و بەشێک لە مەکتەبی سیاسین کە ژیانی ئێوەمان ڕا گرتووە، دەنا کاک ئەوشیروان و ناوەندی کۆمەڵە، سوور بوون لەسەر ئیعدامکردنتان... گوتم: مامجەلال، من بەڵێنی خۆم بەجێ هێناوە، من هیچ کارێکم نەکردووە، ئاخر من، ئاگایەکم لە هەڵاتنی مەلابەختیار نییە و پێشم خراپە...

_ تۆ بێدەنگ بە! دەڵێم بە گۆڕی کاک ئارام، ئەگەر بە کردەوە نەیسەلمێنن کە وازتان لە سیاسەت و دژایەتیکردنی یەکێتی هێناوە، منیش دەچمە بەرەی کاک ئەوشیروان و ناوەندی کۆمەڵە.. چی دەبێت با ببێت! فەرموو بۆ دەرەوە!

لە هەمان ئۆتۆمبێلدا، ئەمجارەیان، لە بەشی نێوەڕاستدا، دایاننیشاندمەوە. ماشینەکە، لە بەردەم ماڵی فەرەیدون عەبدولقادردا، وەستا. فەرەیدون، کە من هەرگیز، ئاوا بە تەیاری نەمدیتبوو، بە تفاق و

چەکی سازەوە، هات و لە پێشەوە سوار بوو. من و فەرەیدون، بە درێژایی ئەو ساڵانە و تا دوورپێیانی جیابوونەوەش، پەیوەندیی هاورێیانەمان، زۆر باش بوو، دەیان و سەدان جار، جگە لە بینینی نێو کۆبوونەوەکان، هاتوچۆی ماڵیانم کردبوو، پێکەوە و لەسەر خوانێک دانیشتبووین، کەچی وەک ئەوەی من لە ماشینەکەدا نەبم، وەهای رەوتار کرد!

لە قوتابخانەکەی هەڵەدن، ژوورێکی بچووکی تەنگەلانیان کردە زیندانم و رۆژ و شەو دەرگەیان دادەخست. دوو رۆژ دوای ئەم رووداوە، لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە کە بەسەر حەوشەکەدا دەیروانی، خاڵەخالیدم و کاکمم بینین کە لە بن دیوارەکەدا هەڵترووشکابوون. ئەوان، لە سلێمانییەوە، بە هیوای دیداری من هاتبوون، بەڵام پێ دەچوو رێگایان پێ نەدەن. کاتژمێرێکی برد و دەرگایان کردەوە، منیان هێنایە راڕەوی مەکتەبەکە و گوتیان: فەرموو لێرە دانیشە، میوانت هاتووە! پاشان کاکم خاڵم هاتنە ژوورەوە.. رەنگە سەختترین هەست و هەڵچوونی دەروونی، ئەو ساتانە بێت کە تۆ خۆشەویستێکی خۆت، بە زەلیلی ببینیت.. ئەو هەستەم لە رووخساری کاکم و خاڵمدا دەخوێندەوە.

گوتم: بۆ ئەرکتان کێشاوە و بەم گەرمایە، ئەم رێگا دوورەتان بریوە، نەدەبوو وەها بکەن!

گوتیان: هەواڵەکەمان خراپ بیست! دەنگۆ وا بوو کە ئیعدامتان دەکەن!

گوتم: چۆن مۆڵەتی هاتنەژوورەوەیان پێ دان؟

گوتیان: سەردانی مامجەلالمان کرد و ئەو مۆڵەتی پێ داین!

_ مامجەلال چیی گوت؟

_ لێتان تووڕە بوو.. ئەیگوت، پشکۆ لە کادرە هەرەباشەکانی ئێمە بوو، من زۆر رێزم لێ دەگرت و خۆشم دەویست، نەدەبوو ئەو کاری وەها بکات، ئەوان زەرەری گەورەیان لە یەکێتی و شۆڕش داوە، من ناهێڵم ئیعدامیان بکەن..

ئەوە دووەمجار بوو، کاکم لە زینداندا بمبینێت، زۆری خەم بە حاڵم دەخوارد. ئەو، لە شەستەکاندا، کادرێکی دێرینی باڵی م.س، واتە جەلالییەکان بوو، ئەویش، چوون بە دڵسۆزی و لە بازنەیەکی تایبەتی مۆراڵدا، سیاسەتی کردبوو، نازارێکی زۆری لە دەست سیاسەت چەشتبوو!

لە مانگەکانی یولی و ئاگۆستیدا، بۆمبارانی فڕۆکە، ژیانی لە خەڵک و لە پێشمەرگەی دۆڵی جافەتی، هەراسان کردبوو.

نیوەڕۆی یەکێک لە رۆژە گەرمەکانی مانگی ئاگۆستی، دەنگی فڕۆکە و زرمەی تەقینەوەی ناپاڵم پێکەوە گەیشتنە ژوورەکەم، دەرگا کڵۆم درابوو، ئەحمەد، لە حەوشەکەوە، وەکو کێچ قەڵەمبازێکی دا و دەرکەکەی لێ کردمەوە و گوتی: خۆت دەرباز کە.. بۆ ژێرزەمینەکە! من، بە شوێن ئەحمەددا، بە دوو

قەڵەمباز، گەیشتمە حەوشەی قوتابخانەکە و خۆم لە ژێرزەمینەکە هاویشت. ساتێ من، لە پێپلیکانەکان دەهاتمە خوارێ، لەسەر بانەکانی گەڕەکی ئەوبەر، بە دەیان بۆمبی بچووک پێکەوە دەتەقینەوە. بۆمبەکان لە بەرمیلێکی ئێجگار گەورەدا، لە فڕۆکەوە دەهاوێژرانە خوارێ و ساتێ نزیک زەوی دەبوویەوە، بەرمیلەکە یەکالا دەبوویەوە و سەدان بۆمبی هێشوویی لێ بەردەبوونەوە. لە ژێرزەمینەکەدا، دکتۆر فواد مەعسوم و نەوشیروان مستەفام دیتن، پێ دەچوو، بۆ جێگایەک بە ڕێگاوە بوویێتن و بۆ خۆپاراستن، خۆیان لە ژێرزەمین پەستاوتبێت. ئەوان، خۆیان لە من نەبان کرد و سەرگەرمی قسەوباس بوون. سەرکردەکان، ناتوانن زیندانییەکی بێبەها ببینن! منیش هەر وەهام کرد!

سەلاح چاوشین، ئەندامی مەکتەبی عەسکەری بوو، ماڵەکەیشی هەر لە گوندی هەڵەدن بوو. هەندەکجار، ئێواران، لوتفی دەنواند و پیاسەیەکی لەگەڵ دەکردم و هەواڵ و دەنگوباسی شۆڕشی بۆ باس دەکردم. من و سەلاح، ساڵانێک بوو هاوڕێ بووین، ئەگەرچی هەرگیز پێکەوە کارمان نەکردبوو. دیسانیش، لەو دۆخەی منی تێدا دەژیام، ئەو وەکو هاوڕێیەک لێمی دەڕوانی و مامەڵەی لەتەکدا دەکردم. سەلاح گوتی: پەیوەندییەکانمان لەگەڵ ئێراندا باشتر و باشتر دەبن، ئێمە خەریکین لە نێوان ئێراق و ئێراندا، خۆمان یەکلا دەکەینەوە!

گوتم: مەبەستت چییە؟

گوتی: هەموو هاوکارییەک لەگەڵ ئێران دەکەین و هەموو پەتێکی مفاوەزات لەگەڵ ئیراق دەپسێنین!

گوتم: ئەوە خەتەر نابێت؟

گوتی: نازانم... بەلام، وەکو برادەرانی مەکتەبی سیاسی دەڵێن، ئەمجارە، یان دەفرین یان دەترین!

ڕۆژانی پاییزی ئەو ساڵە، جەنجاڵییەکی زۆرم لە مەکتەبی عەسکەری دەدیت، لێپرسراوەکان و کادرە عەسکەرییەکان، هەمیشە سەرقاڵ بوون، وا پێ دەچوو، یەکێتی، هێزەکانی بۆ هێرشێکی گەورە ساز بدات. پاشتر، یەکێتیی، بە سەرکردایەتی نەوشیروان مستەفا و هاوکاریی پسپۆڕانی سوپای پاسدارانی ئێران، چەک و جبەخانەیەکی زۆریان بۆ ناوچەی گەرمیان گواستەوە و یەکەمین پەلاماری هاوبەشیان بۆ سەر بیرەنەوتەکانی کەرکووک ئەنجام دا!

پاش ئەو کردە سەربازییە بۆ سەر دەسگانەوتییەکان، بەعس شێتگیر بوو. بۆمبارانی فڕۆکە و تۆپباران، ورووئیان نەدەدا.. چەند ڕۆژێک، لە بەیانییەوە، گوند چۆڵ دەکرا و پێشمەرگەکان، وەسەر چیا دەکەوتن و منیشیان لەگەڵ خۆیان دەبرد. پێشمەرگەیەک، بە ناوی مامۆستاعومەر، هەمیشە لەگەڵ من بوو. واتە بەرپرسیارێتیی منی وەکو زیندانییەک، لە ئەستۆ نرابوو. ئێمە پێکەوە سەردەکەوتین و پێکەوە گۆیژمان دەڕنی، پێکەوە نانمان دەخوارد و ئیتر... ڕۆژێکیان، دەمەوخۆراوا، لە شاخ دابەزین و لە دەرەوەی گوندی هەڵەدن، لەسەر گابەردێک پشوومان دا. م.عومەر، چەکەکەی هەڵگرت تا بەرێ

بکەوین، دەستی بەر ماشەکەی کەوت و ڕیژنەیەک گوللە بە بنبالّی مندا، دەرباز بوو. ئەو، زیاتر لە من ترسا و هیچی نەمابوو دلّی بوەستێت.. گوتم: مامۆستا گیان، هیچی نەمابوو نەجاتم بدەیت! پێویست ناکات، هەمیشە فیشەکت لە بەرکاردا بێت! هەق وایە، کەمێک متمانەت بە من هەبێت!

پاییزی ئەوساڵە، زستانیشی لەگەلّ خۆی هێنابوو! یاخود تەمەنی خۆی بە زستان دابوو.. کەشێکی سارد و باراناوی و هەر زوو بەفر، دنیای ئەو دەڤەرەی داپۆشی. لە زیندانە چکۆلەکەمدا، سۆپایەکیان بۆ دانام کە بە دار گەرم دەبوو. ئەحمەد، ئەو گەنجە گەنمڕەنگە بوو کە لە دابینکردنی کۆتەرەداراندا، دەستپڕ بوو، پیرەسۆپا، هەمیشە ئێڵەی دەهات.
یەکێتی، بۆ بەرگرتن لە هێرشی دەوڵەت، بەشێکی زۆری هێزەکانی خۆی، لە ناوچەکانی دیکەوە، بۆ دەڤەری سەرکردایەتی هێنا بوو. پێشمەرگەکانی هەورامان و شارەزوور، کە چەند ساڵان پێکەوە کارمان کردبوو، هەندێکیان لوتفیان نواند و سەردانیان کردم، لەوانیش: فەلاحی حەمە بۆر، ساڵەحی مەجیلان و زۆری دیکەش. دکتۆر کەمال شاکیر، بە دوو دیاریی زۆر بەنرخەوە هات.. ڕادیۆیەکی «سۆنی»ی زۆر باش و ڕۆمانێکی بە ناوی «لۆلیتا» بۆ هێنا بووم کە لە درخاندن نەدەهاتن.
شەڕ و دابلۆقەی دەوڵەت لەسەر ناوچەکە، باری ژیان و گوزەرانیان خراپ کردبوو، خۆراک و پێویستییەکان کەم دەبوونەوە، حالّی منیش حالّی پێشمەرگەکانی بارەگا بوو. دەمویست لە ڕێگای پێشمەرەکانەوە، هەندەک خواردن بۆ خۆم بکڕم، بەڵام بێپارە بووم. نامەیەکم بۆ حامیدی حاجی خالیدی هاوڕێم نووسی کە ئەوسات لەو ناوچەیە فەرماندەی عەسکەری بوو. لە نامەکەدا، هەوالّی برسێتیی خۆمم بۆ باس کردبوو، نامەکەم دایە ئەحمەد و ئەویش گەیاندبووی. ڕۆژی دوایی، حامید، حاتەمناسا، گیۆنییەکی پڕ لە خواردنی هەمجۆرەی لە قوتوونراو، شەکر و چا، تەباخێکی گچکەی ناردبوو، مالّی ئاوا بێت، لەو ڕۆژگارەدا، هەمووکەس نەیدەوێرا خۆی لە قەرەی ئێمە بدات. ئەو ئەرکی هاوڕێیەتیی خۆی بە زیادەوە، بە جێ هێنا!
سەلاح کونجرینی، فەرماندەی کەرت بوو لە مەکتەبی عەسکەری، ئێوارەیەک گوتی: مامۆستا، ئەمشەو، بۆ ناخواردنی ئێوارە، لە مالّی ئێمە دەبیت. ئێوارە کە تاریک داهات، بە دزێنی، منی بردە مالّی خۆیان، سەلاح چاوشینیش لەوێ بوو، پێکڕا نانمان خوارد و تا درەنگانێ قسەوباسمان کرد، پاشان هێنامییەوە بۆ زیندانەکەم.

# لە هەڵەدنەوە بۆ زیندانی بەرگەڵوو

لە مانگی ئیسابەری ١٩٨٦دا، گوێدرێژێکیان هێنا و هەر کەلوپەلێکم هەبوو، لێیان بار کرد و لەگەڵ دوو پێشمەرگەدا، بەرەو سەرگەڵوو بەڕێ کەوتین. لە گوندی هەڵەدن، زۆر دوور ئەڕۆیشتبووین. لە ڕێگادا، دلێری سەید مەجید و موحسین عەلی ئەکبەرمان تووش هاتن. دلێر گوتی: ئەمشەو دێیتە ماڵی خۆمان، لەوێ پشوویەک دەدەیت و ڕۆژی دوایی دەچیتە زیندانی بەرگەڵوو. کاری دلێر، لە بەشی بەڕێوەبەرایەتیی مەڵبەندی دوو بوو. قادری حاجی عەلی، لێپرسراوی مەڵبەند و، ماڵ و بارەگای ئەویش لە گوندی سەرگەڵوو بوو. شەو، لە ماڵی دلێر پشوویەکی باشم دا، لە حەمامی گەرمدا خۆم شت، نانێکی باشمان خوارد، قادری حاجی عەلی هات و پێکەوە، کەمێک نارەقیشمان خواردەوە، زۆرمان قسەوباس کرد. دلێر و قادر، گوتیان: بەیانی بچۆرە زیندانی بەرگەڵوو کە زیندانی نێوەندی یەکێتییە و مەڵبەند ئیدارەی دەکات، پاشتر، ئێمە هەوڵ دەدەین، ئەگەر کاک ئەوشیروان و سەرکردایەتی، بڕیار بدەن، هەر لێرە، لە نزیک خۆمان، شوێنێکت بۆ جێبەجێ دەکەین و لەوێدا دەستبەسەر دەبیت! ئەوشەوە، م.موحسین، بە یادی جاران، هەندەک شیعری لە دیوانی مەحوی خوێندەوە.

بەیانی، تاشتیمان کرد، کاوەی برای دلێر، دۆشەک، پشتی و پێخەو، هەندەک کتێب لە کتێبخانە چکۆلەکەی دلێری کۆکردنەوە و لە گوێدرێژەکەی بار کردن، من ماڵاوایییم لە دلێر و م.موحسین کرد، لەگەڵ کاوەدا، بۆ بەرگەڵوو دابەزین و لە بەردەم دەرگای زینداندا ڕاوێستاین!

زیندانی بەرگەڵوو، لە تەختاییەکدا، لەبەر زاری دەربەندێکی زیدەسەختدا دروست کراوە. بینایەکی دوو نهۆمی بە بلۆک و چیمەنتۆ ڕۆنراو کە چواردەوری بە تەل پەرژین کراوە. ئێمە، لە دەرکەی پەرژینی حەسارەکە دەچینە ژوورێ و لە بەردەم دەرگایەکی پۆڵای گەورەدا دەوەستین کە بە سوورگییەکی ئەستوور داخراوە و قوفڵێکی گەورەی پێوە ئاوێزانە. فەرهاد کە پێشتر لێپرسراوی کەرتی ڕێکخستنی «دووکان» بووە، ئێستا بەڕێوەبەری زیندان و کەسێک بە ناوی مەلایاسین، جێنیشینیەتی.

فەرهاد، هات و منی بۆ زیندانەکەی بەخێر هێنا و گوتی: شێخعەلیش لەم زیندانەدایە، لە ژوورەوەیە، تۆ ناچیتە ژوورەکەی ئەو، بۆت نییە بیبینی و قسەی لەگەڵ بکەیت. من، بە بیستنی هەواڵی بوونی شێخعەلی لەم زیندانەدا، ناسوودە بووم. مەلایاسین، سوورگییەکەی ڕاکێشا و زنجیرەکەی لێ کردەوە، دەنگێکی تابڵێی ناقۆڵای لێوە هات، دەرگا واز بوو. کەلوپەلی منیان لە کاوە وەرگرت، کاوە، پێش ئەوەی بڕوات، گوتی:

هەرچییەکت پێویست بوو، هەواڵمان بۆ بنێرە، من خۆم بۆت دەهێنم!

من، بە دوی مەلایاسیندا، قوڕگی تاریکی ئەمەنگی زیندانەکە هەڵیلووشیم، بە ڕاڕەوێکی تاریکدا، تا کۆتایی ڕۆیشتین و مەلا گوتی:

تۆ لەم ژوورەدا، جێگاکەت چێ بکە!

ژوورێکی گەورە و تاریک، بۆنی شێ و چڵکی لێ دەهات، سیخناخ بوو لەو زیندانییانەی کە نەمدەناسین!

مەلایاسین، ڕۆیشت و دەرگا گەورەکەی زیندان داخرایەوە.

پیاوێک گوتی: فەرموو مامۆستا! وەرە لای ئێمەوە و یاتاغەکەت لە تەنیشت منەوە ڕابخە! پاشتر زانییم کە ناوی «عەلی»یە و خەڵکی سەرگەڵووە. عەلی، لەسەر کێشەیەکی کۆمەڵایەتی، چەند ڕۆژ بوو زیندانیی کرابوو. ئەو، چوونکەماڵی لە سەرگەڵوو بوو، پۆشتە و پەرداخ و هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤ لە زینداندا پێویستی پێیان هەیە، هەیبوون، لە هاوکاریکردنی منیش دەستی نەدەگێڕاوە. کوڕێکی دیکە، بە ناوی هاشم، لەودیوی عەلییەوە ڕاکشابوو، ئەو خەڵکی گەرمیان بوو. برایەکی هاشم، ئەو پێشمەرگەیەی کوشتبوویەوە کە پێشتر قادرفەرەجی سەرەکجاشی کوشتبوو. براکەی، پاشی ئەنجامدانی تاوانەکە، خۆی گەیاندبوویە لای بەعس و ئێستا هاشم، لە بری براکەی زیندانی کرابوو.

هەندێک لە زیندانییەکان بە عارەبی قسانیان دەکرد، لە عەلیم پرسی، ئەمانە چین؟

_ هەموویان ئەفسەری بەعسن و لەم شەڕانەی دواییدا گیراون.

_ چەند کەسن؟

_ حەڤدە ئەفسەرن و ئێمەیش بە تۆوە سێ کەس، ئەوا لەم ژوورەدا، دەبینە بیست.

_ بیست کەس، بۆ ئەم ژوورە زۆر نییە؟

_ دەبێ شوکر بین، وا دەبێ، دەبینە دوو هێندە!

_ زۆر ساردە، لەرزم دێ!

_ شەو ساردتر دەبێ، دیوارەکان بە بلۆک درووست کراون، ببینە ناویان لێ دەچۆڕێ، کە لە دەرێ ڕا باران لێ دەکاتەوە، ئەوجا لە ژوورەوە، باران دەبارێ!

_ چۆن؟

_ ساپیتەی زیندانەکە، چیمەنتۆڕێژە، ئەگەر ڕۆژێک باران بباری، ئەم بەشی سێ ڕۆژان ئاو هەڵدەمژێ و بە کاوەخۆ و نم نم، لە ژوورەوەی دەبارێنێ! ببینە! ئەبومحەمەد، چۆن ساپیتەکە دەسڕێ! ئێمەش دەبێ ئەو کارەی بکەین..

لە چوار سوچی ژوورەکەدا، چوار داری درێژ دانرابوون کە سەرەکانیان تۆپەڵەپەڕۆیان لێ پێچرابوون،

لە چوار لاوە، دەبوو بنمیچ و ساپیتەکە، ناوبەناو وشک بکرێنەوە.
گوتم: کاک عەلی، ئەم زیندانە چەندە گەورەیە؟ مەبەستم چەند ژوورە؟
_ ئەم ژوورەی خۆمان کە دەیبینی!
_ بەڵێ
_ لێرە وەدەرکەویت، بە دەستی چەپدا و بە درێژایی ڕاڕەوەکە، دوو قاوشی گەورە هەیە. یەکێکیان تایبەتە بە سەرباز و جاش. ئەوی دیەکەیان، قاوشی عەشایەرە!
_ قاوشی عەشایەر؟
_ بەڵێ.. ئەو خەڵکەی کە لەسەر کێشەی عەشایەری، کۆمەلایتی یان هەر کێشەیەکی دی زیندانی دەکرێ، لە کۆتایی ڕاڕەوەکەدا و بە دەستی ڕاستدا، دوو تەوالێت هەن کە دەتوانن حەمامیش بن..
_ بەڵێ..
_ لەوسەر ڕا، بۆ ئێرە بگەڕێیتەوە کە هەر دەبێتە دەستی چەپت، ژووری پێشمەرگانە. مەبەستم زیندانی ئەو پێشمەرگانەی کە بە هەر هۆیەک بەند دەکرێن. پاشان ژوورێکی دیکە هەیە کە زیندانی لێپرسراوانە، مەبەستم ئەو پێشمەرگانەیە کە لێپرسراون و دەخرێنە زیندانەوە. وەکو ئێوە، کاک شێخعەلیش، لەو ژوورەدایە!
_ نهۆمی سەرەوە؟
_ ئەوێ، بارەگای پێشمەرگە و شوێنی بەڕێوەبەرایەتیی زیندانە. کاک فەرهاد و مەلایاسین، بە ڕۆژ لەوێ دەبن!
_ ئەی بە شەو؟
_ مەلایاسین، شەوانیش هەر لەوێ دەبێ، بەلام کاک فەرهاد، دەچێتەوە ماڵی خۆی کە چەند مەترێک لێرەوە دوورە.
نێوەڕۆ، دەرگای زیندان بە تەقوهوڕ واڵا کرا، دەنگی بەریەککەوتنی دەفر و قاپ، زیندانی پڕ کرد. هەر کەسە و بە دەفری خۆیەوە، بەرەو لای دەرگاکە ڕۆیشت. عەلی، گوتی: کاتی نانی نیوەڕۆیە، تۆ پێویست ناکات بجووڵێی، منیش ناڕۆم، لە ماڵەوە خواردنم بۆ دێت و پێکەوە نان دەخۆین. لە دەرگای ژوورەکەوە، سەیرم کرد، حەشاماتێک بۆ خواردنوەرگرتن، ڕیزیان بەستبوو، دوو مەنجەڵی گەورە لە نێو دەرگاکەدا دانرابوون، یەک لە دوای یەک زیندانییان، دەچوونە پێشێ و برنج و شلەیان وەردەگرت. زیندانییە عەرەبەکان، بە کاری چێشتلێنان و دابەشکردنیدا ڕا دەگەیشتن، چەند کەس لەوان، لە نانەخۆری زینداندا کاریان دەکرد.
زۆری نەبرد، خواردنی عەلی گەیشت و لەگەڵ هاشمدا، پێکڕا نانمان خوارد.

شێخعەلی هات و کوڕێکی گەنج کە تازە خەتی دابوو، بە دوی ئەودا هاتە ژووریٚ. لەگەڵ شێخعەلیدا کە ساڵێکی ڕەبەق بوو لێک دابڕابووین، باوەشمان بە یەکدا کرد و هەردووکمان لە داخەوە دەکوڵاین! کوڕە گەنجەکە، بە خێرهاتنی کردم و شێخعەلی پێی ناساندم.. ئەمە کاکە عەلیی خۆمانە، عەلیی مامەحەمە! من و مامەحەمەی باوکی، عەلی و دوو کەسی دیکە لەم ژوورەی تەنیشتاندایین. سبەینێ ڕەنگە جێگایەک بەتاڵ بێت و تۆش بێیتە لای ئێمە. شێخعەلی وەهای گوت.

من گوتم: فەرهاد، پێی گوتووم، بۆم نییە قسە لەگەڵ تۆ بکەم و تۆش وەها دەڵێیت!

_ قسەیەکی بێمانایە! چۆن دەکرێ لە یەک زینداندا بین و قسە لەگەڵ یەکدی نەکەین؟ ئەو بۆ خۆیی گوتووە، سبەی جێگایەک بەتاڵ دەبێت. کەسێک ئازاد دەکرێ و دڵنیام کە تۆ دەهێننە شوێنەکەی.

_ چی لەوە باشترە!

پێش کاتژمێری دەی ئێوارە، هاشم گوتی: مامۆستا، ئەگەر کاری سەرئاوت هەیە، فریاکەوە!

_ بۆ؟ ئەی پاشتر؟

_ کاتژمێر دەی تەواو، دەرگای ژوورەکان کلیل دەدرێن و کەس ناتوانێت بچێتە ڕاڕەوەکە!

_ ئەگەر کەسێک تەنگاو بێت، یاخود زگی بچێت، چی؟

_ سەتڵێک لە ژوورەوە بۆ ئەو حاڵەتە هەیە، خوا بکات پیاو پێ نەگیرێ!

لە وادەی خۆیدا، مەلایاسین بە چەپکێ کلیلەوە گەیشت، دەرگاکانی کڵۆم کردن و ناڵەی لە دەرگا گەورەکەی دەرەوەش هەستاند..

ئەمشەو، هەست دەکەم لە زینداندام. هەستەکانی ناوەوەی مرۆڤ لە زیندانی تەنیاییدا و هەستێک کە لێرەدا هەیەتی، جیاوازن.

لێرە، تۆ لەگەڵ کەسانی جیا و ئەقڵە جیاکاندا هەڵسوکەوت دەکەیت، بەریەک دەکەوین و بە ناچاری دەبنە هاوڵاتیی دنیایەک و ئەندامانی خێزانێک کە ڕێسا و یاساکانی، لێپرسراوان و زیندانوانان دایاندەڕێژن و تۆش دەبێت پێڕەویان لێ بکەیت. تۆ، هەر کەس بێت و هەر چییەک بێت، زیندانییت و زیندانییانیش لەبەر یاساکانی زینداندا، چوون یەکن!

لە زیندانی تەنیاییدا، مۆتەکەی تەنهاییبوون سواری کۆڵی ڕۆحت دەبێت و بڕستت لێ دەبڕێت، لەوێدا، هەمیشە بە ناخی خۆتدا شۆڕدەبیتەوە و لەگەڵ بیرۆکە و هزرینە ناکۆکەکاندا، لە شەڕێکی نەبەراوەدایت!

لێرەدا، ڕووخسارە نامۆکان، ڕەفتاری نابەجێی هەندەک زیندانییان، زرمەهوڕی دەرگا و هاتوهاواری زیندانوانان، بۆگەنی چڵک و ئارەقە، فرکانفرکانی مشکەکان، تاریکایی فەزای زیندان، لێدان و ئەشکەنجەدانی جاشان و تاوانباران، ڕۆحت دەکرۆژن و دەتکەنە مرۆڤێکی قێزەون، بێزت لە خۆت

دێتەوە!

ڕۆژی پاشتر، مەلایاسین هات و گوتی: شتومەکی خۆت بپێچەوە و بۆ ژوورەکەی شێخعەلی بڕۆ! ئەوە، بڕیارێکی باش بوو. ژوورێکی سێ بە چوار مەتردووجا، چوار دیواری هێند بەرز، ئەگەر بتویستبا لە پەنجەرە تەسک و درێژەکەی بنمیچەکەوە، لە دەرێ بڕوانیت، دەبوو بچیتە سەرشانی کەسێکی بالآبەرز و بەو حاڵەشەوە، ئەستەم بوو شتێک لە دنیای دەرەوە حاڵیی ببیت!

مامەشێخ و من، عەلی و باوکی، کوڕێک کە خوارزای قادرجەباری بوو، گەنجێک بە ناوی ڕێبوار و عەلی ناوێکی تورکمانی کە لە سوچێکی ژوورەکەدا دووکانێکی گچکەی دانابوو، بووین بە ئەندامانی خێزانێکی گچکە لە نێو خێزانە گەورەکەی زینداندا و هەر کەس و چیرۆکی خۆی هەبوو! عەلی و باوکی کە تەمەنی لە ٦٥ساڵ هەورازتر بوو، دووساڵێک دەبوو لە زینداندا بوون. ئەوان، لەسەر کێشەیەک گیرا بوون کە پەیوەندی بە کوشتنی تەمومژاویی کەسێکەوە هەبوو کە فەرماندەی کەرتی یەکێتی بووبوو. دایکی عەلی، خوشکی غەریب هەڵەدنی بوو، هەموو خزمانیان پێشمەرگە بوون، هەر بۆیەش لەم ژوورەیان دانابوون.

گوتم: عەلی، تۆ کە زۆر گەنجیت، لە کەنگێوە زیندانییت؟

_ نازانم! وابزانم کە لە دایکم بەربوومەوە، یەکسەر بۆ ئێرەیان هێنام!

عەلی، دەنگخۆش بوو، گۆرانییشی باش دەزانی، کە تێی دەچڕی، ئیدی تا ماندوو دەبوو، نەیدەبڕییەوە، هەر بۆ خۆیشی دەیگوت: ئاخر عەلی، تۆ دۆم نەبیت، دووڕاجی نەبیت، شایەر نەبیت، ئەم هەموو بەندانە لە کوێ دێنییت!

خوارزاکەی قادرجەباری و ڕێبواریش، پێشمەرگە بوون، لەسەر چی بەند کرابوون، وە بیرم نایەتەوە! عەلیی تورکمان، لە هێزی تایبەتی موخابەرات و دەستەی ملازم موحسین بووبوو، لە دۆخێکی نادیاردا و لە سۆنگەی چیرۆکێکدا خۆی دەیگێڕایەوە، هاتبووە شاخ، لە شاخ گومانیان لێ کردبوو، ئیدی چارەنووسی وەک ئێمە بوو!

ژیان لەم ژوورەدا، باشتر دەگوزەرا، ژمارەمان کەمتر بوو، کە دەرگەمان دادەخست، ئیدی ئاگامان لە دنیای جەنجاڵی نێو ڕاڕەوەکە نەبوو. لە ژوورێ دا، تەباخێکی چکۆلە و مەنجەڵ، کتری و قۆریمان هەبوون و بۆ خۆمان خواردنمان ساز دەکرد، هێندە گوێمان بە خواردنی زیندان نە دەدا. کەسوکاری مامەحەمە، هەموو ڕۆژێک دەهاتن و لە ڕێگای ئەوانەوە هەر شتێکمان ویستبا دەمانکڕی، جگە لەوانیش، ئەو زیندانییانەی کە ڕۆژانە دەیانبردنە کارکردن، لە ناو گوندی سەرگەڵوو، پێویستییەکانیان بۆ دابین دەکردین.

دلێری سەیدمەجید، جارێکی تریش سەردانی کردم، هەندەک پێویستی و چەند کتێبی بۆ هێنا بووم.

کتێبەکان، ڕۆمانی حەمەدۆکی یاشار کەمال کە عەبدوڵای حەسەنزادە، بە زمانێکی جوان کوردیاندبووی، ڕۆمانەکانی دیکەی یاشار کەمال کە شوکرمستەفا وەریگێڕابوون، چەند ژمارەی گۆڤاری «ئەلئەقلام» و ئەلسەقافەئەلئەجنەبییە« و شتی دیکەش کە بۆ ئێمە خەزنەیەکی گرانبەها بوون. عەلیی مامەحەمە، ئەگەرچی خوێندەوارییەکی وەهایشی نەبوو، دیسانیش هۆگری خوێندنەوە بوو، پاڵەوانەکانی نێو ڕۆمانەکانی یاشارکەمال، بە تایبەت، حەمەدۆک، جەبار، ڕەشیدەزلە و ئەنەحۆری، بووبوون بە بەشێک لە ژیانی زیندانی ئەو. لەگەڵیاندا دەژیا و وێنای ڕەفتار و هەڵسوکەوتی ئەوانی دەکرد. ئای عەلیی مامەحەمە! تۆ چەند ئاشقی کەسێتیی عەلییەشەلی شوێنهەڵگر بوویت.. عەلییەشەل کە لە ئاخەوە «حەمەدۆک»ی خۆش دەویست و بە ناچارییش هەندەک جاران شوێنپێ هەڵدەگرت. بەڵام هەرگیز ناپاکیی لێ نەدەکرد. عەلییەشەل، شوونەدۆزێکی هێند لێزان و بەئەزموون بوو، شوێنپێی نیشتنەوەی تەیروتوریشی لەسەر بەردەکان دەناسینەوە!
لە خوێندنەوەدا، زمانی شوکر مستەفا و عەبدوڵای حەسەنزادە، مەستیان دەکردم. لە خوێندنەوەی گۆڤارە ئەدەبییەکاندا، لە دنیای شیعر و ئەدەبیاتدا، دەفریم و فەزای زیندانم جێ دەهێشت.. چێژێکی قووڵم لە خوێندنەوەی شیعرەکانی ناظم حیکمەت، وەردەگرت و وێنە جوانەکانی ئەو شیعرانەی ناظم، تاریکایی زیندانیان بۆ دەبەزاندم و ترووسکەی ژیانیان لە ناخمدا دەژیاندەوە. گێڕانەوەی ئازارەکانی زیندان، تەنها کەسانێک لێی دەگەن، کە ڕۆژگارێک ئەزموونی دۆزەخی زیندانیان کردبێت.. عەلیی مامەحەمە، ئەو گەنجەی هەموو قوڵایی ژیان لە چاوەکانیدا بڵاچەی دەدا.. من، دەمەوێت وێنەکانی ئەو ڕۆژگارە تاریکانە، هەڵەرزینەکانی شەوانی نێو شەختەبەندی زیندان، لە هزری تۆدا زیندوو بکەمەوە، عەلی! دەبێ تۆ ئێستا لە کوێ بیت؟ با پێکڕا بگەڕێینەوە نێو زیندانە چکۆلە و تاریکەکەمان، لەسەر زک ڕابکشێین، حەمەدۆک لە نێوان هەردووکماندا بێتە پەیڤین و مامەشێخیش، شیعری ستوونی بنووسێت و نەیەوێت بۆمانی بخوێنێتەوە.. ئازادعەرەب، بە دەنگە ناسازەکەی، لە ڕاڕەوەکەدا، گۆرانیی سەعدون جابر بڵێت و تۆیش بە جاڕزییەوە بڵێیت: بایەقوشەکە، دەستی پێ کردەوە! ئەم ئازادعەرەبە، هەم ئەگبەتە و هەم شوومە! ئازاد، بەشێک بوو لە کێشەکەی ئێوە، ئەویش لە تۆمەتی کوشتنی ئەو فەرماندەی کەرتەوە گلابوو، چارەنووسی بە هیی ئێوەوە بەند بوو!
وای عەلی!
گوتم: عەلی، ئەو هەڵا و زرموکوتە چییە؟
گوتی: ترپی دێوە!
ـ ترپی دێو، چییە؟
ـ زەلامە زلەکە، قەڵەوی قەڵەوەکان، بەربووەتە سەروگوێلاکی عومەر. هەر کوشتیان فەقیرە!

_ کام عومەر؟

_ ئەوەی کە جاش بووە و دوایی لەگەڵ چەندکەس بووەتە پێشمەرگە و ئێستا لێرەیە، فەرهاد و دوو پێشمەرگە، تێلاترپێنیان کرد!

بۆچی و لەسەر چی، هێندەمان بۆ گرنگ نەبوو.. عەلی گوتی: ئەمە زیندانە، زیندان!

لە زینداندا هەمووشتێک ڕوو دەدات، کەسێک فەلاقە دەکرێت، کەسێک ئازاد دەکرێت، کەسێکی دیکە گوللەباران دەکرێت، کەسێک لە نێو پیسایی زینداندا، تووشی نەخۆشیی پێست دەبێت و گوڵ دەبێ.. کەسێک دەکوژن و تا دواهەناسەی هاوار دەکات، بژی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان!

گوتم: لێرە؟

گوتی؟ بەڵی.. لێرە، لەم بەرگەڵوەدا، پارساڵ، چوار پێشمەرگەی خەڵکی خانەقینیان گوللەباران کردن، مامۆستاحەیدەرێکیان لە نێودا بوو، بە دەم چزەی گوللەکانەوە، هاواری کرد(من بیتاوانم.. بژی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان!)

گوتم: ئاخر بۆچی؟

گوتی: براکەی کە ئەویش هەر پێشمەرگە بوو، مینێکی چاندبوو لە بەرگەڵوو، نزیک بارەگای کاک نەوشیروان، ئەو هەڵات و مامۆستا حەیدەر و سیانی دیکەیان گرتن و پاشان ئیعدامیان کردن!

_ ئەی باشە ئەوانە پەیوەندییان بە کارەکەوە هەبوو؟

_ نازانم! خۆ من سەرۆکی کۆمەڵە نیم! هەر کەسە و شتێکی دەگوت، بەڵام خەڵک بۆیان بە داخ بوون، بە تایبەت مامۆستا حەیدەر، کەس بڕوا ناکات، ئەو، کاری وەهای کردبێت، یاخود ئاگاداری بووبێت!

ئەندامانی خێزانەکەمان هەمیشە زیاد و کەمیان دەکرد، پاش ماوەیەک، مامەحەمە، لەبەر پیری و پەککەوتەیی، ئازاد کرا. من و مامەشێخ و هەردوو عەلی، پێ دەچوو، ئەندامانی هەمیشەیی خێزانەکە بین.

لە مانگی یەنیوەریی ١٩٨٧دا، میوانمان زۆر و ژوورەکەمان نەفەسبڕ بوو. غەریب کونجرینی، سەلاح کونجرینی و سالاری حاجی دەرویشیان هێنان و لای ئێمە دابەزین. غەریب و سەلاح، فەرماندەی کەرت بوون و لەسەر مەسەلەیەک گیرابوون کە ئێستا وە بیرم نایەتەوە. سالار، کادرێکی زیرەک و لێهاتووی کۆمەڵە بوو، بە تۆمەتی «ئاڵای شۆڕش»بوون، گیرابوو.

لە ژووری زینداندا، باس لە هەموو شتێک دەکرا، سیاسەت نەبێ! ئێمە بە توندی بنچاو خرابووین و کەمتر کەسێک دەیوێرا، لە بارەی سیاسەتەوە، بماندوێنێ، بەڵام ئەو کادرانەی بە تۆمەتی «ئاڵا» زیندانی دەکران، هەواڵ و دەنگوباسیان بۆ دەهێناین و ڕاسپاردەی ئێمەیشیان بۆ دەرەوە دەبرد.

سالار، بۆی گێرامەوە و گوتی: کاتێک مەلابەختیار، لە زیندان هەڵات، دنیا خرۆشا، هەموو هێزی پێشمەرگە و بەرگریی میللی، کێومالّی هەموو ناوچەکەیان کرد، هەموو ڕێگا و تووڵەڕێگاکانیان گرتن، هەر شوێنێکی سووکەگومانێکیان لێ دەکرد پشکنییان.. ماڵی کاک بەکری حاجی سەفەریان ئابڵووقە دابوو، پاشان چووبوونە ژوورەوە و کون و قوژبنیان پشکنی بوو، بۆ کاک بەکر، ئەمە سووکایەتییەکی گەورە بوو!

لە تاریکایی زستاندا، زیندان تاریک و تاریکتر دەبوو، لەو کوێستانەدا، خۆر هەر نەبوو، ئەگەر هەیشبا، نەیدەتوانی ڕۆژنەی پۆلابەندی زیندان ببەزێنێ.. لە ڕۆژانی هەتاودا، هەموو ڕۆژێک، تیرۆژێک، هێندەی چارەکەدینارێکی ئاسنین، بۆ ماوەی دە خولەک، بە تەختی ژوورەکەدا دەگەڕا و پاشان هەیپێی لێ دەکرد. من، لەو ڕۆژانەدا نووسیم:

(لە درزێکی بچووکەوە خۆرم بینی
گوتم: شەیدای ماچێکی تۆم زارت بێنە!
گوتی: ببوورە بقەیە
منیش بۆ لای خۆت مەهێنە!)

لە زینداندا، خۆر، هەوا، ئاوی پاک لە پێداویستییەکانی ژیانن و ئێمە لێیان بێ بەش بووین. زیندانییەکانی دیکە، ڕۆژانە، دەبرانە حەساری زیندان و هەوایەکیان وەردەگرت، ئەوان ئەو شانسەیان هەبوو، ئێمە نەمانبوو!

ئاوی خواردنەوەی زیندانییەکان، بە هۆی بۆرییەکەوە، لە گوندی «سەرگەڵوو»ەوە، پێچاوپێچ بە دۆڵەکەدا دەگەیشتە «بەرگەڵوو» و بەشێکی لێ دەگەیشتە زیندان. زۆرجاران، وا دەبوو کە بۆرییەکە وەبەر پارچەی گوللەتۆپان بکەوێت، بشکێت و ئاوی ئاوەڕۆی گوندی بەرگەڵوو، مزگەوت و بنکەکانی پێشمەرگە تێکەڵ بە ئاوی خواردنەوەی ئێمە ببێت و ئیدی دەبوو ئاوەکە یاخود درووستتر بڵێم گوواوەکە لە تەنەکەدا بکوڵێنین، بیپاڵێوین و ئەوجا بۆ خواردنەوەی بەکار بێنین، بەو حاڵەشەوە، ئێمە بەشێکی گوواوی گوند و بنکەکانمان دەخواردەوە!

ڕاڕەوەکەی زیندان، لە ڕێگای ئەو زیندانییانەوە کە بۆ کارکردن دەبرانە دەرێ و پاشان بە پێڵاوی قوڕاوییەوە دەگەڕانەوە، دەبوویە قوڕ و لیتە، ساتێ ناچار بە چوونە نێو ڕاڕەو دەبوویت، دەبوو دەرلنگەکانت تا خوارئەژنۆ هەڵبکەیت و ئاگاداری خۆت بیت.

حەمامکردن لە توالێتدا، کارێکی قێزەون بوو، وەلێ هەمووکەس ناچار بوو ئەو کارە بکات.. لە

تەنەکەیەکدا ئاو گەرم بکە  و لە چلەی زستاندا، لە توالێتی سارد و ڕچیودا، لە نێو بۆگەنی میز و گوودا، خۆت بشۆ و هەڵبلەرزێ!

بەهار هات. بەڵام وەرزەکان بۆ ئێمە مانایەکیان نەبوو، هەر وەرزەو کێشەی خۆی هەبوو. هەتا تەمەنی بەهار پتر هەڵدەکشا، شێ و دڵۆپەی نێو زیندان، هەڵلەرزینی شەوانەی نێو پێخەوی لە سەرما هەڵکێشراو، جێگای خۆیان بۆ گڕەی دیوارەبلۆکی لە گەرمادا هەڵقرچاو. بۆ چۆڕاوگەی ئارەقە و هاڵاوی ئاگری تەباخەکان چۆڵ دەکرد. ئیدی زیندان دەبوویە ئەو دۆزەخەی خودا مرۆڤی پێ دەترسێنێ!

لە بەهاردا، خزم و کەسوکار سەردانیان کردین. چنووری خوشکەزام، براژن گوڵزار، پەروینی خوشکم، حورپەتی پوورە کافە، دادەعەتییە و دادەحەپسەی جووتەخوشکی شێخعەلی هاتن و هەمیشەش لە هاتنیاندا، هەواڵی شار، خوردانی چەند ڕۆژ، جلوبەرگ و پارەیان بۆ دەهێناین. چنوور، لە هەمووان ماندووتر بوو. پێیەکی لە زێوەی ئێران کە بارەگای ئاڵای شۆڕشی لێ بوو، پێیەکی دیکەی لە شار و پاشان بۆ زیندانی بەرگەلوو!

چنوور، باسی هەوڵ و تەقالای ڕێکخستنی شاری کرد و گوتی: بەردەوام هەوڵ دەدەن تا ڕێگەچارەیەک بۆ ئاشتی، لەگەڵ یەکێتیدا بدۆزنەوە و کۆتایی بەم دۆخەی ئێوە بهێنن، بەڵام نە یەکێتی ئامادەیی تێدایە و نە برادەرانی ئاڵاش لە زێوە، نەرمییەک دەنوێنن.. هەندەک لە برادەرەکان، زۆر توندن.

## هاوینی ١٩٨٧

هێشتا شوێن هەر زیندانی بەرگەڵووە، زەمەنیش زەمەنی خەستبوونەوەی تۆپباران، دەستپێکردنی ژارباران، مۆڵخواردنی پاسداران و سەرەتای دەرکەوتنی تراژیدیاکانە.
دەوڵەت، لە پەسا، دۆڵی جافەتی بە گشتی و سەرگەڵوو و بەرگەڵووی بە تایبەت، گا بە فڕۆکە و گا بە تۆپی دوورهاوێژ، بۆمبباران دەکردن. هەندەک لە بۆمبەکان گازی ژەهراوییان دەوەشاند، پێشمەرگە و سیڤیل دەکوژران و ترس و بیمیان لە دڵی خەڵکدا دەچاند. ناپاڵمەکان، دنیایان دەهەژاند و زیندان لەسەر لەپی دووکەڵ و ئاگر، جۆلانێی دەکرد.
پێشمەرگە و پاسەوانان، ڕۆژانە، بۆ خۆپاراستن لە گازی ژەهراوی، هەڵدەکشان بۆ بەرزاییەکان و ئێمەش خاولی و پارچەمان تەڕ دەکردن و چاوەڕێی چارەنووسی نادیار بووین.
مامەشێخ و من، لە نەبوونی هەوا و ئاوی پاک و لە سۆنگەی نەبوونی بواری بزووتندا، باری تەندرووستیمان زۆر خراپ بوو، ئیدی بیرمان لە پەیوەندگرتن لەگەڵ سەرکردایەتیی کۆمەڵە کردەوە!
دەبوو کارێک بکەین، بەڵام چی بکەین؟ نامەیەک دەنووسین و بۆ سەرکردایەتیی کۆمەڵەی دەنێرین..
نامەیەکی زۆر کورت و داوای بینینی کەسێک دەکەین کە شەرحی حاڵی خۆمانی لا بکەین و بزانین ئەم دۆخە دۆزەخاوییە تا کەنگێ بەردەوام دەبێت. نامەکەمان نارد و پاش دوو ڕۆژێک، پێیان ڕاگەیاندین کە حەمەتۆفیق ڕەحیم، دەیەوێت بمانبینێت.
مامەشێخ نەهات. من، چووم و حەمەتۆفیقم دیت و باسی ژیانی سەخت و نالەباری زیندان و تەندرووستیی خۆمانم بۆ کرد. حەمەتۆفیق، هەم ڕێزی لێ گرتم و هەمیش گوێی لە باس و بۆچوونەکانم گرت. ئەو، گوتی: هەموو داواکانتان بە سەرکردایەتی دەگەیەنم و پاشان وەڵامتان دەدەمەوە.
لە زیندانی یەکێتیدا، هەر پێشمەرگەیەک زیندانیی بوایە، ٥ دینار مووچەی مانگانەی هەبوو. ئەو ڕۆژەی مووچەکەیان هێنا، مامەشێخ، مووچەکەی خۆی و هیی منیشی ورد کردن، لە زەرفێکی کردن و لەسەری نووسی: ئێمە، هەوا، ئاو، هەتاو، دەرمان و ژیانمان دەوێ! مامەشێخ، زەرفەکەی بە پێشمەرگەیەکدا، بۆ فەرهادی بەڕێوەبەری زیندان ناردەوە!
بەیانیی ڕۆژی دوایی، ئێمە جارێ خەوتبووین، دەرگا کرایەوە و فەرهاد، بەدەم جنێودانەوە، هاتە گیانمان و بە مستەکۆڵە و شەق، پەلاماری شێخەعلیی دا، هەرچی نەشێ و نەکرێ پێی کردین، لە ژوورەکەی دەرکردین و بۆ ژووری ئەفسەرە عەرەبەکانی بردین!
لە نێو ئەفسەراندا، جێگامان لێ خۆش کرد و ماوەی دوو هەفتەمان لە نێو ئەواندا گوزەراند.

پاشنیوەڕۆی ڕۆژێک لە ڕۆژەکان، ئەفسەرێک کە لەگەڵ مندا هاوجێگە بوو، بانگ کرا بۆ دەرەوە و پاش کاتژمێرێک، بە گریان و هەڵەرزینەوە گەڕایەوە..
گوتم: ها خێر؟
_ تەواو.. هەر ئەمشەوم ماوە!
_ چۆن دەزانی؟
_ کەسوکارم هاتبوون، پێیان گوتم وەسێتیان بۆ بکەم!
ئەوشەوە، تا بەیانی نەیهێشت بخەوم و هەموو چیرۆکی ژیانی خۆیی، بە گریانەوە، بۆ گێڕامەوە. چیرۆکی ئەو، چیرۆکی هەموو ئەو کەسە نەگبەتانە بوو کە لە سیستەمی بەعسدا، دەبنە برغوویەکی گەچکە لە ماشێنی هاڕینی کۆمەڵگەدا.. سیستەمێک کە مرۆڤەکان بۆ ئەوەی بژیێن، ناچارن ببنە ڕۆبۆت.
من، کە چەندساڵان، دژ بە بەعس خەباتم کردبوو، ماندوو بووبووم و هەموو تەمەنی گەنجیی خۆمم، بە هۆی بەعسەوە، لە شاخ و چیادا بەسەر بردبوو، من کە هاوڕێ و خۆشەویستەکانم، لە زیندانی بەعسدا ئیعدام کرابوون، لە شەڕدا شەهید بووبوون، بۆ خۆشم جارێ لەژێر گازبارانی بەعسدا بووم، کەچی ئیعدامکردنی ئەو هاوماڵە زیندانییەم پێ خۆش نەبوو! من، وەکو ئینسانێک لێم دەڕوانی، مەرگەساتی هاوڕێکانی خۆمم لە زیندانی بەعسدا وێنا دەکردن و هەموو هەستێکی تۆلەسەندنەوەم تێدا خەوتبوو! ساتێ باسی منداڵەکانی خۆیی بۆ دەکردم، منداڵەکانی هاوڕێ شەهیدەکانم بیر دەکەوتنەوە.. منداڵەکان منداڵن، بێ ئەوەی بزانن باوکیان لەسەر چی و لە کوێدا ئیعدام دەکرێن!
پاش دوو هەفتە، گەڕاینەوە ژوورەکەی خۆمان و لەگەڵ عەلیی مامەحەمەدا، ڕۆژانمان بەسەر بردن.

# چیرۆکی عومەرعەرەب

عەلیی مامەحەمە، لە ڕاڕەوکەوە، وەژوور کەوت و گوتی:

_ عومەرعەرەب، ئەوزادی عەبەی تەقی و سەلاح چاوزەقیان بۆ زیندان هێناون..

_ ناوی عومەر عەرەبم بیستووە، دەزانم کەسێکی زۆر ئازا و فەرماندەی کەرتە، بەڵام ئەوانی تر ناناسم!

_ ئەوانیش فەرماندەی مەفرەزەن، وابزانم ئەوزاد، جێگری عومەرە.. عومەر، دێتە ژوورەکەی ئێمە و ئەوانیش لە ژووری پێشمەرگەکان دەبن.

_ لەسەر چی زیندانی کراون؟

_ شتێک دەبێ هەبێ، خۆیان دێن و چیرۆکی خۆیان دەگێڕنەوە.

عومەر، هات و سڵاوی کرد، لە تەنیشت منەوە، جێگایەکی بۆ خۆی چێ کرد.

کوڕێکی گەنمڕەنگی باڵاناوەنجی، بە دوو چاوی بزۆز و تیشکبارەوە کە زرنگییان لێ دەبارین.

عومەر، لە ڕۆژانی سەرەتادا، بێدەنگ و کەمدوو بوو، لەگەڵ ئێمەش، لاتەریک و کەمتر دەیدواندین. لە زینداندا، هەموو کەسەکان بە جۆرێک، لەگەڵ یەکدی دەکرێنەوە، پردی پەیوەندییەکان دروست دەبن و دواجار، دڵی خۆیان دەکەنەوە و چیرۆکەکانیان دەگێڕنەوە.

عومەر گوتی: مامۆستا، ئێوە بۆ وەهاتان کرد؟

_ چیمان کردووە؟

_ ناپاکیتان لە یەکێتی و شۆڕش کرد!

_ هیچ ناپاکییەک لە گۆڕێدا نییە، پێت وایە، ئێمە ناپاکیمان کردبێت؟ ئێمە کێشەی فیکری و سیاسیمان لەگەڵ کۆمەڵە و یەکێتیدا هەبوو!

_ ئاخر ئێوە، بۆ ئەوەی شۆڕش تێک بدەن، پەیوەندیتان بە موخابەراتی ئێراقەوە کردووە، ٢ میلیۆن دینارتان لە بەعس وەرگرتووە!

_ چۆن دەزانیت؟ کێ ئەمانەی بە تۆ گوتووە؟

_ تەنها بە منیان نەگوتووە، بە هەموو پێشمەرگە و لێپرسراوێکیان گوتووە! دوای گرتنی ئێوە، کۆبوونەوەیان لەگەڵ هەموو لێپرسراوەکان کرد و پێیان ڕاگەیاندین کە ئێوە، لە بەردەم کامێرای ڤیدیۆدا، بە زمانی خۆتان، ئەو ڕاستییەتان درکاندووە!

_ تۆ، یاخود کەسێکی تر، ئەو فیلمەی دیتوە؟

_ نا.. من نەمدیوە، بەڵام لێپرسراوەکانی کۆمەڵە، پێیان گوتین، ئەگەر بمانەوێت دەتوانین بیبینین!
_ عومەر! لەم شۆڕشەدا، لەم کەژوکێوەدا، لەم دنیایەدا کە جگە لە یاسای خوێن و زەبر هیچ یاسایەکی دیکە حوکم ناکات، خەڵک لەسەر سووکەگومانێک ئیعدام دەکرێت، پێت وایە، ئەگەر ئێمە، ئەو کارەمان بکردایە، ئێستا زیندوو دەماین؟
_ئەمەم.. بڵێم چی.. ڕاست دەکەی!
چەند ڕۆژێکی گەرمک بوو تا ئەو وێنەیە لە هزری عومەردا بسڕمەوە و وێنەیەکی دیکەی لە جێگادا دابنێم.. ئەوان، زەوینەیەکیان لە نێو هێزی پێشمەرگەدا، بۆ ئەگەری ئیعدامکردنی ئێمە، سازاندبوو!
لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژاندا، عومەر هۆگری من دەبوو، متمانەیەکی زۆری پێم هەبوو، ڕێزێکی زۆری لێ دەنام. عومەر، سەرپاکی چیرۆکی منداڵیی خۆیی بۆ گێرامەوە، منداڵیی کوڕەپۆلیسێک کە باوکی، بۆ دابینکردنی ژیان، ساڵانێک بۆ خوارووی ئێراقیان دەبات، پاشان بۆ سلێمانی دەگەڕێنەوە.
عومەر، باسی ئەو چالاکییانەی خۆی و هاوڕێکانی بۆ باس کردم کە لە پاش شکستهێنانی گفتوگۆی بەعس و یەکێتی، لە ناوشاری سلێمانیدا، ئەنجامیان دابوون. ئەو چیرۆکانە، هەر بە ڕووداوی نێو فیلمەکانی «ڕامبۆ» دەچوون، بەڵام ڕاستیش بوون.
_ عومەر، چیتان کردووە، وەها لە زیندانیان خستن؟
_ کارێکمان کرد، بەڵام ناچار بووین، ژیان پێی کردین، بێدەرامەتی و سەختیی ژیانی خێزانەکەم پێی کردم، لە کاتێکدا، هاوڕێکانی من، مەبەستم ئەوانەیە کە وەکو من لێپرسراو بوون و نیو هێندەی من چالاک نەبوون، ژیانیان باش و لێیان دەڕژا. ئیتر کردم و پەشیمانم!
_ چیت کرد؟
_ چووینە شاری سلێمانی، دکتۆر «موحەمەد باقر»مان فڕاند و لە خانوویەکی چۆڵدا، هەر لە شاردا، شاردمانەوە و داوای پارەمان لێ کردا
_ چۆنتان فڕاند و چەند ڕۆژ شاردتانەوە؟
_ بە ئۆتۆمبێل فڕاندمان، چاومان بەست و لەماڵێکدا داماننا و تەلەفوونمان بۆ ژنەکەی کرد. ژنەکەی، ئامادەیی نیشان دا کە پارەکەمان بۆ بهێنێت، بەڵام لە ڕووی تەکنیکییەوە، کارەکەمان بە ئەنجام نەگەیشت، ژنەکەی ئاگاداری موخەبەراتی کردبوو. ناچار بووین دکتۆر جێ بهێڵین و خۆمان دەرباز بین. دکتۆر، دۆستی نزیکی کاک ئەوشیروان و مامجەلال بوو، کارەکەمان ئاشکرا بوو! دەوڵەمەندەکان، هەم دۆستی بەعسن و هەم دۆستی شۆڕش!
_ خراپتان کردووە، بەڵام ئازاد دەکرێن..
_ دەترسین.. دەترسین ڕەمیمان بکەن!

_ نا.. پێم وا نییە.
لە ناوەڕاستی هاویندا، عومەر و هاوڕێکانی، برانە دەرەوەی زیندان و کەپرێکیان درووست کرد، لەوێدا دەستبەسەر بوون. بەڵام ڕۆژی چەند جارێک، عومەر و نەوزاد دەهاتنە ژوورەوە و سەردانی ئێمەیان دەکرد. ئەوان، چێژیان لە قسەوباسەکانی ئێمە وەردەگرت.
ڕۆژێک، عومەر هات و دانیشت، لە کاتێکدا ئەندامانی دیکەی خێزانەکە، لە ڕاڕەوەکەدا پیاسەیان دەکرد، ئێمە تەنها بووین، عومەر گوتی:
_ مامۆستا، من متمانەی هەموو دنیام بە تۆ هەیە و دەمەوێت پلانێکی خۆمت بۆ باس بکەم!
_ یانەڵا.. خێر!
_ من دەترسم ئیعدامم بکەن!
_ بۆچی ئیعدامت دەکەن؟ تۆ دەستبەسەریت و حاڵت باشە!
_ هەندێک شتم بیستووە، کاک نەوشیروان لە دەرەوەیە و دێتەوە، هەر گەیشتەوە ئیعداممان دەکات!
_ بۆ دەبێ ئەو ئیعدامتان بکات؟
_ با.. دەیکات، من خۆم زانیاریم وەرگرتووە!
_ من، بڕوا ناکەم!
_ تۆ بڕوا دەکەیت یان نا، ئەوە ئارەزووی خۆتە، بەڵام من دەمەوێت، پلانەکەی خۆمت بۆ باس بکەم! دەشتوانم باسی نەکەم، خۆ من هیچ کارێکم بە تۆ نییە، تەنها خۆشم دەوێیت و متمانەم پێت هەیە.. خۆ سرڕەکەم دەپارێزیت؟
_ عومەر، من و تۆ لێرەدا یەکترمان ناسیوە، ئەو ساڵانەی من لێپرسراو بووم، تۆم نەدیوە و پێکەوە کارمان نەکردووە.. دەڵێن هاوڕێیەتیی زیندان، زۆر پتەوە، بەڵام هیوادارم پلانی خراپت نەبێت!
_ لەمە خراپتر هەر نییە!
_ چۆن؟
_ من، ئەمشەو هەڵدێم.. هەر سێکمان، من و نەوزاد و غەریب کونجرینی!
_ بۆ کوێ هەڵدێن؟
_ ئێمە، بەیانی لە سلێمانی دەبین!
_ ئیختیفا دەکەن؟
_ ئیختیفای چی، تەسلیم دەبینەوە و تەواو!
_ عومەر، کاری وەها مەکەن. ئاخر تۆ چەند ساڵە پێشمەرگەیت، پێشمەرگەیەکی ئازا، مێژوویەکت لە

نارازیتی هەیە. تۆ هیچ نەماوە دژی بەعس نەتکردبێت. بەعس دەتکوژێت!
_ هەموو شتێک دەزانم و بیرم لە هەمووشت کردووەتەوە، بەڵام ئەمە دوابڕیارمە. خۆ ناشێ خەبەرم لێ بدەیت؟!
لە دڵی خۆمدا گوتم: وای چ شۆڕشێکی سەمەرەیە! کەسێک، بە هەموو دڵسۆزی و توانستی خۆیەوە، دەبێتە پێشمەرگە، گاڵتە بە مەرگی خۆی دەکات و پاشتر وا بە ئاسانی، دەبێتە جاش و لە سەنگەری دوژمنەوە، بە هەمان تین و تاوێک کە هەیەتی، دژایەتیی هاوسەنگەرەکانی خۆی دەکات!
_ خەبەرت کە لێ نادەم، بەڵام کاری خراپ مەکە!
_ کاری خراپ، بەرانبەر ئەو کەسانە دەکەم کە بەم دەردەیان بردم! دەمەوێت کاری باشیش بکەم!
_ کاری باش؟
_ بەڵێ.. کە چوومە شار، دیارە دەبم بە جاش!
_ ئێ..
_ خزمەتێکیش بە ئێوە دەکەم! ئا.. من دەمەوێت ئێوەش لەم زیندانە دەرباز بکەم!
_ چۆن؟
_ شەوێک، مەفرەزەیەک لەگەڵ خۆم دێنم و ئەم زیندانە کۆنترۆڵ دەکەم، پەلی لێپرسراوەکان دەبەستم، ئێوەش لەگەڵ خۆم دەبەم!
_ بۆ کوێمان دەبەیت؟
_ بۆ هەر شوێنێک پێتان خۆش بێت، دەتوانم لە شار بتانشارمەوە و پاشان ڕەوانەی ئێرانتان بکەم!
_ نا عومەر گیان، واز لە ئێمە بهێنە، ئەم کارەی تۆ، لە ڕووی سیاسییەوە، ئێمە دەکوژێت..
_ بە خودا دەیکەم!
_ دەزانم لە دەستت دێ، بەڵام ئێمە نامانەوێت.. لە ناخەوە پێم ناخۆشە، ئەم کارە دەکەیت و دەڕۆیت، بەڵام کە تۆ متمانەت بە من هەیە، منیش ناچارم، نهێنییەکەت ڕابگرم و نەیدرکێنم!
_ من، هەر دەڕۆم، هەر کارێکتان لە شار هەبوو، لە خزمەتتانادام. من ئاڵای شۆڕش نیم، بەڵام تۆ هەر کارێکت هەبێ، وەرامم بۆ بنێرە، لەبەر خاتری تۆ، کار بۆ برادەرەکانیشت دەکەم.
من کە دەمزانی دەیان سەرۆکجاش هەن، پەیوەندییان لەگەڵ هێزەسیاسییەکاندا هەیە و بە ئاگاداریی ئەوان بوونەتە جاش، گوتم:
_ عومەر، ئێستەش پەشیمان ببیتەوە، هەر درەنگ نییە، بەڵام ئەگەر ڕۆیشتیت، من کارم پێت دەبێ..

ـ ئێستا چ کارێکت هەیە؟

ـ هیچ کارم نییە، بەڵام دەفتەرێکم هەیە، چەند چیرۆک و پەخشانێکی تێدان، دەتوانیت بیگەیەنیتە شار و پاشان کەسێکی بۆ دەنێرم.

ـ من نازانم چیرۆک و پەخشان چین! بەسەر چاو، هەرچییەک هەیە، بیدە بە نەوزاد و من دەیگەیەنم. برادەرەکانی نێوشارتان ئاگادار بکە، با بێن و هەر کارێکیان هەبوو، بە سەر چاو!

عومەر هەستا، ئەملاولای ماچ کردم. لە چاوەکانی عومر رامام، رکم لێی نەدەبوویەوە، بەزمییم دەهاتێ و دڵم پێی دەسووتا!

رۆژی دوایی، چێشتنگاو، لە زینداندا بوو بە هەڵا، ئەمشەو، عومەرعەرەب، نەوزادی عەبەی تەقی و غەریب کونجرینی، دەرباز بوونە!

## ڕۆژنامەنووسێکی تورک و
## نامەیەک بۆ مەسعودبارزانی!

زیندانی بەرگەڵوو، مەملەکەتێک بوو بۆ موزاییکی ئینسانەکان، لێرەدا، بینینی کەسانێک کە تۆ هەرگیز وێنات نەدەکردن، مومکین بوو.

لە کۆتایی هاویندا، ڕۆژنامەنووسێکی تورک، کە لە ڕێگای بەغدادەوە گەیشتبووە کوردستان. لە ناوچەی گەرمیان فڕێندرابوو. لە ڕێگادا، بەر گازی کیمیاوی کەوتبوو. چاوەکانی پەرێشان بوون. ئەویش بوویە میوانی ژوورەکەی ئێمە.

عەلی تورکمان، خۆی کردە وەرگێڕمان و گفتوگۆمان لەگەڵدا کرد. کابرای ڕۆژنامەنووس، کەسێکی چەپ بوو. بۆ ڕوژنامەیەکی تورکی کاری دەکرد، قسەوباسێکمان لەمەڕ بزووتنەوەی چەپ کرد، چیرۆکی خۆمان بۆ گێڕایەوە و بەڵێنی پێ داین کە گەڕایەوە وڵاتی خۆی، ڕیپۆرتاژێک لەسەر ئێمە و ژیانمان بنووسێت و بڵاوی بکاتەوە. ئەو، داوای وێنەی ئێمەی دەکرد، بەڵام لە زینداندا، ئەوە مەحاڵ بوو. ئێمە، تێگەیشتین کە ئەم ئازاد دەکرێ و لە ڕێگای ئێرانەوە، دەچێتەوە تورکیا. ئەو، گوتی، بە نیازە سەردانێکی بارەگای سەرەکیی پارتیی دیموکراتیی کوردستان بکات و مەسعودبارزانی ببینێت.

مامەشێخ گوتی: چ دەرفەتێکی باشە! نامەیەک دەنووسین بۆ مەسعودبارزانی، سەرەخۆشیی مردنی ئیدریس بارزانیی لێ دەکەین. حاڵی خۆمانی بۆ باس دەکەین و داوای لێ دەکەین کە هەوڵ بدات لەگەڵ مامجەلال و سەرکردایەتیی یەکێتیدا قسە بکات. بەڵکوو چارەسەرێکی سیاسییانە بۆ کێشەی ئێمە ببیننەوە. من نامەکەم نووسی و مامەشێخ پێی باش بوو. پاشتر، زانیمان کابرای ڕۆژنامەنووس، ڕیپۆرتاژێکی لەسەر کوردستان نووسیبوو و باسی ئێمەیشی کردبوو. نامەکەی بە مەسعودبارزانی گەیاندبوو یان نا؟ نەمانزانی.

# پاییزی ١٩٨٧

زیندان جمەی دێت و ڕێ بەر ڕێدار ناکەوێت، لەپەسا و پۆل پۆل، سەرباز و جاش و ئەفسەران، بە دیل دەگیرێن و دەهێنرێنە زیندان. ئێستا ئێمە بە زەحمەتێکی زۆر دەتوانین لە ژوورەکەمان دەرکەوین و بە ڕاڕەوەکەدا گوزەر بکەین. قاوشەکانی ئەفسەران و سەربازەکان، جێگای دانیشتنیشیان لێ نابێتەوە. دیلەکان، بۆ ئەوەی نەخنکێن و هەناسە هەڵمژن، لە ڕاڕەوەکەدا دەمێننەوە. عەلیی تورکمان کە بە هەناسەبڕکێ، لە تەوالێتەکانەوە، بە ڕاڕەوەکەدا، خۆی گەیاندەوە ژووری، گوتی:
ئەمشەو سەربازێک، لە ژووری سەربازاندا، خنکاوە و تەرمەکەی لە ڕاڕەوەکەدا دانراوە.
داستانی ڕزگارییە! هێزەکانی یەکێتی، بۆ کشاندنی بازنەی ئەو ئابڵووقەیەی دەوڵەت لەسەر ناوچەکەی داناوە. هێرش دەکەن و لە سەرەتادا، بە قوربانیدانێکی زۆر، هەموو بەرزاییەکان دەگرن و هێزەکانی دەوڵەت تێک دەشکێنن. ڕادیۆی یەکێتی، تەنها سەرچاوەی هەواڵەکانە و ئێمە بە پەرۆشەوە، گوێ بۆ گۆڕانکارییەکانی بەرەکانی شەڕ، ڕا دەدێرین.
هێزەکانی بەعس، هێرش دەکەنەوە، ئێرانییەکان، بەڵێنەکانیان بە جێ ناهێنن و وەک بڕیارە کۆمەکی هێزەکانی یەکێتی ناکەن و بەشدارییەکی جیدیی شەڕەکان نابن. دەوڵەت، زۆربەی شاخ و بەرزاییەکان دەگرێتەوە.
ئەم مانگە، چڕترین بۆمبیارانەکان بۆ سەر دۆڵی جافەتی دەست پێ دەکات. زیندان، لە دۆزەخی ناوەوەی خۆیدا، لە هەنگامە و هاتوهاواری ئەم حەشاماتەدا، دەمانخنکێنێ و بەعسیش لە دەرەوە، دۆزەخێکی بۆ زیندان داخستووە! ئەبوونەحمەد، ئەفسەرێکی دیلە و دەڵێ: هەتا ئێمە لەم زیندانەدا بین، زیندان سەلامەتە و بۆمبێکی وێ ناکەوێت!
_ چۆن دەزانیت؟
_ لەشکری دەوڵەت، وردینەی خاڵ و هێڵکارییەکانی ئەم ناوچەیەی هەیە و بە پێی نەخشە، تۆپباران دەکات. ئەوان، دەزانن زیندان لەسەر کام هێڵ و لە چ خاڵێکدا جێی گرتووە. مەگەر تۆپهاوێژێک، بە چاوی خەواڵوو و بە هەڵە، گوللەتۆپێک بۆ ئەم شوێنە بنێرێت!
فڕۆکەکان پەیدا دەبنەوە، گوێمان لە ناژیری خۆشاردنەوەیە، لە زینداندا، چ شوێنێک بۆ خۆحەشاردان نییە. ناڵەیەک و دنیا دەلەرزێ، دیوارەکان بە یەکدا دێن، تۆز و خۆڵ و وردەپارچەی ناپاڵم، لە پەنجەرە چاوکوێرەکانەوە، سڵاو لە زیندان دەکەن. ناخی زیندان پڕ دەبێ لە دووکەڵ و بۆنی باڕووت و هێندەی دیکە ڕەش دادەگەڕێ.

لە چاوی کوێری زیندانەوە، دەنگی بێزارییەکانی ئێمە بە هیچکوێیەک ناگات، جگە لە دەنگدانەوەی ئازارەکانی ناخی خۆت، دەنگێک نابیستێت..

((زیندان!
تاسەی پەیڤێک بۆ هەڵفڕین
مەیلی نیگا بۆ ڕامووسانی ڕۆشنایی
حەزی بیستن بۆ ختووکەی پەنجەی دەنگێک
جیا لە ناڵەی ناخی خۆت!
بێزاریی ڕۆح لە دیوارەکانی جەستە و
جەستە لە باڵەفڕێی ڕۆح!))

ئەم ڕۆژانە، برستم لێ براوە، تین و تاوێکم نەماوە، ئێسکەکانم، شێ و سەرما داغانیان کردوون. مامەشێخ و عەلیی مامەحەمە، باڵم دەگرن و بۆ چوونە تواڵێت، یارمەتیم دەدەن. مامەشێخ، تەندرووستیی لە من باشتر نییە و بە دەرمان بەرێوە دەچێ! من، داوای دکتۆر دەکەم، دەمنێرنە نەخۆشخانەی بەرگەڵوو، دکتۆرەکان پشکنینم بۆ دەکەن، دەرزیم لێ دەدەن و دەرمانی پێویستم پێ دەدەن. لە هەفتەیەکدا، پاش بەکارهێنانی دەرمانەکان، تەندروستیم باشتر دەبێت و وە سەر پێیان دەکەومەوە.
زریانێک هەڵدەکات و هەموو شتێک دەهەژێنێ، درەختەکان لە ڕیشە هەڵدەکێشێ، گابەردەکان تل دەدات، لافاوێک دێت، لافاوێک کە بڵێسەی ئاگری لێ هەڵدەستێ، کێوەکان دەتوێنەوە، هەموو دنیا دەریایەکە لە ئاگر، مامەشێخ پەلی من دەگرێت و لە دەرگای گڕگرتووی زیندانەوە دەردەچین، لە بەردەم زینداندا، بەلەمێک وەستاوە، سواری بەلەمەکە دەبین و بە نێو دەریای ئاگردا، لە نێوان زمانی بڵێسەکانەوە، دەپەڕینەوە. بەلەم دەفڕێ و لە ئاسمانەوە، هەموو شتێک دەبینین، هەموو شتێک کە لە سووتاندایە! دایکم، کراسێکی ئاوداماني سپیی پۆشیوە و لەسەر کورسییەک لە گڕ، لە تەهی ئاسماندا ڕۆنیشتووە و چەپکێ گوڵی سوورمان بۆ دەهاوێ.. من چەپکەگوڵم پێ ناگیرێتەوە و گوڵەکان بەسەر زمانی ئاگرەوە هەڵدەقرچێن!
خەونەکەم بۆ شێخەلی گێڕایەوە، ئەو گوتی: خەونێکی ترسناک و سەیرە!

## زیندانی بەرگەڵوو، فیبریوەریی ١٩٨٨

ئەو ساڵە، ساڵی هاتنی ئەنفال و نغرۆبوونی دنیا بوو!

جەنگی ئێران_ئێراق، لە بەرەکانی نێوڕاست و باشووردا، چەقیوە و تەکانێک نادات. هێزەکانی ئێراق، پێچەوانەی چاوەڕوانیی ئێران و هێزە سیاسییەکانی کوردستان، کێڵگەکانی «مەجنوون» و هەندەک ناوچەی دیکەی گرنگ دەگرنەوە. کوردستان دەبێتە شەڕگەی هێزە دژەکان و ئێران، قورسایی خۆی لە بەرەکانی کوردستاندا، بە هاوکاریی هێزە کوردییەکان، زیاتر دەکات.

لە مانگی یەنیوەریدا، زەنگی مەترسییەکی گەورە دەبیسترا، تاپۆی حەزیایەک دەبینرا کە دەیویست هەموو وڵات لووش بدات. هێزەکانی پاسداران، وەک ڕەوەگوورگ لە ناوچەکە وەر بووبوون.

کۆپتەرەکانی ئێران، دۆڵاودۆڵ دەفڕین و لە بەرگەڵوو، ڕێک لە تەختاییەکەی تەنیشتی زینداندا دەنیشتنەوە، بارەکانیان جێ دەهێشتن و دەگەڕانەوە. فڕۆکەکانی ئێراق، لە بەرزاییەوە، کۆپتەرەکانی ئێرانیان بنچاو دەکرد و بۆسەیان بۆ دەنانەوە.

مامەشێخ گوتی: شوکر بۆ خودا کە یەکێتی فڕۆکەخانەیەکی هەیە، بەڵام بۆ دەبێ ئەم فڕۆکەخانەیە، ڕێک بە قنگی ئێمەوە نووسابێت! دەترسێم ڕۆژێک، فڕۆکەیەکی ئێراقی، بە ڕۆکێتێک، فڕۆکەخانە و زیندانەکەی ئێمەش نغرۆ بکات!

فڕۆکەیەک هات و نیشتەوە، عەلی مامەحەمە گوتی: بەرزم بکەنەوە، دەمەوێت لەو کونەوە ببینم کە ئاخۆ چیی تێدایە!

جەباری عەلی حوێز، گوتی: وەرە سەر شانم!

عەلی، لە قەڵادووشکانی جەبار دانیشت و جەبار هەستا سەر پێیان.

عەلی گوتی: وا نابێت، هیچ نابینم، دەبێت بە پێیان لەسەر شانت بوەستم، دیوارەکە هێند بەرزە دەڵێی شوورەی قەڵایە!

_ هەستە سەر پێ!

عەلی هەستا و گوتی: دەیبینم!

_ چییە؟

_ مەسینە! ئافتاب!

_ چی؟

_ مەسینەی دەستنوێژهەڵگرتن.. پاسدارەکان، دەچن بۆ کەربەلا و پێیان وایە، ئێراق مەسینەی لێ نییە.

جەبار گوتی: دابەزە، شانم شکا!
جەباری عەلی حوێز، مانگێک دەبوو، بۆ دیوەخانەکەی ئێمەیان هێنابوو. من، جەبارم پێشتریش دەناسی. دەرگایان کردەوە، مەلایاسین گوتی: کاک جەبار لای ئێوە دەبێت!
جەبار، کادری دێرینی سۆسیالیست و پاشتر هیی یەکێتی بوو.
ئێمە، پێشینەی چیرۆکی جەبارمان دەزانی و زیندانیکردنی ئەومان پێ سەیر نەبوو.
جەبار، لە سەروبەندی کۆتاییهاتنی مفاوەزاتدا، بەعس دەستگیری کردبوو. ژنەکەی کە بۆ دیداری ئەو، سەردانی زیندانی کردبوو، لە داوی موخابەرات کەوتبوو. ژنەکەی جەبار، بە فەرمانی موخابەرات، لە کاتێکدا کە جەبار پاش گۆڕینەوەی لەگەڵ دیلێکی بەعسدا، ئازاد و لە ناوچەی قەرەداخ پێشمەرگە بوو، ژەهری لە نێو ماستاو، بۆ ژمارەیەک لێپرسراو، لە بارەگای مستەفاچاوڕەش کردبوو.
لە سۆنگەی ژەهەرنۆشین و ئالوودەبوونیان، بێستوونی مەلاعومەر و دایکی مستەفاچاوڕەش شەهید و دکتۆرمەحمودعوسمان، مستەفاچاوڕەش، سامی شۆڕش، دکتۆرشوان و هەندەک کەسی دیکەش ئالوودە بوون.
ژنەکەی جەبار، خۆی دەرباز کردبوو و پاداشتی خۆی، لە بەعس وەر گرتبوو.
جەبار، جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە، کە ئەو، لەو سات و کاتەدا، لە قەرەداخ بووە، لە مەڵبەندەوە برووسکەیان بۆ کردووە و خۆی بە پێی خۆی هاتووە بۆ سەرکردایەتی.
_ ئەگەر من ئاگاداری کاری ئەو بێڕەوشتەی ژنم بووایەم، بە پێی خۆم نە دەهاتم. من، دەمتوانی لە بری ئەوەی بۆ ئێرە بێم، بۆ سلێمانی بڕۆم! ژنەکەم، پێش ئەوەی تاوان دژی ئەو برادەرانەی من بکات، تۆڵەی لە من کردووەتەوە! جەبار وەهای دەگوت.
مەرگی بێستوون دڵگرانی کردم. بێستوون، لە شەڕی پەلامارەکەی یەکێتی و زیندانیکردنی ئێمەدا، میوانمان بوو.
_ من، خۆم بە ئەندامی ئەم رەوتەی ئێوە دەزانم، هەر کێشەکە بە ئاشتی و بێ تەقوتۆق چارەسەر بکرێت، من لەگەڵ ئێوەم، ئاخر من دەمەوێت نە کورد بکوژم و نە کوردیش بمکوژێت! بێستوون، دوانێوارە، لە گوندی «تەکییە»، وەهای پێ گوتم.
لەگەڵ خەستبوونەوەی هێرشەکانی بەعسدا، زیندان دەهات چۆڵ و چۆڵتر دەبوو. زیندانییەکان، پاکوپیس دەکران. هەندێکیان، بە چەرەیەک پارە، لە نێوان ٢٠ تا ٣٠ هەزار دینار، ئازاد دەکران. ئەفسەرێک کە داوای پەنجاهەزار دیناریان لێ کردبوو، بە کوڵ دەگریا و دەیگوت: پەنجا هەزار، ئەگەر گەڵای دارپرتەقاڵیش بێت، بە ساڵێک کۆ ناکرێتەوە!
هەندەک لە سەرباز و جاشان، بێ بەرانبەر ئازاد کران، ژمارەیەکی زۆریان گواستنەوە بۆ ناوچەکانی

قەرەداخ و خۆشناوەتی و جاریّ سەدکەسێک لە زینداندا مابوون.
بازنەی ئەنفال، بە زمانی بلێسەی خۆیەوە، تەنگ دەبوویەوە. بەعس، بڕیاری دابوو، بە هەر نرخێک بێت ئەو ناوچەیە کە مەترسیی بۆ دەسەلاتی ئەو لە کوردستاندا درووست کردبوو، کۆنترۆڵ بکات. دریژایی بەرەکانی شەڕ، لە هەر چوارلاوە، چەند سەد کیلۆمەتر دەبوو. ژەنراڵەکانی سوپای بەعس، لە نزیکەوە، سەرپەرشتیی شەڕەکەیان دەکرد. هێزەکانی یەکێتی، سەرسەختانە بەرگرییان دەکرد. ناپاڵم و کاتیۆشا و تۆپی دوورهاوێژی ژارڕژێن، یەک چرکەش ورووتیان نەدەدا.
لە دۆڵی جافەتیدا، قیامەت هەڵسابوو، دۆزەخ تاو درابوو. مرۆڤەکان، چەکدار و بێچەک، ژن و منداڵ، پیر و گەنج لەو دۆزەخەدا دەسووتان.

((گەوەی زنجیرەکان، بە هاڵاوی نزوولە و
سنککوتانی دایک گەرم دانەهاتن،
بە هەناسەی ژەهراویی بیابان لێک ترازان!
لە ژێر بریسکەی ئەو شمشێرانەی بە ئاسماندا هەڵدەسووڕان
سپێنەی چاوەکانی هەتاو ڕژا،
دەربەندەکان پەرکەمیان گرت،
ئەستێرەی بن ئەشکەوتەکان کوژانەوە،
بنکاچەکان کەفیان چەڕاند،
گابەردەکان، سەری بەناڵەیان بە کۆشی نوالاندا کرد!))

وای خودایە! زیندان چۆڵوهۆڵە! قاوشەکان، سرتەیان لێوە نایەت. ئێستا، مامەشێخ، عەلیی مامەحەمە، جەباری عەلی حوێز و من، میراتگری ئەم زیندانە گەورەیەین! شۆڕش، ئەگەر شتێکی بە میرات بۆ ئێمە جێ نەهێشتبێ، ئەم زیندانەی وەکو دیاری، پێ بەخشیوین!
جەبار، دەترسێ و لە ناخەوە هەرسی هێناوە. جەبار، شەوانە خەوی نییە و تا سپێدە جگەرە دەکێشێ.
گەرەوگوڵی بەیانی، دەنگی بادانی کلیلی زیندان، جەباری ڕاچڵەکاند.
جەبار، لە ناخەوە، لە قووڵایی دەستی خۆیدا، هەستی بە کۆتایی خۆی کردبوو.
_ من، دەرۆم! گەردنم ئازاد بکەن! ئێستا دەمبەن و ئیعدامم دەکەن!
دەرگا کرایەوە و جەبار هەستا، ئاوڕێکی لە ئێمە دایەوە، لە چاوانی جەباردا، جگە لە ترس، هیچی

دیکەم نەبینی! جەبار، جگەرەیەکی پێ کرد، بێ ماڵئاوایی، پێشیان کەوت.
لە نێو گرمەی تەقینەوەی کاتیۆشادا، گوێمان لە ڕێژنەگوللەیەک بوو. من، ئەو دەستڕێژەم ناسییەوە.
ئێستاش نەمزانی کە ئاخۆ جەبار، هاوتاوانی ژنەکەی بوو یاخود ئەو دەستڕێژە، تاوانێک بوو بۆ سڕینەوەی مرۆڤێک کە ناوی جەباری عەلی حوێز بوو! نازانم.

((زیندان..
کەوڵکردنی کەرامەت لە بەریێی گزگلەکاندا،
چاوانی خوێنتێزاوی جەللاد نیوەشەوان،
دەست و چاوبەستنی کەسێک،
دووکەرتبوونی دڵی شەوگار بە دەستڕێژێک،
هاوارێکی بێفریاڕەس!))

عەلیی مامەحەمە، من و مامەشێخی بە گەرمی لە ئامێز گرت، ئەملاولای ڕامووسین و گوتی:
_ منیش دەڕۆم، یان نازانم دەکەن و لەگەڵ کەسوکارەکەمدا دەچمە ئێران، یاخود دەمگوێزنەوە بۆ زیندانێکی تر و لە شوێنێکی دیکە!
گوتمان: عەلی گیان، خوات لەگەڵ، هیواداریین بتبینینەوە، بەڵام لە زیندانێکی دیکەدا نا!
بە ڕۆیشتنی عەلی، دڵم گوشرا و چاوانم پڕ فرمێسک بوون.
_ کاک شێخعەلی، دەبێت چارەنووسی ئێمە چی بێت؟
_ جا چی ماوە! چی دەبێت با ببێت!
_ ئاخۆ کاک بەختیار حاڵی چۆن بێت؟
_ کاک بەختیاریان بۆ مەڵبەندی سێ گواستووەتەوە، ڕەنگە ئەوێ ئارام بێت!
لە ڕاڕەوەکەدا، دووقۆڵی، دەهاتین و دەچووین، بە هزری پەرت و شێواومانەوە، بیرمان لە دۆخەکە دەکردەوە، بە ڕابردوودا دەگەڕاینەوە و دەگەیشتینەوە خاڵی کۆتایی، خاڵی دوارۆژەکانی ژیانی «شۆڕشی نوێ» لە گرکانی ئەنفالدا. ئێمە، کە لە دەستپێکی شۆڕشدا، ئەسپناسا، بەرەو چارەنووسێکی گەش غارمان دەدا، ئێستا لە ڕەشترین چارەنووسدا، لە کۆتاییەکانی زیندانی شۆڕشدا، چاوەڕێ بووین! دەرگای زیندان کرایەوە، فەرهاد و مەلایاسین، پێکڕا وەژوور کەوتن..
_ ئێوەش خۆتان ئامادە بکەن، شتەکانتان بپێچنەوە و دەبێ بڕۆین!
_ بۆ کوێ؟

_ هێشتا نازانین. زیندانەکە دادەخەین و ئێوەش، دەچنە مەقەڕێک تا بڕیارێکتان بۆ دەدرێت!
لە ماوەی ساڵێک و چەند مانگاندا، لە زیندانی بەرگەڵوو، نیمچەماڵێکمان پێکەوە نابوو. چی کۆ بکەینەوە؟ ڕۆمانەکانی یاشارکەمال، دەستنووسەکانی خۆم، چەند کتێبێکی فیکری و سیاسی، هەندەک جلی ژێرەوەم لە کوڵەپشتێک نان و مامەشێخیش هەر وەهای کرد. ئێمە ساز و ئامادە، لەگەڵ فەرهاد و مەلایاسیندا، لە زیندان دەرکەوتین. لە حەساری زینداندا، بۆ دواجار ئاوڕم لە دەرگا پۆڵایینەکەی زیندان دایەوە، لە سوورگییە ئەستوورەکەم ڕوانی، ئەو سوورگییەی ساڵێک زیاتر بوو، هەموو ڕۆژێک لەگەڵ کازیوەدا، زیرەی لە مێشکم هەڵدەساند! ڕۆژێکیان بە مەلایاسینم گوت: بۆ وا بە قاییم ئەو سوورگییە ڕادەکێشن؟ دەنگی زنجیرەکە، لە دۆزەخەوە دەبیسترێت! ناکرێت کەمێک هێورتر بێت؟ مەلا، بە زەردەخەنەیەکەوە کە لە سووکایێتی خاڵی نەبوو، گوتی: مامۆستا، ئێرە هوتێل نییە، ئێرە زیندانە، زیندان!
فەرهاد، هاوڕێیانە قسەی لەگەڵ دەکردین و لوتفی دەنواند، خۆی لەگەڵمان هات، لە زاری دەربەندەکە تێپەڕین و بە چۆمی بەرگەڵوودا سەرکەوتین. لە بەردەم مەقەڕی مامۆستا عەبدولادا وەستاین و وتیان، فەرموون! ئێوە، لێرە دەبن.
مامۆستا عەبدولا، ئەندامی سەرکردایەتیی «شۆڕشگێڕان» بوو، پیاوێکی جوامێر و بەڕێز کە ڕێزێکی زۆری لێ گرتین.
هاژە و هاڕەی کاتیۆشاکان و ناڵەی تەقینەوەی ناپاڵمەکان، بواری قسەکردن و لێکتێگەیشتنیان نەدەدا.
ژوورێکی پاک و ڕووناک و گەرموگوڕ کە ڕاخەر و پێویستییەکانی تێدا بوون، لە ئامێزی گرتین. لەو دۆزەخەدا، داخستنی دەرگا پێویست نەبوو، لە ساتێکدا، دەبوو چەندجاران، فریای کەویت و بە قەڵەمبازێک، خۆت لە حەشارگاکە بهاویت!
شەو، کە جارێ ڕانەکشابووین، گرمژنێک و ئیدی خۆمان لەژێر دەرگا و پەنجەرەی ژوورەکەدا دیتەوە! بە پەلەپرووزێ، لە ژوورەکە دەرکەوتین. وای خودایە! ژوورەکانی دیکەی بارەگاکە نەمابوون. ئێمە، خۆمان لە حەشارگەکە هاوێشت و شەومان لەوێدا ڕۆژکردەوە.
بەیانی گوتیان: خۆتان ئامادە کەن! لەگەڵ دوو پێشمەرگەدا، خۆمان گەیاندە بارەگای جەبارفەرمان. جەبار، لەسەر بانی مەقەڕەکەی وەستابوو، سەرگەرمی کاری خۆی بوو. ئەو، خۆی لە ئێمە نەبان کرد. ئێمەیان لە کادانی بارەگاکەدا دانا و چاوەڕێ بووین. کاتژمێریک تێپەڕی و کادرێک بە ناوی «عەبدولکەریم هەڵەدنی» هات و گوتی با بڕۆین!
_ دەچینە کوێ؟

_ لەگەڵ کاک عەلی بچکۆل و هێزێکدا، بەرەو «مەرگە و کانیتوو» دەڕۆین!
هێزێکی گەورەی نیواونیو لە پێشمەرگە و پاسدار، لە بەرگەڵووەوە جما و ئێمەش لەگەڵیاندا، لە هەورازی «کەرکەر» سەرکەوتین و لەوێڕا، بۆ دۆڵێک شۆڕ بووینەوە کە کۆتایی نەبوو، یاخود من، بە هۆی دوو ساڵ و نیو، ژیانی زیندان و نەجووڵانەوە، ڕۆحم دەیویست لە جەستەم دەربچێت، وەهام دەبینی!
بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر، نزیک گوندی کانیتوو بووینەوە و من، هێزی هەنگاوێکم پێ نەمابوو.
عەبدولکەریم گوتی: مامۆستا، زۆرمان نەماوە، هێز وەبەر خۆت بنێ!
_ ناتوانم، دەبێت پشوو بدەم!
_ نانیشە! من چاوەڕێت دەکەم.
وەکو لاشەیەکی بێگیان، لە تەبارێکدا کەوتبووم، عەبدولکەریم بە دیارمەوە، چاوەڕێ بوو.
مزگەوتی کانیتوو، لە زیندانیان جمەی دەهات. عەلیی مامەحەمە و عەلی سامیی تورکمان، پێشوازییان لێ کردین و جێگایان بۆ کردینەوە.
کانیتوو، لە ئامێزی ئاسۆسدا، لە نێو هێلانەی بەفردا هەڵنیشتووە. لە مزگەوتەزیندانەدا. ئەفسەرەکان، موستەشارەکانی فەوجی سووک، ئەو پێشمەرگانەی لەسەر کێشەی «قەتڵ» زیندانیبوون، هەندەک سەربازی بریندار، من و مامەشێخیش چاوڕێی چارەنووسی خۆمان دەکەین.
شەڕەکان گەرم بوون.. چنگە گڕبارەکانی ئەنفال، نەک هەر مرۆڤ، گوند و دار و بەردی دەسووتاندن و باڵای «ئاسۆس»یشی دەرووشاند. تەرمی شەهیدەکان و جەستەی لە خوێنشەلاڵی ئەنگاوتەکان، دەهێنرانە مزگەوت. مزگەوت، هەم زیندان و هەم تیمارخانە و هەم مەکۆی شەهیدەکانیش بوو! لەسەر تاتەشۆرەکە، لە کەناری حەوزە گەورەکەی مزگەوتدا، تەرمی سەرتیپێکی یەکێتی دانرابوو. ئەو، پیاوێکی باڵابەرزی سووروسپیی جوانخاس بوو کە من، پێشتر دەمناسی.
کانیتوو، بە هەموو لێکدانەوەیەکی جیوگرافی و حیساباتێکی هونەری بەڕێوەبردنی جەنگ، دەبوو دواپێگە و دواسەنگەر بێت کە بکەوێت، کەچی وەها نەکەوتەوە.
شەوێک لە کانیتوو، پشوومان دا و بەیانییەکەی، فەرمانی گەڕانەوەی شێخعەلی بۆ سەرگەڵوو، بۆ ئەوەی لەوێڕا ئازادی بکەن و بە کۆپتەر بۆ ئێرانی بنێرن، گەیشت. شێخعەلی، گرفتی جیددیی تەندروستیی هەبوو. مامەشێخ، منی لە ئامێز گرت و بە گەرمەوە ماچی کردم و ماڵئاوایی کرد!
_ خەمت نەبێت و ورەت بەرز بێت، یەکتر دەبینینەوە!
_ خەم نییە، بزانین چارەنووس چی دەبێت!

## گیرخواردن لە گەرووی ئەنفالدا

_ وەخۆ کەون! خۆتان کۆکەنەوە و بۆ دەرەوە! ئەنفال گەیشت! دەنگێک وەهای گوت.
مزگەوت شێوا و بوو بە هەلا و فرکان فرکان. کۆڵەپشتەکەم لە کۆڵ کرد و پاڵتۆکەم لە بەر کرد.. پێڵاوەکانم! نایانبینمەوە. کەسێک لە پێی کردوون و بۆی دەرچووە. منیش، جووتێک پێڵاوم لە پێ کردن و لە مزگەوت دەرکەوتم. لە مزگەوتدا بوو بە دەستڕێژ. گوللەکان لە جەستەی ئەفسەرە بریندارەکان کە نەیاندەتوانی دەرکەون و ڕێ بکەن، دەرباز دەبوون و بەر دیوار و بنمیچەکە دەکەوتن.
لەبەردەم مزگەوتدا، ئەفسەرە دیلەکانیان ڕیز کردن و پێیان گوتن: ئێوە دەتوانن ڕێ بکەن، دەی وەڕێ بکەون!
_ مامۆستا تۆ چی دەکەیت؟
ڕەسوڵی کاکەڕەش، کە لێپرسراوی ئیشوکارەکان بوو، پرسیاری لێ کردم.
_ تۆ هەرچییەکت پێ باشە، وەها دەکەم.. من، لەگەڵ ئێوە دێم!
_ لەگەڵ ئێمەدا دەرباز نابیت و ڕەق هەڵدێیت.. تۆ دەزانیت، ئاسۆس چ سەختە؟ چەند دوورە؟ چ بەفرێکی لێ کەوتووە؟ پێنج سەعاتێک سەرکەوتن و ئەوەندەش زیاتر دابەزین، تا دەگەینە «سەفرە و زەروون»، بۆ تۆ کە دوو ساڵ و نیوە زیندانییت، مەحاڵە!
_ ئەی چی بکەم؟
_ خۆت سەرپشک بە! هەرچییەکی خۆت بە گونجاوی دەزانیت، ئەوە بکە!
_ تا هەر کوێ بتوانم دێم و پاشان بیرێکی لێ دەکەمەوە.
بە پشت کانیتوودا هەڵگەڕاین و بە نێو ڕەز و باخاندا، ڕێک بە بەردەم کۆنەبارەگاکانی ساڵی ١٩٨٤ی دەسگای نێوەندیی ڕۆشنبیریی کۆمەڵەدا، چنگمان لە باڵای بەفراویی ئاسۆس گیر کرد. ئەفسەرەکان، دەیانویست خۆ بگەنێنن و خۆ بدزنەوە بەڵام گوللەبارانکردنی دوویان، بە دەستی پێشمەرگەیەک کە کەسانی خۆشەویستی خۆی لە دەست دابوون، ڕێگای لێ گرتن و ناچار بوون، گوێ بە خۆیان بدەن! ئەفسەرێک کە زەندەقی چووبوو، خۆی بە منەوە پێچا و گوتی: مامۆستا، بمپارێزە، خاتر ئەڵڵا!
_ ئەگەر دەتەوێت زیندوو بمێنیت، سەرکەوە! منیش دەمەوێت کەوڵی خۆم ڕزگار بکەم.
ئەنفال، بە دوماندا، بە لاقی ئاگرینەوە، غاری دەدا! ڕێژنەی دۆشکا و گوللەتۆپەکان، کانی و باخ و ڕەزەکانیان بە ئێمەشەوە، گڕ دەدان.
من و عەلیی مامەحەمە، لە نێو قەتارەی سەدان پێشمەرگە، پاسدار، دیل و زیندانی، ژن و منداڵاندا، بەرەودوا، لە بەفری تا چۆکان هاتوودا، سەردەکەوتین!

سەعاتێک و دووان و سیان، هەواڵێک لە دووندی ئاسۆس نییە. دەست بۆ گیرفانم دەبەم. هەندەک وردەنان دەردێنم و لە زارمی دەنێم.. نانەکە، تفت و تاڵە و نێڵنجم دێ! ئەمە نیشانەی ڕەقهەڵاتنە، سەیری پێیەکانم دەکەم، پێخواسم! دەمەوێت لەگەڵ عەلی قسان بکەم، زمانم لە گۆ کەوتووە، لە پشتەوە شانی عەلی دەگرم.. عەلی، ئاوڕ دەداتەوە و من بە ئاماژەی دەست، پێی دەڵێم: دانیشە!

لەگەڵ عەلیدا، لە بن کاچێکدا دادەنیشین و من لە بنار دەڕوانم. بنار، بە بەفرەوە، لە بڵێسەی زمانی ئەنفالدا دەسوتێ! کات، بەرەو چواری ئێوارێ هەڵدەکشێ.. ئێمە، شەش سەعاتانە سەر دەکەوین و ئێستا دەبێ فکرێک لە حالی خۆمان بکەین. گوڕێکم تێ دەکەوێتەوە و دەڵێم:

_ لە سەرکەوتندا، هیوایەکمان نییە، شەو دادێ و ڕەق هەڵدێین!

_ چی بکەین؟

_ ئێواران، لەشکری دەوڵەت لە هێرش دەکەوێت، لە شوێنی خۆی دەمێنێتەوە و بەیانی، دەست پێ دەکاتەوە!

_ نێ..

_ دەتوانین بە نیوسەعاتان، بە خلیسکێنە، بگەینەوە باخەکانی کانیتوو!

_ ئەی پاشان؟

_ لەوێ، لە ئەنوایەکدا پشوو دەدەین و لەگەڵ شەبەقدا، بە شاخەکانی ئەوبەردا، بەرەو ناوچەی دۆڵی جافەتی دەڕۆین.

_ تۆ چیت پێ باشە، من لەگەڵ تۆدام!

پێکەوە، لە نێوقەدی ئاسۆسەوە، بە خۆخلیسکێنە، دێینە خوارەوە، زۆرمان نەماوە و من لە کاوەبەفرێک دەکەوم، عەلی فریام دەکەوێت و هەوڵی ڕزگارکردنم دەدات. من، هەرچی تینێکم هەیە، بە خۆمی دەدەم و ڕاست دەبمەوە، بەڵام کۆڵەپشتەکەم جێ دەمێنێت. کۆڵەپشتەکەم، ڕۆمانەکانی یاشارکەمال و زمانە باڵاکەی شوکرمستەفا، وێنە شیعرییە ڕەنگینەکانی «نازم حیکمەت»، «بنجی» پاڵەوانە بێزمانەکەی ڕۆمانە پڕ داهێنانەکەی ولیام فۆکنەر، دەستنووسەکانم، ئەو شیعر و چیرۆکانەی لە زینداندا نووسیبوومن، هەر هەموویان لە بەفردا ڕەق هەڵاتن و ئەنفال هەڵیلووشین!

لە بناردا، چنگە خوێناوییەکانی ئەنفالم دیتن.. ژن بە مەلۆتکەی دەستییەوە، لەنێو بەفردا، بۆ ئەبەد خەوتبوو! پاسدارانی بڕستلێبڕاو، بووبوونە شەختە و کلیلی بەهەشت لە گەردنیاندا ڕچیبوون! مەڕ و بزنی لە بەفردا نووقمبوو، لە گیانەڵادا بوون! کورد، لە ئاگردا دەسووتا و لە شەختەدا دەبوو بە بەرد!

وای چ میللەتێکی بێ پەنا و کڵۆڵین!

لەنێو باخەکاندا، ژن و منداڵ، گەنج و پیر، پێشمەرگە و پاسدار بە یەکدا دێن و کەس بە کەس

نییە!

کۆمەڵێک، ئاگرێکیان هەڵکردووە و لە دەوری ئاپوورەیان داوە. لە ئاگرەکە نزیک دەبینەوە، زیرۆی عەبدوڵا رێوی و گێلاس خانی هاوسەری، لە من دەڕوانن..

_ کاک پشکۆ، پێڵاوت لە پێدا نین، پێیەکانت لە دەست دەدەیت! زیرۆ وەهای گوت.

_ دەزانم، بەڵام چارم نییە!

نەفسەرە دیلەکانی بەعس دەبینم، بە ڕیز، بە بەرچاوی ئەو هەموو پێشمەرگە و خەڵکەوە، بەرەو مۆڵگای سوپای خۆیان، ملی ڕێگایان گرتووە و کەسێک کاری بەوان نییە.. هەموو کەس، لە خەمی خۆی و چارەنووسیماڵومنداڵی خۆیدایە! شیرازەی دۆخەکە تێک چووە و کەس ئاگای لە کەس نەماوە.

ئاگرەکە بە جێ دێڵین و بەرەو خانەباخێک دەڕۆین. من، لە پێیەکانم ڕادەمێنم و هەموو دنیا، بە هەموو شۆڕشەکانییەوە، لە جووتێ پێڵاودا دەبینم! جووتێ پێڵاو، هێندەی هەموو دنیا گەورە بێت و جێگای پێیە ئاوساو و نیوەمردووەکانمی تێدا ببێتەوە!

_ مامۆستا، ئەوە تاکێک پێڵاوە! عەلی، وا دەڵێ.

تاکیک پێڵاو، لە پێ دەکەم و پاڵ بە دەرگای ماڵێکەوە دەنێین و دەیترازێنین. ماڵێکی گەرم و جارێ کوانوویان سارد نەبووەتەوە. دار لە سۆپاکە دەنێین و گڕی دەدەین. سۆپا، ئێڵەی دێ، دنیا دێت تاریک دابێت.

عەلی، لە ماڵەکەدا، نان، هەنگوین و پەنیری ژاژی دەدۆزێتەوە و لە ژوورێکی دیکەدا، هاوار دەکات: ئەم ماڵە دووکاندار بوونە، پێڵاو.. سەد جووت پێڵاوی لێیە!

جووتێک پێڵاوی چاک لە پێ دەکەم، نان و پەنیر و چا دەخۆین و لەبەر ئاگردا، لاقانی لێ ڕادەکێشین..

تەقەی دەرگاکە هات، چوار کەس خۆیان لە ژوورێ دا، عەلی سامیی تورکمان، سەردار ناوێک کە پێشمەرگە و خەڵکی شارەزوور بوو، ئەو، لەسەر کێشەی قەتڵ زیندانی کرابوو. سێهەمیان، پیاوێکی ڕیشسپی بوو، ئەو، موستەشار بوو، بڕیار بوو بە چەردەیەک پارە، ئازاد بکرێت، بەڵام ئەنفال ڕێگای نەدابوو. چوارەم کەس، پیاوێک بوو سەر بە موخابەراتی بەعس و پێشمەرگە دەستگیریان کردبوو!

ئەوان، نانیان خوارد و پشوویان دا، لەبەر گەرمیی ئاگردا، قسەوباسمان گەرم کرد و جاروبار، تەقینەوەی گوللەتۆپێک، ساردی دەکردەوە..

کابرای موخابەرات گوتی:

_ مامۆستا، تۆ چی دەکەیت؟

ــ من، پلانی خۆمم هەیە.
ــ چۆن؟
ــ پێش گزنگ، بەرەو سەرگەڵوو دەڕۆم.
ــ لەوێ زیندانت دەکەنەوە، ڕەنگە بشتکوژن!
ــ با بیکەن.. چارێکی دیکەم نییە!
ــ با، هەتە!
ــ چۆن؟
ــ لەگەڵ من وەرە!
ــ بۆ کوێ؟
ــ مامۆستا، تۆ، من ناناسیت. من، جەنابت دەناسم، دەزانم چیت و کوڕی کێیت و عەشەرەتت کامەیە. بەڵێنی شەرەفت دەدەمێ، بە سەلامەتی و بە ئۆتۆمبێلی خۆم، بێ ئەوەی دەوڵەت پێ بزانێ، دەتگەیەنمە سلێمانی و ڕزگارت دەکەم!
ــ سوپاست دەکەم، من کاری وا ناکەم!

لە مامەی موستەشارم پرسی:
ــ تۆ چی دەکەی؟
ــ من، ڕێگای دوورم بۆ نزیک بووەتەوە، بەیانی، خۆم تەسلیمی سوپا دەکەم و بیست هەزار دیناریشم، لانیکەم، قازانج کرد!
ــ عەلی سامی، تۆ چی؟
ــ مامۆستا، حەیفت نەکرد! من لەگەڵ تۆ و عەلیی مامەحەمە و سەربار دەبم. من، تا «پەتەکە» لەگەڵ ئێوەم!
ئەو شەوە نەخەوتین، کاتژمێر ٤ی بەیانی گوتم:
ــ هەستن با بەڕێ کەوین!
ئێمە، بەرەی بەعسیانمان لە خانووەکەدا جێ هێشت. سەرەتا، بە ناو باخەکاندا، بۆ دۆڵەکە شۆڕ بووینەوە و پاشان بە چیاکەدا سەرکەوتین.
لە ڕێگادا، لەگەڵ کاروانی ژن و منداڵاندا یەکمان گرتەوە. ژنێک کە پەلی دوو منداڵی گرتبوو، منداڵی سێهەمی لە کۆڵ دابوو، بە نێو بەفرەکەدا ڕێی دەکرد و هەناسەی سوار ببوو. ئێمە کە پشوویەکی باشمان دابوو، بە نۆرە، تا لوتکەی چیاکە، منداڵەکانمان لە کۆڵ کرن.

لە دووندی چیادا، لەگەڵ سپێدەدا، دانیشتین و لە دۆڵی مەرگە و «کانیتوو»مان ڕوانی. تانک و تۆپخانەی دەوڵەتمان دەبینین، بۆ کانیتوو، پێشڕەوییان دەکرد. بارەگاکانی دەسگای ڕۆشنبیری دەبینم.. دەبێ کونەتەیارە و حەشارگەکانمان مابن؟ هەر کەسە و کونێکی بە نێو کرابوو. پێشمەرگە قۆشمە و قسەخۆشەکان دەیانگوت: هەر مەسئولێک، زۆر لە کوندا بمێنێتەوە، کونەکە دەبێتە هیی ئەو! ئەمە، کونەکەریمە و ئەوی دیکەیان، کونەدکتۆر.. ئیتر، خوا دەزانێ کە چیی تریان گوتووە!

دۆڵاودۆڵ، بە دوو ڕۆژان و بە وچان، گەیشتینە گوندی «گۆمەزەل». گوندەگە، دوامەنزڵی ئاوەدان و بنکەی ئەو هێزانە بوو کە لە دۆڵی جافەتییەوە، پاشەکشەیان دەکرد و بەرەو سنوور دەڕۆیشتن. کۆپتەرەکانی ئێران، لە بەردەم گونددا دەنیشتنەوە، بریندارانیان بار دەکردن و دەگەڕانەوە. عەلیی تورکمان گوتی: مامۆستا، تۆ پارەت پێیە؟

_ تەنها ٥ دینار!

_ من پەنجا دینارم پێیە. نیوەی بۆ تۆ، نازانین بە کوێ دەگەین!

پارەکەم لێ وەرگرت، چووینە بەردەم مزگەوت و پاشان هەر سێکمان بووینە میوانی ماڵێک، شەویش هەر لە ماڵەکەدا خەوتین.

بەیانییەکەی، پێشمەرگەیەک هات و گوتی: مامۆستا، کاک سەلیم دەڵێت با بێت بۆ ئێرە!

_ بۆ کوێ؟

_ لەو ماڵەی ئەوبەرە!

لەگەڵ عەلیی مامەحەمە و پێشمەرگەکەدا، ڕۆیشتین. لە ماڵەکەدا، سەلیم(دلێری ئەحمەدشوکری)، جەمال ئاغا، دارای حاجی برایمی چەرمەگا و چەند کەسی دیکەشی لێبوون.

سەلیم گوتی: مامۆستا، دوێنێ، کاک ئەوشیروان لێرە بوو و لە هاتنی تۆ ئاگادارە!

_ بەڵێ...

_ لەسەر فەرمانی ئەو، تۆ دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ سەرگەڵوو، من نامەیەکت بۆ دەنووسم، لەگەڵ خۆت نامەکە بیە و بیدە بە برادەران!

_ من، بە موعجیزە ڕزگارم بووە، تازە بۆ کوێ بگەڕێمەوە؟

_ دەزانم... لە ئاسۆس زیاتر لە ٦٠ کەس ڕەق هەڵاتوون، باشبوو کە تۆ دەرباز بوویت، بەڵام بگەڕێوە لای برادەران و ئەوان ئاگادرت دەبن.

_ بە تەنها و بە پێیان زەحمەتە!

_ دەڵێم وڵاغێکت بۆ پەیدا بکەن.

عەلیی مامەحەمە گوتی: من لەگەڵت دێم، نایەڵم تەنها بیت، سۆراغێکی کەسوکاریشم دەکەم، بەڵام با چەکێکیشمان بدەنێ!
سەلیم، نامەی نووسی، وڵاغ پەیدا کرا، چەکێکیان دا  بە عەلی و بە رێ کەوتین. لە رێگادا، سەدان ژن و منداڵ و پێشمەرگە، پێچەوانەی رەوتی ئێمە، بۆ سەرسنوور دەرۆیشتن.
لە سەرگەڵوو، لە بارەگایەکدا، ملازم عومەر، کۆسرەت رەسوڵ، دلێری سەیدمەجید و زۆر لێپرسراوی دیکەشی لێبوون کە سەرگەرمی پاشەکشەپێکردنی هێزەکان بوون. ملازم عومەر، کە زۆر سەرقاڵ بوو، هات و باوەشی پێدا کردم. شێخەلی، جارێ هەر لەوێ بوو، چاوەڕێ بوو تا بۆ ئێرانی بنێرن. چەند سائێک لەگەڵ شێخەلیدا دانیشتین. دلێر، پێشمەرگەیەکی نارد و جووتێ پێڵاوی «ئەدیداس»ی نوێی بۆ هێنام کە بۆ ئەو دۆخە زۆر پێویست بوون. دەمەوئێوارێ، مامۆستا عەبدوڵا هات و گوتی: مامۆستا لەگەڵ ئێمە وەرە!
سواری ئۆتۆمبیلێک بووین، لەژێر تۆپبارانا، لە «سەرگەڵوو»ەوە بەرەو یاخسەمەر و بارەگای مامجەلال رۆیشتین!
لە یاخسەمەر، منیان بە مەفرەزە تایبەتەکانی مامجەلال سپارد و خۆیان گەڕانەوە.
بەختیار و هۆشیاری ساڵەح رەفعەت، لە ئامادەیی مامجەلالدا، بەرپرسی پێشمەرگە و ماڵ و حاڵی مامجەلال بوون.
کەسێک هات، منی لە ئۆفیسەکەی مامجەلال کرد، دەرگاکەی داخست و رۆیشت! چەندساڵ پێش ئێستا و چەندین جار، هەر لەم ئۆفیسەدا، من لەگەڵ مامجەلالدا دانیشتووم و باسی کێشە و گرفتەکانم لەگەڵدا کردووە. هەر لەم ئۆفیسەدا بوو، ئەو گوتی: کەڵک لە ئەزموونی فەلەستینییەکان وەردەگرین و چوارچێوەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، فراوانتر دەکەین! ئەی بۆ نەیکرد و بارەکەی بەم هەوارە گەیاند؟ رەنگە ئەو ویستبێتی و بەشێک لە سەرکردایێتیی کۆمەڵە و نەوشیروان مستەفا دژ بووبن. ئاخر، جیابوونەوەی ئێمە لە کۆمەڵە و مانەوەمان لە چوارچێوەی یەکێتیدا، بنکەی دەسەڵاتی نەوشیروان و سەرکردایێتیی کۆمەڵەی دەلەرەزاند! ئەی کێ ناڵێت هەموو ئەو بۆچوونانەی مامجەلال، تەنها بۆ راکێشانی ئێمە نەبوویێت بۆ  خاڵێکی رووبەڕووبوونەوە کە بواری پاشەکشەمان نەبێت و ئەوانیش بۆ پاکتاوکردنمان دەستناوەڵابن؟!
پەنجەرەکانی ئۆفیسەکە، بە دووکەڵی ژەهر و بۆمبەکان، رەش داگەڕاون. لەگەڵ چڕبوونەوەی تاریکیدا، تەقینەوەی بۆمبەکان بە ناڵەتر و بۆنی ژەهر خەستتر دەبێتەوە. پێشمەرگەکان، بە دەمامک و جلوبەرگی دژەژەهرەوە، لە حەشارگەکەدان و منیش لەژێر رەحمەتی ژەهردا، لە ماڵی مامجەلالدا، چاوەڕێی دواساتەکان دەکەم!

پێشمەرگەیەک نزیک دەبێتەوە و من هاواری دەکەمێ:

_ کاکە تا ئێرە وەرە! پێشمەرگەکە دێت و من دەڵێم:

ئێوە خۆتان لە حەشارگەدا و بە دەمامکی دژەگازەوە دانیشتوون و منیش لێرەدا، لەم ئۆفیسە شووشەبەندەدا، زیندانیم!

پێشمەرگەکە، دەڕوات و خێرا دەگەڕێتەوە.

_ مامۆستا، ئەم جلوبەرگە بپۆشە و ئەم ماسکەش بگرە. دەتوانیت بێیتە لای ئێمە. کاک بەختیار، دەڵێت: با بێتە لای خۆمان.

ئەوشەوەمان لەژێر گرمژنی کاتیۆشا و ژاربارانەدا، ڕۆژ کردەوە و بەیانی، لەگەڵ گزنگدا، کەلوپەلی مامجەلالیان لە دوو تراکتۆر بارکرد، سوار بووین و بەرەو بەرگەڵوو، لە هەورازی «کەرکەر»ەوە، بەرەو گوندی گۆمەزەل، گەڕاینەوە. گۆمەزەل، جمەی دێ و ژەنراڵ بەفر، بە شمشێری ڕچیوی دەستییەوە، ڕێگای دەربازبوونی گرتووە و دەبێ چاوەڕێ بین!

## کاروانێک لەنێو زریاندا!

پاش دوو رۆژ چاوەڕوانی، کاروانی پێشمەرگە و خەڵکی گوندەکانی دۆڵی جافەتی، لە گۆمەزەڵەوە، بەرەو دۆڵی «سەفرە و زەروون»، بە ڕێ کەوت.

دۆڵ بە دۆڵ و باسکەوباسک، هەڵدەگەڕێین و دادەگەڕێین، هەموو دنیا سپی دەچێتەوە، سپییەک ناوی چاوان دەبا. سەرمایەک نەک هەر دەست و لاقان، دڵانی پڕ لە شکست و بێهیوایی دەرچێنێت.

ئەمە کاروانێکە، بێ ڕێبەر و بێ چاوساغ، لە هەوڵی دەربازبوون لە گەرووی ژەهراویی ئەنفالدا. ڕووی لە دۆڵی بەستەڵەکی مەرگ ناوە!

لەم دۆڵەدا، لە نێو دڵی شەختەدا، سەدان پەتووی ڕەنگاوڕەنگ و دەیان پارچە ڕاخەر، بە بنچکانەوە جێ ماون و زۆر لەوە زیاتریش. بە درێژایی چەند کیلۆمەتر، پەتووە ئاڵووالاکان لەسەر بەفر ڕاخراون تا مێگەل و وڵسات، لەنێو بەفردا ڕۆ نەچن! ئەم تابلۆیە، هەر دەڵێی ڕێژیسێۆرێکی لێزان، بۆ دەرهێنانی فیلمی کارەساتی ئاژەڵ و مرۆڤەکان، جێبەجێی کردووە!

لەم نواڵی مەرگەدا، مرۆڤەکان تا کەمەریان لە بەفردا چەقیون و لەگەڵ چارەنووسدا ملانێ دەکەن. لە بەستەڵەکی شکستدا، لەبەر کەلاکی مەڕ و بزن، ڕەشەوڵاغ، گوێدرێژ و بەرزەوڵاغ، بواری هەنگاونانت نییە! کێ پاڵەوانە بەدبەختەکانی نێو کۆمەڵەچیرۆکی «لەژێر ئاسمانی شەختەدا»ی «جاک لەندەن» دەناسێت؟ ئێمە کتومت ئەو پاڵەوانانەین کە چارەنووسمان بە زریان و ئەنفالەوە شەتەک دراوە!

مرۆڤە گوناهەکان، هەموو شتێک لە بەفردا جێ دەهێڵن و تەنها دڵی لە هەموو شتێک خاڵیی خۆیان، لەگەڵ خۆیاندا دەبەن و بە هیوای بەجێهێشتنی مێژوو، هەناسەبڕکێیانە! ئەوە ئێمەین کە دەمانەوێت مێژوو ببەزێنین یاخود مێژوو، لە دەرگای خوێناویی ئەنفالستانی خۆیەوە، وەدەرمان دەنێت؟

کاک بەختیار، ئەم چەکە زیادانە چی لێ بکەین؟ پێشمەرگەیەک، پرسیار لە بەختیاری ساڵەح ڕەفعەت دەکات.

ـ چییان لێ دەکەن، بیکەن! فڕێیان بدەن!

من دەڵێم: چەکێک بدەنە من، من دەتوانم چەکێک هەڵبگرم!

زیندانییەک بە کلاشینکۆفێکەوە، لە دۆڵی مەرگدا، بێهیوا و نیوەگیان، لەگەڵ کاروانێکی شکستخواردوودا، بەرەو سنووری شکستییەکان بە ڕێکاوەیە!

لەگەڵ دارای حاجی برایم و پێشمەرگەکانیدا، ماوەیەک پێکەوە دەبین. پاشان زمانی زریانەکە لێکمان دادەبڕێ و ئیدی من خۆم تەنها دەبینم.. تەنها و بێ هیچ کەسێک، بێ پێشمەرگە و پاسەوان،

بێ «بەختیار» و «هۆشیار» و هەر کەسێک کە بەرپرسیاریی ڕزگارکردن یاخود ئیعدامکردنی زیندانییەک، لە ئەستۆی خۆی بنێت!
زیندانییەک، بۆ ئازادکردن یاخود ئیعدامکردنی خۆی، نە فریشتەیەک شک دەبات و نە جەللادێک!
لە لووتکەیەکی بەرزەوە، بەرز تا نزیک ماڵی خودایەک کە لە بورجی سەڵتەنەتی خۆیەوە، لە مەرگەساتی ڕەعییەتەکەی دەڕوانێت، چۆڵەچرای هومێدێک دەبینم و جەستەی ئازاوم، بە تولەڕێی شەختەدا، بۆ ناو دۆڵی کەچەهیوایەک کێش دەکەم.
لە نێوان چەندین چادردا، لە چادرێک ژوور دەکەوم کە ١٠ تا ١٥ پێشمەرگەی نیوەمردووی لێ ڕاکشاوە، چایان دەم کردووە، هاڵاوی هەناسە و بۆنی چای دەمکراو، فەزای چادریان لێوانڕێژ کردووە.
مارف! ڕێک خۆیەتی و بە ئاکە چاوەکەیەوە، لێم دەڕوانێ..
_ مامۆستا، حاڵت زۆر شڕە!
_ جا کێ حاڵی شڕ نییە..
سەیرێکی چەکەکی کردم و گوتی:
_ بۆ بە تەنهایت؟
_ لەگەڵ مەفرەزەکەی مامجەلالدا بووم، ئەوان دواکەوتوون و نازانم چییان لێ بەسەر هاتووە!
_ ئازادیان کردیت؟
_ هەموومان ئازادین!
ئەو شەوە نەخەوتم بەڵکە بوورامەوە! بەیانی کە ڕۆژ بوویەوە، لە چادرگەکە ڕامام، سەدان و بگرە هەزاران کەسی لێبوو. خەڵک بە پێ، بە تراکتۆر، بە ئۆتۆمبێلی پاسداران، بەرەو شاناخسێ و مەرگەوەڕ دەڕۆیشتن، تا لە چۆمەکە بپەڕنەوە و پەناگایەک لە خاکی ئێراندا پەیدا بکەن.
وەی خودایە! ئەمە ئاشبەتاڵێکی جاڕبۆنەدراوە! ئاشبەتاڵێک بە بۆنی ژەهر و خوێنەوە! ئەمە هەرەسێکی دیکەیە و کەسێک، خۆی لەژێر باری قورسایی کارەساتبارەکەی نانێت! کێ بوو گوتبووی: تەرمی شۆڕش لەو گۆڕەی کەوتووە، کەسێک جورئەت ناکات بینێژێ!
هێشتا هەواڵێکم لە بەختیار و مەفرەزەکەی نییە. بۆ دەبێ چاوەڕوانی ئەوان بکەم؟ بە خۆمم گوت. چ دەرفەتێکی باشە، سواری ئۆتۆمبێلێک دەبم و یەکسەر بەرەو سنووری پەڕینەوە، بەرەو وەدەستخستنەوەی ئازادییەک کە دوو ساڵ و نیوە، بە ناهەق لێم زەوت کراوە. ئەم فرسەتە، دەشێ دەستپێکێک بێت بۆ کردنەوەی دەرگایەک بەرەو چارەنووسێک، جیا لە زیندان و ئازارەکانی!
ئەمبولانسێک هات و ساتێ دەیویست بەرەو سنوور بگەڕێتەوە، سوار بووم و کەسێک لێی نەپرسیم.

ئەمبولانس، بزووت و منیش بە هزرێکی پەرتەوە، جێگایەکەم گرتبوو. نیوکاتژمێر تێپەڕی و لەسەر ڕێگاکە، بەختیار و مەفەرزەکەم بینی کە لە سنوورەوە، بۆ پەیداکردنی من، دەگەڕانەوە و هەموو ماشێن و تراکتۆرێکیان دەپشکنی. ئەوان، ئەمبولانسەکەیان ڕاگرت و گوتیان: ئەوە تۆ لە کوێیت؟ وەرێ خوارێ!

_ من، ئێوەم بزر کرد و بە شوێن ئێوەدا دەگەڕام.

چەکەکەیان لێ وەرگرتم و لەگەڵ خۆیان بردمیان.

ئێوارێ، لە شاناخسێ، لە بارەگایەک کە «حەمەمینی خەجێ» لێپرسراوی بوو، وچانمان دا.

حەمەمینی خەجێ، هەم هاوڕێی زۆر خۆشەویستی من و هەم ئەندامی «ئاڵای شۆڕش»یش بوو.

بەیانی، بۆ دەموچاوشتن، چوومە سەر کانییەکە و حەمەمینیش هات!

_ چیت لێ دەکەن؟ بۆ کوێت دەبەن؟

_ نازانم چیم لێ دەکەن و چارەنووسم بە کوێ دەکات. بەڵام دڵنیام، لە ئێرانەوە، دەمگەیەننەوە «قاسمەڕەش» و «نێوزەنگ»، لەوێ، لە زیندانم توند دەکەنەوە؟

_ خۆت نیازت چییە؟

_ تۆ هەواڵ بۆ کاک جەمالی حەمەی خواکەرم و برادەران بنێرە کە من زیندووم و هەر چۆن بێت، هەوڵی هەڵاتن دەدەم، با ئەوان ئاگادار بن!

_ دڵنیا بە، ئەو کارە دەکەم.

## ئەنفال،
## زنجیرەکانی دەستم دەکاتەوە و ڕۆحم وێران دەکات

((لەسەر پردە نیوەڕووخاوەکان نووسیبوویان:
بە خەمساردی خەونەکەنتان جێ بێڵن و
فەرموون بۆ ئەودیوی مێژوو!))

بە ئۆتۆمبێلێک، لەسەر پردێکی نیوەڕووخاو پەڕینەوە و لەوسەرییەوە، پاسدارەکان وەستابوون و ناوای بەرگەی مۆڵەتی پەڕینەوەیان دەکرد، مۆڵەتی پەڕینەوە بۆ ئەودیوی مێژوو. بەختیار، ناوی منیشی وەکو پێشمەرگە، لە لیستی مەفرەزەکەی خۆیاندا نووسیبوو!
ماشینەکە، بە گەردنەی چیایەکدا، پێچاوپێچ ئاژۆتی و لەسەر لووتکەوە، ئاوڕێکم لە وڵاتێک دایەوە کە تانوپۆی بە ژەهری ئەنفال چنرا بوو! وڵاتێک کە ڕۆژگارێک بۆ من وڵات و ڕۆژگارێک مەکۆی خەبات و ڕۆژگارێک زیندانی ڕۆح و ڕۆژگارێکیش ئەنفالستانە و لێی هەڵدێم..

((تۆ ئێستا لە لووتکەی ئەوبەری مێژوودا،
لە قووڵکەی مەینەتی و تێکشکان،
لە دۆڵێک لێوانلێو لە خوێن و
بەلەمێک بە ڕەنگی زەردەپەڕ،
لە گۆلێک ماڵامال لە چاوی نووقاوی ئەستێرە،
درەختێک لە بەرگی پاییزدا،
گوڵجاڕێک گوڵگوڵین بە جەستەی زارۆکان،
لە ئاسمان دەڕوانی کە تەرمی دایکی
لە ئامێز گرتووە!))
(لە شیعری تارمایی وێنەکانەوە)

لە گوندێکی دەوروبەری «بانە»، دابەزین و لە دیوەخانی ماڵێکی ئاندەدا، پشوومان دا و شەو، لەوێ خەوتین.
شەو، دەمویست دەرفەتێک بۆ دەربازبوون ببینمەوە، بەڵام پێشمەرگەکان وریا بوون، پاسەوان لە بەردەرگا هەبوو، بەختیاریش، لە پایینی ژوورەکەدا، نزیک دەرگاکە، ڕاکشابوو. ئەو، لەگەڵ هەر

چوونەدەرەوەیەکی مندا، هەڵدەستا و چاودێریی دەکردم.
بەرەو شاری «سەردەشت» رۆیشتین و ئێواریّ لە هۆتێلکدا دابەزین.
من، لە ژوورێکدا جێگام بۆ دانرابوو، کە بەختیار و چەند پێشمەرگەیەکی دیکەشی لێبوون.
زۆربەی کات و هەتا دەمی خەوتن، لە ژووری پێشوازیی هۆتێلەکەدا داینەوە و پێم وابوو ئەمە دەرفەتێکە، ئەگەری بینینی کەسێکی ناسراو یاخود پێشمەرگەیەکی «ئالای شۆڕش»م بۆ دەڕەخسێنێ، بەڵام چوون سەرجەمی ژوورەکانی هۆتێلەکە، بۆ یەکێتی تەرخان کرابوون. شانسێکی کەمم بۆ ئەو ئەگەرە هەبوو. بۆ ناخواردنی ئێوارە، هەندەک لە پێشمەرگەکان، بۆ ریستوورانتەکان رۆیشتن، بەڵام من بواری ئەوەم نەبوو، ئەوان خواردنیان بۆ هۆتێلەکە، بۆ هێنام!
تەنها شەو و رۆژێک دەرفەتم ماوە و ئەگەر فرسەتێک دەست نەخەم، ئیدی لە گەڵ یادەوەرییەکانی ساڵانی پێشوودا، پێکەوە و بە هەمان رێگای سەرەتای هەشتاکاندا، بەرەو نێوزەنگ و قاسمەڕەش دەڕۆین و لەوێدا، کوختێک دەکەنە زیندانم و لە سەردەمی هەرەس و تێکشکانی «شۆڕش»دا، چارەنووسم نادیار دەبێت!
سەردەشت، لەژێر تیرۆژی خۆری رۆژێکی سەرەتای مانگی مارسدا، دەدرەوشی و من لە پەنجەرەی ساڵۆنی هۆتێلەکەوە، رژانی ئەو تیشکە و ئاوێزانبوونی لەگەڵ جەستەی راکشاوی بەفری سەر شەقامەکە دەبینم، لە دەستپێکی وەرزی بەهارێک دەڕوانم کە رەنگی خوێن و ژەهری گرتووە!
لە هاتوچۆ و بزووتنی ژیانی ئاسایی خەڵک، لەسەر شەقامەکە دەڕوانم، پۆلێ قوتابیی جانتالەشان، سەرنجم بەند دەکەن، خۆم و یەکەم جانتای قوتابخانەم دەبینمەوە کە دایکم، لە سەفەرێکی خۆیدا، لە «عەبابەیلێ»وە بۆ شاری سلێمانی، لە گەڕانەوەیدا، بۆی هێنابووم. جانتایەکی لە تەنەکەدروستکراوی رەنگکراو کە زیاتر لە باوەڵێکی گچکە دەچوو تا جانتای قوتابخانە!
_ ئێمە تا کەی لێرە دەمێنینەوە؟ لە پێشمەرگەیەک دەپرسم کە لە تەنیشتمەوە، لەسەر کورسییەک دانیشتووە.
_ پاشنیوەڕۆ بەڕێ دەکەوین!
_ ناتوانین بچینە بەردەرگا و هەوایەکی پاک وەربگرین؟
_ با بڕۆین!
لە بەردەرگای هوتێلەکەدا دەوەستین و لە شەقام و دەوروبەری دەڕوانین.
_ ئێرە، نستیە و سارد، بچینە ئەوبەر و لە خۆرەتاوەکەدا کەمێک وەمێنین، تۆ دەزانیت، من، دوو ساڵە هەتاوم نەدیتووە!
پێشمەرگەکە، سەیرێکی کردم و بە نابەدڵی، گوتی:

_ باشە، فەرموو!

پێشمەرگەکە، مافی هەڵگرتنی چەکی لەسەر شەقامەکە نەبوو، بۆیە تەنها دەمانچەیەکی لەژێر پشتوێنەکەی دانابوو.

ئێستا دەرفەتێکی باشە..

_ من، جارێکی دیکە شار نابینمەوە و هەندەک شتم پێویستن، ئەگەر بوارم هەبێت، پێم باشە بیانکڕم و لەگەڵ خۆمیان بەرم، بۆ ئەچینە ناوبازاڕەکە و لە دووکانێک پەیدایان بکەین؟

_ نابێت.. ئەوە بەرپرسیارێتیی من نییە و دەبێت کاک بەختیار، مۆڵەتم پێ بدات! هەر چییەکت پێویستە، من دەڕۆم بۆت دەهێنم!

من، کە قسەم لەگەڵ پێشمەرگەکە دەکرد، پاشەوپاش و بێ ئەوەی ئەو هەست بکات، چەند مەترێک لێی دووردەکەوتمەوە، ئیدی بە هەموو تین و تاوێک کە هەمبوو، غارم دا!

من، بە سەر شەقامەکەدا غارم دا و ئەو، لە بری ئەوەی بە دومدا غار بدات، بە هاوارەوە، بۆ هۆتێلەکە گەڕایەوە و هاوڕێکانی خۆی ئاگادار کردنەوە! من، کەڵکم لەو هەڵەیەی ئەو وەرگرت و لە شەقامەکەوە، بە دەستی ڕاستدا بامدایەوە و خۆم لە کۆڵانێک هاوێشت. من، غار دەدەم و شار شارەزا نیم، نازانم ڕوو لە کوێ بکەم. کۆڵانەکە، گەیاندمییەوە سەر شەقامێکی سەرەکیی ناوشار، شەقامێک کە لە خەڵک جمەی دەهات.

پاسەوانێک دەبینم و بەرەوڕووی دەچم و بە کەچەفارسییەک دەڵێم:

_ من، کوردێکی ئێراقیم و دەمەوێت ببمە پەناهەندە و نازانم بۆ کوێ بچم، دەتوانیت یارمەتیم بدەیت؟

_ فەرموو، لەگەڵ من وەرە!

دەستی گرتم و چەند هەنگاو لەوێ دوور کەوتینەوە، ئاوڕێکم لە دواوە دایەوە و کۆمەڵێک پێشمەرگە، بەڵام بێ چەک، بە دوماندا غاریان دەدا!

_ ئاغا! ئەو کوڕە بۆ کوێ دەبەیت؟ ئەوە هاوڕێی ئێمەیە!

_ ئەو دەیەوێت ببێت بە پەناهەندە، بۆ شەهربانیی دەبەم!

من، گوتم: ڕاست ناکەن، من هاوڕێی ئەوان نیم و نایاننناسم!

یەکێکیان گوتی:

_ ئەمە، زیندانییە، بەعسییە و لە دەستی ئێمە هەڵاتووە!

من گوتم: درۆ دەکەن!

پاسەوان گوتی: من، ئەرکی خۆم جێبەجێ دەکەم، من گەرەکە ببیەم و تەحویلی بدەم. ئێوە، پاشان

برۆن و لەوێ داوای بکەن!
دەستی من بە دەستی پاسەوانەوە، کۆمەڵێک پێشمەرگە بە هاتوهاوار، شوێنمان کەوتوون. پاسەوانەکە، ئۆتۆمبیلێکی پاسداران ڕادەگرێ کە بە ڕێکەوت، لەوسەری شەقامەکەوە دێت.
_ دەتوانیت، تا شەهربانیمان بگەیەنیت؟ من، دەبێت ئەم ئاغایە، بۆ ئەوێ ببەم! شۆفێرەکە بە فارسی گوتی: بیان بالا!
ئۆتۆمبێلەکە، بە خێراییەکی زۆر خێرا، شەقامەکەی جێ هێشت و پاش کەمێک وەستا. پاسەوانەکە منی بردە ژوورەوە، لەگەڵ کەسێکی دیکە قسەی کرد و ئیتر من لە ژوورێکدا دانیشتم کە ئەفسەرێکی پلەبەرز، لە پشتی مێزێکەوە دانیشتبوو. ئەفسەرەکە پرسیی: چت دەوێت؟
_ من، کوردێکی ئێراقیم، چەند ساڵان پێشمەرگە بووم و ئێستا دەمەوێت لە سایەی کۆماری ئیسلامیدا، مافی پەنابەرییم هەبێت!
_ زۆر باشە، ئێستا کاغەزەکانت تەواو دەکەم و ڕەوانەت دەکەین! ئەفسەرەکە، لە پەنجەرەکەوە، لە دەرێی ڕوانی و گوتی: ئەو هەموو پێشمەرگە ئێراقییە، لە دەرەوە چی دەکەن؟
_ ئەوانە هاوڕێی منن. من نامەوێت چیتر پێشمەرگە بم. ئەوان دەیانەوێت، بە تۆپزی من لەگەڵ خۆیان ببەن، بەڵام من نەخۆشم و دەمەوێت لە ئێران بمێنمەوە!
لە دەرگای ژوورەکە درا، پاسەوانەکە هات و سڵاوێکی سەربازیی کرد و گوتی: نوێنەرەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، دەیانەوێت، بێنە ژوورێ و لەمەڕ ئەم ئاغایە قسەت لەگەڵ بکەن!
_ با بێن!
دوو مامۆستای شیکپۆش، وەژوور کەوتن و سڵاویان لە ئەفسەرەکە کرد. ئەفسەر گوتی: فەرموون!
_ ئەم پیاوە، هەرچییەکی بە ئێوە گوتووە، درۆ دەکات. ئەمە زیندانییەکی بەعسییە و فەرمانی ئیعدامکردنی هەیە. ئەم دەیەوێت لە دەستی ئێمە دەرباز بێت!
ڕووخساری هەردووکیان بە من ئاشنابوون، بەڵام ناویانم نەدەزانین.
ئەفسەرکە گوتی: تۆ چی دەڵێیت؟
_ ئەوان درۆ دەکەن. ئەوان دەزانن کە من زۆر لەوان ئینقلابیترم. من، تەنها دەمەوێت مافی پەنابەری وەربگرم!
مامۆستای نوێنەر گوتی: نا، درۆ دەکات، ئەو هەموو پێشمەرگەیەی لە دەرێ وەستاون، دەتوانن ڕاستگۆیی ئێمە بسەلمێنن!
ئەفسەرەکە، کەمێک ڕاما و پاشان گوتی: ئێستا من چی بکەم؟ من کارێکی زۆرم هەیە، باشترە تەحویلی ئەم دوو ئاغایەت بدەمەوە!

ڕەوشەکە، دەهات بۆ جێگایەکی ترسناک سەر بکێشێت. جەستەی یەکێتی، لە شکستدا، خوێنی لێ دەتکا! کوشتن و ئیعدامکردنی من، لەو حاڵەتە هیستریایەی یەکێتی و ئەوشیروان مستەفای تێ کەوتبوون، کارێکی مسەوگەر بوو! ئێستا دەبوو، چیرۆکی ڕاستەقینەی خۆم بگێڕمەوە، بەڵام بۆ کێ؟ ئەم ئەفسەرە، نەک هەر بێئاگایە و سەر لە حیکایەتی من دەرناکات، بەڵکە ناتوانێ وێنایشی بکات. ئەو دەسگایەی کە بە ئیشوکاری ئۆپۆزیسیۆنی ئێراقیدا ڕا دەگات، ئاڵای شۆڕش و هەموو هێزە سیاسییەکان دەناسێت، لە چیرۆکی ئێمە ئاگادارە، تەنها سازمانی ئیتلاعاتە!

بە ئەفسەرەکەم گوت: کارێکی باشم لەگەڵ بکە و تەحویلم مەدەرەوە.. من، چیرۆکێکی دیکەم هەیە! من، دەمەوێت قسە لەگەڵ لێپرسراوی ئیتلاعات بکەم!

_ تۆ لێپرسراوی ئیتلاعات دەناسیت؟

_ من کە نایناسم، بەڵام ئەگەر ناوی من بدەیتە ئەو، حەتمەن ئاگاداری چیرۆکی من هەیە؟

_ ناوت چییە؟

_ پشکۆ، ئەندامی سەرکردایێتیی «پەرچەمی ئینقلابی!»

ئەفسەرەکە، تەلەفوونەکەی هەڵگرت و ژمارەیەکی لێدا!

نوێنەرەکانی یەکێتی، دەیانویست فشار بۆ ئەفسەرەکە بهێنن، بەڵام ئەو گوتی: دەبێت چاوەڕێ بن! چەند خولەکێک چاوڕوانی و کەسێکی باڵابەرز و کەتە، پانتۆڵێکی خاکی و پاڵتۆیەکی سەوزباو لەبەردا، جانتایەک بە دەستییەوە، هاتە ژوورێ و سڵاوی لە ئەفسەرەکە کرد و پاشان سڵاوێکی گەرمیشی لە من کرد.

من، هەرگیز نەمزانی و لایشم گرنگ نەبوو بزانم کە ئەو لێپرسراوەی ئیتلاعات ناوی چیبوو! من، لەو ساتەدا، ئەوم وەکو فریشتەی فریاڕەسی خۆم دەبینی! کابرا گوتی: فەرموو، لەگەڵ من وەرە!

دەستی گرتم و لە ژوورەکە دەرکەوتین. ئەو، بە نوێنەرەکانی گوت: ئێوە، بڕۆنە دەرێ و لەوێ چاوەڕوان بن!

لە ژوورێکدا دانیشتین، پەردەکانی داکێشان و ئۆستانە گوتی:

_ چۆن بە زیندوویی لە بەفر و جەنگ ڕزگارت بوو؟

من، چیرۆکی مەرگەساتی خۆمم بۆ گێڕایەوە و پاشان گوتی:

_ شیخەلیی هاوڕێت لە شاری سەقزە، دەزانیت؟

_ نازانم، بەڵام بڕیار بوو بۆ ئەوێی بەێن!

_ هەواڵی مەلابەختیار چی؟

_ هەواڵێکی درووستی نازانم، بەڵام پێم وایە، لە سنووری مەڵبەندی سێی یەکێتییە!

_ ئێمە چی بۆ تۆ بکەین؟ تۆ زۆر خراپ لە دەستی یەکێتی هەڵتوویت و کۆمەکپێکردنت سەختە! مەبەستمە بڵێم، بە ڕۆژی نیوەڕۆ و بە بەرچاوی هەموو خەڵکەوە!
_ چارێکی دیکەم نەبوو! دەتوانن کۆمەکم بکەن؟
_ با بزانین، من هەموو هەوڵێکی خۆم دەدەم. ئێوە کەسانی باشن، بەڵام مەخابن، کۆمۆنیستن!
_ کۆمۆنیستیش شۆڕشگێرە! بەڵام ئەوە چیرۆکێکی دیکەیە.
_ هەستە با بڕۆین!

لە حەوشەکەدا، هەڵایەک بوو ئەوسەری دیارنەبوو، هەرچی پێشمەرگە و لێپرسراوی یەکێتی لەو شارەدا هەبوون، کۆوەبووبوون. کابرا گوتی: ئەمە خۆپیشاندانە! ڕێ نییە وەدەرکەوین! بە پاسدارێکی گوت، تا ئۆتۆمبیلەکەی بۆ بهێننە نێو حەوشەکە و لەگەڵ دەرگای ساڵۆنەکەی جووت بکەن. وەهایان کرد. کابرا، منی لە پێشەوە دانیشاند و خۆی لە پشت ستێرنەکەوە، سولفی گێڕا. نوێنەرەکانی یەکێتی، خەریکبوون لە پشتی ئۆتۆمبێلەکەوە، سوار بین، ئەو گوتی: دابەزن! ئەگەر دەتانەوێت، بە ماشینی خۆتان وەرن!
کە ئۆتۆمبیلەکەی ئاژۆت، لە پەنجەرەکەوە، لە نێو حەشاماتەکەدا، نیگام لەسەر ڕووخساری شەڕلێیاریوی بەختیاری ساڵەح ڕەفعەت نیشتەوە، دەستی ڕادەوەشاند و هەرەشەی لێ دەکردم، هەندەک قسەی بەرزونزمیشم بیستن، بەڵام گوێم پێ نەدان!
ماشینەکە، بە خێرایی تێپەڕی و زۆری نەبرد، لە بەردەم دەسگای ئیتلاعاتدا وەستا. کابرا دابەزی و پێشم کەوت. لە ژوورەکەی خۆیدا، چایەکی بۆ بانگ کردم و گوتی:
_ ئێستا، نوێنەر و لێپرسراوەکانی یەکێتی پەیدا دەبن، دەبێت لە شوێنێکت بشێرینەوە!
_ هەرچییەکی خۆتان بە باشی دەزانن!
_ لە زیندانێکی تاکەکەسیت دەنێین، بەڵام تۆ میوانی ئێمەیت، هەرچییەکت پێویست بوو، داوای بکە!
_ من لەگەڵ زیندان ڕاهاتووم!

پاسدارێک هات و بۆ ڕاڕەوێکی باریک و تاریک، پێشم کەوت، دەرگای ژوورێکی کردەوە و گوتی: فەرموو!
ژوورێک، پانییەکی ٢ مەتر و درێژاییەکەیشی هەر هێندە دەبوو، تاریک و گڵۆپێکی لەرزۆک بە ساپیتە زۆر بەرزەکەیەوە، تیشکێکی کزی زەردباوی دەڕژاند. لە ژوورەکەدا، پەتوویەکی چڵکن ڕاخرابوو.

دوو پەتووی دیکەشی لێبوون. دەرگاکە پۆڵا و تەنها پەنجەرەیەکی چکۆلە لە بەشی سەرەوەیدا هەبوو، کە لە دیوی دەرەوە، پاسەوانەکان دەیانتوانی بیکەنەوە.

کە پەتووە سەربازییە چڵکنەکانم دیتن، یەکسەر بۆ لای پەتووە ڕەنگاوڕەنگە بێنازکەوتووەکانی نێو بەفری دۆڵەکە گەڕامەوە! ئەو پەتووە ڕەنگین و نوێیانە. دەشێ هەر دانەیەکیان، ڕۆژگارێک بە دەستی کابانێکی دەستتەڕ، لە ژوورێکی گەرموگوڕی خانووەقوڕینەی گوندێکدا، لە کونجێکدا، بە نازەوە، پارێزرابێ و بۆ میوانانی لە بەردڵانی دەرهێنابێ! مرۆڤ، ئەگەر بەخت یاری بوو بێت و لە گوندێکدا، میوانبوونی کابانێکی دڵوالای بە نسیب بووبێت، ئیدی بۆنی مێخەک و هەزبێڵەی ئەو پەتووانەی لە ڕۆحی خۆیدا، بۆ ئەبەد هەڵگرتووە.

پاسەوانەکە، چەند جارێک لە ڕۆژنەکەوە، پرسیاری کرد، داخۆ شتێکم پێویست نییە. من تەنها داوای «چا» و ناوم کرد. بۆ نیوەڕۆژ، برنج و مریشک «چلاومرغ»یان بۆ هێنام. ئێوارێ، شۆرباوێک و دوو سەموون و پاشانیش چایان هێنا.

پێ دەچێت، ئەمشەو، دواشەوەکانی ژیانی زیندانم بێت. کێیش دەڵێ وەها دەبێت. جارێ ترس و دڵەڕاوکێکانم جێیان نەهێشتووم! تۆ بڵێی سەرکردایەتیی کۆمەڵە، بە تایبەت نەوشیروان کە خۆی چەند ڕۆژێکە لە ئێرانە، زۆر بۆ ئیتلاعات بهێنێ و ئەمانیش، ڕاستەوخۆ نەوانم بکەنەوە؟! جا چ هێزێکی سیاسیی کورد، هەر نەبێ لەم دۆخی هەرەس و تێکشکانەدا، هێندەی زۆر بەسەر ئێراندا دەشکێ؟ مەگەر بۆ بەختی ڕەشی من!

ئێرانییەکان، سەر و سمێڵی هاوکارییان بە هێزە کوردییەکان تاشی و داوێنەی ئەنفالیشیان دایە دەستیان! داخۆ ئێران، ئەگەر بیوستبا و لێ بڕابا، نەیدەتوانی پێش بە کارەساتی ئەنفال بگرێت؟ هەر نەبێت دەستبەرداری هێزە کوردییەکان نەبوایە و بەم هەوارە خوێناوییە نەگەیشتینایە! ئێران، کوردستانێکی وێران و کۆمەڵێک هێزی سیاسیی لاواز و پەرتەوازە دەخوازێت. ئەمەیە گەمەی خوێناویی سیاسەتی ئێوچەیی داگیرکارانی کوردستان و ئەو هاوکێشە سیاسییە ئاڵۆزەی کە کورد لە مێژووی خۆیدا، نەیتوانیوە دازنەکانی بەزێنێت!

ئێستا، لە تاریکایی زیندانی ئیتلاعاتدا، قسەکەی سەلاح چاوشینم وە بیر دێتەوە کە لە هاوینی ١٩٨٦دا و لە هەڵەدن، پێی گوتم:(لەگەڵ ئێراندا، هەموو هاوکارییەک دەکەین، ئەمجارەیان، دەفڕین یاخود دەتڕین! سەرکردەکان وەها دەڵێن!)

دیوارەکانی زیندان، سارد و شێدارن. بە ڕووی دیوارەکانەوە و لەبەر تیشکی لاوازی گڵۆپەکەدا، هەندەک ناوی هەڵکۆڵراو دەبینم. ناوەکان، پاشناوی ئێرانییان پێوە لکاوە و ناوی ئەو خەباتکارانەی ئەم بەشەی کوردستانن کە ڕۆژگارێکی تاریکیان لێرەدا گوزەراندووە، ئازار و ئەشکەنجەیان کێشاوە

و دەشێ هەندێکیشیان، دواهەناسەی خۆیان، بە هومێدی سەرکەوتنی دۆزی میللەتەکەیان، لێرەدا سپاردبێت. من، ئەمشەو میراتگری ئەو مرۆڤە جوامێرانەم! ئێمەی کورد، سەرکەوتنەکانمان نا، بەڵام هەمیشە خەم و ئازارەکانمان، بۆ یەکدی جێ دەهێڵین!

لەم زیندانەدا، لە لووتکەی هەرەس و تێکشکانەوە، بۆ بەرایی رووباری تێکۆشان و رۆژگارە سەختەکان، رۆژگاری رۆنانەوەی پردە هەڵتەکیوەکانی رێکخستنی کۆمەڵە، لە دەڤەری هەڵەبجە، شۆڕ دەبمەوە و لەو وردەماسییە ئەسرەوتانەی دەم شەپۆلی شۆڕش کە تۆڕەکانی مەرگیان دەبەزاند، ناوچە سووتماکەکانیان دەکێڵا و بۆ خورتکردنی هێڵەکانی رێکخستن، دەهاتنە بنکەکانی شاخ، رادەمێنم.

حەکیمی مەلاساڵەح، گەنجێکی پرۆزە، هونەرمەند و ئەدیبێک کە هەموو خەمەکانی خۆی بە خەمەکانی رێکخستن گۆڕیبوونەوە، دەهاتە باخەکانی «شۆشمێ» و باسی چۆنییەتی رێکخستنەوەی کەرتی رێکخستنی «وەستائەنوەر»ی دەکرد و کارنامە و پێشنیازی دەخستنە روو.

ئایاری مەلاحەسەن، بە بەژنێکی بچووک و بنێس و بیرێکی باڵا و تینێکی زۆرەوە، دەهات و هەواڵی گەشەکردنی رێکخستنەکان و دابەشکردنی کار و چالاکییەکانی دەگەیاند.

بەیان، گەنجێکی قوتابیی پەیمانگای مامۆستایان کە خەڵکی تەوێڵە بوو، وەکو سمۆرە، چوست و چالاک، تەلانەوتەلان، باخەکانی تەوێڵەی تەی دەکرد، سنووری دەبەزاند و نامەکانی دەهێنان و وەرامەکانی ئێمەی بۆ سلێمانی دەبردنەوە. فەیسەڵی ئەحمەد تۆفیق، لە گوندی دەرمیانە مامۆستا و ئەندامی کەرتی رێکخستنی شەهیدوەستا ئەنوەر بوو کە بویرانە، هەم لە شار و هەم لە شاخ، کارەکانی ئەنجام دەدان! حەمەی غەفوورشەریف، هاورێی منداڵیی و لێپرسراوی من لە یەکێتیی قوتابیانی کوردستان و سەرەتای ئەندامێتییم لە پارتی دیموکراتیی کوردستاندا، کادرێکی هۆشیار و بەئەزموونی کۆمەڵە و لەو رۆژگارەدا، چالاکانە هەوڵی گەشەپێدانی رێکخستنەکانی دەدا!

کێی دیکە؟ زۆر بوون، گەلێک زۆر بوون کەسانێک کە گیانیان لەسەر لەپی دەستانی خۆیان دابوون و بەردەکانی بناخەی رێکخستنیان دادەنایەوە!

لە ناخی تاریکی ئەم زیندانەوە، بە چاوی دووربینی یادەوەرییەکانم، هەموو کەسەکان و رووداوەکان دەناسمەوە..بەختیاری عەلیی حەمەگیانە، لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا، بە دەم پیاسەی ئێوارانی کانیشێخ و کوڵەبۆزەوە، باسی خەباتی سەختی جیڤاریستی و هەلومەرجی شۆڕشی نوێی بۆ دەکردین. بەختیار، لە خێزانێکی کۆمۆنیست بوو، لە نێوەڕاستی حەفتاکانەوە، لە بازنەی فیکری کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینیی کوردستان کەوتبوو، چالاکانە کاری دەکرد و هەڵدەسوورا! بەختیار، لە شەوێکی باراناویی بەهاری ١٩٧٨دا، هاورێی حەمەئاوات و محەمەد سەعید ئەحمەد«شاهۆ»، رێگای شاخ دەگرێتە بەر و دەبێتە پێشمەرگە. تەمەنی پێشمەرگەیێتیی ئەم هاورێ جیڤاریستەمان، بە هۆی کەتەیی و قوورسیی

جەستەیەوە، زۆر کەم بوو. بەڵام لە شار و پاشی گەڕانەوەشی، کوڕی ڕۆژە سەختەکان و هەڵسووڕاوی ئەسرەوتی خەباتی شار بوو!

لەنێو شاردا، مەفرەزە چەکدارە نهێنییەکان، بۆ دەستوەشاندن لە بنکەکانی دەوڵەت، لە زەمەنی دوورکەوتنەوەی مەفرەزەکانی شاخ لە ناوچەکە و سەرقاڵبوونیان بە ئەرکە نشتمانییەکانیان لە کوردستانی ڕۆژهەڵات، کار و کردەی جوامێرانەیان ئەنجام دەدان. فاتیحی خەجێ، ئەو پیاوە جوامێر و کردەیە بوو، کە تەوەری هەڵسووڕاندنی کردە چەکدارییەکانی شار بوو.

دەنگی ناسازی بادانی کلیلی دەرگاکە، لە خەوی ڕاچەناندم، تا چەند چرکەیەکیش هەر پێم وابوو، زیندانی بەرگەڵووە، چاوێکم بۆ مامەشێخ و عەلیی مامەحەمە گێڕا، کە بە خۆمدا هاتمەوە. شوێنەکەم ناسییەوە، ڕووداوەکانی چەند ڕۆژ پێشتری ئەنفال، برووسکەئاسا، بە زەینمدا تێپەڕین.

_ ئاغا، فەرموو بۆ دەستشۆیی بڕۆ!

پێویستییەکانی دەستشوییم وەجێ هێنان و گەڕامەوە، نان و چام خوارد و زۆری نەبرد، وردیانی زیندان هاتەوە و منی لەگەڵ خۆی بۆ ژووری لێپرسراوەکە برد..

_ ئەمشەو، چۆنت گوزەراند؟

_ خراپ نەبوو، هەر وا دەبێ!

_ دوێنێ، نوێنەرەکانی یەکێتی هاتن و هەوڵی زۆریان دا، گوتمان ناردوومانە بۆ تاران و لای ئێمە نەماوە. ئەم بەیانییە، نوێنەری یەکێتی، ئاغای دکتۆر خۆشناو، زەنگی لێدا و داوای کردیت. ئێمە گوتمان: دەبێت لە تارانەوە فەرمانمان بۆ بێت! ئێوە دەتوانن لەگەڵ ئیتڵاعاتی نێوەند، پەیوەند بگرن!

_ ئێستا چی دەبێت؟

_ دەبێ لێرە بڕۆیت!

_ بۆ کوێ؟

_ دەتنێرمە «ژاندارمری». لەوێ وەکوو پەناهەندەیەک، بۆ «کەرەنتینە»ی شاری «ورمێ»ت دەبەن. لەوێ، کاری تۆ تەواو دەبێ!

لە ژاندرامری، بوومە هاوزیندانی سەربازێکی زیندانیکراو. شەوێکم لە زیندانێکی چکۆلە و ئێجگار پیسدا ڕۆژکردەوە.

لە پاسێکی ئەفەرهەڵگردا، دەستی چەپم بە دەستی ڕاستی سەربازێکەوە کەلەپچەکراوە و لە سەرەدەشتەوە،

بۆ مهاباد بە ڕێگاوەین!
پاسەکە پڕە لە موسافیر و من بێئاگا لە دەوروبەرم. لە پەنجەرەکەی لای خۆمەوە، لە سرووشتی تازەخەملیوی ئالان دەڕوانم و خوریی یادەوەرییەکانم دەڕێسمەوە..
لە بەشی دواوەی پیکابێکی دووکابینەدا، ئازار لوولی کردووم و هەر لەم ڕێگایەوە. بە هەمان ئاقار و ئاڕاستەدا. بۆ مهاباد و لەوێڕا. بە پاسێک بەرەو تاران دەچین.. پوورەفاتێ، لە گوندی «مالوان»ی شارەزوور. گوتی: باوکەکەمن، دەموچاوتان بشۆن و نان و چاکەتان بخۆن. لەم ناوە ماتڵ مەبن و بچنە نێو دارەکان.. لەسەر جۆگاکە، نووشتامەوە و مشتێک ئاوم هەڵگۆزی و ئیدی نەمتوانی ڕاست ببمەوە.. ژانێک، مینا کێرێکی تیژ، هەناومی دەئاژنی، ئەژنۆکانم شل بوون و لار بوومەوە..
چواردەستە هەڵیان گرتم و لە بەرهەیوانی ماڵی پووره فاتمەدا، جێگایان بۆ چێ کردم..
سامان گوتی: پاسکۆپان! دەرزی پاسکۆپانت بۆدەکەم و هەر ئێستا چاک دەبیت. ئەمە بە ئازاری گورچیلە دەچێت!
پاسکۆپان، دەرێکی نەخوارد و بۆ من، ئازارشکێن نەبوو، بە دەم ژانەوە پێچم دەخوارد و گینگڵم دەدا..
_ تراکتۆرێک پەیدا بکەن!
مەحمودی حاجی فەرەج و مەفرەزەکەی، هەندەک لە پێشمەرگەکانی دەستەکەی خۆم و سامانیش کە بەناچاری فێری کاری برینپێچی بووە، لە تراکتۆرێکدا، بە پانتایی شارەزووردا و بە ڕۆژی ڕووناک، بەرەو هەڵەبجەی دەئاژووین! شەو، لە هەڵەبجە و لە ماڵی عەلیی حەمەبۆر، دەمێنینەوە. ڕۆژی دوایی. فەریدوون عەبدولا. دکتۆرێکی میسری، بۆ ماڵەوە دەهێنێت. ئێمە هەوڵ دەدەین دکتۆرەکە، من نەناسێت و نەزانێت پێشمەرگەم، بەڵام دکتۆر دەڵێ: ئەگەر وێنەی تیشکی ئێکست بۆ نەگرین، ناتوانین کێشەکە دەستنیشان بکەین. تۆیش کە ناتوانیت بێیتە نەخۆشخانە، هەندەک دەرمانی ئازارشکێنی باشت بۆ دەنووسم و بڕۆ لە شوێنێکی دیکە چارەسەری خۆت بکە!
لە تاران، ئەنجامی وێنە و پشکنینەکان وەردەگرمەوە. دکتۆرە شارەزاکە، دەڵێ: تۆ، ٣ گورچیلەت هەن و گرفتێک لەواندا پەیدا بووە، بەڵام بە دەرمان چارەسەر دەکرێ. لە هۆتێل، چیرۆکەکەم بۆ دلێری سەیدمەجید گێڕایەوە، دلێر گوتی: شانست نەبوو، ئەگەر ٣ دڵت هەبووایە باشتر دەبوو! لە ڕێستوورانتەکەدا، لەگەڵ دلێر، مامۆستاجەعفەر و مامۆستا موحسیندا، داوای خواردنی «ستێک»مان کرد، چەقۆ و چەتاڵیان هێنان. من، پێشتر هەرگیز بە چەقۆ و چەتاڵ، نانم نەخواردبوو.. کامیان بە دەستی ڕاست و کامیان بە چەپ دەگریت؟ دەستەکانم دەلەرزین، ستێک لەژێر چەقۆدا بازی دەدا و چەتاڵ بۆی نەدەگیرایەوە! مامۆستاجەعفەر گوتی: چەتاڵەکە، بە دەستی چەپت بگرە و لە گۆشتەکەی

بچەقێنە! بە دەستی ڕاستت چەقۆکە بگرە و گۆشتەکەی پێ ببڕە! چەقۆ و چەتاڵ بەیەکدا دەهاتن و من ئیتر حەوسەڵەم نەما. پڕم دایە گۆشتەکە و بە دوو پاروو، تەودیوم کرد!
پاسەکە ستۆپێکی کرد و سەربازەکە گوتی: ئاغا، دادەبەزین!
تێرمینالی مهاباد بوو. من، چاوێکم کردبووە دە چاوان و لە کەسێکی ئاشنا دەگەڕام.. چ کەسێکم نەدیت!
بە دەستی کەلەپچەبەندەوە، سەربازەکە، بۆ پاسێکی دیکەی کێش کردم و بەرەو ورمێ ڕۆیشتین.
شەقامانی ورمێ چۆڵ و بێدەنگ، فڕۆکەکانی بەعس، بە ئاسمانی شاردا گڕ دەخۆن، خەڵک بۆ پەناگاکان خۆیان دەکوتن. سەربازەکە دەڵێ:
_ ماڵی خوشکم لێرەیە، ماشێنیان هەیە، دەچینە ماڵی خوشکم و زاواکەمان بۆ کەرنتێنەمان دەبات!
_ کەلەپچەکە ناکەیتەوە؟
_ نا، ئاغاگیان، نابێت!
بە سەرشەقاماندا، بە دەستی کلیلدراوەوە، غار دەدەین! من، دەبێت ڕێک بە خێرایی سەربازەکە غار بدەم، دەنا مەچەکم لێدەبێتەوە!
ماشێنی زاوای سەربازەکە، لە بەردەم کەرەنتێنەدا وەستا، منیان تەحویل دا و خۆیان گەڕانەوە.

# وێنەکانی مەرگی هەڵەبجە

کەرەنتینە، زیندانێکی گەورەی پەناهەندەکان. چەندین هۆڵی فراوان و لەواندا بەشی خێزانداران و زگورتییان جودان. حەوش و حەسارێکی چەند بڵێی هەراو کە بە دیوار و لەسەر دیواریشەوە، بە درکەپەرژین چواردەور دراوە. کارمەندێک، ناو و زانیارییەکانی منی تۆمار کردن و پاشان لە هۆڵێکی گەورەدا، تەختێکی خەویان پێ دام. لێرەدا، چەندین کوردی پەناهەندە دەبینی کە هەر یەکێکیان چیرۆکی پڕ کارەساتی خۆی هەیە.

هەموومان، خێزانێک، وڵاتێک، مێژوویەکمان جێ هێشتوون و بۆ ڕزگارکردنی ڕۆحی بریندار و هەگبەی یادەوەرییەکانمان، چارەنووس بە ئێرەی گەیاندووین!

چەند کاتژمێر پاش گەیشتنی من، پێشمەرگەیەکیان هێنا کە من ئەمدەناسی و ئەو چیرۆکی منی دەزانی. خۆی کردە هاودەم و دراوسێ تەختی خەوتنم!

پێشمەرگەکە، باسی کارەساتی ئەنفال و تێکشکاندنی شۆڕشی، لە ئەزموون و بینینەکانی خۆیەوە، بۆ گێڕامەوە..

_ تەواو! هیچ شتێک نەما، هەموو شتێک ڕووخا و کەس لەبەر زریانی ژەهر و ئەنفالدا خۆی نەگرت!

_ دەزانم، منیش لەوێ بووم، منیش بۆنی مەرگ و ژەهرم لێ دێت!

_ تۆ، هەر گۆشەیەک و کەنارێکیت بینیوە، منیش هەروەها.. بەڵام ئەمە قیامەت بوو، قیامەتێک کە بەهەشتێکی بۆ ئێمە تێدا نەبوو.. ئێمە هەمومان دۆزەخی بووین! بەعس، حەشری هەموومانی کرد و بۆ نێو مەرگەساتی فڕێ داین!

_ بەعس، ئێران، جەنگ، خۆمان و ئیتر..

_ تێناگەم!

_ تێگەیشتنی ئاسان نییە!.. هەواڵی نوێ چییە؟

_ بەعس، بە بۆمبی کیمیاوی لە شاناخسێی داوە!

_ کەی؟ کەس ئالوودە بووە؟

_ لەم ڕۆژانەدا، بە خەستی لێی داوە.. حەمەمینی خەجێ شەهید بووە! چەندین برینداریش هەن کە هێناونیان بۆ ئێران!

هەواڵی شەهیدبوونی حەمەمین، موچڕکێکی بە جەستەمدا هێنا و بەنجی کردم! من لە ساڵی ١٩٨٠وە، ساتێک ڕابەری سیاسیی هەرێمی سێ بووم، حەمەمینم دەناسی، چ پیاوێکی جوامێر و بە هیممەت

بوو!
_ ئەی بریندارەکان؟
_ زۆرن، ئەوی تۆ بیناسیت، ڕەنگە سالاری حاجی دەرویش بێت!

کەسێک هات و بۆ نووسینەگەی کارمەتیینەی بردم. لە نووسینگەکەدا، پیاوێک بە خێری هێنام و بە ناوی «فازیل» خۆی ناساند، بە شێوەی ڕەفتار و قسەکردنیدا، بە لێپرسراوێکی بەرزی ئیتلاعات دەچوو. کابرا، بە وێڵ و ئوسووڵێکەوە قسانی دەکرد، ئەتەکێتی «پیاوی دەوڵەت»ی لێ دەباری.
_ ئاغای پشکۆ، چیرۆکی زینداناکردنی خۆت و ئەو ماوەیەی ژیانی خۆتم لە زینداندا، بۆ باس دەکەیت؟
_ چیرۆکێکی درێژ و پڕ ئازارە! پێم وایە، نە دەتوانم بیگێڕمەوە و نە دەشتوانم بینووسم! بەڵام کورتەی چیروکەکە، سەرئەنجامی کێشە و ململانێی فیکری، ڕێکخراوەیی و سیاسیی نێو دەروونی یەکێتیی نیشتمانی و کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانە. ئێمە نەمانتوانی کێشەکانمان بە ئاشتی و هێمنانە چارەسەر بکەین و ئەنجامیش بە کارەسات گەیشتین!
_ دەتوانیت باسێک لە کێشەکانتان بکەیت؟
من، کورتەیەکم بۆ باس کرد و لە میانەی قسەکانی من و سەرنجەکانی ئەودا، تێگەیشتم کە ئەو باشتر لە من ئاگادارە و وردبینەی کێشەکان و کەسێتیی کەسەکان و تەواوی ڕووداوەکان شارەزایە!
ئەو، جەختی لەسەر قسەکانی لێپرسراوی ئیتلاعاتی سەردەشت کردەوە و گوتی: ئەوشیروان مستەفا، لە ڕێگای نوێنەریانەوە لە تاران، زۆر مەبەستی بوو کە تۆ تەحویلی ئەوان بدەینەوە، بەڵام ئێمە نەمانکرد!
گوتم: هەڵویستی ئێوە، جێگای پێزانینی منە!
فازیل، وەهای دەردەخست کە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان، لەگەڵ هێزە کوردییەکاندا گەڕاوە و شارەزاییەکی باشی لە بارەی کەسایێتیی سەرکردەکانی کورد و کادرەکانی ئەو هێزانەوە هەیە. فازیل گوتی، ئێوە، باس لە کۆمۆنیزم وئەخلاقی کۆمۆنیستانە دەکەن، بەڵام من شەوێکیان لە بارەگایەکی پێشمەرگەدا، ئاگاداری ئەوە بووم کە پێشمەرگەیەکی کۆمەڵە، لەگەڵ ئێسترێکی ماچەدا سێکسی کردا
من گوتم: ئەوە هیچ پەیوەندی لەگەڵ ئایدۆلۆگیدا نییە، ئەوە غەریزەی گەنجێکە کە بە ناچاری کاری وەها ئەنجام دەدات!

فازیل کە بە بنەچە کورد بوو و کوردییەکی باش دەداخێوی، لێپرسراوی بەشی ئیتلاعاتی دەرەوەی

سنووری ڕۆژئاوای ئێران بوو. واتە لێپرسراوی پەیوەندییەکانی ئیتلاعات بوو لەگەڵ هەموو هێزە کوردییەکان کە هاوکارییان لەگەڵ ئێران دەکرد.

فازیل، جگە لەوەی لێکۆڵینەوەی فەرمیی لەگەڵ دەکردم، دیسانش وەکو پیشە و کاری موخابەراتیی خۆی، دەیویست کەڵک لە باری ناهەمواری دەروونیی من وەرگرێت و بەرەو بازنەیەکم کێش بکات کە خۆی مەبەستی بوو..

_ کاک پشکۆ با لەسەر کۆمۆنیزم و ئیسلام قسان بکەین!

_ چ پێویست دەکات و چ کەڵکێکی هەیە؟

_ کەڵکی بۆ ئاسوودەیی دوارۆژی ژیانت دەبێت؟

_ نازانم! بەڵام دوو فەلسەفە و دوو ئیدۆلۆگیی جیاوازن!

_ کامیان بە ڕاستتر دەزانیت؟

_ دیارە، من کۆمۆنیزم بە درووستتر دەزانم!

_ کۆمۆنیزم وا شکست دەهێنێت.. سەیری ئێران و ڕێبەرانی حیزبی توودە بکە، بزانە چۆن هەڵدەگەڕێنەوە و دژی کۆمۆنیزم دەنووسن!

_ ئەوانە لادەر و دژەکۆمۆنیزمن!

کابرا زەردەخەنەیەکی وە سەر لێوان کەوت و گوتی:

_ ئەگەر تۆش بتوانیت دژەکۆمۆنیزم بیت، بۆ خۆت باشترە، ژیانت خۆشتر دەبێت و ئێمە هەموو شتێکت بۆ دەکەین!

_ چییم بۆ دەکەن؟

_ ژیانت دەپارێزین، ژیانت مسەوگەر دەکەین، ئەگەر بتەوێت بۆ دەرەوەش سەفەر بکەیت، هەموو کارئاسانییەکت بۆ دەکەین!

_ من، لەسەر فیکری چەپ، هەموو ژیانی گەنجییەتیی خۆمم لە مەترسی خستووە و ئێستاش بە ئاسانی دەستبەرداری نابم!

_ تۆ هێشتا گەنجی و فیکریش، زۆر ناراستە و ئاقاری دیکەی هەیە!

_ پێم وایە، من باشترینیانم هەڵبژاردووە و لێی پەشیمان نیم!

_ سەربەستیت، بەڵام لەم حاڵەتەدا، ئێمە ناتوانین یارمەتیت بدەین!

_ مەبەستت چییە؟

_ ناتوانین زەمانەتی پاراستنی ژیانت بکەین و هیچ گەرەنتییەک بۆ بژێوی و ژیانت نادەین!

_ ڕەنگە برادەرەکانم لە «نالای شۆڕش» بتوانن ئەو کارە بکەن!

_ برادەرەکانت هەم لە ڕووی هێز و هەمیش لە ڕووی دەرامەتەوە، زۆر لاوازن و هیچیان پێ ناکرێت!

_ گرنگ نییە.. ژیان بەردەوام دەبێت!

_ باشە، تۆ، دوو تا سێ ڕۆژی دیکەش لێرە دەبیت و پاشان بەرگەیەکی هاتوچوت بۆ دەکەین تا دەگەیتە «زێوێ» و دەچیتە لای برادەرەکانت، هەر ئەوەندە و تەواو.

_ منیش هەر هێندەم دەوێت و سوپاستان دەکەم.

ئێوارەی ڕۆژی ١٦ی ئازاری ١٩٨٨، سەرهەواڵی کەناڵێکی تەلەفزیۆنی ئێران، جەستەی لوول کردم و ڕۆحی زامدارمی هێندەی دیکە وێران کرد..(لەپاش ئازادکردنی شاری هەڵەبجەی باکووری عێراق، لەسەر دەستی هێزە قارەمانەکانی قەرارگای ڕەمەزان و پێشمەرگە کوردە ئێراقییەکان، فڕۆکەکانی سەددامی کافر، شارەکە بە بۆمبی ژەهراوی بۆمباران دەکەن! هەزاران کەس لە خەڵکی مەزڵووم و بێدیفاعی ئەم شارە شەهید و ئالوودە دەبن!) وێنەکانی مەرگی هەڵەبجە، یەک لە دوای یەک، لە چاوی «تی ڤی»یەوە بۆ چاوکانی زەینی من دەپەڕنەوە و لە قووڵایی بوونمدا، بۆ ئەبەد دەمێننەوە! کۆڵانەکانی منداڵییم. لە تەرمی خۆشەویستانم سەررێژن، دەشتی «عەنەب»، بووەتە گوڵجاڕی ڕۆحە هەڵفریوەکان. «کانیشێخ» و دەوروبەری کارێزی «حاجی ناجی» سیخناخن لە لاشەی سووتاوی ژن و منداڵان، ئیتر شوێنێک بۆ دەورکردنەوەی دەرسەکانی «کیمیا» نەماوە! کۆڵانەکانی گەڕەکی «پیرموحەمەد» و «تووەوشک»، پڕن لە تراکتۆر و پیکابی تژی لە مرۆڤە خنکاوەکان. ماڵی «عەلی حەمەبۆر» و «ئیسماعیلی حاجی ئەولقار» بە ڕووخاوی دەبینم.. ڕێک ئەو ژوورانەی ماڵەکانی ئەوان دەبینم کە چەندین ڕۆژان، حەشارگەی بێترسی ئێمە بوون! لە «کانییەقووڵکە»، منداڵان دەبینم کە مەمکی ژاراویی دایکیان دەمژن! دایکم، برام، خوشکەکان، خوشکەزا و برازاکانم! وێنەکانی ئەوان وێناناکەم! هەموو وێنەکان ئەوانن و ئەوانیش هەموو وێنەکانن! وێنەکان مێشکم جام دەکەن، بیرکردنەوەم ئیفلیج دەبێت و تەنها وێنە ژەهراوییەکان دەبینم. هەموو وێنە خنکاوەکانی منداڵیی خۆم و هەموو یادەوەرییەکانم، لە گڕەی ژەهردا، پەل دەکوتن و لە گیانەڵاندان.. هەموو شتێک کەوتووەتە ئاویلکە و ژیان لەنێو گۆڕی بەکۆمەڵدا خەوتووە!

وای خودایە! وای سەرکردایەتیی سیاسیی کورد! چلۆن پرکێشیی ئەم کارەتان کرد و لەبەر ڕۆشنایی کام ئەقڵدا، سەرکەوتنی خۆتان لە مەرگی شارێکدا دەبینن؟! وای لە ڕێبەرانێک کە باکیان بە پیرۆزییەکانی نەتەوە نییە و هیچ هێڵێکی سوور ناناسن! بڵێی مێژوو چۆن ئەم ڕەفتار و کردە سیاسییەتان لە ڕووپەڕی خۆیدا بنەخشێنێت؟

ئێستا من، درەختێکی بێڕیشەم و چڵەکانم دەلەرزن، گەڵاکانم بە کۆمەڵ دەخەزێن!

من، چەند ساڵان پاشتر و لە دۆزەخی مەنفادا، وێنەکانی مەرگی هەڵبجەم، وەها وێنا دەکردن:
((ئێمە نیشانەیەکین ناخوێندرێتەوە. ئێمە هەست بە هیچ ئازارێک ناکەین. وا پێ دەچێ ئێمە زەمانمان لە خاکە نامۆکاندا بزر بکەین _ هۆڵدەرلین))
چرکەساتی لەگۆڕنانی مێژووی برینە ئەمرەکان.. ئەو زامە هەرگیز پەترۆکەنەبەستووانەی کە لە بەهارەرۆژێکی بۆنداردا، لە بیابانە قاقڕ و زەردەکانەوە، بارگەیان تێک نا و لەسەر جەستەی زیوینمان هەواریان خست.
زرینگەی زەنگی ئەو چرکەساتانە، بۆ هەمیشە لە بولێڵی یادەوەرییماندا زایەڵەی دێ.
مێژوویەکی ئێڵنجهێنەر، پریاسکەیەک گوناه و هەگبەیەک تاوان و ڕۆمانێکی نەنووسرای لە بنهەنگڵ ناوە و دەستەودامان لە دومان هەنکەهەنکییەتی و ئێمەیش نە جورئەتی خوێندنەوەیمان هەیە و نە توانای ناشتنیشی!
مێژوویەکی لەسەرشانمان هەڵترووشکاو، گران وەک بەردەکەی سیزیف.. ئەرێ ئێمە مەحکومین بە مێژوو؟ ئەوە ئێمەین کە دەبێ لە ژێلاوە بۆ سەر لووتکەی پاڵ پێوەنێین؟! یاخود ئەوە ئەسپی مێژووە کە گالیسکەی چارەنووسمان لەم دەشتی کاکیەکاکیی زیندانەدا دەناژووێ؟
زۆر هەن دەبێژن:
میللەتە مەزنەکان مێژووی مەزن دەخولقێنن، لە خوێندنەوەشیدا، لەززەت بە ڕۆحیان دەبەخشن و واژامی بەژنی دوارۆژیان دەبێتە چرۆی ئەرخەوانی.
ئێمە لەبەر قریشکەی کۆرپەی ڕۆحمان، توانای توێژینەوەی مێژووی خۆمانمان نییە. تۆ بڵێی ئێمە مرۆڤگەلێکی گچکە و گوناهبار بین و لە مەرگەساتی جەستەماندا، هەست بە کزانەوەی تاوانەکانمان بکەین؟! یاخود لەززەت لە دیلییەتی ئاخ و بزربوونی زمان و نامۆبوونی ڕۆحمان ببەین؟
سا وەرن! تا پێکەوە بە گەرووی چرکەساتە مەرگچێنەکاندا ڕۆبچین و لە ئاڵانی ئەنگوستلەچاوی جیهانی لە زەمەن دابڕاودا، چراوگێکی لەرزۆک پێ کەین! ئەو جیهانەی مەودای نێوان: دەنگ و بێدەنگی، گوناه و پاکیزەیی، مەرگ و ژیان دەسڕێتەوە.. ئا لەوێدا، پەندێک ببینینەوە، پەندێک، نەک بۆ ئەزبەرکردن، بەڵکو بۆ تێڕامان!
ئێمەی کورد: گەلێکی جەستەدازاوی، برینەباڵای، هەناوڕەشی، بەژن لە خوێن هەڵژەنراوی نێو جەنگەڵی ئەم وێرانەیەین کە جیهانی پێ دەگوترێت.. خاکمان: مەکۆی جەنگی نێوان زاڵمانە و خۆشمان: شمشێرە خوێناوییەکانی دەستیان. هەر بۆیە بوونمان گرێچنی مەرگە و نشتمانیشمان؛ باربەستی قوشمەنە تینووە هەرگیز لەخۆێن تێرنەبووەکانیان.
هەڵەبجە..

ئەفسانەیەکی خنکاوی بن گۆمی لیخنی جەنگ و سیاسەتە و لەژێرەوە هاوارییەتی.. دەست ڕا دەدات تا پەلمان بگرێت و لە خەونی جیهانی بێنابڕوویی سیاسەت و مافی مرۆڤ، ڕامانچەنێنێ و بێدارمان کاتەوە!

میللی زەمەن بۆ دواوە دەچەرخێت و کات: بەربەیانێکی وەنەوشەیی، ڕۆژ: ١٦ی ئازاری ١٩٨٨، شوێن: دەڤەرێکی تازە بە شنەبای بەهار خەملیوی نێو ئامێزی (سوورێن) و (بالآنبۆ)، ڕووداو: سەرکەوتنی تراژیدیای مەرگ و جێنگۆڕکێی داگیرکاران!

هەڵەبجە، ماکەوێکی تازە لەقەفەزدەرفرتیوە و لە دنیای حەپەساندا باڵەتەپێیەتی! ئینسانەکان، ڕەوتی ئاسایی ژیانیان تێک چووە، مینا مێگەلێکی گورگتێبەربوو، بە ترسەوە بە یەکدا دێن، لەنێوانی دێوی ژێردەستەیی و هومای ئازادیدا ئەبڵەق ماون! چاویان لە ئاسۆی لێڵ و نادیاری چارەنووس و سیمای خوێناویی چەکدارە ڕیشنەکان بڕیوە. چەکدارە ڕیشنەکان: بزێون، زمانشیرین و خۆشگوفتارن، کەچی لە ترپەی پۆستاڵەکانیاندا، قرچەی جەرگی ژنە ڕەشپۆشەکانی مهاباد و لە سیمای نوورانییاندا، زووڕەی کچێنیی ئەتککراوی کیژۆڵە هەڵواسراوەکانی (سنەی خوێناوی) دەبیستین!

کەژاوەی پەیامبەرە چنگسوورەکان لە چوار لاوە، پەیتا پەیتا لە شار وەردەبن و خەڵکی شاریش، نە چەپکەگوڵی سەرکەوتنیان پێشکەش دەکەن و نە بەردەبارانیشیان دەکەن!

زاری بڵنگۆکان، شیلەی جاڕی سەرفرازی دەبەشنەوە، کەچی پووڕەهەنگی جەماوەر لێیان دەپرینگێنەوە و ناپووڕەیان لێ نادەن!.

تۆ، سەدان پرس لە چاوانی بزۆزی شاردا دەخوێنییەوە و تەمی گومان لە ڕووی هەمواندا دەبینی! گومان لە چی؟ لە هیچ و لە هەموو شتێک! کێ دەزانێ ئەم دەڤەرە ژانی چ کارەساتێک گرتوویەتی و زریانی چ وەیشوومەیەک و بارانی چ هەنگامەیەک خۆیان مەلآس داوە؟!

کێ دەزانێ، درەختی ئەم سەرکەوتنە، گوڵی ژاڵە یان دڕکەزی یان گوژاڵکی پێوەیە؟! کەس نەیدەزانی لە فەرهەنگی جەنگە دەفرەتییەکاندا، وشەی ((سەرکەوتن)) سڕاوەتەوە و هەموو جەنگاوەرەکان هەر دۆڕاون! ئێمە چۆنمان زانیبا کە ((مرۆڤ تەنیا خۆی ڕزگارکەری خۆیەتی و چ کەسێکی دی لەبری ئەو، ناتوانێت پەیکەری ئازادیی بۆ ڕۆ بنێت!))

ئێمە هەموومان بێئاگا بووین، تا کرۆنۆلۆژیای ڕووداوەکان، بۆ خۆیان هاتنە زمان:

١٦ی ئازاری١٩٨٨، سێ ڕۆژ پێش ئەم مێژووە، ئاگری شەڕ هەڵایسا. هێزە دژەکان لە گژ یەکدی ڕاچوون و هەڵەبجە سەحرای کەربەلا! لە ماوەی دوو ڕۆژاندا. خەیبەری هەڵەبجە داگیر کرا. بەرئەنجامی سەرکەوتنی داگیرکارێک و شکستی ئەوی دیکە، بۆ ئێمە هەرەسێکی گەورەتر و مەرگێکی بەکۆمەڵ و خەمێکی بەخەمتر بوو..

_ هەر ئەمڕۆکە، کاتژمێری ١١،٢٥ دەقیقە، پۆلەبالآشی تەکنەلۆژیای هاوچەرخ، ئاسمانی شاریان داگیر کرد و لەسەر تەختی خوای ستەم ڕۆنیشتن. تەرزەی بۆمبا بستبەبستی کۆچە و کۆلآنی شاری کێلآ.. زوو بن! فریاکەون! بەرەو ژێرخان و پەناگا، هەمان لەنگێزە شوومەکەی چوارەد ساڵی لەمەوپێشە و مێژوو دووپات دەبێتەوە!

لە کونی حەشارگەکانەوە چاومان لێیە، چۆن ئەهریمەنی شەڕ، خۆی دەکوتێتە ماڵبەماڵی (کانییەقوڵکە) و باکووری شار!

_ کاتژمێر دوو و چارەکی پاش نیوەڕۆ، ئاسمانی شار، ڕەشە وەکو سیمای ڕەشی فاشیستەکان، وەک عەمامەی ئاخوندەکان، وەک ئەقڵییەتی سیاسیی خۆمان! پۆلی سەرگەڕ، گڕدەخۆن و خوێنیان دەوێ، بۆ (جوولەکان)، (پیرموحەمەد)، بەرەو ماڵی (وەسمان پاشا) و (باخی میر) و (کانیناشقان). هەر ناڵەیە و ڕەگی خانوو لە بن دێنێ، هەر گرمەیە و ئێسک و خوێن و ناخی خاک و شکۆفەی هێشتا نەکراوەی درەختەکان هەڵدەشێلێ!

_ کاتژمێر دوو و نیوی پاش نیوەڕۆ، پۆلەبالآشی دڵناسنین، هەر لەپەسا دەقریشکێنن، هەوری بۆمبا بلآچەی دێ و دەنگی نییە.. بۆنی سیر دێ! ئەم جاچکە مەزەی مەرگە!

بێپەروا لەسەر مێزی بادەی مەرگێکی پڕ گەڵتەجاڕی دانیشتووین.. ژێرخان و حەشارگەکان، سێخناخن لە مرۆڤە بە مەرگ حوکمدراوەکان.. ئەو مرۆڤانەی نە لە مەرگ دەگەن و نە لە ژیان، ئەو مرۆڤانەی نە ترسنۆکن و نە جوامێر و جەربەزەشن، ئەوان لە نێو تەمێکی سپیدا، بێگوناهانە سەما دەکەن.. سەمایەکی ئەبەدی، سەمایەکی پڕ لەقاقا!

لەگەڵ هەڵکشانی تەمەنی زەمەندا، گەوەی ئەم تەمە ئەگریسە؛ چڕتر، تەنگتر، شێتانەتر بەژنی زراف و هەڵچووی شار دەگوشێت و بە ئەنگلۆرەی ئەرخەوانیی ئەم ئێوارەیەی دەسپێرێت.

جۆلانەی شەو جەستەی شەقام ڕادەژێنێ.. شەقام شانی لەژێر قورسایی تەرمە پیرۆزەکاندا داوە و دەست بۆ پەلی مێرگ و دۆلآن ڕادەدات.. دیوەخانی سینەی مێرگ و گوڵجاڕانیش، وا جمەی دێ و هانا بۆ تریفەی مانگ و سۆزی چیا و فرمێسکی ئەستێران دەبا!

مانگ: چەپکێ تریفەی، شاخ: سۆز و عاتیفەی، ئەستێرە: کانیلەی چاوانی، دەکەنە کەژاوەی کۆتەڵی ئەم کۆستە و دەیدەنە دەست «سیروان».

لەوساوە و تا ئێستا و تا وشە شاباڵی فڕینی بمێنێ، هەڵەبجە شەپۆلی زامداری سیروانە و بەهاران، ئامبازی ترۆپکی (باڵانبۆ) دەبێت و لەوێڕا ئەورۆزێ پێ دەکا و بڵێسەی ناخیشی سترانێ دەچڕێنێ..

## هەڵەبجە وا دەڵێ:

من پۆلەزامێکی زیوینم، تریفەی مانگێکی ساردوسڕ لە خۆیی پێچام و
پێکەوە مەداری مەرگمان جێ هێشت و هەڵفڕین!
فرسەخێ ڕێگامان بڕیبوو،
با هات و جڵەوی ئەسپەکەی لێ گرتین!
دوو فرسەخ ڕێگامان بڕیبوو،
خۆر هات و چاوی خۆی پێ بەخشین!
سێ فرسەخ ڕێگامان بڕیبوو،
شەپۆلە سەوزەکان لە کۆڵیان کردین و
سترانی ژیانیان بۆ چڕین..زەریاکان، دواوێستگەی سەفەری ئێمە بوون،
لەوساوە بێهودە دێین، دەچین
بەستێنێ دەستی خۆی ناخاتە نێو دەستی هیوامان،
ئەوینێ پشکۆی خۆی نانێتە نێو کوانووی ئەوینمان
وا ئێمە سنووری مەرگمان بەزاند و
کەژاوەی ئەم گەشتەش، نەگەیشتە دوورگەی ژین!
ئەم دەنگە، چریکەی گۆپیتەی لقێک بوو، ئەمێستا قەدی خۆی
جێ هێشتووە و لەنێوان زەوین و ئاسماندا
چەترێکی پەمەیی هەڵداوە!
ئەم تیشکە، چریسکەی چلچرای ڕۆحێکی ماندوو بوو
ئێستاکە لە بەندی جەستەی خۆی ڕەهایە و
لە سۆمای زەمەندا دەسووتێ و تەنیایە!
ئەم دەنگە:
زایەڵەی تاساوی زەنگێکی لە ژەهرگیراوی مەرگێک بوو
لە دووندی (باڵآنبۆ) سەر نەکەوت،
ترۆپکی (شنروێ)ی ماچ نەکرد،
دەستێکی نەخستە سەر شانی (سوورێن) و
نەیتوانی پێنج هەزار وەنەوشە بە دیاری بۆ باخچەی خوا ببات!
ئەم دەنگە:

ڕەنگینە بە ڕەنگێ

نە ئەوسا کەسێک و نە ئێستاش هیچ کەسێک

دەتوانێ وەکو خۆی ببینێ..

بە ڕەنگێ:

خوێن نییە

خوم نییە

نە زەردەی خۆراوا،

نە سیمای تریفە و نە ڕەنگی بەیانە..

ڕەنگێکە:

نە تارای تەماویی (باخی میر)

نە بازرەی تاڤگەکەی (ئەحماوا) و

نە چاوی گڕگرتووی سیروانە!

ئەم ڕەنگە:

نە خوێنی پەنجەکەی شکاوی (تایەربەگ)

نە تاپۆی بەئاستەم بینراوی (خاکوخۆڵ)

نە شێوەی پڕ سیحری گەشتەکەی (گۆران)ە!

ئەم دەنگە:

ڕەنگینە بە ڕەنگی هەڵەبجە و هەڵەبجە و هەڵەبجە!

ئێمە:

شاهێدی هەڵەبجە بووین،

قوربانییەکانی هەڵەبجە بووین،

شمشێری ژەهراویی جەللادەکانی هەڵەبجە بووین!

ئێمە:

کە پەیڤێکمان بۆ گوتن نەبێ،

چاوێکمان بۆ تێڕامان و هزرێکمان بۆ تێهزرین نەبێ،

دڵێکمان بۆ خۆشەویستی و

میحرابێکمان بۆ سووژدەی ئەشق نەبێ،

ئەقڵێکمان بۆ خوێندنەوەی ئەقڵ و

جورئەتێکمان بۆ دوواندنی مێژوو نەبێ،

جەستەی مێژوومان هەر دەبێ

مەزرای مەزاری هەڵەبجە بێ!

ئەی خودای من!

زۆر پێ دەچێ گوناهبار بم

هەر بۆیە تۆش:

لەبەر ڕەهێڵەی ژەهراویی جەللادانداا،

لە ژێر خەنجەری خوێناویی سەری خۆمدا،

وا بەتەنیا بەجێت هێشتم!

## گەیشتن بە زێوە، گەیشتن بە ناهومێدی!

ئۆتۆمبیلێکی «پەیکان» لە تەنگی «قاسلموو» تێدەپەڕێت و بە ڕێگایەکی چەوڕێژدا، ڕووەو گوندی «زێوە» بە پێنج موسافیرەوە، دەیناژووێت. لە ئوستانداریی ورمێ، فازیل، کوتەکاخەزێکی پێ دام و گوتی:
_ بەم بەرگەیە دەتوانیت بچیتە «زێوە» و بە برادەرەکانت شاد بیتەوە!
_ بەچی و چۆن بڕۆم؟
_ لە هەر شەرواڵەپێپیەک بپرسیت تێرمیناڵەکەت پیشان دەدات.
پاش دوو ساڵ و نیو، بە تەنها و بێ هیچ پاسەوان و وردیانێکی زیندان، لەسەر شەقامەکانی شاری ورمێ دەرۆیشتم، هەر دوو هەنگاو و ئاوڕێکم لە دوی خۆم دەدایەوە، چاوڕێی چەکدارێک بووم کە لە پشتمەوە ڕێ بکات و ئاراستەی ڕۆیشتنەکەم بە ئارەزووی خۆی بگۆڕێت! ئازاد بووم و لاقە ماندووەکانم بە ئازادیی، بەرەو تێرمیناڵێک هەڵیاندەگرتم کە بڕیار بوو بە هەواری ئازادیم بگەیەنێت. ئازادییەک کە ئیدی هیچ مانایەکی نەبوو!
کاک «سیروان» ئێمە لە دووڕێیانی «ڕاژان» دادەبەزین! پیاوێک کە لەگەڵ منداڵێکدا لە پێشەوە دانیشتبوون، وەهای بە شۆفێرەکە گوت.. کە تەرمەکەی «سیروان»یان لەژێر تەرمی کچە ماکسیپۆشەکەدا دەرهێنا و بە چواردەستە گەیاندیانە بەردەگا. ترس و ماندوویتی بڕستی لێ بڕیبوون.. یەکێک لە پێشمەرگەکان ڕۆیشت و پاش چەند خولەکێک بە «جێب»ێکەوە گەڕایەوە.. لاشەی خوێناویی سیروانیان لە جێبەکە نا و بە کۆڵانەکانی کانیناشقاندا، بەرەو گوندی «باوکۆچەک» ڕۆیشتن.. لە مزگەوتەکەدا، تەرمەکەیان دانا و هەواڵەکەیان بە عەشرەت و کەسوکاری سیروان گەیاند.. ساتێ ئەمان بە چەکی زامنترازاوی دەستیانەوە خۆیان بە ژووردا کرد، کچەکان جارێ سفرەی ناخواردنیان نەپێچابوویەوە.. دایکیان لە تەنیشت سەماوەرەکەوە چای تێدەکرد.. لەگەڵ یەکەم دەستڕێژدا، کچە گەورەکەیان تەکانی نەدا و خوێن لەسەر سفرەکە لرفەی کرد.. کچە ماکسیپۆشەکەیان، بۆ ڕزگارکردنی گیانی خۆی، ئامبازی باڵای سیروان بوو.. سیروان هەرچییەکی کۆشا، نەیتوانی لە خۆیی دوور بخاتەوە.. هاوڕێکەی سیروان، پەنجەی بەر ماشەی چەکەکەی کەوت و ڕێژنەگوللەیەک باڵای هەردووکیانی بێژا و خوێنیانی ئامێتە کردا کێ فەرمانی ئەنجامدانی ئەم چالاکییەی بەم مەفرەزەیە دابوو؟ نازانم! چالاکیی تیرۆرکردنی دوو کچ کە گومانی ئەوەیان لێ کرابێت، کاری لەشفرۆشییان کردبێت و سێکسیان بە پیاوانی ڕژێم فرۆشتبێت! لە شۆڕشدا، مرۆڤەکان وا بە ئاسانی ژیانیان لێ دەسێندرێتەوە!

_ کاکە، ئێرە «زێوە«یە. فەرموو دابەزە!
لە جادە خاکییەکەوە، بەرەو دوو ڕیز خانووی پەرپووتی لە خشت دروستکراوی بە جەمالۆن سەرداپۆشراو ڕۆیشتم.. وێنەی خانووەکان، بۆ ژیانی دوو سەدە پێشتریان گێڕامەوە، ئاخر ڕێک بەو کوختانە دەچوون کە «ئەلێکس هالی» لە ڕۆمانی «ڕەگەکان»دا، وەکو ماڵی کۆیلە ڕەشپێستە فرێنراوەکان، وێنەی گرتوون!
حەمەئاوات، سەلاح، ئەحمەد. ڕووناکی شێخ جەناب، حەیدەر، ئازادچاوشین، گۆران، شێرکۆ و هەموو برادەرەکانی دیکە هاتن و دەورەیان لێ دام، بەخێریان هێنام و پاش پشوویەکی کەم، لە ژوورە چکۆلەکەی «ڕووناک»دا نانی ئێوارەمان خوارد و بە درێژایی شەوەکە، من چیرۆکی خۆمم بۆ گێڕانەوە و ئەوانیش چیرۆککگەلێکی خۆیان و ژیانی زێوەیان باس کردن. من، بە جەستەیەکی دازاو و ڕۆحێکی ماندووەوە قسەم دەکرد و ئەوانیش لە کرۆکی کێشە و ململانێکانی خۆیاندا، لە دۆخی سەخت و دژواری گوزەرانی زێوەدا، تۆسقاڵێکیش لە ئازاری چیرۆکەکانی من نەدەگەیشتن، منیش بە دەروونی شێواوی خۆمەوە، نەمدەتوانی گرفتە سیاسی و ڕێکخراوەییەکانی ئەوان وێنا بکەم..
ڕۆژی پاشتر، مامۆستا عادل و دکتۆرقادر لە ورمێوە هاتنە دیدارم. م.عادل کادرێکی دێرینی کۆمەڵە و لە کادرە هەرە چالاکەکانی دامەزراندنی ڕێکخستنەکانی «ئاڵا» بوو لە نێو شاردا. من پێشتر «عادل»م نەدیتبوو بەڵام دەمزانی کە لە شاردا، کەسێکی جوامێر و بەهیمەت بووە. ئێوارەی ئەو ڕۆژە، نانمان لە ماڵی عیماد ئەحمەد خوارد و لەوێش لە ئەنجامی قسەوباسەکاندا، تێگەیشتم کە ناکۆکی و پێکەوەنەسازانی کەسەکان، ململانێی دەسەڵات لە ڕێکخراوێکی بچووکدا کە هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو، بێئەزموونیی لە سیاسەت و دەستتێوەردانی حیزب و ڕێکخراوی دەرەکی، تەلاری ڕێکخراوەکەیان شەق کردووە و هەر لایەک بۆ خۆیی ڕادەکێشێ!
م. عادل خۆی بە ڕێبەری گرۆیەک دەزانی کە ئەنتی سۆڤییەت بوون و عیماد ئەحمەد و سالارعەزیزیش کە لە سوێد بوو، ڕێبەرایتیی گرۆی زۆرینە کە پێڕەوانی خەتی سۆڤییەت بوون. حەمەئاوات کە ئەندامی کۆمیتەی سەرپەرشتیی ئاڵا بوو، لەنێواندا وەستابوو، لایەنگری پارستنی قەوارەی ڕێکخراوەیی ئاڵای دەکرد و پەیوەندیی لەگەڵ هەردوو «بەرە»دا باش بوو. من، دەمویست لە کێشەکان بە دوور بم و ئەگەر بکرێ ڕۆڵێک بگێڕم کە یەکێتیی ڕێکخراوەکە بپارێزێ. بەڵام پاش ئەوەی شێخەڵی گەیشتە زێوێ و کۆبوونەوەییەکمان لەگەڵ حەمەئاوات و عیماد ساز دا، تێگەیشتم کە ئێمە پێش ئازادبوون و گەیشتنیشمان بە زێوە، نەک هەر کراوین بە بەشێک لە کێشەکان، بگرە لایەنی عماد ئەحمەد و سالار عەزیز، ئێمەیان وەکو ئاڵای شۆڕش قەبووڵ نییە و لە هەموو هاوکێشەیەکیان دەرکردووین!
لە کۆبوونەوەکەدا، بڕیارمان دا چەند بکرێ کێشەکان سڕ بکەین، هیچ کۆبوونەوە یان پلینۆمێک

نەبەسترێت کە ببێتە هۆی دووکەرتبوون و لێکترازان، حەمەئاوات بە نهێنی بچێتە شار و لەگەڵ ڕێکخستنەکانی شار، کارەکانی خۆئامادەکردن بۆ پلینۆم ساز بدات.
حەمەئاوات سەفەری کرد و لەبەر سەختیی دۆخی ڕۆژگاری ئەنفال، نزیکەی ٣مانگی پێچوو!
برادەرەکانی ئاڵای شۆڕش، لە بودجەیەک کە هەیانبوو ١٠٠٠تومانیان بە من دا تا دەستێک جل و هەندەک پێویستیی پێ بکڕم! هاوڕێ حەیدەر لەگەڵم هاتە ورمێ و کارەکانی جێبەجێ کردن. شەو، لای شێرکۆخانەقینی ماینەوە کە ژوورێکی لە ورمێ بە کرێ گرتبوو. ڕۆژانی پاشتر سەردانی ماڵی دکتۆرقادر و م.عادلم کرد و گێڕانەوەکانی ئەوانیش لەمەڕ دوو ساڵ و نیوی ژیانی زێوە، کۆبوونەوەکان، ململانێکان و شەڕەتێڵای نێوان کەس و گرووە نەیارەکان، قسەوقسەڵۆک و ڕک و کینەی هەندەک لە کادرەکان لەسەر ئێمەی زیندانی و پاکانەنووس، تەواو ناهومێدیان کردم.
فوادی مەجیدمیسری، لە «شنۆ»وە هاتە زێوێ و شەوێک لامان مایەوە. من، فوادم وەکو ڕەخنەگر، وەرگێڕ، شانۆنووس و تێکۆشەرێکی چەپ دەناسی بەڵام تا ئەوکات ڕووبەڕوو نەمدیتبوو. لە یەکەم بینیندا، فوادم خۆش ویست. فواد، داوەتی کردم بۆ شنۆ و چەندجارێک سەردانم کرد!

## سەفەرێک بۆ
## نێو دنیای ئازاری هەڵەبجەییەکان

شێخەڵی و من، بە جەستەی ناتەندرووست و ڕۆحی ماندوومانەوە، بۆ بینینەوەی خزم و کەس و هاوشارییە شاربەدەرکراوەکانمان، بەرەو ئۆردووگاکانی هەڵەبجەییەکان سەفەرمان کرد.
لە ئۆردووگای کامیارانەوە دەستمان پێ کرد و لە جوانرۆ کۆتاییمان پێ هێنا. لە هەر ئۆردووگایەکدا دەیان خیزانی خزم و ناسراومان بە سەر کردەوە، گوێمان بۆ چیرۆکە خوێناوییەکانیان گرت، ئەو چیرۆکانەی لێکچوونیان نەبوو، هەر کەس و حیکایەتی مەینەتییەکانی خۆی هەبوو. ئەوان بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانیان، ناخی خۆیان خاڵی دەکردەوە و هەستیان بە جۆرێک لە ئاسوودەیی دەکرد، کەسانێک هەبوون بێدەنگ و وڕ و کاس، لەبەردەم گەورەیی خەمەکانیاندا، هیچ وشەیەکیان جگە لە بێدەنگی، بۆ دەربڕین نەبوو! پیاوێک کە ٧منداڵ و هاوسەرەکەی بە دەستی خۆی لە خاک نابێ، هیچ پەیڤێکی بۆ گوتن نییە! ژنێک، پاش لەدەستدانی بینایی خۆی، منداڵەکەی لێ ون دەبێ و هەرگیز نایبینێتەوە، چ چیرۆکێک بگێڕێتەوە؟
لە ئۆردووگای «کەنگاوەر»ی نزیک کرماشان، کۆڵانەوکۆڵان، بە نێو چادرەکاندا دەڕۆم لە ماڵی خۆمان پرسیار دەکەم، لە کۆڵانێکدا، ژنێک دەبینم بە گاڵۆڵکی بەرەو چادرێک دەڕوات.. دایکم! وەکو منداڵی پێڕۆکەنەبوو، لەسەر دەست و قاچان ڕێ دەکات! پەلاماری دەدەم و لە ئامێزی دەگرم. وای دایکەگیان! هەڵیدەگرمەوە و دەیبەمە نێو چادرەکە.. کاکم، براژنم، خێڵان، بەرزان، ئەردەڵان و کچێکی تازەپێڕۆکەبوو کە من پێشتر نەمدیوە و ناوی «باخان»ە! پاش ساڵانێک دابڕان، لەژێر چادری ئاوارەییدا، پێک شاد دەبینەوە! قوڕگم لە گریان تژییە و خۆم پێ ناگیرێ.. نازانم بۆ ڕۆحی کڵۆڵی خۆم دەگریێم یان بۆ مەینەتییەکانی ئەوان.. دایکم، بە درێژایی ئەو ڕۆژانە، لێی دەڕوانیم و پرسیارێکی لێ نەدەکردم، ئەو بە هەستی دایکانەی خۆی، هەموو برینەکانی ڕۆحی منی دەبینین و بە خوڕ فرمێسکی بۆ دەڕشتم! ڕۆژانی پاشتر، دادە سوعادی خوشکم، چنور و ڕزگاری خوشکەزام دەبینمەوە، ئەو خۆشەویستانەی کە پێشتر لە نازونیعمەت و ماڵی گەرم و ئاوەدانی خۆیاندا، لە هەڵەبجە بینیبوومن، ئێستا لەژێر چادری سارد و پەڕپووتدا، لە چاوانی بێهیوایان دەڕوانم! ڕووخساری بێڕەنگ و لێوانی زەرد و بێبزەیان، حیکایەتی مەرگەساتی شارێک و وڵاتێک دەگێڕنەوە!
ماڵی کاکم بێحاڵ و گیرفانبەتاڵ بوون و حاڵی منیش لە هیی ئەوان شڕتر، ئەوەی کە کارێکم لە دەست نەدەهات، خەمێک بوو لە ناخەوە دەیخواردم! کاکم دڵی منی دەدایەوە و دەیگوت، هێندەمان کەلوپەل بۆ دەربازکراوە، کە دەیانفرۆشین و ژیانیان پێ دەگوزەرێنین!

خەڵکی هەڵەبجە، لە ناخەوە زامدار بوون، لێوانلێوبوون لە تووڕەیی و سیخناخ بوون لە ناهومێدی.. ئەو شارەی کە مەکۆی شۆڕش و ڕاپەڕین بوو، ئێستا لە گۆڕستانی شۆڕشدا نێژرابوو! خواست و چاوەڕوانییەکانی خەڵکی ئەو شارە لە مژدەکانی شۆڕش، هەمووی پووچ دەرچوو! ئەوان تووڕە بوون لە بەعس، لە جەنگ، لە شۆڕش و لە لێپرسراوانێکی ویژدانمردوو کە شارێکی مردوویان تاڵان کردبوو.. چیرۆکەکانی دزی و تاڵانکاری بێکۆتایی بوون!

کەسانێکی زۆر دەهاتن و لەمەڕ ئەگەری لێبووردنی بەعس و گەڕانەوە بۆ ئێراق پرسیاریان لێ دەکردم. من دەمگوت: ئەگەر دڵنیا بن بەعس ئەنفالتان ناکات و بە زیندوویی دەمێنن، بگەڕێنەوە، ژیان لە ماڵوحاڵی خۆتاندا و لە بندەستی بەعسدا، زۆر لە ژیانی ئۆردووگاکانی ئێران باشترە! مرۆڤ کە خاکی دۆڕاند، ئیدی هەموو شتێک لە دەست دەدات!

# نیسان زێوە!

لە شاری «سەقز»، شێخعەلی بۆ تاران سەفەری کرد و منیش بۆ «زێوە» گەڕامەوە.
لە زێوە، دوو بەرەی دژ بەیەک لەژێر دوو ڕیز جەمالۆندا، شیروتیریان لێک دەسووی!
بەرەی زۆرینە بە ڕێبەرایێتیی عیمادئەحمەد، کۆبوونەوەیەکی فراوانیان بەست، بەرەی ئەنتی سۆڤییەت بەشدارییان نەکرد و منیشیان بۆ کۆبوونەوە فراوانەکە بانگهێشت نەکرد! ئیدی من بە ناچاری و بێ خواستی خۆم، چوون بەرەی کەمینە کادرانێک بوون وەهایان نیشان دەدا کە پێڕەوانی «پرۆژەی ئاڵای شۆڕش»ن و ئەو پرۆژەیەش، ئێمە پێش زیندانیکردنمان دامانڕشتبوو و سەرخەتە گشتییەکانیمان دیاری کردبوون، لە ماڵی ئەم بەرەیەدا وەکو پەناهەندەیەک مامەوە!
ئاڵا، بە کردەوە کرا بە دوو کەرتەوە و هەندەک بەیان و بڵاوکراوەشیان دژ بەیەکدی نووسین و پریشکی ئەم شەڕەکاخەزە منیشی گرتەوە.. ئێوارەیەک بەرەی ئەوبەر، نووسخەیەک لەو پاکانەیەی کە کۆمەڵە لەژێر حوکمی ئیعدامدا بە ئێمەی نووسیبوو، خستبووە نێو ژوورەکەم! ئیدی تێگەیشتم کە سیاسەتی کوردی و ململانێکانی، هیچ پرەنسیپێکی مۆراڵی سیاسەتیان تێدا نییە و ئەقڵییەت و مۆراڵی هەموو «براکان» لە بازنەیەکدا دەخولێنەوە! قسەکانی ئازادهەورامیم وە بیر هاتنەوە کە لە ساڵی ١٩٨٥دا و لەژێر چادرەکەی خۆیدا پێمی گوتن(کاک پشکۆ، جیابوونەوە خەتەرە، بەم کەرەسەیەی لە کۆمەڵەدا هەیە، لە کۆمەڵە باشتری پێ درووست ناکرێت...) من، ئەوساتیش بۆچوونەکانی ئازادم قەبووڵ بوون و هەرگیز بەو ئاڕاستەیەدا کارم نەدەکرد کە کێشەکان بەرەو هەواری دەستلێکبەردان سەر بکێشن، بەڵام ئیدی وەها کەوتەوە!
لەو سەروبەندەدا، نامەیەکم لە سالارعەزیزەوە، لە وڵاتی سوێدەوە پێ گەیشت. نامەکە، لە کوتەکاخەزێکی چکۆلەدا نووسرابوو، تەنها چەند دێڕێک بوو کە خۆشحاڵیی خۆی بە ڕزگاربوونی من دەربڕیبوو، هیوای پشوودان و حەوانەوەی بۆ خواستبووم، باسێکی لە «ئاڵا» و سیاسەت نەکردبوو، ڕێک وەک ئەوە وەهابوو کە من لەسەر مەسەلەی «قەتڵ»، دوو ساڵ و نیو ئەو هەموو ئازارەی زیندانم چێژتبێت!
من، چەند مانگێک پاشتر ئاگاداربووم کە لە ساڵی ١٩٨٧دا، لە وڵاتی سوێد، کۆنفرەنسی ڕێکخستنەکانی دەرەوەی «ئاڵا» بەستراوە و لەوێدا، سالارعەزیز و بەشێک لە هاوڕێکانمان، جەختیان لەسەر ئەوە کردووە کە بەیانێک لەسەر ئێمە بنووسن و لە «ئاڵای شۆڕش»مان دەر بکەن! هەندێک لە هاوڕێ بەوەفاکانمان، دژیان وەستاونەتەوە و ڕێگرییان لێ کردوون! چ مۆراڵێکی سیاسی و چ کەمفرسەتییەکە ئەمە؟ ئێمە سێ کەس، هاوڕێ و هاوخەباتی چەندساڵەی ئەوان، جارێ چارەنووسمان دیار نییە و لە

زینداندابین، لەژێر شمشێری ئەنفال و ژەهرباین. کەچی ئەوان چاوەڕێ ناکەن و بۆ ئیعدامکردنی سیاسیمان پەلەیانە!

نامەیەکی دارای شێخ موحەمەد لە لەندەنەوە گەیشت. نامەیەکی پڕ لە سۆز و هاوخەمی و دڵدانەوە، نامەیەکی بە شیعر سیخناخ و ڕازاوە کە ۲۰۰ دۆلاریشی لەگەڵدا بوو. ئەو چەردەپارەیە، بۆ من ئێجگار زۆر بوو!

م. جەعفەریش بە هەموو سۆز و خۆشەویستیی خۆیەوە، نامەبارانی کردم و لە ئازارە ڕۆحیەکانی کەم کردمەوە!

حاکم سەرداری هاوڕێی دێرین و خەباتی سەختی شارەزوور، چەندین نامەی بۆ ناردم و هەمیشە جەختی دەکردەوە، ئەگەر من بڕیاری چوونە ئەورووپا بدەم، تێچووی سەفەرەکەم لە ئەستۆی خۆی دەنێت. ئەو دەنووسیبووی: ئەو دۆزەخە جێ بهێڵە و سیاسەت بۆ سیاسەتکارانێ کە هەر خۆیان دەزانن چۆن سیاسەت دەکەن واز لێ بهێنە! تۆ ماندوویت و ڕۆحبریندار، لە بیری چارەسەرکردنی زامەکانی ڕۆحی خۆتدا بە!

کە پارچەبوونی «ئاڵا» بە کردەوە ڕووی دا، پارتیی دیموکراتیی کوردستان، کەو ئەو ساڵانە، جۆریک کۆمەکی بە برادەرەکانی ئاڵا کردبوو، بارەگای سەرەکیی لە گوندی «ڕاژان» بوو. ئێمە نامەیەکمان بۆ «م.س»ی پارتی نووسی و داوامان لێ کردن پەیوەندییەکە لەگەڵ هەردوو لادا بپارێزن و کۆمەکەکە دابەش بکەن، بۆ دیداریش پاشتر فرەنسۆهەریری هات و کۆبوونەوەیکمان لەگەڵ سازدا. ئەو، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە پارتی، دەست لە گرفت و کێشەی «ئاڵا» وەر نادات و کۆمەکی هەر دوو بەرە دەکات!

زێوە، بۆ من زیندانێکی کراوە بوو. پێویستم بە شوێن و جێگایەکی هێمنی دوور لە سەرئێشەی ناو «ئاڵا» هەبوو. من هەمیشە پێویستم بە تەنهایی بوو. لەززەتم لە بیرکردنەوە و تێرامانەکانی خۆم وەر دەگرت. لە زێوەدا، کەسێک لە ئازارەکانی ناخی من نەدەگەیشت و برادەرەکان چاوەڕێ بوون کە من بە گوڕ و تینی ئەوانەوە، ئەو ململانێیانە بە ڕێوە ببەم کە بڕوام پێیان نەمابوو. شاری شنۆ و قەلەندەرخانەکەی فوادی مەجید میسری، نزیکەی مانگێک داڵدەیان دام. لای فواد کەمێک پشووم دا و حەسامەوە، بەشێکی ئەو شیعرانەی لە زریانەکەدا ڕەق هەڵاتن و لە گەرووی ئەنفالدا نوقم بوون، نووسیمنەوە و پاشتر بوون بە کۆشیعری «ژارک».

هەنگاوە ناگرینەکانی ئەنفال جارێ لە پێ نەکەوتبوون.. هەواڵە جەرگبڕەکان دەگەیشتن و لە ناخەوە دەیانتەزاندم.. هەواڵی شەهیدبوونی ئازاد هەورامی لە دواقۆناخەکانی ئەنفالدا، بۆ من دڵتەزێن بوو.

من، ساڵانی پاشتر و بە پەخشان، شیوەنم بۆ مەرگی ئازادەورامی گێڕا.
هەر ئەو هاوینە، هەواڵی شەهیدکردنی «ئازادی فەقێ عەلی» و هاوڕێکانی لە قەرەداغ گەیشت. ئازاد و مەفرەزەکەی، لە ڕۆژگاری ئەنفال و شکستدا، قەرەداخیان جێ نەهێشتبوو، لە «قۆپییەکان»دا مابوونەوە و لە هەوڵی درێژەدانی خەباتی دژەئەنفال و هاوکاریکردن بوون لەگەڵ مەفرەزە پەرتەوازەکانی یەکێتی.
پاش چەندین ساڵ، بەهادین نووری بۆی گێڕامەوە و گوتی: ( بەڵێ.. ئازاد و هاوڕێکانیم لە قۆپی دیتن و داوایان لێ کردم تا بۆ مەسەلەی ئاشتبوونەوەیان لەگەڵ مەفرەزەکانی یەکێتیدا هەوڵێک بدەم.. لەو دۆخە دژوارەدا کە هەموو کوردستان دەسووتا، دەمویست کارێکی وەها بکەم، بەڵام «مەحمودی مامەعەزە» کە لێپرسراوی مەفرەزەکەی یەکێتی بوو، نەدەهاتە ژێر بار و لە ترسی سەرکردایەتیی خۆی، نەیدەوێرا هاوکارییان بکات و لەگەڵیان ئاشت بێتەوە!) ئازاد و هاوڕێکانی، لە ئەشکەوتێکدا، دەستێک یاخود دەستانێکی نادیار، فرسەتیان لێ هێنابوون و شەهیدیان کردبوون!
ئیعدامکردنی سالاری حاجی دەروێش، لە لایەن سەرکردایەتیی کۆمەڵەوە، هەواڵێک بوو وێنام نەدەکرد! سالار، کادرێکی چالاک و هاوڕێیەکی جوامێر و پیاوێکی بەهیمەت بوو کە پاشی کارەساتی هەڵەبجە، هەواڵی ئیعدامکردنی گەیشت! سالار چیی کردبوو؟ تاوانی چیبوو؟ نازانم.. ئێستاش، پاش چەندین ساڵان، بەڵگەیەک نییە تاوانی ئەو پیاوە بەناهەق ئیعدامکراوە بسەلمێنێت!
شۆڕش لە شکستدا، سەرگەرمی خواردنی منداڵە بزێوەکانی خۆی بوو!
دەبێت حەقیقەتێک بۆ مێژووی خوێناویی شەڕی براکان بنووسمەوە و بڵێم: یەکێک لە سەروەرییەکانی ئاڵای شۆڕش، پێیەستبوونی «ئاڵا» بوو بە پرەنسیپێکی سیاسی و درووشمێک کە هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە، لە بەرنامەی سیاسیی خۆیدا چەسپاندبووی و کاری بۆ دەکرد، ئەویش دژایەتییکردنی شەڕی نێوخۆ و هەوڵدان بۆ ئاشتەوایی و یەکڕیزیی بزووتنەوە چەکدارییەکەی کوردستان بوو. بە درێژایی ئەو ساڵانە، وێڕای تەنگپێهەڵچنین، ڕەدونان و شەهیدکردنی چەند پێشمەرگەی «ئاڵا» بە دەستی مەفرەزەکانی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان، لە ناوچەی هەولێر و شوێنەکانی دیکەدا، خوێنی یەک پێشمەرگەش بە دەستی مەفەرزەکانی «ئاڵا» نەڕژێنرا و هەرگیز لە هەوڵی تۆڵەسەندنەوە و قووڵکردنەوەی زامەکاندا نەبوون. کەم هێزی سیاسیی کورد هەبووە، هەر چەندیش بچووک و کەمهێزیش بووبێت، سەرکردەکانی زیندانی کرابن، پێشمەرگەی بە ناهەق لێ شەهید کرابێت، هەموو کوردستانی لێ پاوان کرابێت، لە شاخ و لە شاردا، دژایەتیی کرابێت و هێندە تۆلیرانسی هەبووبێت، بە ناخێکی بێ کینە و ڕکەوە کاری کردبێت و هەڵسووڕابێت!
هیچ هێزێکی سیاسیی کورد، وەکو «ئاڵا» و لێپرسراوەکانی، نەیتوانیوە لە فەزای ململانێکان و لە گەرمەی جەنگی ئێراق-ئێراندا، دەست بە بنەما فیکری و سیاسی و ئەخلاقییەکانی خۆیەوە بگرێت

و بۆ بەرژەوەندی و بەهێزکردنی خۆی، مۆراڵی فیکر و سیاسەت ئەتۆرێنێت و لە بازنەی جەنگەکە نەکەوێت، مەرجەکانی ئیتلاعاتی ئێران جێبەجێ نەکات و نەکەوێتە بازنەی سیاسەتی ئێرانەوە. ئەگەر لە کۆمیتەی سەرپەرشتیی «ئاڵا»دا کەسانێک هەبووبن کە ویستبێتیان بازنە فیکری و سیاسی و ئەخلاقییەکان ببەزێنن و لاسایی هێزەکانی دیکە بکەنەوە، ئەوا خۆشبەختانە، زۆرینەی ئەندامانی لیژنەی سەرپەرشتیی «ئاڵا» و کادرەکانی، ئەو سیاسەتەیان پێ قووت نەچووە و جێبەجێیان نەکردووە! ئەمە، دەشێ سەروەرییەکی دیکە بێت، کە کادرانی «ئاڵا» شانازیی پێوە بکەن!

بازنەی پەیوەندییە سیاسییەکانی «ئاڵا» لەگەڵ هێزەکانی کوردستانی ئێراقدا، پارتیی دیموکراتیی کوردستان لە پلەی یەکەمدا و حیزبی شیوعیی ئێراق لە پلەی دووەمدا بوو. پارتیی، جگە لە کۆمەکی لۆجیستیکی، لە سەرەتادا، کاتژمێرێکی لە وێستگەی رادیۆکەی خۆی بە «ئاڵا» دابوو. حیزبی شیوعیی ئێراق، لەگەڵ ئەوەی هاوکاریی «ئاڵا»یان دەکرد، دیسانیش وەکو پێشەی خۆیان، دەستیان تێ وەردەدا و گرفت و کێشەی فیکری و سیاسییان بۆ دەخولقاندن. ئاڵا، وەکو پرەنسیپی فیکریی خۆی، هاوکاریی کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێرانیشی دەکرد و دیشوکاری کادران و خێزانەکانیانی لە شارەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان، جێبەجێ دەکردن.

# تاران، هەوارێک بۆ هەڵفڕین

لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٩دا، پاشی کۆتاییهاتنی جەنگی ئێراق_ئێران، بە یەکجاری کوردستانم جێ هێشت و گەیشتمە تاران. شێخعەلی، چەند مانگێک بوو لە تاران و لە هۆتێلێکدا بە ناوی «چلنەستوون» دەژیا. ئەو لە ژوورەکەی وەریگرتم و ماوەیەک پێکەوەمان گوزەراند. لە تارانەوە پەیوەندگرتن لەگەڵ هاوڕێکانی ئەورووپا ئاسان بوو. دکتۆر هەژار مارف و مامۆستا جەعفەر، لە ئەڵمانیا دەژیان و گرنگییەکی زۆریان بە دۆخی من دەدا، هاوکارییەکی زۆریان دەکردم. ئەوان، بە نامە لە هەموو ئەو هەوڵانەی بە هاوکاریی برادەرەکانی دیکە بۆ ئازادکردنی ئێمە دابوویان، ئاگاداریان کردم. لە ساڵی ١٩٨٧دا، هەوڵەکانی ئەوان لە ڕێگای ڕێکخراوێکی ئەڵمانییەوە بە ناوی ڕێکخراوی هاوکاریکردنی گەلانی هەڕەشەلێکراو(Society for threatened peopls)
بە لووتکەی خۆی گەیشتبوو. سەرۆکی ئەو ڕێکخراوە، کێشەی ئێمەی بە (ڤیللی براند) و ڕێکخراوی سۆسیال دیموکراسیی نێودەوڵەتی گەیاندبوو. ڤیللی براند، مەسەلەکەی لەگەڵ مامجەلال لە ئەورووپا، ورووژاندبوو. مامجەلال بەڵێنی دابوو کە ئازادمان بکات، بە مەرجێ ئەڵمانیا یان وڵاتێکی دیکەی ئەورووپا، مافی پەنابەریمان بداتێ و ئێمە لە کوردستان و لە ئێران نەمێنینەوە و کاری سیاسی نەکەین.
لەسەر پێشنیازی د.هەژار و م.جەعفەر، چەند نامەم بۆ کاک (ئەلکساندەر شتێرن بێرگ) نووسی، سوپاسی هەوڵی ئەوانم کرد و دۆخی نوێی خۆمانم بۆ باس کرد.
وەرامەکانی ئەلکساندەر، بۆ من دڵخۆشکەر بوون، ئەمە ڕوونووسی وەرگێڕدراوی یەکێک لە نامەکانییەتی:
گۆیتنگن ٢١ی ئاپریلی ١٩٨٩
بەڕێز کاک زەینەدین ئەجمەدین مستەفا
سڵاو و ڕێز
نامەی بەڕێزتان کە لە ١٩٨٩/٤/٩دا نووسراوە، لە ١٧ی ئاپریلدا بە دەستم گەیشت.
ئەم گرفتەی جەنابتان بۆ ئێمە تازە نییە. ئێمە لە مانگی ١٠ی ساڵی ١٩٨٧وە، لەگەڵ مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی نشتمانیی کوردستاندا، لە هەوڵی ئازادکردنی ئێوەداین.
لە ١٩٨٧/١٢/٢٥دا، لە شاری بەرلین، لەگەڵ کاک جەلال تاڵەبانیدا دەربارەی ئازدکردنی ئێوە دواین. ئێمە، لە ڕۆژی ١٩٨٧/١٢/٣٠دا، مۆڵەتی سەفەری جەنابتان و دوو برادەرەکەتانمان لە وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانیای ڕۆژاوا وەرگرت. ئەم مۆڵەتە ڕەسمییەی سەفەری ئێوە، یەکێک بوو لە مەرجە

سەرەکییەکانی ئازادکردنتان کە کاک جەلال تاڵەبانی دایناوبوو. ئازادکردنی ئێوە، دەبوو لە مانگی مارسی ١٩٨٨دا، پاش گەڕانەوەی کاک جەلال تاڵەبانی ئەنجام بدرێت. چوونکە ئەو دەیویست بە شەخسی لەگەڵ سکرتێری کۆمەڵە بدوێت و ئیقناعی بکات، چوونکە سکرتێری کۆمەڵە لەگەڵ ئازادکردنی ئێوەدا نەبوو.

ئەو کاتەی کە من لە شاری «بۆن» لەگەڵ کاک جەلال تاڵەبانی بووم و گفتوگۆی نێوان تاڵەبانی و «ڤیلی برانت»م ڕێک دەخست، دەستەیەک لە چەند کەسانێک کە ناویان لە خۆیان نابوو دۆستی ئێوە، بە کاری هەڵەشانەی خۆیان، ئەم بەڵێنەی کاک جەلال تاڵەبانییان هەڵوەشاندەوە. لە ڕاستیدا، من هەستم بەوە کرد کە ئەوانەی ناوی خۆیان نابوو دۆستی ئێوە، مەبەستیان ڕزگارکردنی ئێوە نەبوو، بەڵکە تێکدانی گفتوگۆکانی جەلال تاڵەبانی بوو لەسەر حیسابی مەسەلەی ئێوە. ئەم هەڵوێستە، وای لە کاک جەلال تاڵەبانی کرد، پاش تێکچوونی گفتوگۆکانی، هەڕەشەی ئەوە بکات کە جارێکی تر و دووبارە، لەژێر سەرپەرشتیی کۆمیتەیەکی چاودێری ئینتەرناسیۆناڵی، موحاکەمەی ئێوە بکاتەوە، بەڵام ئێمە و ئەمینستی ئینتەرناسیۆناڵ، بڕیارمان دا کە بەشداری لە موحاکەمەیەکی وەهادا نەکەین، چوونکە ئێمە خۆمان لەو وەزعەدا نە دەدیت کە بتوانین بە شێوەیەکی مەوزوعیانە، لەو هەلومەرجەی ئەو کاتەدا، ڕاستیی ئەو لێکۆڵینەوەیە بزانین. ئەو ڕووداوانەی کە پاشتر و لە هاویندا ڕوویان دا، بەتایبەت پاش تەسلیمکردنی «یاخسەمەر»، هەموو جۆرە هەوڵێکی دیکەی کرد بە هیچ. مەکتەبی سیاسی، خەبەری پێ داین کە جەنابتان هەڵاتوون و شێخەڵیش ئازاد کراوە. ئەوەی کە بۆ من جارێ دیار نییە، مەسەلەی مەلابەختیارە و زۆر سوپاستان دەکەین کە بەسەرهاتی ئەومان بۆ ڕوون بکەنەوە، تاکو بزانین هەوڵی ڤیزە بۆ دوو یاخود سێ کەس بدەین. چوونکە ئەو ڤیزانەی ساڵی ١٩٨٧، هێزیان نەماوە و پێویستە هەموو هەوڵەکان سەرلەنوێ بدرێنەوە. لە ڕاستیشدا، وا هەوڵەکان دەدەین. تکایە جۆری کاخەزی سەفەرتان، شوێنی دەرچوون و ژمارە و ڕۆژەکەی بنووسن و پێمان بڵێن. ئەگەر خێزان و منداڵتان لەگەڵدا بوون، ناو و مێژووی لەدایکبوونیان بە وردی بنێرن. ئێمە لە لایەنی خۆمانەوە، لە وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانیای ڕۆژاوا، کۆمیسیۆنی پەنابەرانی سیاسیی سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکان، داوا دەکەین کە سەفەرتان بەرەو ئەڵمانیا یاخود وڵاتێکی ئەورووپی ئاسان بکەین و ڕێتان پێ بدەن لەسەر ئەساسی ئینسانی، مافی پەنابەری وەربگرن. لەم هەوڵ و تەقالایەماندا سەرکەوتوو دەبین یاخود نا، جارێ بە تەواوی نازانین.. بەڵام بە گشتی، هیوای سەرکەوتنمان هەیە، وایش دەزانین کە سەرکردایەتیی یەکێتیش، ئێستا گوێی خۆی لە مەسەلەکە کەڕ دەکات و هیچ تەگەرەیەک لەبەردەم دەرچوونی ئێوە دانانێت. تکایە بۆ پەیوەندگرتن، تەنها پەیوەندی لەگەڵ خۆماندا بکە، چوونکە ئێمە بە تەواوی لەوە دڵنیا نین کە دۆستەکانی ئێرەتان دۆستن یاخود..؟!!

ئەگەر بتانەوێت ڤیزەکانتان بە بێ گیروگرفت وەرگرین، تکایە با مەسەلەی دەرچوونتان نەبێتە مەوزوعی پروپاگەندەی سیاسی، تاوەکو بە سەلامەت دەربەچن.
هیواداریـن هەوڵ و تەقالاکانمان بە ڕاستی سەر بگرن و بە هیوای سەرکەوتنتان.
تێبینی:
١_ تکایە ئەگەر گیروگرفتتان لە نووسینی ئینگلیزیدا هەبوو، نامەکانت بە کوردیی سۆرانی بنووسە.
٢_ لە هەموو وەزعێکدا، من لە پاش ١٩٨٩/٥/١٥وە نامەیەکتان بۆ دەنووسم کە وردەی ڕووداوەکانی تیادا باس دەکەم.
دڵسۆزتان
ئەلکسەندەر
چەند نامە لە نێوان ئەلکسندەر و مندا هاتن و ڕۆیشتن، دکتۆر هەژار و م.جەعفەر ئەرکی گەیاندن و وەرگێڕانیان دەکێشان.
ئیدی سەروەختی چڕکردنەوەی هەوڵەکان بوو بۆ ئازادکردنی مەلابەختیار. لە ئەورووپا، جگە لە مامۆستا جەعفەر، دکتۆرهەژار، دکتۆر پۆلای خانەقا، شێخ دارا، حاجی ئومێد، شێخ باهیر، ئازادهەورامی لە فەرەنسا و هەموو هاوڕێکانمان، ئەوا ڕۆشنبیران و نووسەرانی کوردیش هەر چۆن بۆیان کرا و دەست و قەڵەمیان بە هەر کوێیەک گەیشتن، لە ڕێگای ڕێکخراوە سیاسی و خێرخوازە نێودەوڵەتییەکانەوە، فشاریان بۆ سەرکردایەتیی یەکێتی و سکرتێری کۆمەڵە هێنا. نووسەران و ڕۆشنبیرانی کورد، بە جیاوازیی بیر و ڕایانەوە، بۆ داکۆکیکردن لە ئازادی و ئازادکردنی مەلابەختیار، نامەیکیان ئاراستەی هەر دوو سکرتێری کومەڵە و یەکێتی کرد و داوایان کردبوو کە یەکێتی و کۆمەڵە، دەست لە پێشێلکردنی مافەکانی ئینسان هەڵبگرن و ئازادی بۆ مەلابەختیار بگێڕنەوە!
لەسەر پێشنیازی م.جەعفەر، من نامەیەکم بۆ بیرمەندی عەرەب «هادی عەلەوی» نووسی و بۆ ئەو ئادرێسەی کە ئەو پەیدای کردبوو، پۆستم کرد.
ڕۆشنبیری گەورە، هادی عەلەوی، پاش دوو هەفتە، وەرامێکی جوامێرانەی بۆ ناردمەوە.. ئەو نووسیبووی: (بە کێشەکەتان ئاشنام، بەڵام لێرە، لە شام، کادر و لێپرسراوەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، بە ناوەڕۆو مەسەلەکەیان لە من گەیاندبوو. ئەوان وەهایان باس دەکرد کە ئێوە کەسانێکی ئاژاوەگێڕ و تێکدەرن. ویستووتانە ڕیزەکانی بزووتنەوەکە بشێوێنن و شۆڕش لاواز بکەن..نامەکەی تۆ حەقیقەتی مەسەلەکەی لە لا ڕۆشن کردم.. من پەیمانت دەدەمێ، هەر ئێستا نامەیەک بۆ شەخسی تاڵەبانی بنووسم و دەسەڵاتی خۆم بۆ ئازادکردنی مەلابەختیاری هاوڕێت بەکار بێنم) بە داخەوە،

نامەکەی ئەو رۆشنبیرە گەورەیەی عەرەب کە لەسەر تاوانی خنکاندنی هەڵەبجە، بێبەرینامەی خۆی نووسی، لەگەڵ دەیان نامە و دەکۆمێنتی دیکەدا، لە نێوان ئێران و سوێددا فەوتان!

هەوڵ و تێکۆشانی هەموولایەک، لە زەوینەی رەق و کرێنی ئژەئازادیی کۆمەڵەدا بەری گرت و پاش ئەوەی مامجەلال، بەو قەناعەتە گەیشت کە لە زەمەنی شکست و داچوونی بزووتنەوە چەکدارییەکدا، ئیدی پاساوی زیندانیکردنی مەلابەختیار نەماوە و لە ئەوروپاوە تەنگیان پێ هەڵچنیون. مامجەلال، قەناعەتەکانی خۆی دەگشتێنێت و سکرتێر و سەرکردەکانی دیکەی کۆمەڵە رازی دەکات. مەلابەختیار، لە هاوینی ساڵی ١٩٨٩دا، ساڵێک و چەند مانگان پاش ئازادکردنی شێخعەلی و هەڵاتنی من. ئازاد کرا و هەر سێکمان پاژێکمان لە تەمەنی پڕ ئەشکەنجە و ئازاری زیندان پێچایەوە..تەمەنێک هەموو چارەنووسی منی گۆڕی و لە قووڵایی رۆحمدا و لە پانتایی دەروونمدا، برینگەلێکی هەڵکەندن، سارێژبوونیان ساڵانێکی زۆر و تراپییەکی دەروونیی ماوەدرێژیان گەرەک بوو!

ساتێ حەمەئاوات، بە دەربیسەرییەکی زۆرەوە و بە هاوکاریی برادەرانی کۆمەڵەی زەحمەتکێشان و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، پەرژینەکانی ئەنفالی بەزاندن و گەیشتەوە ئێران. «ئاڵا» دووکەرت بووبوو. حەمەئاوات بەو ئەنجامە زۆر دڵگران بوو، بەڵام تازە کارێک ئەدەکرا و ئەوی ئەدەبوو روو بدا، رووی دابوو!

مەلابەختیار بۆ چارەسەر و پشوودان هاتە تاران و من سەرگەرمی تەواوکردنی مۆڵەتی سەفەر و جێهێشتنی ئێران بووم.

سێرای ئەرج و ماڵە چکۆلەکەی عەبدوڵای حەمەسدیق، بنکەی هەموو لایەکمان بوو.

عەبدوڵا، ساڵانی هەشتاکان پێشمەرگە بوو، لە کارەساتی هەڵەبجەدا براگەورەکەی لە دەست دابوو. هاتبووە ئێران و کچێکی خانەقینیی کردبووە هاوسەری خۆی.

خێزان و دوو منداڵەکەی عەبدوڵا، بە هۆی ماڵەباوانیانەوە، گەیشتبوونە سوێد و ماڵەکەی کە لە ئۆردووگایەکدا بوو. دوو ژوور و بەرهەیوانێک بوو، ژوورێکیان د.قادر و «پەیام»ی هاوسەری و لاقەی کچە سێساڵەیان لێی دەژیان و من و عەبدوڵا و هەر میوانێک هەبووایە، لە ژوورەکەی دیکەدا دەمانگوزەراند.

من، کە هاتمە تاران، قاچاخ و هیچ کاخەز و مۆڵەتێکی دەوڵەتیم پێ نەبوو، ئێستا ئیدی بە هیمەتی عەبدوڵا کە کەسێکی دەستڕۆیشتوو لە تاران دەناسێ، وا لیزەپاسی سەفەرم ئامادە دەبێت.

حاکم سەردار، گفتی خۆی لەمەڕ تێچووی سەفەری من، بە زیادەوە بە جێ گەیاند. دکتۆرهەژار، م.جەعفەر، فەرەح زۆراب»سامان»، شێخ دارا، مامۆستا تایەرعوسمان»سەرکەوت» دەستگیرۆیی و باربوویان کردم، هەرگیز پاداشتی چاکە و دڵداوەلایی ئەوانم پێ نادرێتەوە.

## کۆبوونەوەیەکی تایبەت  لە تاران!

ئەو ڕۆژانەی مەلابەختیار لە تاران بوو، کۆبوونەوەیەکی تایبەتمان بۆ پێداچوونەوەی دۆخی «ئاڵا» و هەڵسەنگاندنی هەلومەرجی سیاسیی ئەو ڕۆژگارە، ئەنجام دا. نووسینەوەی ڕوونووسی بڕیارەکانی ئەو کۆبوونەوەیە، دەشێ کەڵکێکی بۆ خوێنەر هەبێت و بزانێت ٢١ ساڵ پێش ئێستا، ئێمە وەکو کەسانێکی چەپ، چلۆنمان بیر کردووەتەوە و دۆخە سیاسییەکەمان چۆن خوێندووەتەوە..

«کۆبوونەوەیەکی تایبەتی:

ڕۆژی ١٩٨٩/٩/١٨، لە «تاران»دا، کۆبوونەوەیەکی تایبەت و نهێنی لەنێوان هاوڕێیان، م.پشکۆ، حەمەناوات، ڕووناک و مەلابەختیاردا کرا و بارودۆخی ئێستای سیاسی و ئیدۆلۆژی و ڕێکخراوەیی لێک درایەوە، سەرئەنجام گەیشتینە ئەم ئەنجامانە:

ئەلف: بۆ ئاڵای شۆڕش:

١_ دژایەتیکردنی ڕیڤیژینیزم وەکو ناقارێکی خیانەتکارانەی ناو بزووتنەوەی کرێکاران.

٢_ دژایەتیکردنی ناسیۆنالیزم لەناو بزووتنەوەی نەتەوایەتیدا.

٣_ «حشع» نوێنەری ڕاستەقینەی ڕیڤیژینزمە لە ئێراقدا.

٤_ تێکۆشان لە پێناوی دامەزراندنی ڕێکخراوی چینایەتیی نوێی کرێکاران.

٥_ کێشەی شوورەوی، بەو پێیەی ئێستا مشتومڕێکی قووڵی لەسەر پەیدا بووە، هەروەها گرفتەکانی بزووتنەوەی کۆمۆنیستیش تەقیونەتەوە، بۆیە: دەبێ ئێمەیش بکەوینە منازەرە و لێدوان و لێکۆڵینەوەیەکی قووڵی هەمەلایەنە لەسەریان، پێشوەخت حوکم نەدرێت، بەڵام بە گەرمی زەمینە بۆ گەڵاڵەی دواحوکمی زانستییان خۆش بکەین.

٦_ بکەوینە گفتوگۆ و مونازەرەکردنی ڕاستەوخۆ لەگەڵ گروپە بچووکەکانی «م ل»، لە پێناوی ڕێکخستنی ڕێبازی مارکسیزمی شۆڕشگێڕ، لە بەرامبەر دوژمنانی مارکسیزم و بزووتنەوەی کرێکاراندا.

بێ: ئەرکە سیاسییەکان:

١_ بەعس، ڕژێمێکی فاشیستییە، خەباتی سەرەکیمان لە پێناوی ڕووخاندنیدا دەبێ. ئەخشەمان، تاکتیک و ستراتیژمان، درووشم و شێوەی کارکردنمان لەو پێناوەدا بێ و بە هیچ شێوەیەک، هیچ کار و کردەوەیەکمان، شێوە و شێوازێکمان، ناکۆک نەبێ لەگەڵ دژایەتی و دوژمنایەتیکردنی بەعسدا.

-یەکێتی:

لە رووی چینایەتی و ئیدۆلۆگییەوە، هێزێکی دژ بە بزووتنەوەی کرێکاران و مارکسیزمە، بۆیە ناکۆکیمان لەتەکیاندا بەو پێیە دەبێ. بەڵام ئەگەر هات و پاش چارەسەرکردنی کێشەکانی ناو خۆمان و تا رادەیەکیش گرووپەکانی دیکە، هەلومەرجێکی سیاسیی گونجاو خولقا کە بتوانێت جۆرێک لە هاوکاریی سیاسییان بەزۆریش لە قازانجی خۆماندا، لەگەڵدا دروست بکەین، ئامادەین و دەشبێ کاری بۆ بکەین.

_ پارتی، پاسۆک، پارتی سۆسیالیست و پارتی گەل لە یەک ریزدا دایاننانێین و هەر یەکەیان حیسابی سیاسیی جیایان بۆ دەکەین..

١_ پارتی دیموکراتیی کوردستانی ئێراق: نوێنەری بورژوا_خێڵەکیی کوردستانن و لە رووی چینایەتی و سیاسییەوە، سەرەڕای ئەو توانایەی هەیانە، بەڵام دژ بە کرێکاران و مارکسیزمن، رابردوویەکی خیانەتکارانەیان هەیە. وێڕای هەندێ لایەنی چاکەیان، لە روانگەی چینایەتییەوە ئەمانیش تەماشا دەکەین و دەرتانی جۆرێک لە هاوکاریی سیاسییان لەگەڵدا دژ بە بەعس لێ رەچاو دەکەین. ئەوەشمان لەبەرچاوە، تۆسقاڵێک یارمەتییان داوین.

٢_ پاسۆک، لایەنێکی بێپاشەڕۆژی: سیاسی، فیکری و کۆمەڵایەتین، ناسیۆنالیزمی تەسک و بۆیشیان بلوێ، کۆنەپەرستیتیشیان ناشارنەوە، هێندەی بکرێ وەکو هێزێکی لاوەکی و بێکارا مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین.

٣_ پارتی سۆسیالیست: نوێنەری توێژێکی وردەبورژوان.. لاوازترن لە لایەنەکانی تر و پاشەڕۆژیان زووتر لە ئاوابوونە، مەترسییەکیان لەسەر خەباتی چینایەتی هەشبێ، زۆر کەمە، ئەگەر پێویست بکا بچینە ناو ململانێوە لەگەڵیان، ئەگیان وەکو هەن، دایانورووژێنین.

٤_ حیزبی گەل: گەرچی لەوانی دی پێشکەوتووترن، خۆیان لە ئاقاری چەپ نزیک دەر دەخەن. بەڵام لە رووی چینایەتییەوە، ئەمانیش نوێنەری توێژێکی وردەبورژووان، هەر بەو حوکمەی لەبەر ناکۆکییان لەگەڵ لایەنەکانی دیدا، خۆیان بە چەپتر دەنوێنن، ئێمەش مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین. بەڵام وەکو حیزب قابیلی ئەوە نین ببنە نوێنەری چەپ یان ببنە بەش لە خەباتی کرێکاران و مارکسیزمدا.

جیم_ گروپەکان:

هەوڵدان بۆ بەراستی مونازەرەکردنی زانستیانە لەگەڵیاندا، لە پێناوی گەڵاڵەکردنی بۆچوونی چینایەتی و ئیدۆلۆگی و دارشتنی بەرنامەی هاوبەشی رێکخراوەیی. بۆ ئەمەش دەبێ گەرمتر لە جاران، گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەین و لەسەر ئۆرگان و نووسراوەکاندا، لایەنی چاکە و ناراستەکانیان، هێندەی دەیانزانین، بابەتیانە، بە رۆحییەتی پتەوکردنی رێبازی مارکسیزمی شۆڕشگێڕ، بخەینە روو))

ئەو تێکستەی نێو جووتکەوانەکە،٢١ساڵ لەمەوبەر، بە قەڵەمی مەلابەختیار و بە ڕەزامەندیی ئەو ناوانەی لە بەرایینا هاتوون، نووسراوە!

ئەم دەکۆمێنتە، لە ڕووی مێژووییەوە، بەهایەکی نییە، ڕۆژگاری پاشتر و ڕووداوە سەوزەکانی ژیان، بەشێکی زۆری بۆچوونەکانی هەڵتەکاندن، ئیسانیش بۆ نەوەی پاش ڕاپەڕین و خوێنەری ئێستا و ئایندەش، بێکەڵک نابێ.

## سەفەر بەرەو مەنفا

کاخەزەکانی پەڕینەوە لەسەر پردی نێوان دۆزەخی نیشتمان و «بەهەشت»ی مەنفا، بە هیمەتی «عەبدوڵای حەمەسدیق» ساز کران و ئیدی بە پەیداکردنی پاسپۆرتێکی ساختە لە «کوچەی عارەبان»ی تاران. تەنها وەرگرتنی «ڤیزا»یەکی گەرەک بوو.
پاسپۆرتمان کڕی و لە ڕێگای دۆستێکمانەوە کە لە وڵاتی سوێد دەژیا. توانیمان سەفیری وڵاتی پۆڵۆنیا لە تاران بناسین و ٦ڤیزای بە ۱۲۰۰دۆلار لێ بکڕین، تا لە تارانەوە بەرەو مۆسکۆ بفڕین.
ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی مانگی نۆڤەمبەری ۱۹۸۹، لە فڕگەی «میهراباد»ی تارانەوە، پاش ماڵاواییکردن لە حەمەئاوات و سەلاحی خوشکەزام، مەلابەختیار و ڕووناک خانی هاوسەری و چەند برادەری دیکە، ئێمە(شێخعەلی، دکتۆرقادر و پەیام خانی هاوسەری و کچەکەیان. هەڵمەت سەفادین و من) لە فڕۆکەیەکدا جێمان گرت و بەرەو بەرزاییەکانی ئاسمان هەڵفڕین.
فڕۆکە، بەنێو پەڵەهەورەکاندا کشا و ئاسمانی تەمگرتووی تارانی جێ هێشت و منیش هاوکورسیی مامەشێخ. بە ئاخێکی پڕ ئازار و دڵێکی بێهیواوە. فیلمی یادەوەرییەکانم لە هزردا هەڵدەکردەوە..
یادەوەرییەکانی هەشت ساڵ خەباتی سەختی پێشمەرگەیەتی و دوو ساڵ و نیوی زیندانی پڕ زەلیلیی چیا، وێنەکانی مەرگی هەڵەبجە و ونبوونی منداڵیی خۆم، تابلۆ خەماوییەکانی ژێر چادرەکانی ئاوارەیی هەڵبجەییەکان و جەستەی کووڕ و لەپێکەوتووی دایکم.. وای دایکە! ئەوە دوابینین و دوا پێکگەیشتنمان بوو.. چ سەفەرێکی درێژ بوو دەساڵان جێهێشتنی تۆ! چ برینێکی گەورەیە دۆڕاندنی نیشتمان و نەبینینەوەی تۆ! وای چ بێمانا بوو شۆڕش و چ بێمۆراڵ بوو سیاسەت!
نیگایەک لە مامەشێخ دەگرم، قاتێک چاکەت و پانتۆڵی ڕەش، کراسێکی سپی، کەرەواتێکی سوور و قژێکی خورمایی و سپیی تێکەڵ و ڕووخسارێک لێوانلێو لە ئازارێک جگە لە من کەسێکی دیکە نایخوێنێتەوە، پێکێک ویسکیی بە دەستەوە گرتووە.. وێنەکان جێگۆڕکێ دەکەن و مامەشێخ، شۆرتێک و فانیلەیەکی بێقۆڵی سپیی لەبەردایە، ڕیشێکی سپیی درێژی بە ئارەقە خووساو کە بە پەنجەکانی هەڵیدەخورێنێ، لە گۆڕەزیندانەدا دێت و دەچێ و لەسەرخۆ و بە مینجەمینج، شیعرێکی مامەشێخ ڕەزا، بە میزاجی خۆی هەڵدەشێلێ و دەیڵێتەوە..
((بۆ حەمەی وەستافەتاح ئێمەت هەموو «بەم دەردە برد»
ئەی حەمەی وەستافەتاح دایکت بە کێری نێرەکەر))
هەر من دەمزانی مامەشێخ لەگەڵ کێیەتی و «حەمەی وەستافەتاح» کێیە و چ کارەیە!

لە فرگەی <مۆسکۆی جوان> دەنیشینەوە و بە پاسێک بۆ هۆتێلی «ترانزێت»مان دەگوێزنەوە، تا ڕۆژی دوایی بە پێی ئەو «ڤیزا»یەی پێمان دراوە، بۆ «وارشۆ» بفڕین!
لە هۆتێلەکە، دوو جوامێر «ناراسی قادر مننەوەر و سامانی مەلانەحمەدی بانیخێڵانی» دێنە سەردانمان، پاسپۆرتەکانمان دەبەن، بلیتی «ستۆکهۆڵم»مان بێ هیچ بەرانبەرێک بۆ پەیدا دەکەن و ئیدی ئێمە، ڕۆژی دوایی، لە «مۆسکۆ»وە بۆ سوێد، بۆ وڵاتێک کە من جگە لە فیلمی «نامۆیەک لە سوێد» هیچی دیکەی لێ ئاشنا نیم، دەفڕین!

## ڕۆژژمێرێک بە بەرامەی زیندانەوە!

ئەمڕۆ، ١٩ی مارسی ٢٠١٠، سەرگەرمی نووسینەوەی دواوێنەکانی «حیکایەتەکانی زیندان»م. لە پشوویەکدا، لە سەدبارە پشکنینەوەی ئارکیڤی نامەکانمدا، ڕۆژژمێرێکی کۆن و پەڕپوت دەبینمەوە. لێی ورد دەبمەوە و بڕوا بە چاوانم ناهێنم.. ڕۆژژمێرێکی چکۆلە و چرچ، لێی نووسراوە:

**هۆشیار محەمەدعەزیز**
**ڕۆژژمێری هاوسەر**
**لەسەر بڕیاری وەزارەتی ڕاگەیاندن لە چاپ دراوە**
**لە بڵاوکراوەکانی پرۆژەی هاوسەر «١١»**
**سلێمانی_شەقامی حەمدی**
**چاپخانەی الفرات**
**١٩٨٨**
**٢٦٨٧ و ٢٦٨٨ی کوردی**
**١٤٠٨و ١٤٠٩ی کۆچی**
**نرخی ٧٥٠فلسە**
**لە لاپەڕەی سەرەتادا، نووسراوە:**
**ناوونیشانی خاوەن ڕۆژژمێر**
**ناو و نازناو: زین الدین/ پشکۆ**
**پیشە: زیندانی**
**شار: سەرگەڵوو**
**گەڕەک: بەرگەڵوو**
**شەقام: زیندانی بەرگەڵوو**
**ژمارەی خانوو:......**
**ژمارەی ئۆتۆمبێل:...**
**جۆری خوێن:....**

ڕۆژژمێرێکی تەمەن بیستودووساڵە، وێنەکانی زیندان، شێ و ساردیی دیوارەکان، هاتوهاواری زیندانییان، گرمە و ناڵەی ناپاڵمەکان، خرەوهوری دڵتەزێنی ڕاکێشانی زنجیری دەرگا ناسنینەکانی لە خۆیدا هەڵگرتوون و لەژێر ڕنووسبەفری «ئاسۆس»دا دەرباز بووە و دۆزەخی ئەنفالی بەزاندووە! با پێکەوە هەندەک لە ڕۆژەکانی ئەم ڕۆژژمێرە سەرسەختە بەسەر بکەینەوە و سەرخەتی ڕووداوەکان بخوێنینەوە:

١١ی کانوونی دووەم، دووشەمە:

چ نییە.. چوار ڕۆژانە باران نییە و لە ژووری هەر دەبارێ!

١٤ی کانوونی دووەم، پێنجشەمە:

هەواڵی هێنانەوەی تەرمی (٤٥) شەهید بۆ سلێمانی.

١٦ی کانوونی دووەم، شەمە:

هێرشی ئێران لە ناوچەی ماواتەوە..

١٧ی کانوونی دووەم، یەکشەمە:

گرتنی هەندێ بەرزایی لە ڕۆژاوای ماوەت..

٢٠ی کانوونی دووەم، چوارشەمە:

پتر لە ١٨٠ سەربازی دیل هاتوون.. ئێستا ڕێگای بزووتن نییە.

٢١ی کانوونی دووەم، سێشەمە:

چنور و حورپیەت هاتن..

٢٢ی کانوونی دووەم:

ئێستا ١٣ کەسین..

٢٣ کانوونی دووەم: ١٤ کەس

٢٤ی کانوون: ١٥ کەس

٢٥ی کانوون: ئەمشەو ١٦ کەس بووین..

٢٦ی کانوون: ئەمشەو هاتینەوە ژووری حانووت..

٢٩ی کانوون: چەند بریندارێک ئازاد کران..

٣٠ی کانوونی دووەم: کۆپتەر و فڕۆکەی جەنگی هاتن و بۆردوومانیان کرد..

٣١ی کانوونی دووەم:

مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٨٨مان لەم کونەسەگەدا گوزەراند. مانگێکی پڕ سەرما و تۆف و کرێوە.. لە ژوورەوە لەبەر ڕێژنەی دڵۆپەدا شەو و ڕۆژمان تێپەڕاند..

٢ی شوبات: دوو جاران کۆپتەر هاتن و نیشتنەوە..
٥ی شوبات: چەندین جار کۆپتەر.. پێ دەچێت خۆسازدانی هێرشێکی نوێ بێت..
٦ی شوبات: کۆپتەر بەردەوامە، ژمارەیەکی باشیان لێرە بە رێ کرد، زیندان چۆڵترە..
٧ی شوبات: شێخ چووە نەخۆشخانە و دەرمانی بۆ منیش هێنا..
١٢ی شوبات: هەموو پێشمەرگەکان گوێزرانەوە، ئێستا ئێمە چوار کەسین..
١٣ی شوبات: بەیانی سەعات ٤،٤٠ دەقیقە، جەباریان برد و ماینەوە سێ کەس..
١٤ی شوبات: هەر سێکمان لێرە ماوین. ئەم چەند ڕۆژە ناڵۆز و سەختن، مەترسیی فڕۆکەمان زۆرە.
١٧ی شوبات: ئەمشەو نەخۆش بووم، دەرزییان بۆ کردم..
١٨ی شوبات: جومگەی ڕانم زۆرم ئازار دەدات و بە ئاستەم دەبزوێم.. دەرزییەکی تریان بۆ کردم..
١٩ی شوبات: ئەمڕۆ زیندان کرایە بارەگای پێشمەرگە و بۆ ئێمەش زیندانێکی بچووکتر..
١٩ی شوبات: ٥.٣٠دەقیقەی ئێوارە، لە تابووتی بەرگەڵوویان دەرهاوێشتین و هاتینە بارەگای ناوەندی شۆڕشگێڕان.
٢٣ی شوبات: ئێوارە گوێم لە شانۆگەریی ساتێ هەڵۆ بەرز دەفڕێی تیپی سالار بوو لە ڕادیۆی کوردیی بەغداوە، بەرهەمێکی سەرکەوتوو بوو.
٢٤ی شوبات: تۆپبارانی کیمیاوی و ڕاجیمە بۆ یاخسەمەر و چەند شوێنێکی تر سەعات دووی بەیانی، ئێوارە بۆردومانی فڕۆکە، هێرش بۆ دۆڵمازەڵە.
٢٦ی شوبات: شەو سەعات نۆ، بۆردمانی چڕ بۆ بەرگەڵوو، چیی نەمابوو تێدا بچین.
٢٧ی شوبات: چووینە مقەڕی جەبارفەرمان. سەعات ٣ی ئێوارە کەوتینە ڕێگا..کەرکەر، دۆڵی شارستێن.
٢٨ی شوبات: سەعات ٣ی بەیانی گەیشتینە کانیتوو. حاڵی سەگایتی بوو، بە فەتارەت چووین..
٢٩ی شوبات: زیندانی کانیتوو، گەورە، ٦٣کەس لە یەک مزگەوتی بێپەنجەرە. پیسی و ئەسپێ، ئەفسەر و سەربازی گانگرینگرتوو، جاش، پێشمەرگە و کەمترین هۆی ژیانی ئاژەڵیشی تیا نییە..
١ی ئازار: سەعات ١٠ تۆپباران ئێرەشی گرتەوە.. بەردەوامە.
٢ی ئازار: شەڕی ساروخ.. شەڕی بەرەکان توندتر و هێرشەکانی دەوڵەت خەستتر.. ١٦ساروخ بۆ تاران، ٥ساروخ بۆ بەغدا..
٤ی ئازار: شێخعەلی گەڕایەوە بۆ بەرگەڵوو.. کارەساتی چۆڵکردنی کانیتوو..

٥ی ئازار: هاتینە خورخورە.. شەو لە یاخییان بووین..

٦ی ئازار: لە گۆمەزەلین..

٧ی ئازار: هاتمەوە بەرگەڵوو، یاخسەمەر.. برادەرەکان زۆر ڕێزم لێ دەگرن بەڵام زیندانییم..

٩ی ئازار: ئەمشەو لە کەرکەر بووین.. گۆمەزەل

١٠ی ئازار: گۆمەزەل

١١ی ئازار: هاتینە سیرەمێرگ و گەڵاڵە

١٢ی ئازار: شاناخسێ.. بەرەو بانە و سەردەشت.

١٣ی ئازار: خۆم تەحویلی جمهوریی ئیسلامیی ئێران دا!

١٤ی ئازار: لە زیندانی سەردەشتم.. نیوەڕۆ ژاندارمری..

١٥ی ئازار: سەردەشت.. ئۆردووگای ئورمییە

١٧ی ئازار: ئۆردووگا.. هەڵەبجە ئازادا!

١٨ی ئازار: هەڵەبجەم بە وێرانی بینی.. ئاخۆ لاشەی چەند لە ئازیزانم بووبنە خۆراکی بۆمبا؟

٢٦ی ئازار: کەرەنتینە..تەحقیق!

٢٨ی ئازار: ک.. گەلەک بێزارم..

٦ی نیسان: کەرەنتینە تەواو.. بەرەو زێوە..

ئەمە پانۆرامای ڕووداوەکانی مانگەکانی سەرەتای ساڵی شوومی ١٩٨٨ بوو، بێ دەستکاریکردن و هەر بەو ڕێنووس و زمانەی کە من لە «ڕۆژژمێری هاوسەر»دا تۆمار کردبوون و دەشێت ببنە بەرچاوڕوونییەک بۆ خوێندنەوەی حیکایەتەکانی زیندان.

**نوسین و دیمانە لەسەر ئەزموون و یاد:**

## ئەزموون و یاد

ئەنوەر حسێن
a_bazgr@yahoo.com

ئەزموون و یاد، یەکێکە لەو کتێبانەی باس لەرووداوەکانی شۆڕشێک دەکات کەلە سەردەمانێکدا شۆڕش ئەرکێکی نیشتیمانی، رزگاری و چینایەتی لەئەستۆ دەگرێت، بەڵام توشی دەیان کێشە و نەهامەتی دەبێتەوە.
شەڕی دەسەڵات و فیکر و ئایدۆلۆژیا لەدەوریەکدا و شەڕی ناوخۆ لەدەورەیەکی تردا.
هەفتاکان و هەشتاکان لەسەرتاسەری دونیادا رەوتی چەپ و مارکسیست و دروستکردنی هێز و گروپی لەمشێوەیە مۆدێل بوو. کەزۆربەی گەلانی جیهانی سێهەم و وڵاتانی گەشەکرد و دواکەوتوو. بەبێ ئەوەی لەگەڵ واقیعەتی کۆمەڵگادا هەست بەزەرورتی بکەن. سەرسەختانە بانگەشەیان بۆ دەکرد و قوربانیشیان بۆ دەدا و دواتریش پشتیان تێکرد و ئەو تێزەیان وەکو پێویست جێ بەجێ نەکرد.
ی.ن.ک وەکو هێزێکی ئەلتەرناتیڤ لەوکاتەدا، داینەمۆی شۆڕش و خەباتێکی سەردەمیانە بەجەماوەری پێشکەوتوخواز و چەکدار و خاوەن ئیمان و ئیرادە بوو کە لەگەڵ بەعسی فاشی و بەعسیزمی بەعس رووبەروو بوو بوو. کەچونەوە بوو بەگژ مەحاڵدا.
ئەزموون و یاد پێمان دەڵێت.
یەکەم: کێشە و ململانێیەکانی ناو حزب لەکوردستان و (ی.ن.ک)یش وەکو یەکێک لەوهێزە سەرەکیانە، تائێستاش گیرۆدەی ئەم قەیرانانەن و جیابونەوەی گۆڕان یەکێکە لەتازەترین قەیرانەکان. کەبێگومان کاریگەری رووداوەکانی سی ساڵی رابردوو و رووداوەکانی ناو (ئەزموون و یاد) تائێستاش لەسەر تاک و سەرکردە و حزبەکە و کۆمەڵگاش ماوە.
دووەم: رووداوەکانی (ئەزموون و یاد) کەمترین ئەزموونی بەرهەمهێنانەوە بۆ حزبەکان. هەربۆیە دوای راپەڕین، شەڕی ناوخۆ، شەڕی هێزە سیاسیەکان، ململانێیەکان و کێشە بەردەوامەکان نەیتوانیوە ئەزمونەکانی رابردوو وەکو یاد چاولێبکەین، بەڵکو یادەکان زیاتر هانیداوین بۆ ئەزمونی ململانێ کە کەس قازانجی نەکردوە.
سێهەم: (ئەزموون و یاد) مێژوویەکە لەرشتنی خوێنی براکان لەشاخ، بەڵام لەشارەکانیش رووداوەکان دووبارەن، بەشێکی زۆر لەشۆڕشگێڕ و قارەمانەکانی هێزە سیاسیەکان لەم

شەڕانەدا کوژراون. کە نەخەونەکانیان هاتە دی، نە بەو خەونەوە چەکیان لەشان کردبوو، وەلآم بۆ ئەم کوشتنانە چی یە؟ خێزان و هاوسەر و ژن و منداڵەکانیان تاچەند گوزەرانیان باشترە و تاچەند شەهیدەکان و بنەماڵەکانیان خەونەکانیان هاتەدی؟

چوارەم؛ ئەو هاوکاری و پەیوەندیە قوڵەی نێوان حزبەکانی باکور و خۆرهەڵات لەگەڵ یەکێتیدا کاڵبۆتەوە. بگرە گلەیشیان لەیەکێتی هەیە وەکو هاوپەیمانی دوێنێ و خاوەنی دەسەڵاتی شاری ئەمرۆ.

(ئەزموون و یاد) پێماندەڵێت پشتیوانی ی.ن.ک لە(حزبی دیموکراتی کوردستان و کۆمەڵە) تەنانەت شەهیدبوونی پێشمەرگەی یەکێتی لەپاڵ دیموکرات و شەهیدبوونی پێشمەرگەی کۆمەڵە لەپاڵ (ی.ن.ک) حیکایەتی دێرینی هەیە. کەدەبێ ئەم ئەزمونە و یادە. یادەوەریەک بێت بۆ بەردەوامی و هاوکاری ئەم دوو حزبە. کەئێستا خانو و ژیان و گوزەرانیان لەکۆیە و زرگوێز هاوتای ژیان و گوزەرانی یەکێتی ساڵانی هەشتاکانە لە زەڵێ و نۆکان و گوندەکان...!

پێنجەم؛ (ئەزموون و یاد) پێماندەڵێت؛ هەڵوێست و مبادی هەندێک سەرکردەکانی یەکێتی و کۆمەڵە و لەوکاتەدا هێندە بەقەناعەت و بەباوەڕ و ئیمانەوە کاریان کردوە. دەکرێت هەرکێشە و ململانێیەکی حزبی لەرێگای دیالۆگەوە بکاتە چارەسەر.

شەشەم؛ پەنجە خستنە سەر خاڵێکی گرنگ لە ئەزمون و یاد، پێشبینیکردن و بۆچونی هەندێک لەسەرکردەکانی ئەوکات کەلەئەزمون و یاد ناویان هاتوە سەبارەت بەحزبەکان. فیکر و مبادی و داهاتویان. کەهەندێکیان پاش نزیکەی بیست ساڵ راستە و راست وەکو خۆی دەرچون. ئەوەش ئاماژەیەکی باشە کەهەر هێزێک وەک خۆی بناسین و مامەڵەی لەگەڵدابکرێت.

حەوتەم؛ (ئەزموون و یاد) ململانێیەکی سەخت و خوێناوی و پڕ لەکێشە و ململانێی حزبی و فیکری و بەتایبەتی ناو یەکێتی دەگێڕێتەوە، بەلآم ئەوە یەکێتیە کەهەرخۆی رێگا دەدات کتێبێک بەواقیعی لەسەر مێژوو و ملانێیەکانی بلآوبکرێتەوە کەرەنگە تائێستا هیچ هێزێک رێگای نەدابێ لەم جۆرە کتێبانە لەسەری بنوسرێ و چاپ بکرێ.

بەلآم ئاگادارم کاتێ خۆی کتێبەکە رێگا بەچاپکردنی نەدەدرا، بەلآم دوایی بەرپرسێکی (ی.ن.ک) وتی؛ «رێگا لە ئازادی نوسەران مەگرن. ئەوە درووشمی مام جەلالە کەئازادی بۆ نوسەران فەراهەم بکرێت» دەمەوێت بڵێم هەرچاپکردنی کتێبەکە بۆخۆی مانای سەلماندنی بونی ئازادیە لەناو ئەم هێزەدا و رەنگە ئەوەش دەستکەوتێکی گەورەبێ.

جیالەوە بۆچونی زۆر خەڵکم پرسی لەسەر کتێبە و بۆچونەکانی پشکۆ نەجمەدین. هەموویان بۆچوونیان وابوو کە کتێبەکە بەوپەڕی راستگۆیی و واقیعی نوسراوە. بەتایبەت کە پشکۆ بۆخۆشی لەناو رووداوەکاندا بوە و بەشێک بوە لەململانێکە، بەلآم هەست ناکرێ وەکو هەندێک

لەوانەی مێژوو دەنوسنەوە، دەیانەوێت خۆیان بکەنە فریشتە و پاڵەوان، نەخێر ئەم رۆسۆیانە بیرەوەریەکان دەگێڕێتەوە بێ رتوش و خۆبە سۆپەرمانکردن. یان کردنی کەسێک بە قارەمان سۆپەرمان و شکاندنی کەسێکی تر.

بەپێی هەواڵێکی رەخنەی چاودێر (ئەزموون و یاد)ی پشکۆ نەجمەدین پڕ فرۆشترین کتێبی ساڵ بوە. ئەوەش ماناو مەغزای زۆری هەیە کەدەبێ باشتر بخوێندرێتەوە و دەرسی لێ وەربگرێت و بەشانازیش بۆ حزبەکە و سەرکردەکانی لەئێستادا بژمێردرێ کەرێگا بەچاپکردنی دراوە و بدرێ.

# ئەزموون ویاد...
# یادێک لە ڕۆحە سپیەکانی ڕۆژانی ڕەش

ئازاد تۆفیق

بەعس هەموو شتێکی لووشدابوو، هیچ نەمابوو... هەرهیچ *

بەرایی ...

نوسینی هەربابەتێکی ئەدەبی ،جا یاداشت و گێڕانەوەی بەشێک لەمێژوو بێت ، یان دەقێکی داهێنراو، بۆ خۆی کاریگەریکی گەورە لەسەر هەست و دڵ و دەرونی مرۆڤ جێدەهێڵێ و زۆرجار مرۆڤ دەخاتە بەردەم ڕامان و ئەندێشەیەکی هێندە قوڵی پرسیاراویەوە، کە مرۆڤ بەدوای دۆزینەوەی خۆیدا وێڵ دەبێت. چونکە دەقی سەرکەوتوو حاڵ لەمرۆڤ دێنێ و خوێنەر کەمەن کێش دەکات و پێ بەپێی ڕووداو و کارەساتە تراجیدیەکان چرکە و ساتە ڕەنگاڵەییەکانی نێو ئەو دەقە، مرۆڤیش لە تەکیدا بەچەشنێک ڕێدەکات، کە هەست بە ترپەی دڵی خۆی دەکات و بەمەش هەندێک جار یا دڵتەنگ دەبێت و تەمی خەم لەسەر ڕۆحی کەپرۆکە دەبەستێت، یان خەنین و شادی دەبنە میوانێکی ئێسک سوکی نێو ناخی. بۆیە هەمیشە دەقی سەرکەوتوو مرۆڤ والێدەکا هەرچەندە شوێنی ڕاستەقینەی خۆی لە چواردیواری ژورێ تێنەپەڕێت، کەچی ئەم بەدوو باڵ و بە خەیاڵ بەسەر هەوردا بفڕێت و لەتەک فریشتەدا بدوێت . دیارە هەرئەم حاڵەتەشە والەخوێنەر دەکا دوای خوێندنەوەی یاداشتێک، نۆڤلێتێکی کورت، ڕەنگ و ڕووی، یا شادی لێدەپژێت یا بەچەشنێک خەمبارو دڵگوشراودەبێت، ئەڵێی تازە مەرگی ئازیزێکی خۆی بیستوە. بێگومان ئەوە سیحری دەقە کەهەندێجار ڕۆح ڕادەژەنێت و سەرڕێژی دەکات بەگوڵ، یا ڕۆح کەسیرە و کەلەپچە دەکات، ئەوە نهێنی دەقەو هیچی دی بەجۆرێک لە ڕۆح دەناڵێت، کە خۆینەر دوای خۆیندنەوەی ئەو دەقە هەموو شتێکە خۆی نەبێت، لەهەموو کەسێکەوە نزیکە جگە لە خودی خۆی. ئەمەش بۆ خۆی چەندە دەلالەتە بۆ نامۆبوونی خۆێنەر، ئەوا سەرەتاییترین ئاماژەیشە بۆ سەلیقەو لێهاتووی نوسەرێ کە بەحیکمەتی ووشەکانی یا ناخمان دەکات بە بورکان و گورزە تیشکی ڕۆژنەی چاو تەڵخ و تەماوی دەکا، یا ڕۆح لێوانلێودەکات لە شادی. مانای وایە ئەوە تەلیسمی دەقە کەوالەخوێنەر دەکا هەرزوو مرۆڤ خۆی لەبیربکات و ببێتە بەشێکی هەڵسوراو لە بونیاد و پێکهاتەی ئەو دەقەو خۆی لە نێو فەزایەکدا ببێنێتەوە کە جگە لەناو دەقدا لەهیچ جوگرافیا و پانتایەکی تردا ئەو فەزایە بوونی نەبێت. جا گەر ئەم حاڵەتە بۆ دەقێکی نوسراو کە سەراپای ڕووداو و کاراکتەرەکانی دەستچنی خەیاڵ بن و نوسەر لە ڕێی فەنتازیا و خەیاڵی ڕووتەوە بە دونیا نا مەئلوفەکەی خۆیمان

بناسێنێت، ڕاستیەکی حاشاهەڵنەگر بێ . ئەی ئاخۆ بۆ دەقێک کە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی بە قۆناغ و ڕۆژگارێکی تایبڵێیت هەستیارەوە هەبێت و ڕووداوەکان کت ومت لەدایک بووی واقیع بێ و مەرگەسات و دڵە ڕاوکێ و دابڕان و غەدرو پاڕانەوە و گیانەڵای ئازیزان، نەفەنتازیا بێ و نەدروستکراو ، نەبەرهەمی خەیاڵ بێ و نەوڕێنەی تا لێهاتووان . ئیتر ئەبێت چ کاریگەرییەک لە ڕۆحی مرۆڤ بکات و چ ئاسەوارێکی قورس لە ناخی مرۆڤدا هەڵبکۆڵێت. با ئەوەش لەولاوە بوەستێت گەر خوێنەر خۆی شایەت و بینەرێکی جدی یەک بەیەکی ئەو خەمانە بێت کە تا هەنوکەش خوێنیان لێ دەچۆڕێ و ئاهیان لی دەتکێ. پێموایە ئیتر وەیل بەدڵی کەیل و حاڵی شپرزیی ئەو خۆێنەرە بێت.

وادیارە مرۆڤ سەرسەختترین بونەوەری سەرزەویە کە نەک هەر بەرگەی ئەم هەموو غەم و ئازارو غەدر و ناهەقیە دەگرێت، بەڵکو هێندە زاڵم و دڵ ڕەقیشە لەدوای کەوتنە خوارەوەی هەرگەڵایەک، پرچڕنینی هەر دایکێک، پاڕانەوەی هەردیلێک، گیانەڵای هەر ئازیزێک لە شەرگەکاندا، کەچی ئەم دواتر نەلە پیاسەی خۆی دەکەوێت و نەخەندەش لەسەر لێوی باردەکات. جا بەبۆچوونی من دەقی (ئەزموون و یاد) یەکێکە لەو دەقە کاریگەرو هەستیارانەی کەلەیەکەم خوێندنەوەیدا تەلیسم لە ڕۆحی خوێنەر دەکات و مرۆڤ کەمەن کێش دەکات . بۆیە گەر خوێنەرێ پێی وابێت بەیەک جار خوێندنەوەی ئەم دەقە تینوێتی لەتێگەیشتنی ڕوداوەکان و فەنتازیای ئەو بیرەوەرییە دەشکێ، ئەوا بەهەڵەدا دەچێت .

### دەق و وەزیفەی ئەپستمۆلۆژی

هەموو دەقێکی نوسراو هەرچۆن لەڕووی مەعریفیەوە ئەرکی ئەبستمۆلۆژی خۆی هەیەو دەکرێت مرۆڤ لێیەوە فێر ببێت و زانیاری لەسەر ڕوداوو شوێن و جوگرافیای ئەو پانتایە بزانێت کەبۆتە شانۆی ڕودانی ڕووداوەکان. ئاوەهاش لەڕوی فۆرم و زمان و وێنەی شیعری و ڕستەی پڕماناوە دەبێت دەق چێژو موسیقاو خرۆشی و خۆشیەکی وابدات بەگوێی خوێنەرداو بەچەشنێک موخاتەبەی دڵی خوێنەر بکات، کەببێتە مایەی سەرسوڕمانی مرۆڤ بەرامبەر ئەو گەمەو دەست بازیەی کە نوسەر لەتەک ووشەدا دەیکات. چونکە نوسەر تا چەند ڕستەی شیعری لە نوسینەکەیدا بەکاربهێنێت و پەناببات بۆ بەکارهێنانی ووشەی نێو زاراوە جیاکانی زمانی کوردی و تا چەند بەوێنەی هونەریی لەڕووداوو شوێن و شپرزەیی و دڵەڕاوکێی دەرووونی کارەکتەرەکانی ئاگادارمان بکات، ئەوەندەش ئەرکی نوسەر لەنوسینی هەردەقێکدا کە بریتیە لە تواندنەوەو پەیوەندی دیالێکتیکانەی نێوان فۆرم و ناوەرۆک بەدوونیا بینیەکی

جوانەوەو لەرێی دەربڕینێکی هونەری سادەو ڕەواندا بەرجەستە دەبێت. کەمن بۆ خۆم لەکاتی خوێندنەوەی ئەم بیرەوەرییەدا بەشێوەکی هێندە سەرنج ڕاکێش هەستم بەگەیاندنی ئەو ئەرکە کرد، گەر بڵێم توش شۆک بووم، ئەوا زیادڕەویم نەکردوە. چونکە (پشکۆ نەجمەدین) یەکێکە لەو نوسەرانەی کەهەرچەندە ئەوەندەی من بزانم سەرەتا لەدنیای سیاسەتەوە هاتۆتە نێو دونیای نوسینی ئەدەبی و پێش ئەوەی شاعیر و چیرۆک نووس و ئەدیب بێت، نوسەری سیاسی بووە. بەڵامماڵی دڵی هێندە پڕە لەمانگی ووشەو پڕە لە شیعری کریستاڵی، ئەوا لەکاتی خوێندنەوەی بەرهەمەکانیدا خوێنەر هەست دەکا لەبەردەم ئەزموونێکی گەورەدا وەستاوە . لەبەر ئەوە بە بڕوای من دەقی ( ئەزموون و یاد) چەندە بیرەوەری و گێڕانەوەی یاداشتە، ئەوەندەش شیعرو خەیاڵ و فەنتازیایە. ئەمەش بۆخۆی جوانیەکی ترو تایبەتمەندیەکی تری داوە بەگێڕانەوەی بیرەوەریەکان و ئەو ڕاستیەمان بۆ دەسەلمێ کەنوسەر زۆر شارەزاو لێهاتوانە دەستی بەسەر ئاوێتەکردنی ئەو پەیوەندیە ئۆرگانیەدا دەشکێت کە لە نێوان فۆرم و ناوەرۆکدا هەیە.

بۆ ڕاستی و دروستی ئەم بۆچوونەش ، پێمخۆشە چ لە ڕووی ناوەرۆک و چ لەڕووی فۆرمەوە خوێنەر بەهەندێک ڕووئیای جوانی ئەو نوسەرەو حاڵەتی دەروونی پڕنهێنی کارەکتەرەکانی ئەو دەقەو شوێنی جوگرافی و هەندێک ڕستەی شیعری لەم بیرەوەرییەدا ئاشنا بکەم و هاوکات گەر بۆم بلوێ ساتێک لە هەواری کلۆمدراوی ئایدۆلۆژیادا بساکێنم، تابتوانم قسەیەک لەسەر سیحری ئەو تەلیسمە بکەم، کەچۆن لە دۆینیدا بە چەشنیک لە ڕۆح و هەنگاومان گیر بوبوو کە جگە لەخۆمان هیچی دیمان نەئەدی. لەبەر ئەوە من پێموایە لەم بیرەوەریەدا چەمکی ئایدۆلۆژیا شانبەشانی برینەکانی شەڕی براکان، دوو کۆڵەکەی هەرە گەورەو دوو فیگەری هەستیاری فراوانی نێو ئەم دەقەن و نوسەر بە ئەنقەست و بەو پەڕی هۆشیاریەوە زۆرترین پانتایی ئەم بیرەوەرییەی بۆ تەرخان کردوەو لەزۆر شوێندا گەر بە ئیحایەکی بچووکیش بێت،ئەوا لەفۆرمێکی هونەریی بەرز و جوان دا هەڵوێستەی لەسەر کردوە و ئاماژەی پێداوە. تا خوێنەر بزانێت ناوەرۆک چەند ڕیالیستی پڕمانابێت و چەندە کارەساتەکان بارگاوی بن بە خوێن و ڕوداوەکان ناخ بسمن و ئاسەوار لەسەر ڕۆحی مرۆڤ جێبهێڵن، ئەوا فۆرمیش کەبەرگی دەرەوەوپردی گوزارشتە لە حاڵەتەکان هێندە گرنگە. بۆیە گەر نوسەرێک نەتوانێت هاوسەنگیەکیان لە نێواندا دروست بکات و شانبەشانی یەک ڕێیان پێنەکات، ئەوا حەتمەن تای تەرازوی نوسینەکەی بەلایەکدا لاسەنگ دەبێت و بەمەش ئەو نوسینە جگە لەوەی کە هاوسەنگی لەدەست دەدات، ئەوا یەکێک لە ڕەکیزە سەرەکی و بنچینەیەکانی خۆی کە فۆرمی جوان و ئسلوبی نووسینی سەرکەوتوە وون دەکات.

چونکە وێنە کێشانی شوێن و وەسفکردنی پانتایەکانی سروشت کە ڕەگەزێکی زیندوو جوانی

هونەری نۆڤلێت و دەقی ئەدەبی یاداشت ئامێزن. دەکرێت خوێنەر لێیەوە لە دیاریکردنی وەرزوو چۆنیەتی کەش و هەواو تەنانەت توبۆگرافیای ناوچەیەک تێبگات و هاوکات لە ڕێی وێنە هونەرییەکانی ئەو دەقەوە، بە خەیاڵ و لە زهنی خۆیدا بەکون و کەلەبەرە تاریک و نسرم و پێچاو پێچەکانی ژیاندا ملی ڕێ بگرێت و نەخشەی ئەو شوێنە بکێشێت کە ڕووداوەکان جوڵەی دراماتیکیانەی خۆی تیا دەکەن. بەبی ئەوەی (گێڕەوە – ڕاووی) باسی هیچ لەوحاڵەتانەی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ڕاپۆرت ئاسا کردبێت. دیارە ئەمەش سەلیقەی ئەو نوسەرانە دەردەخات کە ئەدەب لە زانست جیادەکەنەوەو هونەر بەهونەر دەنووسن . جا من پێم وایە (پشکۆ نەجمەدین) زۆر بە وریاییەوە و بەشێوەیەکی ئەدەبی جوان مامەڵەی لەتەک ئەم حاڵەتەدا کردوە و زۆر دەست ڕەنگینانە لە چەند ڕستەیەکی وەسف ئامێزی هونەری جواندا هەر زوو خوێنەر بەو کەش و فەزایە ئاشنا دەبێت و لە جوگرافیای ئەو دەڤەرە ئاگادار دەبێت کە لەیەکەم هەنگاوو دەست پێکی ئەو بیرەوەریەدا نوسراوە .....

* گیارەشەی بەهارە ، گیاو گوڵ تا چۆکان هاتووە، مانگ دەستبازی لەگەڵ پەڵە هەورە مەستەکان دەکا کەبەنازەوە لە دەوری سەما دەکەن. لە نێوانی دەستبەردان و چوونەدەستی پەڵەهەورەکاندا، گورزە تیشکێ هەڵدەخلیسکێ و خۆی بە برژانگەکانی ئێمە دەگرێتەوە. ئێمە نەرم و لەسەرخۆ، بەنێو پەڵەگەنمی وەکەروێشکە کەوتوودا ڕێ دەکەین. بۆنوبەرامەی گوڵان، خانە خانەی قوڵاییەکانی هەست لێوانلێو دەکەن. ل ٦

* لێرەدا ... لەهەمواری نێو شانی ملەی هەڵووژەدا، گەر ڕوو لەهەورامان ڕاوەستیت، ئەوا دەستی ڕاستت هاوچمکی توولە ڕێگایەکە پێچاوپێچ بۆ لوتکەیەک سەردەکەوێت کە بەسەر هەردوو هاوینە هەواری (قەمان) و (وەزگێڵ)دا دەڕوانێت و دەستی چەپیشت باسکەو باسک بەرەو دوندی (ملەی تاوێرە) سەردەکەوێت. لوتکەی پشتی (قەمان) بەرزترین ترۆپکی چیای شنروییە و پێی دەڵێن (بەفری میری) ئێستا سەربازگەیەکی لەسەر هەڵتۆقیوە. لەبەرزایی بەفری میرییەوە ڕاوەستەو بەهەردوو ئاقاردا هەڵڕوانە، تا چاو هەتەر بکا ناوچەکانی کوردستانی هەردوو دیوت لێوە دیارن. شنرویێ دەستێکی بەدەستی زنجیرە چیای (باڵانبۆ) وەیەو دەستەکەی دیکەشی شانبەشان و ملەبەملە، شۆڕدەبێتەوە تا لە بناری شارەزووردا قوڵ ڕۆدەچێ و بە چەندین کەرتە شاخی گا ڕژد و گا هەموار، دەگاتەوە دامێنی چیاکانی هەورامان ... ل١٧

* دۆڵی (ئەشکەوەڵ) لەدەستپێکدا فراوان و وورده وورده تەنگ و تەنگتر، تا بە تەنگایی دەربەند دەگات و ئیتر لێرەدا هەردوو بەر ، تا چاوو بڕبکات ، زەردەمای بەرزوو سەخت و ڕژدەو

نێوانیان دەریچەیەکی تەسک کە تاکە سوار بەزەحمەت لێی دەرباز دەبێ ... ل١٩
خوێنەر لەم وێنانەی سەرەوەدا سەرباری ئەوەی زانیاری لەسەر تۆبۆگرافیای ناوچەیەک وەردەگرێ، ئەوا لەڕێی چەندین وێنەی شیعری و ڕستەی مۆسیقییەوە بەرەگەزێکی تری هونەریی ئاشنا دەبێ و لە شوێن و جوگرافیای کەش و دەربەندێک دەگا، کە نوسەر لەڕێی سودوەرگرتن لە هونەری سینەماوە، ئەم حاڵەتەی بۆ بەیانکردوین.

## ناوەرۆک مێژوویەک لە ڕاستی

دەقی (ئەزموون و یاد) کەمێک لەبیرەوەرییەکانی مرۆڤێکی دڵزاخاو دراوە بە ئایدۆلۆژیا، ڕۆح کە جێگای هەموو شتێکە فیکر نەبێت، لێرەدا بەپێچەوانەوە لێوان لێوە و لێی دەڕژێ، لە قۆناغێکی تابڵێی هەستیار و ترسناکی گەلەکەمان دا و لەدەڤەرێکدا کەبەپانتاییەکانی شارەزور و مای سەربەرز و سەربڵندی هەورامان ناسراوە. کاراکتەرە سەرەکییەکان و سەرجەم جوڵە و ڕوداوەکانی نێو ئەم دەقە پێشمەرگەکانی یەکێتی و ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و خودی نوسەرن. دیارە لەم چەشنە نوسینەدا مادەم مرۆڤ خۆی لایەنگربێ و تەرەفێکی ئەکتیڤی نێو کێشە و ململانێکانیش بێت، ئەوا مەحاڵە بتوانێ بێدەروەست و بێ لایەن بێ. هەرچەندە من بۆخۆم پێموایە لایەنگیری لەو نێوەندەدا نەنگی نییە بەقەدەر ئەوەی مرۆڤ نەتوانێ بەویژدانەوە لەکێشەکان بڕوانێ و ڕۆحی خۆی ئاسودەنەکات لە گێڕانەوەی ململانێ و ڕوداوەکاندا و بەئەمانەتەوە قسە لەسەر برینەکان نەکات. کەبەبڕوای من سەرلەبەری ئەو ئەزمونە بە ڕووداو و کارەساتەکانی و ناحەقی و غەدرەکانی و بەزەیی و دڵڕەقی و شەڕوشۆڕ و بەرەنگاری و هەڵوێستەکانییەوە سەدلەسەد ڕاستە و هیچ ڕەخنە و سەرنجێک لەسەری ناتوانێ هێندەی سەرە دەرزییەک لە کێوی بڕوای من بەرامبەر ئەوڕاستییەبگۆڕێ. جا ئیتر نازانم من ئێستاش هەر سەرمەستی سەردەمی ڕێکخستنەکانی (کۆمەڵە) و (ئالآی شۆڕش) بەرامبەر بە مامۆستا پشکۆ بەرینەداوم، یان لەواقیعدا ڕاُستی ڕوداوەکانی نێو ئەو بیرەوەرییە ئەو حەقیقەتانەن کەمن لەدڵەوە هەستیان پێدەکەم. حەتمەن بازی وەڵامی دروست لەسەرشانی بەشی دووەمی ئەم هاوکێشەیە دەنیشێتەوە، ئەویش لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستیانەی خوارەوەدا.

١-نوسەر لە (ئەزموون و یاد)دا نەخۆی کردووە بە سوپرمان و نەپێیوایە موفەکیری فیکری مارکسیزمە. بۆیە زۆر بەڕاشکاوانە دەڵێت.... (من کەباس لە ئەقڵ و ئاوەز و کەمئەزمونی خۆم دەکەم، ئەوا بەپەیژەی ئاستی تێگەیشتن و درکی کەسی دیکەدا هەڵنازنیم).ل٢٢

٢-نوسەر لەیەکەم چاوپێکەوتنی دا لەگەڵ کاک نەوشیروان دا، کەبەدڵشکاوی لای ئەو بەرێزە

جێدەهێڵا و دواتریش لەڕوداوەکانی ناو یەکێتی دا دەکەوێتە بەرەی لایەنی نەیار بەرامبەر بە کاک نەوشیروان. ئەوا سەرباری بوونی جیاوازی لە تێڕوانین و بیرکردنەوەدا، کەچی بەڕاشکاوانە دەڵێت.... (لەهەناوی ململانێ و بگرەوبەردەی ناو کۆمەڵە، من لەسەنگەری ئەوبەری ڕێباز و تێڕوانینی فیکری و سیاسی نەوشیروان کەوتم، دەشێ بەشێکی باریکی ڕیشەکەی لەکەناری ئەو یەکەم دیدارەدا چەقیبێت.) ل١١٨

٣-پشکۆنەجمەدین، لەلاپەڕە ١٣٠ (ئەزموون و یاد) دا تێڕوانینی خۆی لەمەڕ هەڵوێستی (ی.ن.ک) لە کێشە و دانوسانی نێوان خەڵکی کوردی کوردستانی ئێران و کۆماری ئیسلامیدا زۆر بە پۆزەتیف باس دەکات. لەکاتێکدا وەک خۆی دەڵێت... (من لەساتەوەختی نوسینەوەی ئەم دێڕانەدا تاڵەدەزویەکیش بە (یەکێتی)ەوە نامبەستێت).

٤-پشکۆنەجمەدین، لەزۆر شوێندا ڕەخنەی لەهەڵوێستەکانی خۆی گرتووە و پێیوایە هەندێ کێشە لەو سەردەمەدا ڕوی داوە، کەهەربەتەنها لایەنی بەرامبەر لێی بەرپرسیار نییە. وەک ئەو کێشەیەی کەلە هەرێمی یەک لەگەڵ کاک (حەمەی حاجی مەحمود) داڕویدا.... (ئەگەر توندڕەوی ئێمەی کادرانی کۆمەڵە و لوت بەرزی و خۆبەهەموو شت زانینی (حەمە) نەبوایە، دەشیا کاربەوجێگایە نەگەیشتایە.)ل١٥١

٥-لێقەومان لەبەفرا، وێنەیەکی وێنە گەردلێنیشتووەکانی ژیانی شاخە، کەتیایدا پۆلێ پێشمەرگەی دوانزە کەسی، گەر پیاوانی گوند بەهانایانەوە نەهاتنایە ئەوا دەبوونە دوانزە ڕۆح بەفربردوی ئەو چیایە. هۆکاری سەرەکی ئەو ڕوداوەش سوربونی خودی نوسەرە لەو سەفەری هات و نەهاتە، بۆیە هاوڕێکانی بەنابەدڵی شوێنی دەکەون. بەڵام کاتێ ڕزگاریان دەبێ و لەخەم دەرەخسێن ئەوا... (هاوڕێکانم بەچاوی گلەیی و گازندەوە لێیان دەڕوانیم و منیش دەموت حەقی خۆتانە، وەخت بوو هەموومان ڕەق هەڵبێین.) ل١٩٨

ئەمانە و چەندین هەڵوێستی تر، نیشانەی ڕاستگۆیی و مەوزوعیەتی بیرکردنەوەی نوسەرن لەگێڕانەوەی ئەو ڕوداوانەی کەلەو ئەزمونەدا نوسراون و پشکۆنەجمەدین بێ منەتانە تیشکی بیرەوەرییەکانی خۆی خستۆتەسەر. جا ئەگەر کەسێک خۆی بەکەمئەزمون، بەدەروێشێکی ئایدۆلۆژیست، بەبەرپرس لە هەندێ ڕوداو، بە تەرەف لە گەورەکردنی کێشەیەک بزانێ و لە ململانێ فیکری و سیاسیەکان دا،ئاسەوارێ بابچوک و کەمیش بێ، بگێڕێتەوە بۆشتی شەخسی و هاوکات لە هەندێ شوێن دا ڕەخنە لەتوندی هەڵوێستەکانی خۆی بگرێ و خۆی لەوردەکارییەکانی ئەو ڕوداوانە نەبان نەکات. ئیتر دەشێت مرۆڤ بواربدات تەمی گومان گەر توێژاڵێکی کەمیش بێت لەسەر ئاوەزی بەرامبەر ڕاستی و ناڕاستی وردەکارییەکانی نێو ئەو ئەزمونەبنیشێت.....!؟ پرسیارێکە و وەڵامەکەی بۆ خوێنەر و بۆ ئەو هاوڕێیانە جێدەهێڵم

کە لەڕۆژگارێکدا هاوڕێ و هاوسەفەری نوسەربوون، کەمبوون ئەوانەی شانیان دابوویە بەر گلانی ئەسپی هەرەس. بۆیە هیواخوازم ئەو هاوڕێیانە لایەکی جدی لە لاپەڕەگەش و خامۆشەکانی خەباتی ڕزگاری خوازانەی گەلێکی بندەست لە شۆڕشی نوێدا بدەنەوە،کە تا ئەمرۆ بەونی ماونەتەوە.

## فۆڕم ڕەگەزێکی گرنگی جوانکاری

گەر هەرنوسینێکی ئەدەبی، دەقێکی داهێنراو، یاداشت و بیرەوەری، هاوکێشەیەک بێت کە دووتوخم و دوو فیگەر پێکەوە بەشداربن لە پێکهاتن و هاوسەنگی ئەو هاوکێشەیەدا، ئەوا حەتمەن فۆڕم و ئسلوبی نوسین یەکێ لەلایەنە گرنگ و زیندووەکانی ئەو هاوکێشەیە دەبێت. کە ئەویش خۆی لەزمانی نوسین و هونەری وشە سازی و مۆسیقای ناوەوەی ڕستەکان و سەلیقەی ئەدەبیدا دەبینێـتەوە. ئەمەش مانای وایە هەردوو جومگەکە پێکەوە بەشدارن لە بونیاتی ئیستاتیکای (دەق)دا و هەردوو پێکەوە بڕیار لەسەر جوانی و ناشیرینی، یان بەهێزی و لاوازی دەق دەدەن. ئێستا ئیتر لەڕوانگەی ئەم چەند دێڕەوە دەتوانین بڵێین، هەرچی فۆڕمی بیرەوەری (ئەزموون و یاد)ە ئەوا بەچەندین وشەی نوێ و ڕستەی شیعری و وێنەی هونەریی، ئەوا سیحری سروشت و ڕوداووکارەسات و مەرگ و گیانەڵاکانی نێو ئەو دەقەی وا بۆ نەخشاندوین کە خوێنەر نە هەست بە مەلەل بکات و نەلەکاتی خوێندنەوەی ئەو دەقەدا توشی هیچ ماندوبون و زۆر لەخۆکردنێ ببێت. با خوێنەر هەندێ بەدیقەتەوە لەم وشانە ڕابمێنێ و هاوکات لەم ڕستە شیعریانە وردبێتەوە، ئەوکاتە ئەو ڕاستییەی بۆ دەسەلمێت گەر نوسەرێ خۆی شاعیر نەبێ و خاوەنی زەخیرەیەکی گەورەی زمانەوانی نەبێ، هەرگیز نەلەمانای ئەم وشانە دەگات و نەڕستەی شیعری لەمچەشنەشی بۆ دەنوسرێت....(کەڕەسیسە، بەلو زەوی، بەرەواژ، تخێڵ، هەتەر، چرگەنە، دەراو، ژێلاوە، بلاچە، زنار، بەندەنان، تەقەت کراو، ژدیل، ڕژد، بەرمێن، بنڕەمەن، هەراو، گەوە، شتاقیان، گرفنچیکی، قەیتولە، تراوما، پۆلو ........ هتد )

ئەم ڕستە شیعریانەی خوارەوەش شایەتی سەلیقەی ئەو ئاوەزەن .

•ئامبازی هەورازی شنروێ بووم.... ئەمە گەمەکردنێکی جوانە لەگەڵ مۆسیقای وشەدا، کە زۆر جار لەنوسینەکانی (مەلا بەختیار)دا بەدی دەکرێت.

• پێچی دوکەڵ لە قولایی ئاسمان گیر بووە ماڵبەماڵی هاوار داگیرساوە وێنەیەکی شیعری زۆر جوان .

• چۆمەکە دەستی لەدەستی من کردەوەو خێراتر لە هەناوی هەڵچووی ( سیروان ) ون

بوو.... وێنەیەکی شیعری.
•( دەرەی مەڕ )لە ئامێزی دەرەیەکی تەنگ و ڕژد و هەڵەموت دا خەوتووە ... ئاشنا بوون بەجوگرافیای دەڤەرێک بەوێنەی شیعری.
•بۆنی بەیان ( ئاخر بەیانیش بۆنی تایبەت بە خۆی هەیە..... ) ئەم دەربڕینە شاعیریەتی نوسەر دەسەلمێنێت .
•هەتا پتر بە بەژنی سورێندا هەڵدەزنێ ، ئەو پارچە پارچە پۆشاک لە خۆی دەکاتەوە و سنگ و مەمک و گەردنی ، رووت و قووت ، لەبەر تیشکی نیگات دەنێت . .... وێنەیەکی تابلێیت هونەریی و جوان
•ئەم دەستی لەسەر پەلەپیتکە داگرت و ئەو لەسەر زەردەماکەوە بە تەپا و تل تا ڕۆخی ئەو بەری سیروان خلۆر بویەوە.... سوود وەرگرتن لە هونەری سینەما
•ڕۆحی عەزیز لەسەر لەپی میزاجی ئێمە سەمادەکات ...... وێنەیەکی سریالی .
•ماڵئاوایی لەگوندێکی قژ و پۆپ خوێناوی دەکەین...... وێنەکێشانی گەورەترین ماڵ وێرانی بە یەک دێری شیعری و بەس.
•حیکمەتی مەلا بەختیار . ....( حیکمەت)سەرباری ئەوەی ناوی ڕاستی (مەلا بەختیار)ە ، کەچی لێرەدا وەک (جیناس) یش بەکار هاتووە، جوانییەک لە سەلیقەی زمان.
•لەدەشتی گوڵرەنگی شارەزوور رادەمێنم کە وەک مافوورێکی رەنگین تا چاو بڕبکات پانو پۆر لەبەر پێی سوورێندا راخراوە ....وێنەیەکی هونەری لەرێی کامێراوە
•ئێمە کەژیان ساتە وەختێک بۆمان نەخەنیبێت ، ئەستەمە لەئێستا و داهاتووشدا کەمێک بۆ ژیان پێکەنین.... چەند سانا و سادەیە لە دەربڕیندا، هێندەش قوڵە لە ماناو ناوەرۆکدا. دەکرێت خوێنەر لێکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆ سیاسی بە تەنها لەسەر ئەم دێرە بنوسێت .
•ئەم وێنە خوێناویە گەرد لێنیشتوانە ، هەمیشە بەشنەیەکی دارستانی یادەوەریم زیندوو دەبنەوە .... دووریی و تاراوگە نەیتوانیووەخەمی نیشتمان کاڵبکاتەوە.

ژیانی تاحەز کەیت زبر و دژواری شاخ و ڕەقی و تورەبون و شەڕی ناحەز و نابەرامبەر ، ئەو سروتانە بوون کاراکتەرەکانی ناو ( ئەزموون و یاد ) رۆژانە دەست و پەنجەیان لەگەڵدا نەرم دەکرد .قسەکردن و دووان لەسەر ناوچەوانی تالێهاتووی شاخ لە ڕەنگ و ڕوویەکی نەرم و نیاندا، کارێکە ئاوەز و سەلیقەی هونەری گەرەکە. چونکە گێرانەوەی مەرگی ئازیزان لە ساتە وەختێکدا کە مرۆڤ دەستی بەخۆشیا ڕاناگات ، لەو نوسەرانە دەوەشێتەوە بەسدقەوە لە گەورەیی ئەو کۆستە دەگەن و بەراستی خەم بۆ مەرگی هاورێیانی

خۆیان دەخۆن. گیانەلا و سەرەمەرگی ئازیزان، یان کۆچی بێوادەی پێشمەرگەیەک کە هێشتا یەک شەوی لەشاخدا کردۆتەوە، نهێنیەکە نەک شایەت حاڵ و بینەرانی دەوروبەر، بگرە خودی ئەو کەسەش کەمومارەسەی دەکات لە حەسرەت و حەشمەتی ناگات . کەچی نوسەر بە شێوەیەکی هێندە سیحراوی لە نهێنی ئەو حاڵەتانە دەدوێت ، ئەڵێی خۆی بەشێکە لە ڕۆحی پەلەقاژ کردووی سەرەمەرگان

* (ئەو هۆشیارەی چەند ساتێک پێش ئێستا هێزی جوانەگایەکی تێدابوو، وا لەپەلوپۆدەکەوێت و بە ئاستەم لێوانی پێ دەبزوێن... تادێت ڕەنگی زەردوو زەردتر دەبێت.... هەموو هێزی خۆی کۆدەکاتەوە و گەرەکییە تەکان بدات، کەچی سەری دەکەوێتەوە ئامێزی من..... نەرم نەرم چاوی بە چواردەوردا دەگێڕێ.... لەقوولایی ئاسمان ڕادەمێنێ ...! لەچاوانیدا دەیان پرسیاری نامەفهوم و ڕاڤەنەکراو دەبینم! کێ لەنهێنی پرسە قوڵەکانی مرۆڤێکی لە لێواری مەرگدا وەستاو دەگات..؟ ئەرێ دەشێ مرۆڤ لەو ئان و ساتەدا بیر لەچی بکاتەوە وە و حەسرەت بۆچی بخوات ...؟ پەیپێبردنیان ئەستەمە! دەست لەسەر دڵی دادەنێم، هەست بە ترپەی لێدانی ناکەم .... ئێستا چاوەکانی مۆڵەق وەستاون.... ئیدی زەمەن بۆئەو کۆتایی هات ! ئیدی کۆمەڵە، کورد و شۆڕشی نوێ، بۆئەو هیچ مانایەکیان نەما..! ) ل٣٨

(لە پشتەوە لە غەفور دەڕاوانم، خەڵتانی خوێنە. دەچینە ماڵێ و لەسەر سەکۆیەک غەفور دادەنێین. چەند گوللەیەک نێو زگیان بڕیوە. ئەو خوێنڕێژی ناوەکی هەیە و دکتۆر دەڵێت ڕەوشی ئەو مەترسی دارە. لە چاوەکانی غەفور دەڕوانم، دەست لە نێودەستی دەنێم و دەمەوێت دڵخۆشیی بدەمەوە..... ئەو سەیرم دەکات و چاوەکانی زۆر شتم پێ دەڵێن. ئەو بەنیگا ساردەکانی پێی دەگوتم زوڵمیان لێ کردم، هەموو ئەو شتانە دروستکراوبوون، من پاکترین کەسێکم کەبەداخەوە لەشەڕی نەیاراندا وادەکوژرێم).١٧١

## ئایدۆلۆژییەت ڕۆح دەکوژێت و ئاوەز کلۆم ئەدات

ئایدیاو ئایدلۆژیەت، دونیا بینی و ڕوئیای مرۆڤە بۆ شتەکان و تەلیسمێکە ڕۆح وەلاوەدەنێ و پەیامێکە مرۆ پێی وایە تەنها ڕێگایە بۆ گەیشتن بە مەنزڵ . ئەم چەمکە هەر لەسەردەمی سوکراتەوە تا ئەمڕۆ ڕۆڵی ئێجگار گەورەی لەگۆڕانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکاندا هەبوەو بەدرێژایی مێژوویش لە ناو فیکری مرۆڤایەتیدا جومگەیەکی هەرەسەرەکی و پانتایەکی گەورەی بۆخۆی داگیر کردوە. ئایدۆلۆژیەت مرۆڤ یەک ڕەنگ و یەک بین دەکات و ڕەچەتەیەکە بۆ چارەسەری هەموو برینەکان . مرۆڤی ئایدۆلۆژیست ، ئەو بونەوەرە یەک ڕەهەندەیە کەمترین

دیالۆگ قبوڵ دەکات و زۆرترین بۆچوونی خۆیشی بەسەر نەیاراندا دەچەسپێنێت. بۆیە ئەو کەسانەی کەهەڵگری ئایدۆلۆژیەکی دیارکراون، هەمیشە پێیان وایە سەرباری ئەوەی وەلامی هەموو پرسیارەکانیان لایەو دواراستی و دوا قسەش هەرلە سەبەتەکەی ئەوان دا بونی هەیە، ئەوا لەدەرەوەی روئیاکانی ئەوو بەدەر لە جیهان بینیەکەی ئەو، هیچ سەلمێندراویکی دی نیە شایەنی بڕواپێهێنانبێت بەمەش هەموو ژیان بەو گەورەو فراوانیە لەچەند ڕستەو زاراوەیەکی بچووکی نێو کتێبێدا کورت دەکەنەوە و دەبنە دەروێشکی عەودالی ڕێبی تەریقەت، نەک حەقیقەت..!

لە مێژووی دووردا سوکرات یەکێک بوە لەو فەیلەسوفانەی لەبەر پابەند بوونی بە (فەزیلەت) ەوە لەزیندان هەڵنەهات و ژەهریشی نۆشی. لەمێژووی نزیکیشدا، کەمنەبوون ئەو بیرمەندو ئایدۆلۆژیست و سیاسانەی لە پێناو پابەند بوونیان بە ئایدیای خۆیانەوە بەخەندەوە تەوقەیان لەگەڵ مەرگدادەکرد . ئەم سیحرە گەورەی نێو جیهان بینی مرۆڤ لەسەردەمی داگیرکاریدا ، دەکرێت بۆ زات و بۆ خودی ئەو کەسانەی کە هەڵگرینی زەرەری لە قازانجی زیاتر بێت. چونکە لەو رۆژگارەدا هزری ئاخنراو بە ئایدیا لەڕووی فیزیکی وە بوار بۆ خۆشگوزەرانی و تەمەن درێژی جەستە ناداو بەمەش ئەو جۆرە مرۆڤانە هێندەی لە ژیاندا کوژاندنەوە بە نسبیان دەبێ و تروسکای لەماڵی دڵیاندا بەردەوام ترپە ترپیەتی. نیو هێندە چرای ڕۆحیان تا درەگانی تەمەن ناسوتێ .

بەهەر حاڵ قسەکردن لەسەر ئایدۆلۆژیاو کاریگەری ئەم چەمکە لە نێو دنیای فیکردا ، نە کاری ئێمەیەو نە ئێرەش شوێنی ئەو چەشنە باسانەیە. بەلام بەو حوکمەی کەلەم ئەزموونەدا ئەم چەمکە بوونێکی بەرچاوی هەیە (١) و گەر نەڵێن هەموو ، ئەوا زۆرترین پرس و ئەرک و ماندووبون و سەرچڵی و مەترسیەکان و بەرەنگاربونەوەو بگرە شەهید بون و فەنابونی کارەکتەرەکانی ناو ڕوداوەکانی ئەم بیرەوەریە لەوەوە سەرچاوەیان گرتوە، کە کەسانی ناو ئەو دەقە ڕۆحیان لەدەوری قوزاخەی ئایدۆلۆژیا هەڵپێچاوەو خۆراک لەو دارە سیحراویە وەردەگرن واتە ئایدۆلۆژیا بۆتە ڕێنیشاندەری نێو ئەو رێگا تولانی و هەورازە سەخت و دژوارەی خەبات لەوێ رۆژدا . بە چەشنێ گەر ئایدۆلۆژیا لە هزری کارەکتەرەکان لەو سەردەمەدا دەرکەین و ماڵی دڵیان لەو بڕوا لەبن نەهاتوە خاڵی کەین ، ئەوا نەشۆڕشی نوێ هەڵدەگیرساو نە دەتوانراش بە پێنج تفەنگی ژەنگاویەوە بەگژ مەحاڵدا بچین بە ڕای من لێرەدا ئیتر ئایدۆلۆژیەت دەبێتە ڕزگارکەرو مانایەکی گەورەتر لە مانا قەتیسکراوەکەی خۆی دەبەخشێت بە کێشەی گەلێک. چونکە لە رۆژگارێکدا کۆمەڵە و هاوڕێیانی ڕێی ئایدیای (م-ل)

جاڕی شۆڕش و بەرەنگاربونەوەیان دا ، بەعس هیچ تروسکاییەکی بۆ ڕۆشنایی و هیچ هەناسەیەکی بۆ ژیان نەهێشت بوو . بەعس ئەو ماشێنە زەبەلاحەی عروبە بوو کە ڕۆژانە مەرگی بەرهەم دەهێنا مەرگ بەهەموو شێوەکانیەوە، مەرگی مرۆڤ مەرگی کلتور... مەرگی ڕەنگی دێ و کروپی دێ و گەلی دێ بەعس ئەو حەلە عەزیایەکی زەبەلاح بوو ، ئێمەش بێ دەسەلات و بچووک و بێ پەنا... بەعس هەموو شت بوو، ئێمەش هیچ کەچی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە بەپێوە دەوەستان و هەربەپێوەش شەهید دەبوون . بۆیە ئایدۆلۆژیا لەو سەهۆڵ بەندانەی خەباتدا، بوە یەکەمین کوانوی ئاگرو یەکەمین ژیلەمۆی ژێر خۆڵەمێشی دوای هەرەس . بەمەش گەلەکەمان لە قۆناغێکی هەرە هەستیارو مەترسیداری خۆیدا لەڕێی ڕێکخستنێکی بێ وێنەی خاوەن ئایدۆلۆژی وەک (کۆمەڵە)وە گەورەترین سودی لەسیحری ئەم چەمکەوەرگرت و ئایدۆلۆژیا بووە سەرەتای بەرەنگاربونەوەی میللەتێک کە جاڕی قڕکردنی درابوو .

چونکە ئەوە سیحری ئایدۆلۆژیا بوو، کە داستان و موعجیزەی خوڵقان و پێشمەرگە لە ڕۆژگارێکدا بەگژ ڕژمێکدا چویەوە ، دواتر بەهێرش و پەلاماری سی و دوو دەوڵەتی جیهانی ئینجا توانرا بڕوخێنرێ . کۆمەڵەو ئایدیای مارکسیزم لە هزری کادرو سەرکردەکانی دا بە جۆرێ ڕەگی داکوتابوو ، بەعس ئەو ماشێنە گەورەیەی فاشیزم بوبووە گەمەی دەستی هاوڕێیان. ئاخر براینە گەر کاریگەری ئایدۆلۆژیاو بڕوابوون نەبی بەوەی کە دوا قسەو دوا هەقیقەت بەتەنها لای ئێمەی مارکسییە ،کێ ئەتوانێ لە شەڕو ململانێکدا بڕوا بەسەرکەوتن بهێنێ کە هیچ لۆژیکێکی سەربازی سیاسی پشگیری لێ نەکات..! گەر تەلیسمی گەورەی ئایدۆلۆژیا نەبێت لە دڵی مرۆڤدا ، کێ ئەتوانێ ڕۆژانە چەندین جار ڕوەو مەرگ هەنگاوبنێ و مەرگ ڕاوبکات..! کاتێ سەرکردەکانی کۆمەلە لە زیندانا نورەبڕییان لە سەرەی مەرگدا دەکرد، ئەوە ئایدۆلۆژیایە کە هەنگاوەکانیان خێرا و لێویان بێ خەندە ناکات، کاتێک هێزێکی زەبەلاحی جەیش و جاش دەبنە ئەڵقەیەکی گڕاوی و شەش پێشمەرگە لە سەد مەتر تەختایدا حەسار ئەدەن، پێم ناڵێن جگە لە ورەی پۆڵاینی متروبەکراو بە ئایدۆلۆژیا، چ تواناو چ هێزێکە ئەتوانی لەو شەڕگەدا دوژمن ڕسواو زەلیل و خۆی ئازاد و دەرباز بکات ..! بۆیە بەهەڵەدا ناچین بڵێین... گەر ئایدۆلۆژیاو کاریگەری گەورەی ئەو چەمکە نەبوایە لەهزری هاوڕێیانی کۆمەڵە لەو ڕۆژگارەدا، نەخودی پشکۆ خەمی گەلێکی دەکردە کۆڵ و ملی بە چیاوە دەنا و نەڕووداو و وێنە تراژیدیەکانی ناو (ئەزموون و یاد)یش لەدایک دەبوون. جا گەر ئەم چەمکە بۆ هەڵگرانی سەرەخۆرە بوبێ، یان لانی کەم مرۆڤی توشی گێچەڵ و سەرئێشەکردبێ، ئەوا لەئەنجامدا بۆ هەستانەوەی گەل.....

بۆ شۆڕش و بەرەنگاری ..... بۆ بانگی نەخێر و وەستان لەڕوی داگیرکەراندا، دەریایەک بوو لەڕەوایی و مێژوویەک بوو لە پیرۆزی و قومەئاویک بوو بۆ گەروی بەپەلاس بوی گەلێک وفریادڕەسێک بوو بۆ ڕزگاربوون. بەلأم دەبێ ئەوەشمان لە بیرنەچێ، ئەم حاڵەتە لەبەرامبەر داگیرکەران چەندە دروست و لەجێی خۆیدابوو ، ئەوا لەشەڕی براکاندا، پشکۆ واتەنی.... لە ولأتی وێران و داگیرکراو دا، سیحرەکەی بەتاڵ دەبێتەوە و تەلیسمەکەی دەشکێ و پەیامی خۆی لەدەست دەدات و پێچەوانەی پیرۆزییەکەی دەسەلمێ.

* ئەو ڕۆژانە، بەعس لە هەوڵی سڕینەوەی ئێمەدا و ئێمەش لەهەوڵی بڕینەوەی یەکتردا بووین.ل٥٧

* ئەو پێشمەرگانەی پێش چەند چرکەیەک پێکەوە قسانیان دەکردوو بەیەکتر بینین گەشاوەبوون، ژیانیان کەوتنە سەر پەلەپیتکەی چەکی یەکتر.ل١٤٣

* ئێمە لەحەوشەی خوادا، لە قوللەبەرزەکانی خوادا، لە کەوشەنی حەرەمی خوادا یەکتر دەکوژین و خوداش دەستێکمان لێ هەڵناهێنێ... پەیڤێکی ڕەحمەتمان بەگوێدا ناچرپێنێ.... نەعرەتەیەکی خۆی ئاسا ناکێشێ و نافەرموێ: لەولأتی وێران و داگیرکراوتان بڕوانن. ئاورێک لە مێژووی دوور تا نزیکتان بدەنەوە و خەجاڵەت بکێشن.ل٣٧

چونکە شەڕی براکان دۆزەخێک بوو تادەهات بەچیلکە و چەوێلی دەست و پەنجەی خۆمان گڕی ئەو ئاگرەمان خۆش دەکرد. گەر کاتێکیش ئەم گەلە هێندە بەخت یاری بوایە و مۆڵەتێکی کورتی بۆ پشودان لەو دۆزەخە بخواستایە، ئەوا گەرم بوونی نینۆکی لایەک بەس بوو بۆ سەرلەنوێ قوپیاکردەوەی ئەو ئاگرە. پێم وایە هەر ئەم حەقیقەتەشە وای لە نوسەر کردووە کەلەم بیرەوەرییەدا زۆر لا لەشەڕی براکان و کاریگەری ئایدۆلۆژیا بکاتەوە و بەچەندین وێنەی هەستیار شەڕی براکان مەحکوم بکات و هاوکات بەهەندێ وێنەی ڕۆمانسیش ئاشنامان بکات کەچۆن ئەوکاتە ئایدۆلۆژیا ئەقڵی هەموومانی کلیل و کڵۆم دابوو.

*ئەو شەوە ، تابەرەبەیان لەگەڵ دایکم قسانمان کرد. من گوتم ئەو نەیبیست. ئەو شەوە، دایکم بارتەقای هەموو چرکەکانی تەمەنی فرمێسکی بەسەردا باراندم. ئەگەر بارانی فرمێسکی دایکم تیزابیش بایە، توێژاڵێک لە کێوی ورەی منێکی خوێنگەرم و بێئەزموونی نەدەڕوشاند و دڵی نەرم نەدەکردم.ل١٥

*کۆمەڵەی مارکسی- لینینی کوردستان، لە دەستور و بڵاوکراوە نهێنییەکانی خۆیدا و یەکێتی نیشتمانی کوردستانیش لە بلاڤۆکی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان بۆچی) دا، هەموو مەسەلەکانیان وەکو هێلکەی پاککراو، دەرخواردی من و هەزاران گەنجی خوێنگەرمی وەکو

من دابوو! واتە ئێمە کەلەژێر کارکردی ئایدۆلۆژیای (م.ل)و لە چوارچێوەی ڕێکخستنی پۆلاینی کۆمەڵەدا قالکرابووین و خاراو درابوین، جێگای هیچ جۆرە گومان و دڵە ڕاوکێیەکی فیکری و سیاسی لە هزرماندا نەدەبوویەوە!.ل٢١

•ئەگەر مەرگ مەودام بدات ، پەیامی خۆم ، پەیامی شار و فەنتازیای نێو کتێبەکان دەکەمە کردەی شۆڕشگێڕانەی خەباتی شاخ...پەیامی شۆڕشی نوێ ...نوێ بە فیکر و تیور، بە شێواز و ڕێباز و هەڵسوکەوت.. هەڵسوکەوت لەگەڵ خۆمان و خەڵک دا.ل٢٦

•من کە ئەوهێزە سەد کەسییەی یەکێتیم دیت کەزۆربەی لێپرسراو و کادیر و پێشمەرگەکانی کۆمەڵە بوون، ئیدی زانیم خەبات و تێکۆشانی کۆمەڵە و سەرکردە و کادرەکانی، قارەمانێتیی ڕێبەرانی لە سێدارە دراو و مەرگبەزێنەرانی، چ بەرهەمێکیان داوە و پاشتریش لە گوندەکان دا بەو ڕاستییە گەیشتم کە ڕەوشت و ئاکاری جوامێرانە و ڕەفتاری شۆڕشگێڕانەی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە و گیانی لەخۆبردنیان لە ئاست یەکتر و لە ئاست جوتیارانی هەژاری ناوچەکە، چ مانایەکی قوڵ و پیرۆزیان بە چەمک و مانای (پێشمەرگە) داوە و چلۆنیان لەبەرچاوی خەڵک خۆشەویست کردوون.ل٤٣

•وێرای دژواری و سەختیی ئەو بارودۆخەی ئەوێ ڕۆژێ، من ئێستاش هەست بەلەزەت و خۆشییەکانی دەکەم.ل٦٢

لەکۆتایدا دەڵێم، لەزەت بردن لەو ڕۆژە سەخت و دژوارانە، لەماندوبوون و پێ دزگەی شاخ و سرتەسرت و ئیختیفای ناوشارەکان، لەزەت بردنی مرۆڤ لە چرکەکانی دوای گەڕانەوەی لەکەناری مەرگ و گێڕانەوەی ئەو یادەوەرییانەی کە خەمیان لێدەتکێ و ئەڵقەیەکن لە زنجیرەی ئەو خەبات و تێکۆشانەی کە ئەمرۆی ئازادی لێکەوتۆتەوە، لەڕۆحی بەفرینی ئەو کەسانە دەوەشێتەوە کە خەمخواری ڕاستەقینەی ئەم گەلەن و لە ڕۆژگارێک دا چرای هیوایان لەقوڵایی دڵی خەڵکدا چاند، کە بەعس هەموو شتێکی لوش دابوو، هیچ نەمابوو هەرهیچ. بۆیەمنیش بارتەقای نوسەر لەزەتم لەخوێندنەوە (ئەزموون و یاد) وەرگرت و لەڕێکردنم دا لەگەڵیدا چەندە گریام، هێندەش خۆشی بەڕۆحم دا گوزەری دەکردوو وام هەست دەکرد ئەوە منم لە ئێوارەیەکی درەنگ وەختی باراناوی پایزدا بەدیار تەرمی (ڕێبوار)ەوە کز هەڵنیشتووم . ئەوە منم لەتەک هەموو ڕوداو و کارەسات و چرکەیەکی دا هەر لەسەرەتاوە هاوڕای (شێخ عەلی) گیا و گوڵ دەشێلم و بەبێ دەنگی لەنێو بێ دەنگی شەودا بەرەو بنار سەردەکەوم، نەک پشکۆ.

*لە (ئەزموون و یاد) وەرگیراوە.

١- مەبەست لە ڕۆڵی ئایدۆلۆژیایە لەو ئەزمونەی کە ئەم دەقەی پشکۆ نەجمەدینی بەرهەم هێناوە، نەک خوانەخواستە مەبەستمان زاڵی ئایدۆلۆژیابێ لە نوسینی ئەم دەقەدا.

# باوکە، رۆژگارەکانی جەنگ لەکوێ بویت؟

برِوا بەرزنجی

ساڵانی دوایی نازییەکانو ئەدۆلف هیتلەر، ئەو ساڵانەی نەوەیەک دروست بوبو، کە دەستیان نەبو لەجەنگو کوشتاری جولەکەو نەتەوەو میلەتانی دیکە، نەوەیەک نەیدەویست ببێتە شەریکی ئەو تاوانە سورانەی نەوەی پێش خۆیان یاخود باوکەکان خولقاندبویان، ئەوکاتانەی گەنجانی ئەڵمان زیاتر روداوەکانیان لارون دەبو، یان لەدوای سەیرکردنی فیلمێک دەربارەی روداوەکانی جەنگی نازییەکان (وەک فیلمی (پرد)ی دەرهێنەری نەمساوی (بێرناردویکی)، رویان دەکردە گەورەکان، یان باوکیانو دەیان پرسی: (لەرۆژانی شەرِدا چیتان دەکردو ئەو رۆژانە ئێوە لەکوێ بون؟). باوکان، دەیانزانی ئەم پرسیارە گومانێکی گەورەی نەوەی نوێیە، کە باوەرِیان بەپاکێتیو بێگوناهی باوکانو نەوەی پێشو نەماوە. چەندە سەختە وەڵامێکی راست بۆ ئەو پیرە گورگانەی جەنگ (زۆرینەیان هەرچەندە دەیانزانی وەڵامەکانیان درۆیەکی نائومێدانەیە، بەڵام وەک جەنگاوەرێکی دۆرِاو و بریندار وەک ئادەمێکی پەشیمان دەیان وت: (هەرگیز گوللەم ئارِاستەی ئامانجە راستەقینەکە نەکردوەو روی تفەنگم، لەشوێنێکی دیکە کردوەو کەسم نەکوشتوە). ئەم پرسیارو لێپرسینەوانە بەتایبەت ساڵانی (١٩٦٠) پەرەیان سەند، ئەو ساڵانەی شۆرشی (٦٨) یان هەڵگیرساند. ئەو نەوەیە بەرِادەیەک نەوەی پێش خۆیانو کۆمەڵگەکەیان خستە ژێر نەشتەری پرسیارو دادگایکردن، تا ئەو رادەیەی شەرِی سەر شەقامەکان لە (هامبۆرگ)ەوە هەڵگیرسا. شەرِ لەنێوان بزاوتی گەنجانو خوێندکارانو دواتر کرێکارانیش لەگەڵیان، بەرامبەر دەسەڵاتی ئەڵمانیو نەوە تەقلیدیو بەجێماوەکەی نازییەت. بێدەنگ نەبونو لێخۆش نەبونی گەنجانو خوێندکارانی ئەو دەمی ئەڵمان، لەباوکانو نەوە بەجێماوەکەی نازییەت، توانی ریفۆرم لەبیرکردنەوەو کلتوری ئەڵماندا بکات، بەشێوەیەک دان بەتاوانەکانیاندا بنێنو زۆرێکیان بدرێنە دادگاو وەک تاوانباری دژە مرۆڤایەتی دادگایی کران، چونکە ئەوان نەوەیەک بون بێدەنگو ملکەچ بۆ کارە قێزەونو دژە ئینسانیەکانی نازییەت، بەبەرچاوی ئەوانو بەرِەزامەندیانەوە منداڵەکانیان دەبرانە پێشی تانکی ئەمریکیو بەپۆل لەپێشی تانکەکان دەتلیقانەوە. پرسیاری ئەودەمی نەوە نوێکەی ئەڵمان، پرسیارێکی زەرورە بۆ نەوە نوێکەی ئێستای کوردستان، ئەو نەوەیەی ئێستا بەرامبەر نەوەیەک بێدەنگو شەرمن وەستاوە، کە بەشێوەیەک لەشێوەکان بەشداربون لەتاوانەکانی سەردەمی خۆیان، ئەگەر بەبێدەنگیو بێلایەنیش بوبێت. ئەو نەوەیەی

شاهیدی یاخود بەشداری یەکتر کوشتن‌و بون لەم ماڵە سوتاوەدا، بەشدار لەشەڕی دوژمن یان بەرگری لەمیللەت‌و نیشتمان نا، بەڵکو ئا لەو دەمانەی بەرگری‌و دواتریشدا تاوانی گەورەی برا بەرامبەر برا. ئەگەر گەنجێکی ئەڵمان لەسەیرکردنی فلمێکەوە تورەبون بەرامبەر نەوەی پێشو داگیری کردبێت، ئەوا بۆ گەنجی کورد کتێبی (ئەزمون‌و یاد) دەبێتە نمونەیەک‌و ئەو فیلمەی راستی تاوان‌و بێدەنگ بون لەئاستی تاوانی نەوەی پێشو و باوکەکان ببینم‌و ئیدی لەجیاتی ئەفسانەو شەهامەتەکانیان بیر لەدادگایرکدرن‌و سەرزەنشت کرندیان بکەمەوە. (ئەزمون‌و یاد) باسی براکوژی‌و سوتاندنی ئەم ماڵە وێرانە بەدەستی خاوەن ماڵەکان، لەسەختترین قۆناخی شۆڕشی نوێدا بەرامبەر دڕندەیی رژێمی بەعس دەکات. (پشکۆ نەجمەدین)ی نوسەری ئەزمون‌و یاد، کە ئەو رۆژگارە خۆی پێشمەرگەو کادرێکی سیاسی. گەنجێکی دەرچوی زانکۆو رێکخستنی ناوشاری رێکخراوێکی مارکسی‌و خوێنەرێکی خەیاڵگرتو بەئەفسانەی شۆڕشگێڕو شۆڕشەکانی ناو کتێب بوە. ئێستاو لەدەرەوەی ئەفسانەکانی ئەو رۆژگارەی چیاو دۆڵەکانی کوردستان، دیوی ناوەوەی روداوەکانی شۆڕشمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئەو وەک دکتۆرێک بەشوێن ڤایرۆس‌و بەشە نەخۆشەکانی جەستەی (شۆڕش)دا پشکنین دەکات، ئەو کاری کەسانێکی دیکە دوبارە ناکاتەوەو چیرۆکی جوامێری‌و بەرەنگاری دوژمنانمان بۆ ناگێڕێتەوە. (ئەزمون‌و یاد. نوسینەوەی مێژوی شەڕەکان، ژمارەی قوربانیەکان گەورەیی دەستکەوتەکان‌و پەسەندانی ئازایەتی‌و جوامێرییەکان نییە. لە (ئەزموون‌و یاد)دا. وردینەی شەڕو پێکدادانەکانی نێوان هێزی پێشمەرگەو هێزەکانی دەوڵەتی بەعسم وێنە نەگرتون‌و قسەو باسم لەسەر نەکردون. وەها کارێک، نە بەئەرکی خۆمی دەزانم‌و نەنوسینیش بۆمن وەها ئامانجێکی هەیە). نوسەر لەپێشەکی کتێبەکەیدا وادەڵێت، ئەم کتێبە ئاوێنەی راستیەکانی رابردوە، ئەو راستیانەی بەنادروستی‌و بەهانە هێنانەوەو خۆبەفریشتەکردن دەگێڕدرێنەوەیان زۆرجار ئاوڕیان لێنادرێتەوە. ئەو رابدرو مێژووەی دوبارەبونەوەیان هەبوەو ئەستەم نەبوە. بەهۆکاری نەبینینی برینەکان، کە تاڕادەیەک وەک سیفەتی نەتەوەیی کوردی لێهاتوە. چەمکی شۆڕش‌و شۆڕشگێڕ لەم کتێبەدا، قسەکردن‌و خوێندنەوەیەکی سایکۆلۆژیانەیە دەربارەیان، سایکۆلۆژیایی ئەو شۆڕشگێڕانەی لەشارەوە دەچونە ناو شۆڕش. شار، ئەو شوێنەی شۆڕشگێڕەکان تێیدا پڕ دەبون لەئەفسانەو خەیاڵی شۆڕش‌و شار، ئەو شوێنەی شۆڕشگێڕەکان تێیدا پڕدەبون لەئەفسانەو خەیاڵی شۆڕش‌و خۆنەمرکردن، چونیشاین بۆ ناو شۆڕش دەرونێکی ماندو نائومێدی پێدەبەخشین. شۆڕشگێڕانێکیش بەبێئەوەی ئەلف‌و بێیەکیان دەربارەی شۆڕش‌و نیشتمان‌و هیچ شتێکی دیکە خوێندبێتەوە، بەلەبەرکردنی دروشمەکانی

شۆڕش‌و هەستێکی ئەخلاقی، پێش گولەی ناو تفەنگەکانیان بەرەو روی بەعس‌و براکانیشیان دەبونەوە، ئەوان بۆیان نەبو هەمو شتێکی شۆڕش ببینن‌و ببیستن‌و بپرسن. ئەوان خۆراکی ئایدۆلۆژیا بون. سایکۆلۆژیایی ئەو شۆڕشگێڕانەی کێشە کەسێتیەکانی خۆیان دەکردە پێوەر بۆ هەڵسەنگاندنی نیشتمانپەروەری‌و خیانەت‌و خۆفرۆشی کەسانی دیکە. دەکرێت بڵێن تەنها کتێبێک بۆ تێگەیشتن لەسایکۆلۆژای شۆڕشگێڕەکان (ئەزموون‌و یاد)ە.

یەکێکی دیکە لەخەسڵەتە گرنگەکانی ئەم کتێبە، زمانی نوسینەکەیەتی، زمانی نوسینی (ئەزموون‌و یاد) زمانی نوسینی ئەو رۆمانانەیە، کە لەخوێندنەوەیان ماندو نابین، خوڵقاندنی چەند وێنەیەکی سینەماییانە لەهەر پەرەگرافێکدا، گەڕاندنەوە بۆ رابردوی دورو بەستنەوەی بەروداوەکانەوە بەشێوەی (فلاش باک) وا دەکات ئەم کتێبە لەهەمان کاتدا وەک تێکستێکی ئەدەبیش بخوێنرێتەوە. ئەم شێوازە لەنوسینی یادەوەری و مێژوی قوناغێکی هەستیار، یارمەتیدەرە بۆ نەوەی دوای ئەو روداوانەو لێکۆڵەران‌و خوێندکارانی بواری مێژوو زانستی سیاسی. ئێستاو دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە، ئیدی شۆڕش‌و شۆڕشگێڕەکانی روبەڕوی پرسیاری پڕ گومان‌و شێوەیەک لەلێپرسینەوەی مێژوی‌و ئەخلاقی دەبنەوە. نەک تەنها ئەوان بەڵکو شاهیدەکانی ئەو قوناغەیش بەجۆرێک لەجۆرەکان بەرپرسیارن.. ئێستا ئەوکاتەیە بڵێین: باوکە رۆژگارەکانی جەنگ لەکوێ بویت؟

## پشکۆ نەجمەدین یادەوەریەکان هەڵدەداتەوە

مەحمود نەجمەدین

هەمیشە خوێندنەوەی یادەوەری چێژێکی تایبەتی هەیەو جیاوازە لەبەرهەمە ئەدەبیەکانی دیکە، یادەوەری ئەدەبی، سیاسی، زۆرجار کەسایەتی ئیداری‌و خوێندەوار بەهۆی ملنلانێی ژیان‌و کارکردنەوە ژیانێکی جیاوازی هەیە، راوێژکاری وەزیرو مامۆستا ناودارەکان‌و سەرۆک‌و سەرکردەکانی شۆڕش‌و فەیلەسوف‌و زاناو ئەدیب‌و مۆسیقارو سترانبێژو ....هتد یادەوەری خۆیان لەکتێبێکدا دەگێڕنەوە، ئەویادەوەریانەی کەململانێی ژیان‌و بیروباوەڕو روداوەراستەقینەو سەمەرەکان وەک خۆی وێنەدەکێشێت زۆرترین خوێنەر لەدەوری خۆی کۆدەکاتەوە، بۆنمونە یادەورییەکانی محەمەد شوکری ئەدیبی ئەمازیغی بەهۆی ئەوەی کە راستیە سەمەرەکانی ژیانی خۆی باس دەکات لەنانی روتدا، زۆرترین خوێنەری هەیە، هۆکارەکەش ئەوەیە کە شوکری بێ ترس‌و شەرم دانپێدانانەکانی خۆی بڵاودەکاتەوە، ئەنابیس نن ژنە ئەدیبی فەرەنسی‌و کوبی بەهۆی یادەوەریەکانیەوە کەلەحەوت بەرگدا بلاوی کردەوە ناوبانگی دەرکرد، یادەوەری پتر لەبەرهەمی ئەدەبی ئەنابیس نن ی بەدونیا ناساند، داپێدانانەکانی رۆسۆش وەک ئەزمونێکی یادەوەری کە رۆسۆ باس لەژیانی خۆی دەکات، بەیەکێ لەکتێبە نێودارو نایابەکان دادەنرێت، لەبواری سیاسەتیشدا یادەوەرییەکانی چەرچڵ‌و گیڤاراو خەباتی منی هیتلەر کاریگەری خۆی هەیەو باس لەسەردەمی جەنگی جیهانی‌و شەڕە مەترسیدارەکان دەکات‌و باس لەبیروباوەڕو جەنگ‌و روداوەترسناکەکانی ئەوسەردەمە دەکەن، یادەوەری ئەدەبی هەم چێژبەخشەوهەم سودبەخشە هاوکات یادەوەری سیاسی‌و بەسەرهاتی شۆڕش‌و شەڕەکان دیسان‌و چێژبەخش‌و سودبەخشەو بۆنمونە لەخوێندنەوەی ئەم کتێبەی مامۆستا پشکۆ نەجمەدیندا ئیمەی خوێنەر هەست بەچێژی بیرەوەریەکان دەکەین‌و هاوکات سودیشی لێ وەردەگرین، دوای خوێندنەوەی ئەزمون‌و یاد بۆچون‌و بیروباوەڕی تۆی خوێنەر بەرانبەر ئەم ململانێیانەی ئەم رۆژگارە دەگۆڕێت‌و ئیدی ئەم شەقبون‌و دابەشبونەی یەکێتی بۆ دو ئاراستە گرێدراوی ململانێکانی شاخە، ئێمە لەخوێندنەوەی ئەزمون‌و یاد دا ناکرێت تەنها لایەنی ناشیرینی شۆڕش ببینین‌و بیخەینە بەرباس، بەڵام باشتر وایە ئەم دیوی پەردەو ئەو دیوی پەردە نیشان بدەین، لەم یادەوەرییانەی پشکۆ نەجمەدیندا هەست بەغەمگینی‌و نائومێدی دەکەین، وەک نوسەر دەڵێت لەشارەوە بۆ شۆڕش چومە شاخ‌و توشی چیبوم، نوسەر لەیەکەم ویستگەوە تا دواهەمین

سەرهەڵگرتن بۆ تاراوگە، وێنەیەک کە پانتاییەکی زۆری ئەم کتێبەی داگیرکردوە، وێنەیەکی غەمگین‌و ترسناک‌و پڕشەرمەزاری، ئەم کتێبە شانامەو ئەفسانەی غەم‌و عەزاب‌و مەرگە، حیکایەتی شەرمەزاری شەڕی براکوژیە، ئەوەی نائومێدمان دەکات ئەوەیە، کەئەم چیرۆکە روداوی زەمەنێکە، کەبەشی هەرەزۆری بیرەوەری شەڕی براکوژیە، ململانێی یەکێتی، کۆمەڵەوئاڵای شۆڕش‌و یەکێتی، روداوەکانی ئەم کتێبەچیرۆکی حەفتاکانی سەدەی رابردوی شۆڕشی نوێیە، هەمیشە شۆڕشی رۆشنبیرەکان مەترسیدارترە لەشۆڕشی عەشایەرو خێڵەکی، بڕوانن لەنێو ریزەکانی پارتیدا ئەم جۆرە ململانێیە بونی نیە، مەرجەعێک هەیە، ئەو مەرجەعە سەرۆکەو هەمو دەگەڕێنەوە بۆلای ئەو، وەک ئەوەی دەستورێکی نەگۆڕبێت شاپۆست‌و شابۆچون لای ئەو مەرجەعەیە، بەڵام لەنێو بزوتنەوەی سیاسی چینی رۆشنبیراندا شەڕێکی مەترسیدار لەئاکامی بیروبۆچونی جیاوازدا دروست دەبێت، یەکێتی نیشتیمانی وەک نمونەی ئەو جۆرە پارتانە کە بیروبۆچونی جیا ململانێیەکی هێندە ترسناک‌و مەترسیداری تێدا دروست دەبێت، کەبەجۆرێکە کادیرانی حیزب رۆحیان کینەو رک داگیری دەکات، ئەوەتا پشکۆ نەجمەدین باسی روداوی ئاڵای شۆڕش دەکات کەچۆن بەهۆی بیرو رای جیاواز روبەروی مەترسی یەک دەبنەوەو لەرۆژگاری سەختی خەباتدا لەلایەن هاوڕێکانیانەوە بەند دەکرێن، ناکرێت ئەم ململانێیە وەک ململانێی دەسەڵات‌و پێنەبکەین، لەم جۆرەململانێیانەدا ململانێی پۆست‌و پلەو پایە هەیەو هاوکات دڵسۆزی نیشتیمان‌و بیرورای جیاواز، واتە ململانێکان بارگاوین بەبەرژەوەندی تاکە کەس وە بەرژەوەندی میللەت، لەنێو شۆڕشدا دزو پیاو خراپ‌و داوێن پیس هەیەو هاوکات شۆڕش گێڕی پاک‌و بەئەمەک هەیە کەهەرگیز ناپاکی لەنیشتیمان‌و بیروباوەڕی خۆی ناکات، یەکێتی ئەو حیزبەیە کەجیاواز لەحیزبەکانی دیکەی هاوسەردەمی خۆی گرنگی بەبیروباوەڕ دەدا، لەژێر کاریگەری بیر کۆمۆنەو مارکسی‌و ماوە وە پەرەی بەخەباتداوە، خەباتی ئەم حیزبەکە کۆڕە رۆشنبیرەکانی شار لەگوندەکاندا پەرەیان پێدا توشی کێشەی گەلێک گەورە بوە، چەپڕەوەکانی شار لەگوندە خێڵەکی‌و عەشایەرو ئاینیدا پەرە بەشۆڕش درا، ئەم حیزبەیەکەم جار لەژێر ناوی بیری چەپڕەوی‌و مارکسی لینینیدا پەرەی بەخەباتدا، زۆرترین رۆشنبیرانی کوردی لەخۆی کۆکردەوە، یەکێک لەململانێکانی ناو یەکێتی سیاسەت‌و بیروباوەر بو، لەرۆژگارێکی وەها سەختدا سیاسەت دەخوازێت، کەهەندێک جار لەگەڵ دەوروبەردا پێچەوانەی بیروباوەڕ مامەڵەبکەیت، ئەمەش شۆڕشە، سازشکردنی هاوڕێیان لەنێوان یەکتریدا لەسەر بۆچونە جیاوازەکان‌و کادیرانی حیزب دڵسۆزی حیزبەومانەوەی حیزبەلەئەوجی شۆڕش‌و پەرەپێداندا نەک کینەی بیروباوەڕ کە بەو ئاستە

بگات یەکتری زیندان کردنی تێکەوێت، سەرباری هەموئەمانەش یەکێتی لەگەڵ ئەو کێشانەی نێوخۆیدا وەک بزوتنەوەیەک درێژەبەبون و مانەوەی خۆی دەدات، ئەزمون و یاد بیرەوەری کەسایەتی پشکۆ نەجمەدینەو هاوکات هاوڕێو هاوخەباتانی لەبیر نەکردوەو باس لەژیانی خۆیو هاوڕێکانی دەکات، لەچرکە ساتی چونە شاخ تا دواساتیماڵئاوایی بەرەو مەنفا، ئەزمون و یاد زنجیرە وێنەیەکی خویناویو کارەساتبارە، کە خوێنەر توشی غەمگینی دەکات، پشکۆ وێنەی شۆڕشێک دەکێشێ پڕە لەعەزابو ژانی شەڕی براکوژیو شەڕی بیروبۆچونی جیاواز، نوسەر لەم کتێبەدا کەهاوتای ڕۆمانێکی مەزنە واقیعی تاڵی حەفتاکان دەگێڕێتەوە، وەک ڕۆمانێکی مێژوویو ڕوداوەکان دەگێڕێتەوە، ڕوداوە تاریکو ڕۆشنەکانو ناپاکیو چرکەساتی شەهیدبون و زیندانی کردن و بەدیلگرتنی براکان و برسێتیو ڕەقبونەوەلەبەفرداو خەوی نێو ئەشکەوتو زوری ساردو نسرمو هەروەها چیرۆکی شۆڕشگێڕو خەڵکی گوندەکان و حیکایەتی پلینیۆمو کێشەکانی لەسەردەمی شاخدا، ڕوداو لەم حیکایەتەدا گێڕانەوەی چیرۆکەکانی شۆڕشو کوشتن و برینی براکان و شەهیدکردن و ناپاکی هاوڕێیان و شەڕی شۆڕشگێڕو جاشو خۆفرۆشو بەعسیەکانە، گێڕانەوەی ڕوداوە ترسناکو غەمگینەکانی سەرەتای شۆڕش تا ڕۆژگاری شەڕی ئێران عیراقو ئەنفالو کیمیابارانی هەڵبجەیە، شوێن لەم حیکایەتە ڕاستەقینەیەدا جێگیرنیەو پاڵەوانەکان شۆڕشگێڕەکان و لەشارەوە بۆ گوندو بۆ ناوچە شاخاوییەکاندا دەڕۆن، پاڵەوانەکان چەشنی شۆڕشگێڕێکی غەمگین و بەژێر لیزمە بارانی خوێندا لەگوندەکانی هەوارامانەوە بۆ خڕی ناوزەنگو بۆ نێوشارو بۆ... دەڕۆن، شوێنەکان بریتین لەهاوینەهەواری قەمان و چیای باڵانبۆو گوندی گریانەو میری سورو کانی ژنان و پارەزان و شێنێو کانی زەردو قرناقاو پشتئاشان و سەدان گوندو چەندین ناوچەو ڕوبارو هەوارگە شوێنەکانی ئەم حیکایەتەن کەنوسەر باسی ڕوداوەکانی تێدا دەکات، گێڕەرەوەی حیکایەتەکە نوسەرەو پاڵەوانەکان مام جەلال و نەشیروان مستەفاو مەلابەختیارو شێخ عەلیو دلێری سەید مەجیدوسەیفەدین هاواریو حمەعەلی فەتاحو عەلی شامارو ئەحمەد گریانەو مەحمودی حاجی فەرەجو فەرەج تریفەییو .....هتد چەند پاڵەوانێکی سەرەکی کە دەوری گرنگیان هەبوەلەڕوداوەکانداو هاوکات پاڵەوانی لاوەکی هەیە، پشکۆنەجمەدین ناوی چەندین شەهیدی هێناوە کەتا ئێستا زۆربەکەمی لەبارەیانەوە گوتراوەو نەناسراوبونە، ئەزموون و یاد بەرهەمێکی نایابەوچ لەڕوی سیاسەتو مێژوی ناوچەکەو شۆڕشی نوێو چ لەڕوی ئەدەبیاتەوە بەرهەمێکی نایابەوبەرلەوەی بچمە نێوو ڕدەکاری ڕوداوەکانەوە لەبارەی زمانی نوسینی ئەم کتێبەوە دەدوێم کە بەجۆرێکە

چێژی لێ وەردەگرین‌و هەرلەسەرەتای خوێندنەوەوە زمانی نوسینی ئەزمون‌و یاد بەجۆرێک سەرنجی راکێشام داغستانی من ی حمزەتۆفم بیرکەوتەوە، کوردییەکی پاراوو لەبێژنگ دراوو هاوکات‌و شەسازی‌و دارشتنەوەی ئەدەبیانە بەشێوەیەکی جوان‌و سەرنج راکێش، وشەسازی لەپێناوی مانائافراندن‌و وەسفی بەرزو وەسفی جوانی، لەزۆربەی بەشەکاندا نوسەر بەوەسفی سروشتی ناوچەشاخاویەکان‌و روبارو کانی دەستی پێکردوە، گرنگیەکی زۆربەوەسفی سروشت دراوە، دەقاودەق وێنەی سروشتی کوردستان دەکێشێت‌و بەجۆرێک وەسفی رێگا وبان‌و چیاو باخ‌و بێسانەکان دەکات رێک دەڵێی وێنەیەکە لەبەردیدەی خوێنەردا، لەکاتی روداوی شەڕی کۆمەلەوق م دا وێنەی روبارێک دەکێشی کەسوربوە لەخوێنی براکاندا، ئەزموون‌و یاد سەرتا پا چیرۆکی غەمگینی‌و خوێنرشتن‌و ململانێی دەسەڵات‌و بیروباوەڕو کینەیەو لەزنجیرەنیگارێکی تراژیدی دەچێت، لەگەڵ کاری وشەسازی‌و زمان‌و وەسفی سروشتی وەسفی کەسایەتی‌و چۆنێتی وەسفی کەسایەتیەکاندا روداوی لاوەکی‌و گفتوگۆ بونی هەیەو گفتوگۆی یەکەم گفتوگۆی پشکۆو دایکێتی لەبارەی پێشمەرگەو چونە شاخ‌و شۆڕش‌و دواهەمین گفتوگۆ گفتوگۆی پشکۆو هاوڕێکانیەتی لەئێران گفتوگۆی هەڵهاتن‌و سەرخۆهەڵگرتن بەرەو مەنفا، لەگەڵ چەندین گفتوگۆی دۆستانەو کینە لەدلانەی نێوکۆنفراسەکان‌و نێو زینداندا، شێوازی نوسینی ئەزموون‌و یاد بەجۆرێکە کە ئەگەر رۆماننوسەکانمان بەم جۆرە رۆمانەکانیان بنوسیبایەتەوە ئێستا ئێمە خاوەنی ئەزمونێکی ئەدەبی نایاب دەبوین، زمان‌و شێوازەنوسینێک کە وا لەخوێنەر دەکات بێ پشودان تاکۆتایی کتێبەکە بروات باشتربلێم بەجۆرێکە کە خوێندنەوەی هەربۆخۆی پشودانێکە، لەگەڵ ئەوەی روداوە غەمگینەکان ئازاری خوێنەر دەدات بەلام گێڕانەوەکان‌و زمانی نوسین‌و وەسفە سروشتیەکان ئارامی بەخوێنەر دەبەخشن، ئەزموون‌و یاد گەڕانەوەبۆ روداوە واقیعی‌و کارەساتە تراژیدیەکانی کوردلەحەفتاکانی سەدەی بیستدا، چیرۆکی شۆڕشێک پڕلەروداوی غەمگین، لەبەشی یەکەمدا سەرهەڵدانی شۆڕش‌و دەرکەوتنی کۆمەلەوبیری مارکسی‌و ماو شاباسی بابەتەکەن‌و لەبەشی دوەمدا ئالای شۆڕش شاباسی بابەتەکەیە، لەبەرگی دوەمدا زیندانی کردنی کادیرانی ئالای شۆڕش پالەوانی روداوەکانن‌و لەم بەشەدا زیندان پانتاییەکی زۆری هەیە، دەروازەی ئەزمون‌و یاد گەشتی یەکەمی نوسەرو شێخ عەلیە بۆ نێوشۆڕش هەنگاودەنێن، ئەزموون‌و یاد دوسەدو دەبەشەو هەربەشەو ناونیشانی خۆی هەیەو هەربەشە گێڕانەوەی روداوێکەو هەروەها چەند نامەیەکی ئەرشیفی نوسەر چەند وێنەیەکو چەند نوسینێکی مێژوی نیشان داوە، سەرەتا بەکورتی باسی شەڕی پارتی‌و شوعی دەکات‌و باس

لەکوشت برو قوربانیەکان دەکات، نوسەر سەرەتا لەناوچەی شارەزورەوە دەکەوێتەڕێو گەشتی ژیانو شۆڕشی خۆیو هاوڕێکانی دەگێڕێتەوە، چیرۆکی بۆمباکانی دوژمنو سوتانی چالەبەفرەکان باس دەکات، یەکەم دیداری ئەوان لەگەڵ شەوکەتی حاجی موشیردا دەبێت، لەبەشێکی دیکەدا باس لەشەهیدکردنی ئیبرایم عەزۆ دەکات لەکوردستانی باکور، لێرەوە حیکایەتی خوێنرشتنی براکوژی باس دەکات، باس لەململانێی نێوان کۆمەڵەو بزوتنەوەو خەتی گشتی دەکات، ئەو ململانێ سەختو ترسناکەی کە وەک مۆرانە ئەو بزوتنەوەیەی لەناوەوە دەخوارد ورک کینەی گەورەترو گەورەتر دەکرد، لەسەرەتاوە نوسەر زوزو پێمان دەڵێت شەڕبەردەوامە شەڕی براکوژیو ململانێی ناوخۆ بەردەوامە، ململانێو شەڕێک، کە تا رۆژگاری ئێستاش درێژەی هەیە، بەردەوامە رکو کینەکان تۆخ دەکرێنەوە، هیچشتێک ئەوەندەی ململانێی فیکری جوان نیە، ململانێ ئەگەر فیکرو پەرەپێدانو بەرژەوندی گشتی تێدابێت پێویستە بەڵام ئەگەر لەپێناوی بەرژەوەندیو دەسەڵاتو کورسی کورسی بێت ئەوە هەم بزوتنەوەکە لەناودەداتو هەم میللەت دەفەوتێنێ، نوسەر لەگەڵ گەیشتن بەشۆڕش تێکەڵ بەململانێکان دەبێتو تێکەڵ بەململانێی سوسیالیستو کۆمەڵوە دەبێتو لەشارەزورەوە باس لەچیرۆکی شەڕو کێبرکێ دەکات، تا دەگاتە شەڕی کانی ژنانو داستانی شەڕئامێزی براکوژی، بەلای کەسێکی ئاساییو کەم ئەزموونەوە ئەم جۆرە ململانێو شەڕانە قێزەونو ناشیرنو سەمەرەن بەڵام لەراستیدا وانیە ئەمەحەقیقەتە هەمیشە شۆڕشو بزوتنەوە شۆڕشگێریەکان سیخناخن بەو ململانێیانەو شۆڕش رویەکی سپی هەیەو رویەکی تەماوی هەیە کە چەندین حیکایەتی شەرمو نابەجێ لەخۆ دەگرێتو لەشۆڕشدا نمونەی ئەوپاڵەوانانە زۆرن، کە شۆڕشگێڕی ئازاو جەربەزەنو دواجار بەرژەوەندیو سامان یاخود بێزاری لەململانێی سیاسی وایان لێ دەکات بیرلەناپاکیو هەڵهاتن بەرەو بەرەی دوژمن بکەنەوە، شەقبونو دابران لەنێو شۆڕشدا شتێکی ئاساییەو بەتایبەت لەنێو بزوتنەی شۆڕشی رۆشنبیراندا چونکە بزوتنەوەی شۆڕشی رۆشنبیری بریاری تاک لایەنان قبوڵ ناکاتو لێرەشەوە فرەکوێخاییەک دروست دەبێت کە هەموئەندامێک بەمافی خۆی دەزانێت قسەی هەبێتو بەشداربێت لەبریارداندا، ئەم حاڵەتە جۆرێک لەیاخیبون دروست دەکات، لەبەشێکی دیکەی ئەم کتێبەدا نوسەر باس لەراگوازتنی گوندنشینەکان دەکات بۆ ئۆردوگاکان، لەلایەن بەعسیەکانەوە، باس لەوە دەکات کە بەعس لەهەوڵی قرکردنی کوردو کوردیش لەهەوڵی قرکردنی خۆیدابوە، چیرۆکی گرتێبەردانی گوندەکان باس دەکات لەلایەن بەعسەوە، سەردەمی ئەزمەوبرسێتیو نەبونی خواردن لەشاخ باس دەکات، چیرۆکی ئەو پیاوانە دەگێڕێتەوە، کە

هەرگیز لەرۆیشتن ماندونابن هەمیشە لەگەڕاندان لەم گوندبۆ ئەوگوند، پشکۆ باس لەشۆڕشی کۆمەڵە دەکات وەک نمونەیەک لەشۆڕشی کوباو چین لەواقیعی کوردەواریدا، ئەگەر بەش بەش باس لەروداوەکانی ئەم کتێبەبکەین دەبێت بەبابەتێکی زێدەغەمگینو تەواوی نوسینەکە لەبارەی شەڕەماڵویرانکەرەکەی پارتیو یەکێتیدا دەبێتو لەزۆربەی بەشەکانی ئەم کتێبە وێنەی خوێناوی شەڕی براکوژی ئامادەگی هەیەو کوشتنی براکان لەمێژوی شۆڕشی کورد دا هەمیشە ئامادەگی هەیە، شەڕی نێوان پارتیو شوعیو شەڕی یەکێتیو پارتی لەشاخەوە تا رۆگاری پاش راپەڕینو تا ساڵانی کۆتایی نەوەدەکان وردە وردە شەڕەکان سارد دەبنەوەو بەڵام ململانێکان هێشتا ماونو شەڕی راگەیاندن هێشتا درێژەی هەیە، ئەمانە لەنێو هەموشۆڕشێکی دونیاداهەیە هەمیشە هەلپەرستەکان دەیانەوێت بۆ بەرژەوەندی خۆیان شۆڕش ناشیرین بکەن، لەگەڵ ئەو دزوناپاکاندا شۆڕشگێڕی جەربەزە هەبوە کەسڵی لەبەعسو برسێتیو شەڕو مەرگ نەکردوەتەوەو چڵکنیو ئەسپێ بێزاری نەکردوە، بەشێکی دیکەی روداوەکان لەسەر کوردستانی رۆهەڵاتەو روداوەکان لەبارەی شۆڕشی ئیسلامی ئێرانو دەرکەوتنی کۆمەڵەیو دیموکرات لەکوردستانی رۆژهەڵات، چیرۆکی لەسێدارەدانی شۆڕشگێڕە کوردەکانی ئێران دەگێڕێتەوە، لەبەشێکی دیکەدا حیکایەتی کاک ئارامو کال ئازاد هەورامی باس دەکات وەک دو شۆڕشگێڕ کە پڕن لەجوانیو پاکی دو کەسایەتی لەشۆڕشی نوێدا پیرۆزنو خۆشەویستن، لەبەشێکی دیکەدا باس لەروداوی بینینی مام جەلالو نەوشیروان مستەفا دەکات، چیرۆکی مامەڵەی ئەو دو کەسایەتیە باس دەکات، پاشان باسی جیابونەوەی بیروباوەڕە جیاوازەکانی نێو یەکێتی دەکات، باس لەمامەڵەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانو کوردەکانی رۆژهەڵات دەکات، چیرۆکی شەڕی کوردەکانی ئێران دەگێڕێتەوەو نوسەر لەگەڵ هاورێکانی لەکوردستانی باشورەوە بۆ رۆژهەڵات دەرواتو لەوێشەوە ئامدیو دەبێتەوە، لەبەشێکی تردا باس لەشەهید فوئاد سوڵتانی دەکات وەک سیمبولێکی شۆڕش، باسی جێگۆڕکێی خۆی دەکات لەهەرێمی یەکەوە بۆ هەرێمی سێو مانگرتنی خڕی ناوزەنگو چیرۆکی چەکو جبەخانەو پەیداکردنی چەک بۆ شۆڕش، چیرۆکی دەسگیرکردنی نەوشیروان مستەفا لەگەڵاڵە لەلایەن حەمەی حاجی مەحمودو چۆنێتی ئازادکردنیو حیکایەتەکانی کۆنفراسی کۆمەڵەو کێشەکانیو ململانێکانی، شەڕی خەتەکانی نێو یەکێتیو چیرۆکی ململانێی شەخسی، چیرۆکی شەهیدکردنی ئەنوەرو شەهابو جەعفەر، بەرگی دوەمی ئەم کتێبە حیکایەتی ئاڵای شۆڕش.

ئەزموونو یاد کۆمەڵێک روداوی تراژیدیەو خوێندنەوەی ئەم کتێبەگەشتێکە بەنێو دۆزەخێکی

عەزابدەرو غەمگینداو کرانەوەی دەرگای ئەزموون‌و یاد کرانەوەی دەروازەی تراژیدیایەو نیشاندانی ململانێیەکی سەختە، نیشاندانی وێنە خوێناوییەکانە، نیشاندانی دەریایەکە لەخوێن، خوێنی کورد.

## شۆڕشەکان بۆچی وایان لێبەسەردێت؟
## دیدێکی جیاواز لەسەر نوسینەکەی مەحمود نەجمەدین‌و ئەزموون‌و یاد

پێشەوا محەمەد

***«ئەو کۆمەڵگایانەی رابردویان بیردەچێتەوە، مەحکومن بەوەی دوبارەی بکەنەوە»***

هیگل

***«ئێستا لەدڵی رابردووەوە هەڵدەقوڵێت»***

رۆلان بارت

***«بەشەر پیاو ئاگاتە ئەوەی بزانێت کێ راستە، بەڵکو دەگاتە ئەوەی بزانێت کێ بەهێزە»***
گرێتێلسە هۆلم لەرۆمانی (دڵێک بۆ مارییا)دا

لەرۆمانی (مرۆڤێک ناوی لەناواندا نییە)، نوسەری رۆمانەکە (واسینی ئەلئەعرەج)، هەڵوێستی باڵی چەکداری حزبی کۆمۆنیستی جەزایری نیشان دەدات، دەستەیەکیان بۆ رۆڵ بینین‌و بەشداری کردن بەمەبەستی ئەنجامدانی شۆڕش لەناو شۆڕشدا، پەیوەندیان پێوە دەکەن. سەرەنجام پلانی کوشتنی بەکۆمەڵ بۆ سەرجەم ئەو گروپە دادەنرێت‌و بەپلانی رێبەرانی شۆڕش لەناودەبرێن. واتا بەگشتی رەشوروتەکە بەدەست ئەوانەی دوایی خەباتی دوێنێیان پێ دەفرۆشنەوە، هیلاکو ماندوبون. ئەوان ئێستا دەستیان بەسەر سامانی وڵاتدا گرتوەو هەمو شتەکان بەموڵکو مافی رەوای خۆیان دەزانن. لەو رۆمانەدا، جەلادانی شۆڕش بۆ ئەوەی هەردەم خۆیان وەکو قوربانی دەربخەن‌و جەلادێتی خۆیان بشارنەوە، قوربانیان وەکو جەلاد نیشان دەدەن. ئەو رۆمانە لەرێگەی دەنگی بیرەوەرییەکانەوە کار لەسەر گومان دەکات‌و راستییە حاشا هەڵنەگرەکانی شۆڕش ئاوەژو دەکاتەوەو ئەفسانەی شۆڕشی ئازادیخوازی جەزائیری تێکدەشکێنێت‌و ئەوە دەسەلمێنێت شۆڕشەکان تەنیا لاپەڕەی سپی‌و بێگەرد نین، بەڵکو لاپەڕەی زۆری رەشیشیان تێدایە.

لەراستیدا ئەو دەمەی سەرقاڵی خوێندنەوەی رۆمانی ناوبراو بوم‌و لەگەڵ لاپەڕەکاندا ئاودیو

دەبوم، هەمیشە لەمێشکمدا پرسی (شۆڕشەکان بۆچی وایان لێ بەسەر دێت)، پڕ گومانو پرسیاری دەکردم، هەمیشە بەدوای ئەو کارەکتەرەی، کە دوای مردنیو بەتارمایی بەسەر روداوەکانی دوای شۆڕشەکە دێتەوە ئەو پرسیارەم چەندبارە دەکردەوە، ئاخۆ نهێنی گۆڕانو لەبارچونی شۆڕشەکان چی بێت؟

خوێندنەوەی رۆمانێکی فەنتازیو تێکەڵ بەواقیعییەتی گۆڕانی شۆڕشەکان، چێژێکی تایبەتی هەیە، لەو روانگەیەوە، کە دەشێت لەرێگەی نوسنێکی پەتی روداو و راستییەکانەوە هەندێ کێشە بێنەپێشێ، کە بەشێوازی نوسینە ئەدەبییەکەو لەچوارچێوەی ئەدەبیاتدا بونیان نییە.

بەهەرحاڵ رۆمانی (مرۆڤێک ناوی لەناواندا نییە)م خوێندەوەو بەردەوام بەدوای وەڵامی تێکچونی شۆڕشەکاندا دەگەڕام، دەمپرسی: ئاخۆ ئەوانەی دوێنێ سەرسەختانە شۆڕشیان بەرپا کردوە، لەسەرەتای دەستپێکردنیانەوە بۆ ئەوە کردویانە رۆژێک لەرۆژان بەوجۆرە لەباری بەرن؟ دای ماڵن لەهەرچی ئەو شیعارانەی بۆی جەنگاونو خەباتیان بۆ کردوە؟ یاخود ئەوە هەلومەرجێکی تایبەتەو هەمو شۆڕشەکان لەهەر کوێیەکی دنیابن مەحکومن بەوەی بەهەمان ئەو تاقیکردنەوەیەدا بڕۆن؟

بەفەرامۆشی ئەو پرسیارانەوە، بەرگی دوەمی ئەزموونو یادی (پشکۆ نەجمەدین) دەرچو. ئەگەرچی من سەرەتاو لەکاتی خوێندنەوەی (مرۆڤێک ناوی لەناواندا نییە)، هەمیشە خەیاڵم دەچوەوە سەر لاپەڕەکانی بەرگی یەکەمی ئەزموونو یاد، بەڵام لەخوێندنەوەی بەرگی دوەمداو قوڵبونەوەی زیاتری نوسەر بۆ قوڵایی روداوەکان، تەواو لەگەڵ هەردو ئەو کتێبانەدا، جارێکی تر قوڵتر ئاوێزانبومو دەستەپاچەبومەوە لەبەردەم ئەو پرسیارەی، ئاخۆ شۆڕشەکان بۆچی وایان لێ بەسەر دێت؟

لەڕاستیدا لای من رۆمانەکەی واسینی ئەلئەعرەجو یاداشتەکەی پشکۆ نەجمەدین زۆر لێک نزیکن، ئەویش لەو روانگەیەوە، کە هەردو کتێبەکەو روداو و تێکستەکەیان ئامانجی سەرەکیان روبەڕوبونەوەی شۆڕشەکانو بەبەرپرسیارکردنی شۆڕشەکانە بەرامبەر گۆڕانیانو لەبارچونیانو تا رادەیەک لادان لەو ئامانجانەی لەسەرەتاوە خەباتیان بۆ دەکرێت. هەردو تێکستەکە، هەڵوەستەکردنە لەسەر دنیایەک، کە شۆڕشەکان لەناویدا بۆی دەژینو خەباتێک، کە بۆی دەکەنو ئامانجێک بۆی دەژینو دواتریش لەبارچونێک، کە چاوەڕوان ناکرێت. لەیەکەمیاندا لەبەردەم کارەکتەرێکداین کە دوای ماڵئاوایی لەدنیا رۆحەکەی دێتەوەو سۆراغی دەرەئەنجامی ئەو بەڵێنو فەزا بەهەشتییە دەکات، کە شۆڕشیان لەپێناودا کردوە، لەدوەمیشیاندا لەبەردەم قەڵەمی نوسەرێکداین، کە خودی خۆی یەکێک بوە لەخەباتکارانو بەشدار لەهەر جوڵەیەکی

شۆڕشەکەیان. ئەوەی، کە هەردو تێکستەکە زۆر لێکنزیک دەکاتەوە، بێشک قسەکردنە لەسەر هەمان ئەو پرسیارەی، کە لەمێشکی مندایە، ئاخۆ نهێنی لەبارچونی شۆڕشەکان چیبێت؟
دیارە واسینی ئەلئەعرەج بەهەر هۆیەک بوبێت، بەویست بوبێت یان لەژێر جەبرو ترسی راستەوخۆ دەستخستنە سەر روداوەکان بێت، هاتوەو لەرێگەی ئەدەبەوە دیوە راستەقینەکەی دوای شۆڕش‌و ئەو روداوانەی وێناکردوە، کە دواتر لەسەر دەستی خەباتگێڕان‌و خودی شۆڕشەکان بەرپادەبن. بەڵام پشکۆ دێت‌و خودی خۆی هەمان سیناریۆ لەرێگەی کامێرەی چاوەکانی خۆیی‌و دیوە راستەقینەی روداوەکانەوە بۆ ئێمە دەگێڕێتەوە. ئەگەر واسینی ئەلئەعرەج راستەوخۆ لەرێگەی ئەدەبەوە پەنجە بخاتە سەر ناتەواوی‌و برینەکانی شۆڕش‌و دەرئەنجام‌و هەڵەکانی دەستنیشان بکات، ئەوا خاڵێکی درەوشاوەی یاداشتەکەی پشکۆ نەجمەدین ئەوەیە، خودی خۆی ئەگەرچی لەناو بڕیارو کردەوەکانیشدا بوبێت‌و بەشێک لەبەرپرسیارێتییەکانیشی بکەوێتە سەر، بەڵام هەر پەنجە دەخاتە سەر هەڵەکان‌و پێمان دەڵێت «لەو شوێنەدا هەڵەمان کردو نەدەبو ئەو بڕیارەمان بدایە». ئەمە بەلەبەرچاو گرتنی ئەو هێچزەی تێکستەکەی پشکۆ نەجمەدین هەیەتی، کە وەکو خۆم بەیەکێک لەشاکارە ئەدەبییەکانیشی دادەنێم!
هەوێنی ئەم نوسینە
لەڕاستیدا هەر دوای خوێندنەوەی دوبارەی (ئەزموون‌و یاد)، حەزم دەکرد نوسینێکی تێروتەسەلی لەسەر بنوسم، بەڵام هەرچەندم کرد، وا بەئاسانی نەمدەتوانی لەچ ئاستێکداو لەکام روانگەو لەچ دیدگایەکەوە دەتوانم ئەنجام گیرییەکی لێ هەڵێنجم‌و بتوانم لەرێگەی ئەو دەرئەنجامەوە، وەڵامی ئەوە بدەمەوە، ئاخۆ شۆڕشەکان بۆچی بەو دەردە دەچن؟ بەڵام ئەوە کارێکی هەر وا ئاسان نییە، بۆیە کۆڵمداو بەئێستاشەوە هیوادارم لەمەودایەکی نزیکدا بگەڕێمەوە سەری‌و ئەو کارە بکەم.
هەوێنی نوسینی ئەم وتارە، نوسینێکی هاوڕێم مەحمود نەجمەدین بو، کە لەپاشکۆی رەخنەی چاودێردا بڵاوی کردۆتەوەو بەپانتایی لاپەڕەیەک قسە لەسەر ئەزمون‌و یاد دەکات.
دەمەوێت سەرەتا ئەوە بڵێم، چەندینجاریش لێرەو لەوێ ئەوەم وتوە، نوسین کاتێک دەبێت بڵاوبکرێتەوە، کە نوسەرەکەی قەناعەتی تەواوی بەوە هەبێت، لەنوسینەکەیدا شتێک دەڵێت بۆ خەڵکی تازەیەو نەوتراوە، پێویستە نوسینێک، کە لەسەر رۆمانێک، کتێبێکی یاداشت یان هەر کتێبێکی تر دەنوسرێت، زیادەیەک بخاتە سەر ئەو تێکستەی لەسەری دەنوسرێت، وا لەخوێنەر بکات تێڕامانی بۆ تێکستەکە قوڵترو زیاتر بێت، یان هەندێ کۆدو شفرەی ناو تێکستەکە بۆ خوێنەران بکاتەوە، کە لەتوانای هەمو خوێنەرێکدا نییە بتوانێت بگاتە ئەو ئاستەی

تێگەیشتن. بەدەر لەم چەند خاڵە، نوسین لەسەر هەر تێکستو کتێبێک، جگە لەدوبارەکردنەوەو درێژکردنەوەی هەمان قسەو بەسەرهاتی ناو تێکستی لەسەر نوسراو، هیچ شتێکی تر نییەو هیچ زیادەیەک ناخاتە سەر تێگەیشتنی خوێنەر بۆ تێکستەکە.
لەلایەکی تریشەوە، کاتێک نوسەرێک بیەوێت لەسەر تێکستێک بنوسێت، مەرج نییە ئەو نوسەرە بێتو تەواوی تێکستەکە شەنو کەو بکاتو پێی وابێت ئەگەر لەیەکەم وشەو رستەوە تا دوایین وشەو رستە لەسەری نەنوسێت ئەوا هیچی نەنوسیوە، نەخێر بەڵکو دەبێت تەواو بەپێچەوانەوە بێت. واتا دەکرێت لەتێکستێکی ٥٠٠ لاپەڕەییدا تۆ بێیتو تەنها لەسەر رستەیەکی ناو تێکستەکە، یان لەسەر تەنها وێنەیەکی بوەستیتو شیکاری بکەیت. لەبەرئەوە نوسین لەسەر تێکستێکی گەورە، فرە رەهەند، قوڵو فرە ئاڕاستەو جێکردنەوەو باسکردنی لەتەنها یەک وتاردا، بێجگە لەوەی کارێکی نەکردەیە، هاوکات بەبڕوای من زەرەرێکی خراپیش لەتێکستەکە خۆی دەدات. چونکە لای هەموان ئەوە ئاشکرایە، کە ناکرێت لەرێگەی وتارێکەوە تەواوی تێکستێک شەنو کەو بکەیتو تەواوی دیوە نادیارەکانی هەڵبدەیتەوە.
کورتەی باس ئەوەیە، نوسینەکەی مەحمود نەجمەدین لەسەر ئەزمونو یاد، نوسینێکە، کە دەتوانم بڵێم لەو نوسینانەیە، کە لەسەرەوە باسم کرد، واتە نوسینێکە شتێکی تازەی لەسەر ئەزمونو یاد نەوتوە.
بەبڕوای من نوسینەکەی مەحمود کورتکراوەیەکی کەمی نوسینەکەی پشکۆ نەجمەدینە، واتا کاک مەحمود هاتوە هەمان ئەو شتەمان بۆ باس دەکاتو هەمان ئەو روداوانەمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە هەرکەسێکی تر لای خۆیەوە کتێبەکە بخوێنێتەوە، هەمان ئەو تێگەیشتنەی لا دروست دەبێت، کە کاک مەحمود لەسەر ئەزمونو یاد نوسیویەتی. بەواتایەکی تر، ئەرکی نوسینی رەخنە بریتی نییە لەگێڕانەوەی دوبارەی ئەوەی لەناو تێکستێکدا هەیە وەک خۆی، بەڵکو باس کردنو دۆزینەوەی مانا گەلێکو دەلالەتێکە، یان کردنەوەی چەند کۆدێکی نادیارو نا رونی تێکستێکە، کە هەندێجار خودی نوسەری تێکستەکە خۆشی درکی پێیان نەکردوە.
بۆیە لەم روانگەیەوە، مەحمود نەک ئەو کارەی نەکردوە، بەڵکو بەهۆی ئەوەی خۆی لەقەرەی باسکردنی تەواوی کتێبەکە داوە، نوسینەکەی هاوڕێم پەلەپەلو تێکەڵو پێکەڵی پێوە دیارەو سەرەتاو کۆتایی نادیارە، هەوڵی داوە تەواوی ئەوەی پشکۆ نەجمەدین لەدو بەرگدا وتویەتی لەوتارێکدا جێی بکاتەوە، بەڵام لەو هەوڵەیدا سەرکەوتو نەبوە. ئەمەشە وای کردوە کاک مەحمود نەتوانێت بەئەندازەی پێویست لەگەڵ تێکستەکە بڕواتو قوڵبێتەوە، بۆیە دەکرێ تەواوی نوسینەکەی لەیەک چوارچێوەدا کۆبکەیتەوە، ئەویش گێڕانەوەی ئەوەی چی

خوێندۆتەوە، نەوەک نوسینو شیکاری ئەوەی خوێندویەتییەوە.

مەبەست لەم نوسینە

ئامانجی ئەم نوسینەش هیچ کات قسەکردن نییە لەسەر خودی مەحمود نەجمەدین، بەڵکو قسەکردنە لەسەر نوسینێک، کە بەبڕوای من دەکرێت قسەی زیاتری لەسەر بکرێتو رەنگە پێم وابێت کاک مەحمود ئەو حەقەی پێنەداوە.

لەلایەکی ترەوە، ئەو کتێبەی پشکۆ نەجمەدین بەئاشکرا ئەوەی پێوە دیارە، کە لەگەڵ ئەوەی هێواش هێواش روداوەکان شەنو کەو دەکاتو دەیانگێڕێتەوە، بەڵام بەرپرسیارێتییەکی گەورەش روبەڕوی ئەو شۆڕشەو کارەکتەرەکانی دەکاتەوە، بۆیە قسەکردنیش لەسەر ئەو کتێبە، پێویستە بەئاراستەیەکدا بێت، کە شیتەڵییەکی بەرپرسیارانە بۆ روداوەکان بکرێتو هاوکات شا باسی سەرەکیش دەبێت پرسی چۆنو بۆچی بێت لەقسەکردن لەسەر هەر روداو و پێشهاتێکی ئەو کتێبەدا. واتا قسەکردن لەسەر ئەو کتێبەدەبێت قسەکردنێکی پرسیار ئامێزانەو بەرپرسیارانە بێت، بەو مانایەی لەگەڵ باسکردنی بڕیارو روداوێکدا بپرسیت ئەو روداوە بۆچی هەروەها چۆن رویدا؟ ئەمەش بەو ئامانجەی هۆکارەکانو زەمینەی بڕیارو روداوەکان شیبکرێنەوەو بەو شێوازەش دەتوانرێت پەنجە بخرێتە سەر هەڵەو ئەو تەشەنوجانەی رویانداوەو دەشیا ئەگەر بەشێوازێکی تر بیریانلێبکرایەتەوە (وەک پشکۆ نەجمەدین خۆی دانی پێدادەنێت) روداوەکان جۆرێکی تر بونایە، نەوەک بێیتو هەمان ئەو گێڕانەوەیەی لەکتێبەکەدا هەیە دوبارەی بکەیتەوە.

من لەو روانگەیەوە، کە دەکرێت ئەو کتێبەبەئاراستەیەکدا بخوێنرێتەوەو لێیبکۆڵرێتەوە، کە بەتایبەت بۆ نەوەی ئێمە بەرچاوڕونییەکی زۆر گەورەو کاریگەرمان لەسەر شۆڕشو کارەکتەرەکانی رابردو بداتێ، ئەم وتارەم نوسی، پێشموایە نوسینەکەی کاک مەحمود ئەو ئامانجەی نەپێکاو منیش ویستم بەشدارییەکی بچوک لەگەڵ کاک مەحموددا بۆ دەرخستنی ئەو راستیانە بکەم. هەڵبەت کاک مەحمود دەیتوانی وەکو عەرزی ئەو کتێبەچەند سەد وشەیەکی بنوسیایەو ناوی عەرزی لێبنایە، بەڵام کاتێک لاپەڕەیەکی رەخنەی چاودێر دەنوسیت ئەوە لەعەرزی کتێب دەچێتە دەرەوەو دەچێتە بواری رەخنەوە، یان رانانێکەوە، بەڵام ئەو نوسینەی کاک مەحمود نەیتوانیوە ئەو ئامانجە بپێکێتو ببێتە وتارێکی رەخنەیی، شیکاری، یان رانانەوە.

لەکاتێکدا هەمو ئەوانەی ئەزموونو یاد دەخوێننەوە، شایەدی ئەوەی بۆ دەدەن، کە ئەو کتێبەشایەنی زۆر لەوە زیاترەو پێویستە زۆر وردترو هەستیارانەتر مامەڵەی لەگەڵدا بکرێتو نەک تەنها روکەشی روداوەکان، بەڵکو باکگراوندی پشتی بڕیارو روداوەکانیش ببینرێتو

بخوێنرێنەوە.

*واسینی ئەلئەعرەج، مرۆڤێک ناوی لەناواندا نییە، وەرگێڕانی سەباح ئیسماعیل، چاپو بڵاوکردنەوەی دەزگای ئاراس، ل ١٢

yahoo.com@١٩٨٨_Peshawa

# یادەوەریەکانی پشکۆ نەجمەدین
# لە کۆی (یادی و ئەزموون)دا
# تێڕمانینێکی سۆسیۆ سایکۆلۆژی مێژوویی

ناسۆ بیارەیی
هاوینی ٢٠٠٨ سوید

یادو ئەزموونەکانی پشکۆ نەجمەدین و من.
یادەکانی، گێڕانەوەکانی بۆ هەموو منێکی بوو بە پێشمەرگە، لە و تەمەنەی ئەودا خۆم دێتەوە، کاتێک هێشتا ڕیشم دەرنەکردبوو باوەشم کرد بە شاخدا تاکو ئاواتی چینی کرێکاران و زەحمەتکێشان بهێنمە دی، هەرچەندە دوای چەند مانگێک بۆم ساغ بووەوە کە کوردستان داگیرکراوە و دەبێت ڕزگار بکرێت، هەرچەندە وەکو زۆربەی پێشمەرگە، تووشی ترواما(داخورپان) و کارەساتی شەڕ بووم و تا ئێستاش وەکو زەنگێکی ترسناک لە ساتەکانمدا دام بوونیان داسرپێتەوە. هێشتا ڕۆخساری دایکم لە بەر چاوە کاتێک پێکەوە بەرەو بناری هەورامان، لە ڕێکەوتی ٤-١٢-١٩٨٣ گەیشتینە بنەکەکانی پێشمەرگە لە کەڕەچاڵ، ئەو( دایکم) بە شانازییەوە ووتی: ئەم کوڕەمتان بۆ خەبات دەدەمە دەست و لەو ڕۆژە چەند جارێک نەبێت، نەمدییەوە، تاکو ساڵی ١٩٩٤ هەواڵی کۆچی دواییم بۆ هات.

## بۆچی تێڕوانینێکی سۆسیۆسایکۆلۆچی؟

سۆسیال سایکۆلۆژی ئە زانستەیە کە پێوەندی نێوان کۆمەڵگە و تاک دەستنیشان دەکات، کاریگەری کۆمەڵگە لەسەر تاک و تاک لە سەر کۆمەڵگە. سۆسیاسایکۆلۆژی دەکەوێتە نێوان زانستی دەروونناسی و کۆمەڵناسی. لەم تێڕمانەدا لەسەر یادەکانی پشکۆ نەجمەدین، گرنگە کاریگەری پێوەرەکانی کۆمەڵگەی کوردی و ئەو هێزانەی کە ڕەفتاری تاک دروست دەکەن و دەخەملێنن، بخرێتە ڕوو، بۆ ئەوەی نووسەر وێنەیەکی پوختەی بکەوێتە بەردەم کە تا چ ئاستێک و چۆن، کۆمەڵگەی کوردی خۆی بەرهەم دێنێتەوە.
کۆمەڵگە ئەو کارگەیەیە کە تاکەکان بەرهەم دێنێت و لە پێوەرو نۆرمەکانیدا کۆتیان دەکات ( Stvens دیمانەی سۆسیال کۆنستکترەکتیفیزم، لاپەڕە ٢٥٩)، ژیانی مرۆڤەکان گرێدراوە بە سۆسیوکلتورەی کە تێیدا دەژین و کەسایەتێکی کۆلەکتیڤیان بۆ دروست دەبێت و بەو پێوەرانە هەڵس و کەوت دەکەن کە کۆمەڵگەکە بۆی داناوە. کەواتە بوونی شەڕی خۆ کوژی چەند ساڵەی کورد کە ناوی بەشەڕی

براکوژی ناوبەنگی مێژوویی هەیە، بەرهەمی ئەو پێوەرانەیە کە کۆمەڵگەی خێڵەکی و پاشکەوتوو، کە جڵەوی تاکەکانی خۆی پێ بەستووەتەوە. لێ ئێمە هێشتا لە ماڵی خۆمان نەبووینەتە خاوەن ماڵ ، بەڵام زۆرانی ئەوەمانە کە کامان ئەوەی دی بدا بە زەویدا و ملی بشکێنێت. . لە خوێنماندا شەتاوی دووبەرەکی و قین فیچقەی دێت و دەڤەرێکی تیا نیە بەخوێنی ئێمەی برا سوورنەبووبێت. لە هۆشماندا مێخی پێوەرە شەرخوازەکانی بنەماڵە چووەتە خوارەوە و کوشتنی برا و خۆشکەکانمان لا ئاساییە تاکو داوای مافمان لە داگیرکەرانی کوردستان. هێندە ئەو پێوەر و نۆرمانەی بنەماڵە و خێڵمان لا خەستە، کە گوێکانمان ووشەی یەکتر نابیستێت، تەنها ئاژاوە و شەڕ نەبێت. زۆربەمان تووشی تراوەمای خێڵ و بنەماڵە و سەرزک بووین و هۆشی لێ بڕیووین، بووەتە باس و ڕەفتاری ڕۆژانەمان. ئەم بۆچونە تەواو لەگەڵ بۆچەنەکانی نیتشەو فرۆید دا یەکانگیرن. کاتێک، کەلتور، پێوەری و داب و نەریت بە زیندان دەزانن بۆ تاکی کۆمەڵگە و لەبن دەرهێنانی هۆشیاری(یوهانسۆن۲۰۰۱ لاپەڕە۱۵)

هێڵی سەرەکی یادەوەریەکانی نووسەر:

•ژمارەی ئەزموونەکان ٦٦ و کامێرای گەڕانەوەی ماتریاڵ و دیمەنەکان

پێش شەهیدبوونی شاری هەڵەبجە، گەنجێکی خوێن گەرمی هەڵگری تیۆریەکانی مارکس و لینین و بە خەوی بەدیهێنانی شۆڕشی سوور و داپەروەری کۆمەڵایەتی، لە پارچەیەکی پڕ کینەو دووبەرەکی خێڵەکی، پاش بینینی ستەم هەژاری، داش بەتاڵ، هەرەس، نسکۆ، کارەسات، جەوری خێڵ و نەوخوێندەواری، ڕۆ دەکاتە شاخ بۆ لاسایی کردنەوەی ماو (بڕوانە لاپەڕە ۱۵۲ هەرەسی ئەیلول) و کاسترۆکانی ئەوپەڕی دونیا، کە لە دوا تەمەنی ژیانیاندا بوونە دیکتاتۆرێکی دڵڕەق. .یادەکانی ئەو گەنجە لاسارە و سەرەڕۆیە، پیاوە هێمنەکەی ئەمڕۆ لە ۲۷۲ لاپەڕەدا توانیویەتی جێگەی بەشی یەکەمی ئەو چەند هەزار یادەوریانە بکاتەوە کە تەنها هی ئەو نین و میللەتی ژێر دەستەی کوردیش خاوەنیانە. م پشکۆ توانیویەتی بەشێوەیەکی تاڕادەیەک باش دیمەنەکان و ڕووداوەکان وەکو کامیریەک بکاتە ووشەو لە گەنجینەی مێشکیدا بۆ دونیای بوون دروستیان بکات.

•بوون بە پێشمەرگە

بوون بەپێشمەرگە، یان گۆڕینی جۆری تێکۆشان لە خەباتی ڕێکخراوەییەوە بۆ بوون چەکدار، هەر لە یەکەم ڕۆژەوە ئەو لاوە خوێن گەرمە دەخاتە کۆمەڵێک کێشەی ناوخۆە(intra) وە و جیوازی نێوان پراکتیزەکردنی ئەو تیۆریانە کە هانیان داوە و کلیلی چارەسەرکردنی میللەتەکەی تیادا بەدی

دەکات. لەلایەکی دییەوە دەکەوێتە ناو کێشەکانی نێوان خۆی و کۆمەڵگە سیاسیەکەی(inter)وە، کێشەکانی جەلالی کۆنترا مەلایی تەنگی پێ هەڵدەچنن و شەڕی براکان هیوای گەیشتن بە ئامانج لاواز دەکەن و تیۆریەکانی مارکس و ماوی لا دەشێوێنن. نووسەر خۆی وەکو ئامێرێک دەبینێت بۆ بەرهەم هێنانەوەی ئەو سانسۆرە خێڵەکی و بنەمالەییەی کە کۆمەڵگەی کوردی، لە سەر تاکەکان دروستی کردووە بۆ کۆنترۆڵکردنی دەروونی و جەستەیی(سایکۆلۆژی و فیزیکی)یان کە خشتەیەکی نەگۆڕ رەفتار و بیریان بگوشێت و لە دەرەوەیدا نەتوانن پەی بە دنیای ئازاد و رەها ببەن. مەترسی دروستبوون ئەو خشتە نەگۆڕە ئەوەیە ، کە دۆخی دۆگمی و نەگۆڕی لە نێو گروپێک خێڵێک و کۆمەڵگەیەک پێک دەخات ، کە دەبێتە ئەنجامی خۆ پەراوێزکردن و سەیرکردنی ئەوانەی دەرەوە بە نەیار، (سڤێد بەرگ ٢٠٠٣، ل٢٠٩٧-٢٢٣). بە تاڵکردنەوەی تاکەکان لە هەموو خوێنێک، بوونێک و کەسایەتێکی تۆکمە، ئەو هەستەیان لا دروست دەکات، کە سەرەوەری و مانەوەی هەرەوەزی (گروپ، خێڵ و بنەماڵە..هتد) پێش خۆیان دەبێت و وەکو مرۆڤێک نامۆیان دەکات بە بوونی خۆیان ، هەمان سەرچاوە( سنوورەکانی خودی تاک، لاپەرە١٦٦ تاکو ١٧٥). کەواتە لێرەدا بارێکی ئاساییە کە نووسەر، زوو هەست دەکات بەو نۆرم و پێوەرانەی کە کۆمەڵگەی کوردی دەبن بەرێوە، لە یاساکانی خێڵ و بنەماڵە لە تۆڵە، رق، سۆز، بەستەری خوێن تێپەرناکات.

• جیاوازی نێوان شارو لادێ لە دۆزی کێشە سیاسیەکاندا

نووسەر راشکاوانە باسی جیاوازی کێشە سیاسی و خێڵەکیەکان لە نێوان شار و لادێدا دەخاتەرو کاریگەریان لەسەر خەباتی سیاسی +چەکداری. جیاوازیەکان لە شاردا بە بەیڤ و دوور لە بەکارهێنانی چەک خۆیان نیشان دەدا، بەڵام لە تاریکستانی ژیانی پارتیزانیدا(لادێدا) دەبوونە تیغی فیشەک و براکان لە نیوان چەند بەرەیەکی پەرتەوازەدا(مەلایی جەلالی، حسک و پاسۆک و ئیسلامی، شیوعی، بروانە لاپەرە ٤٣) و دابەش دەبوون و ئەنفالێکی وەکو پشت ئاشان و هەکاریان بەرهەم دەهێنا و هەزارانی وەکو ئەحمەد گریانە و مامە رێشە دەبوونە کاوری قوربانی بۆ رازیکردنی سەرۆک خێڵ و بنەماڵە.

## •گیانی تۆڵەسەندنەوەو بۆسەدانان بۆ براکان، بەستەری خوێن و بنەماڵە

لە کۆمەڵگە کۆلەکتیف و هەرەوەزیەکاندا تاک سەروەری خۆی لەدەست نیە و بەستەری خوێن و پێوەری بنەماڵە و خێڵ باڵا دەستە و سەرۆک بنەماڵە و خێڵ خاوەنی هەموو بڕیارەکانە. لەو جۆرە کۆمەڵگانە کە تاکەکان بوونیان نیە و دەبنە سووتەمەنی بۆ مانەوەی بنەماڵە، گیانی تۆڵە سەندنەوە دیاردەیەکی دیار و ڕونە. لێرەدا نووسەر ئۆستایانە توانیوویەتی دیاردەی تۆڵەسەندنەوەی خێڵەکی و بنەماڵەیی لە ناو ئەو هێزە بزوێنەرانەدا وێنەبگرێت کە چۆن کارئەکتەرەکان بۆ سوودی خۆیان دیسایینی دەکەن: بڕوانە شەڕی کانی ژەنان(گورزی تۆڵە!) لاپەڕە ٧٣ تا ٧٩ کە چۆن هەڵگرانی بیری مۆدێرن(کۆمەڵەی مارکسی لینینی) دەبنە سووتەمەنی بڕیار سەرۆک خێڵ(جەلالی و مەلایی) کە چۆن لە گەرمەی خەودا براکان یەکتر دەکوژن و بەها مرۆڤایەتیەکان لە دەست دەدەن و دەگەڕێنەوە سەر دۆخی ئاژەڵ. لێرەدا هەردوو لا بکوژ و قوربانی هوشیاری خۆیان لە دەست نیە. هەروەها خودی نووسەریش دەبێتە قوربانێک و لە شەڕی خێڵەکیدا بەشداری دەکات. نووسەر توانیویەتی وێنەی بەرهەم هێنانەوەی داب و نەریتی خێڵەکی کوردی بخوێنێتەوە و کە چۆن ساڵ دوای ساڵ بەدەست ئەو بنەماڵانە لە کۆمەڵگەی کوردیدا دەژێتەوە. ئەو گێڕانەوەیەی نووسەر لەگەڵ ئەنجامگیری توێژینەوەکانی پێرە بۆردیۆ(١٩٣٠-٢٠٠٢) کە کۆمەڵناسێکی فەرەنسیبووە هاوگیر دەبێتەوە کە دەڵێت: دەسەلاتی سیمبۆلیی کۆمەڵگە بەدەست ئەو هێزانەوەیە کە زاڵن بەسەر پێوەر و نۆرمەکاندا، (بڕوانە لاپەڕە ٤١٤ تاکو ٤١٥ تیۆریرکانی کۆمەڵگە، Andesrson & kasperson ٢٠٠٤).

بەرهەم هێنانەوەی ئەو پێوەرانەش پێوەندی بە ئاستی گرێدانی خوێنی نێوان تاکەکانی ئەو خێڵە یان بناماڵەیە هەیە و تا چەند بۆ سەرۆک یان دەسەلاتدارنیان ملەکەچن. ژیانەوەی گیانی تۆڵەسەندنەوەی بۆ نموونە نێوان خێڵەکان، پارتییەکان و بنەماڵەکانی ناو گەلی کورد، پێوەندێکی ڕاستەوخۆی هەیە بەو فاکتەرانەوە کە دەبنە هۆکاری ژیانەوەی ئەو پێوەر و داب و نەریتە کۆنە بەدرێژایی ساڵەکان.

## ئەکتەرێکی دیاری یادەکان و شەڕی کورد کوژی

«ئەوشیروان، پێی وابوو ناکۆکی لە گەڵ پارتی و ماڵباتی بەرزانیدا سەرەکییە و ئەوان لە بەرەی دژە شۆڕشدا وەستاون.!» بڕوانە سەرەتای لاپەڕە ٢٠٨.

پشکۆ زۆر جار هەوڵی داوە ئۆبجەکتیڤانەو بێلایەن ڕووداوەکان بگێڕێتەوە و وەکو تەماشاکەرێک لە تەرازووی بۆچەنەکانی هەڵیان بسەنگێنێت، تارادەیەکی باش سەرکەوتنی بەدەستهێناوە. نووسەر لە لاپەڕە ١٥٤ تا ١٥٧ باسی ڕەفتاری شەڕانگێزی ئەوشێروان موستەفا دەکات . کاتێک خۆی، پشکۆ و چەند ئەندامێک سەردانی دەکەن( ئەوشێروان موستەفا کە سکرتێری کۆمەڵە دەبێت، مۆن

و تورە. رەخنەی ئەوەیان لێ دەگرێت کە بۆچی دیلێک لە دەستیان رای کردووە و پشکۆ هاوڕیانی بە ترسنۆک ناوزەد دەکات). نووسەر بە پێچەوانەی سەرکردەکەیەوە(نەوشیروان موستەفا)دژی دیل کوشتن و کینە هەڵگرتن بووە. بەڵام سەیرە کە نووسەر ساڵانێکی زۆر توانیویەتی سەرکردەیەکی وا پەسەند بکات، کە ئاگری تۆڵە نەک شۆڕش فێری پارتزانەکانی کورد بکات و سەنگەری بێدەنگی هەڵبژێرێت. تەنانەت کارنەکتەرێکی بەرزی وەکو مەلا بەختیار ئاگای لەو راستییەبووە کە تاچەند نەوشیروان موستەفا، مرۆڤێکی دڵ پڕ کینەو و رەق بووە، لاپەڕە ١٥٥ تا ١٥٧ کەواتە لە شەڕی براکاندا، هەموو بە پێی پلەی لێپرساوی تاوانبارن لە بە فیڕۆدانی خوێنی لاوانی کورد. لێرەدا ئەوە دەردەکەوێت کە چۆن کۆمەڵگە تاکەکان بەپێوەرەکانی خۆی، لە قاڵبی بنەماڵە و خێڵدا پەروەردە دەکات بۆ بەرهەمهێنانەوەی خۆی. سەرانی کورد کارامانە تا ئەمڕۆش ئەندام و لایەنگرانیان بە قازانجی تایبەتی خۆیان پەروەردە دەکەن، ئەمەشە(بەرهەمهێنانەوەی پێوەرە دڕندەکانی بنەماڵە) بزوتنەوەی کوردی لە باشوور ئیفلیج کردووە و بەرامبەر یەکتر دڵڕەق و بۆ داگیرکەرانی کوردستان ئەوپەڕی نەرمی.

ئەم دەربڕینەی نووسەر و بێلایەنی لە باسکردن و گێڕانەوەی رووداوەکان، ئەنجامگیرییەک دەدات بەدەستەوە کە:

•لەبەر ئەوەی نووسەر هەر لە سەرەتای پێوەندیکردنی بە شاخەوە، بیرباوەڕێکی چەپی هەڵگرتووە و نەگونجاوبووە لە گەڵ پێوەندییە خێڵەکییەکان، زۆر ڕاشکاوانەو بێ سڵکردنەوە باسی زاڵبوونی ژیانی بنەماڵەیی و خێڵەکی دەکات کە لێچوونیی شەڕی مەلایی و جەلالی دەبینێت.

•لەبەر ئەوەی نووسەر یەکێک بووە لە دامەزرێنەرانی ئاڵای شۆڕش و زیندانی بوونی لەلای خودی ینک و ئازاردانی. ویستوویەتی ڕوی شەڕانگیزی ینک بەگشتی و لایەنەکانی تر بخاتە ڕو.

•لەبەر ئەوەی نووسەر لە ژێر کۆنتێکستێکی نوێدایە ، بێگومان بۆچونەکانیش گۆڕاوون و ڕوداوە فرە لایەنەکانی بەشێوەیەکی تر هەڵدەسەنگاندووە و تەماشا ی کردوون

## گرنگی یادەوەرییەکانی وەکو داتایەکی سۆسیۆسایکۆلۆژی

•تراومای وێنەو شەڕەکان

لە زۆربەی یادەکاندا، شەڕەکان لە هەناوی نووسەردا وەکو پشکۆیەکی گەش باڵ بەسەر گێڕانەوەکاندا دەکشێنن وچزە لە جەستەی نووسەر هەڵدەستێنن. شەهیدبوونی هاوڕێکانی، کوشتنی برا دوژمنەکانی، سووتاندنی گوندەکان، ڕوی دزێوی داگیرکەرانی کوردستان، قیژەی منداڵان و وێنەی لاوێن و پڕ ئەمەکی دایکی، ناسۆرەکانی دەکەنە پوازگە بەرد و هەموو ساتێک برینداری دەکەن. کارەساتەکان نووسەر دەیانگێڕێتەوە بەڵام تەنها هی ئەوە نین و زۆر لەو پێشمەرگە دێرینانەی کە لە ژیاندا ماون . سات نیە خەو بە شەڕ و بەگوڵ و بۆردومانەوە نەبینن.
گرنگی ئەم یادەورانە وەکو ماتریاڵێکی سۆسیۆسایکۆلۆژی لە سەر ئاستی ماکرۆ و میکرۆوە، لە سەر ئاستی تاک و کۆمەڵگە، ئەزمونێکن بۆ دووبارە نەبوونەوەی ئەو کارەساتە ناوخۆیی و دەرەکیانە کە تووشی میللەتی کورد هاتوون و دەبەن. لێ کاریگەری تراوما یان کارەسات وەکو تیغێک یان دڕێلێک پێکهاتەی بوونی مرۆڤ دەشێوێنن و ژیانی لێ تاڵ دەکەن، ئەوەی جوان بێت یان تاڵ، سروشتی بێت یان دروستکرد، بۆنی کارەساتی لی دێت بۆ ئەو کەسەی کەتووشی کارەساتی تراوما دەبێت. سۆسەن کاپلاند کە پلەی پرۆفیسۆری هەیە لە دەروونناسیدا، لەگەڵ چل منداڵی جولەکەدا، دوای ٤٠ ساڵ چاوپێکەوتنی لە گەڵدا کردوون، گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی کە تراوامای وەکو زەنگیک ژیانی مرۆڤ دەشێوێنێت.

•گرێدانی دەروونی
نووسەر بەستەرێکی دەروونی لە نێوان و خۆیی و یادەکانیدا دروست کردووە، یان ئەوە تراومای یادەکانن کە گیانی نووسەریان بە خۆوە گریداوە و دووبارە و دەبارە باسی برایی و خۆین و هاوژیان دەکات، دەروونێکی پڕ لە کۆیانێکی تاڵ وەهەندێ جاریش خۆش. نووەسەر زۆر باسی تراومای خنکاندنی ئەو لاوە تەمەن حەڤدە ساڵە دەکات، کەتەمەنی پێشمەرگایەتی دوو ڕۆژ دەبێت و لەگۆی ئاوی سیرواندا دەخنکێت.( لاپەرە ٢١٦ پشکۆ ئەجمەدین ١٩٧٨-١٩٨٣). ئەو کارەساتە تاکو ئەمرۆش میشکی نووسەر دەگوشێت، تراومایەکی پڕ زەنگە.».مامۆستا گیان من نامەوێت بمرم». هەمان سەرچاوە لاپەرە٢٢٣.

## خاڵە لاوازەکان

•نووسەر زۆر جار گێڕانەوەی یادەکان و لەگەڵ هەڵسەنگاندنێکی نوێی تێکەڵ یەکدی کردووە،

ئەوەش پێوەندی بە تەمەنی بیست ساڵەی یادەکانەیەوە هەیەتی و نەبوونی ڕۆژمێرێک کە نووسەر بتوانێت پشتی پێ ببستێت. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی بایەخدان بەکلتوری نووسین لە نێو کوردا.

•پاش و پێشکردنی گێڕانەوەی یادەوەریەکان. بۆ نموونە نووسەر لەلاپەرە ٢٤٨ واتە لە کۆتایی کتێبەکەیدا باسی یادێکی بوون بە پێشمەرگەیی خۆی دەکات ساڵی ١٩٧٨. ئەم جۆرە شێوازە سەر لە خوێنەر تێک دەدات و هەمیشە لە بازنەیەکی بێ ئەنجامدا گیری دەکات. هەرچەندە نووسەر خۆی لەسەرەتای کتێبەکەیدا باسی ئەوە دەکات کە ئەو کارێکی ئەکادیمی نانوسێت.
•باسە مێژووییەکان هەندێ جار لە ناو چەقی یادەکاندا سەر هەڵدەدەن. (بڕوانە لاپەڕە ١٤٣ مێژووی بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان). ڕونتر دەبوو ئەگەر نووسەر بەشێکی یادەوریەکانی تەرخان بکردایە بۆ بەشی مێژوویی. چونکە ئەگەر کەسێک یاگاداری پێشمەرگایەتی نەبێت لە مەبەستی نووسەر تێ ناگات و پەیامەکە ناگات. هەروەها هێشتا مێژووی کوردیش لەو پارچەیەی کوردستان نەنووسراوەتەوە تاکو خوێنەر بتوانێت پێی ئاشنا بێت.

•بۆ ئاشنایی بوونی خوێنەر دەبوو نووسەر کورتەیەکی مێژوویی پوختی لەسەر هەموو ڕێکخراوەکانی ناو یەنکی پێشکەش بکردایا.
•نووسەر زۆر لە گێڕانەوەی یادەکاندا پێ داگرتووەو باسی کردوون. بەڵام بەشێوەیەکی ڕون ئەو ئەزمونانە ناخاتە بەردەم خوێنەران کە کامەنن تا وەکو سوودیان لێ وەربگرێت بێجگە هەندێ جار لە باسکردنی ڕای خۆی.
•باس نەکردنی کارەساتی هەکاری بە شێوەیەکی تێر و تەسەل. بڕوانە لاپەڕە٧١ تاکو ٧٢. ئایا ئەو پرسە نێهنیانە کامانەن کە سەرکردایەتی یەنک بە هەموو پێکهاتە ڕێکخراوەکانیەوە، ئەوسا و ئێستا ویری ئەوەیان نەکردووە کە بڵاویان بکاتەوە، ئایا ئەوە بەشێک نیە لە مێژووی کورد؟ ئایا نووسەر بێداری ئەو بڕیارە هەڵانەیە کە سەرکردایەتی وەری گرتوون سەبارەت بە ناردنی زیاتر لە ١٢٠٠ کادیری کۆمەڵە؟ یان ئەویش بێدەنگە؟ لێرەشدا دەبێت دیسان ڕۆڵی تاڵەبانی وەکو ڕوییێکی ئەوسا و ئێستای یەنک دەستنیشان بکرێت. لە هەموو هەنگاوێکی یەنک بە گشتی. چونکە هەردەم سەرکردەبووە

## خاڵە بەهێزەکان

ئەوە خاڵە بەهیزەی کە شایەنی باسە نووسەری «یاد و ئەزموون» توانیوویەتی پەنجەی بێ ترس بخاتە سەر ئەومیە:

ناوبردنی ئەو کارەئەکتەرانەیە کە شەڕی براکوژی (جەلالی و مەلایی) یان بەرهەمهێناوەتەوە و بە سەدان کوڕی کوردیان لە پێناوی بنەماڵەکانیاندا داوە بەکوشت. هەرچەندە ئەم یادانە، تەنها دڵۆپێکن لە دیرۆکی بزوتنەوەیەکی دریژ، بەڵام وەکو شایەتحاڵکن بۆئەوانەی کە تاوانیان دژی مرۆڤ ئەنجام داوە و ڕاستیێکن، کە ئەگەر دادگایەکی بیلانەن هەبووایە دەبوو هەریەکە بە پێی تاوانی خۆی سزا بدرایە. باشتربوو ئەگەر نووسەر ساڵانی ١٩٩٠تا ١٩٩٦ ئەم یادانەی تۆمار بکردایە، هەرچەندە دوورنەبوو ببنە جێگەی مەترسی و هەڕەشە بۆ سەر ژیانی تایبەتی خۆی، چونکە ئەمڕۆ ئەو یادانە تەنها مێژوو و هیچی تر، تەنها توێژێکی هێجگار کەم دەیخوێننەوە، بەتایبەتی ئەوانەی پێشمەرگە بوون.

## سەرچاوەکان

نەجمەدین، پ. (٢٠٠٨). یاد و ئەزموون. سوێد: چاپخانەی کتابی هەرزان، چاپی یەکەم

## چاوپێکەوتنی گۆڤاری ئاوێنە لەگەڵ مامۆستا پشکۆ نەجمەدین

ئا: خەبات ئەوزاد

شەڕی نێوان دووبرا، لەو ترۆپکە بەرزانەدا کە لەماڵی خوداوە نزیکترن تا هەوارگەی شەیتان، وەک ئەوە وایە کە بستێکمان لە نزمایییەکاندا بۆ شەرگە دەست نەکەوێت. ئێمە، لەحەوشەی خوادا، لە قوللە بەرزەکانی خوادا، لە کەوشەنی حەرەمی خوادا یەکتری دەکوژین و خوداش دەستێکمان لێ هەڵناهێنێ... پەیڤێکی رەحمەتمان بەگوێدا ناچرپێنێ... ئەعرەتەیەکی خۆی ناسا ناکێشێ و نافەرمێ: لە وڵاتی وێران و ئاگیر کراوتان بڕوانن، ئاورێک لەمێژووی دورنا نزیکتان بدەنەوە و خەجاڵەت بکێشن»، ئەمە پەرەگرافێکی نێو کتێبی «ئەزموون و یاد»ی پشکۆ نەجمەدینە کە خودی نوسەر لە سەر بەرگی کتێبەکەی جارێکی دی یاداشتی کردوەتەوە. پشکۆ نەجمەدین شاعیر و نوسەرێکی کوردە و یەکێکە لەوانەی لە خەباتی شاخی کوردیدا بەشداری هەبووە و لەگەڵ زۆرێک لە سەرکردە کوردەکان هاوزەمانی پێشمەرگایەتی بووە، ئەو چەند مانگێک بەر لە ئێستا بە کتێبی «ئەزموون ویاد» دەستی بە گێرانەوەکانی مێژووی چەکداری خۆی و کوردایەتی کرد، بەر لە بڵاو بونەوەی کتێبەکە لە کوردستان رێگریەکی زۆری لێ کراو بۆیە نوسەر ناچار بوو لە سوید ژمارەی سپاردنی کتێبەکەی وەرگرێت. ئەو لەمەر ئەو رێگرتنەی لە «ئەزموون و یاد» کرا دەڵێت «هەوڵدان بۆ رێگرتن لە چاپ و بڵاوکردنەوەی «ئەزموون و یاد»، هەوڵێکی ئەزۆک بوو. لە دنیای یەکگوندیی ئەمڕۆدا و لە سایەی پێشکەوتنی لەرادەبەدەر و بەجیهانیبوونی تەکنیکی میدیا و راگەیاندندا تەنیا ئەقڵە ئەخوێندەوارەکانی وڵاتی ئێمە بیر لە پرۆسەی بەرتەسککردنەوەی ئازادیی دەربڕین و چاپ و بڵاوکردنەوە دەکەنەوە». ئەزمون و یاد بەوردی پێمان دەڵێت شۆڕشی کوردی هەر لەسەرتاوە پڕاو پڕ بووە لە شەڕی براکوژی و یەکتری سڕینەوە، پشکۆ لەمەڕ ئەمە دەڵێت «من، بە مەبەست و لە ئاگاییدا، لەسەر تراژیدییاکانی شەڕی نێوخۆ ورد دەبمەوە و زەق و زۆپیان دەکەمەوە. من، کە لە بەشێکی زۆری ئەو شەڕانەدا بەشدارییم کردووە، ئێستاش، پاش بیست و سێ ساڵان، لە ئاگایی و ئاناگاییمدا، ئازارم دەدەن و لە ناخەوە دەمسووتێنن! «. بۆ زیاتر ورد بونەوە لەسەر رووداوەکانی شۆڕشی کوردی و چیرۆکە راستەقینەکانی نێو «ئەزموون و یاد» زەرورەتی سازدانی ئەم دیدارە هاتە ئاراوە ئاوێنە بەچەند بەشێک ئەم دیدارەی پشکۆ نەجمەدین بڵاو دەکاتەوە کەتێدا بەوردی قسە لەسەر بابەتەکان کراوەو چەند حەقیقەتێکی شۆڕشی کوردی راستگۆیانە ئاوڕی لێدراوەتەوە.

ئاوێنە: لەپاش تەواو کردنی «ئەزموون و یاد» و بەر لە خستنە بازاڕ، ڕێگرییەکی زۆری بۆکراو دژایەتی بڵاو کردنەوەی دەکرا. ئەوەبوو بەڕێزتان لە سەرەتا لە سوید ژمارەی سپاردنتان بۆ وەرگرت. هۆکاری ئەمە بەچی دەزانیت؟

پشکۆ ئەجمەدین: هەوڵدان بۆ ڕێگرتن لە چاپ و بڵاوکردنەوەی «ئەزموون و یاد»، هەوڵێکی ئەزۆک بوو. لە دنیای یەککگوندیی ئەمڕۆدا و لە سایەی پێشکەوتنی لەڕادەبەدەر و بەجیهانیبوونی تەکنیکی میدیا و ڕاگەیاندندا تەنیا ئەقڵە ئەخوێندەوارەکانی وڵاتی ئێمە بیر لە پرۆسەی بەرتەسککردنەوەی ئازادیی دەربڕین و چاپ و بڵاوکردنەوە دەکەنەوە. من، لە کورتە وتارێکدا کە ئەوکات لە ڕۆژنامەی «ڕۆژنامە»دا و هەمانکاتیش لە ماڵپەڕە کوردییەکاندا بڵاوم کردەوە، باسم لەوە کردووە کە لە کوردستاندا، جارێ یاسایەکی تایبەت بە ئازادیی کاری نووسین و بڵاوکردنەوە نییە و ئەویشی کە ئێستا کاری پێ دەکرێت، ئاگاتە قولەپێی یاسای هیچ وڵاتێکی مۆدێرن و دیموکرات. لە کوردستاندا، هێشتا دەیان کاری سانسۆر و دژەئازادیی ڕادەربڕین و بڵاوکردنەوە، لەژێر پاساوی بێتامی «پاراستنی ئاسایشی نەتەوایەتی»دا، دژ بە نووسەران و ڕۆشنبیران ئەنجام دەدرێن و سووکایەتییان پێ دەکرێت.
خودی «ژمارەی سپاردن» و هەڵسەنگاندن و خوێندنەوەی بەرهەمی نووسەران و ڕۆشنبیران، لەلایەن دەسگای تایبەتەوە لە وەزارەتی ڕۆشنبیری، جگە لە سانسۆرێکی ئاشکرا، هیچی دیکە نییە. ژمارەی سپاردن، لە وڵاتانی دیموکراتدا، تەنیا بە تەلەفوون وەردەگیرێت و هیچکەس و دەسگایەک، پێشوەخت مافی ئەوەیان نییە داوای بینینی بەرهەمی چ نووسەرێک بکەن.

ئاوێنە: ئەگەر لە خودی نوسەری «ئەزموون و یاد» بپرسن پێناسەی «ئەزموون و یاد» بکە، چۆن دەیکات؟

پشکۆ ئەجمەدین: ئەزموون و یاد، بەوشەنەخشاندن و زیندووکردنەوەی ئەو وێنانەی سەردەمێکی ژیانی منن کە لە سەختترین ڕۆژگاری خەباتی شاخ و تێکۆشانی سیاسیدا، لە هزرمدا نەخشاون و زەمەن تۆزی لەسەر خستوون.

ئەزموون و یاد، لە مەودای دووردا، وێنەگرتنەوەی ژیان و ئازارەکانی تاکی کوردی لە دۆزەخی جەنگ

هاوێژراوە و جەخت لەسەر دووبارەخولقاندنەوەی ژان و دڵەڕاوکێکانی کۆمەڵێک مرۆڤ دەکات کە هەلومەرجی نائاسایی و زوڵم و ستەمی بەعس، لە سۆنگەی کوردبوونیاندا، دەیخستنە دەرەوەی زەمەن و لە شوێنێدا گۆڕەوشاری ڕۆح و جەستەی دەدان.
چاوە دووربینەکانی کامێرای «ئەزموون و یاد»، زیاتر لەسەر ئازار، دڵەڕاوکێ، خەم و پە ژارە و چرکە دەروونییە ئازاراوییەکانی ئینسانی کورد«پێشمەرگە، سیڤیل»، هەڵوەستە دەکەن و هەوڵ دەدەن، وردینەی بارە ناهەموارەکانی ناخی ئینسانەکان وێنە بگرن کە جەنگ بەرهەمی هێنابوون. من، بە مەبەست و لە ئاگاییدا، لەسەر تراژیدییاکانی شەڕی نێوخۆ ورد دەبمەوە و زەق و زۆپیان دەکەمەوە. من، کە لە بەشێکی زۆری ئەو شەڕانەدا بەشدارییم کردووە، ئێستاش، پاش بیست و سێ ساڵان، لە ئاگایی و نائاگاییمدا، ئازارم دەدەن و لە ناخەوە دەمسووتێنن! شەڕی نێوخۆ و کەلتووری یەکترکوشتن، فاکتەری کاریگەری خولقاندنی ئەم بارە شێواوەن کە کوردی تێدا دەژی. وێنەگرتنی شەپۆلەکانی رووباری لە خوێن سەرڕێژی شەڕی دەسەڵات، لە ئامادەیی دەوڵەت و قەوارەی سیاسیی کوردیدا و نیشاندانیان بە نەوەکانی ئێستا و ئایندە، بە ئەرکێکی گرنگی پرۆسەی «نووسینی سیاسی» دەزانم. ئەزموون و یاد، لە زۆر شوێندا و تا ئەو جێگایەی بۆی مەیسەر بوو بێت، بە زمانی شیعر و ستاییلی ڕۆمان، بە قەولی ڕێبین هەردی، پرسەنامەیەکی خەمناکە و مێژوویەک دەگێڕێتەوە، کە هەمووومان خولقێنەری بووین.

ئاوێنە: لەسەرەتای «ئەزموون و یاد» ئەوە باسدەکەیت کە یەکەمین ڕووبەڕو بونەوەی تۆ و یەکەم فیشەک کە تەقاندوتە بەڕوی برا کوردەکەتدا بووە، ئەمە لای تۆ چ هەستێکی دروستکرد. ئایا بەر لەوەی تۆ ژیانی پێشمەرگایەتی هەڵبژێریت لات ڕونبووە کە بەشێک لە خەباتی کوردان بۆ سرینەوەی یەکدیە؟

پشکۆ ئەجمەدین: بەرپرسیارێتیی نووسین و لێتوێژین وام لێ دەخوازێت بە ئەقڵ و لۆژیک و ئەندێشەی ئەو سەردەمە بیر بکەمەوە و بەرسڤ بدەم. ئەوسەردەم، من گەنجێکی خوێنگەرمی بێئەزمونی مێشک بە گیاکەڵەی ئایدۆلۆگی مارکسیزمی سەقەت وەرگیراو شەتەکدراو. تێگەیشتنەکانی من بۆ شۆڕش و هێزە بنچینەیەیی و بزووێنەرەکانی، شەڕی نێوان چینەکان» کرێکاران و بورژوا یاخود چەپەکان و هێزە کۆنەپارێزەکان» کارێکی ئاسایی و سادە بوو کە دەشیا ڕوو بدات. هەستی من، هەستی هەرکەسێکی دەمارگیر بوو کە یەکەمجار لە شەڕ دەکەوێت، بێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کە لایەنی بەرانبەر کوردە یاخود نەتەوەیەکی ناکورد. لەو بارودۆخەدا کە ئایدۆلۆگیای بە مەزهەبکراو،

دەبێتە داینەمۆی ڕۆحی و فیزیکیی ئینسانەکان. ئیدی ناسنامەی ئینسانە دژەکانی تۆ، هیچ ڕۆڵێکی نییە. من لە «ئەزموون و یاد»دا، بە چڕی جەختم لەسەر وەگەڕخستنی ماکینەی ئایدۆلۆژیا «بە بارە سەقەتەکەیدا» لە هزری تاکی کورددا کردووە. دیارە زەمەنێکی درێژ و زەریایەک خوێنی گەرەک بوو تا ئێمە لە نادرووستیی بۆچوون و تیورەکانمان بگەین. کورکوشتن تەمەنێکی درێژ و دیاری لە مێژووی ئێمەدا هەیە. ئێمە ئەو منداڵە بێگوناهانە بووین کە باوکە زاڵم و تاوانبارەکان، بۆ مەرام و مەبەستی خۆیان ڕەوانەی بەرەکانی شەڕی کورکوشتنیان دەکردین و بەکوشتیان دەداین. ئەوان، ئێمەیان ڕەوانەی دۆزەخ دەکرد و هەرکاتیش پێویستیان بایە، پێکی ئاشتییان لە چاوی خوێنە ڕژاوەکانی ئێمە، نۆش دەکرد!

ئاوێنە : ئەگەر بتزانیبا وەهایە ئایا ئامادە بوویت ڕۆژێک شۆڕش بۆ کورد بکەیت؟

پشکۆنەجمەدین: من ناتوانم بە چەمک و تێگەیشتنی ئێستامەوە بۆ شۆڕش، بیر لە سەرەتاکانی ئەوێ ڕۆژێی شۆڕش یان ئەوەی بە ناهەق پێی دەگوترێ «شۆڕش» بکەمەوە و بڵێم وەهام دەکرد یاخود نەمدەکرد! مێژوو ئەوە نییە کە بە خواست و حەزی ئێمە دەبێت ڕوو بدات، بەڵکە ئەوەیە کە ڕووی داوە!

ئاوێنە: بەردەوام گەنج لە کوردستان بەوە دەم کوت ئەکرێت شۆڕشی نەکردووە و حازر خۆرە، ئەمە تاچەند بەراست ئەزانی؟ من کاتێک «ئەزموون و یاد»م خوێندەوە بۆم دەرکەوت ئەوە زۆر ناهەقیەکی گەورەیە دەرهەق بەگەنج دەکرێت، تۆ وەک کەسێکی نێو شۆڕشی کورد وانەزانیت ئەو شۆشەی کە کردویانە هی ئەوەبێت بەو شێوەیە شانازی پێوە بکەن؟

پشکۆ نەجمەدین: شۆڕش، خەبات و قوربانیدان، شتگەلێک نین کەسێک یان کەسانێک شانازییان پێوە بکەن. کەسانێک کە بە ویست و خواستی خۆیان چوونەتە شاخ و پێشمەرگەێتییان کردووە، کەسێک داوای لە ئەوان نەکردووە و مافی ئەوەشیان نییە لاف لێ بدەن و ناز بە سەر کەسدا بکەن. شۆڕش لە چەمکە گشتییەکەیدا، دەبێت پرۆسەیەک بێت بۆ گۆڕانی هەمەلایەنەی کۆمەڵگا و مۆدێرنیزەکردنی لە کایە جیاوازەکاندا و ئەمەش بە بێ خولقاندنی زەمینەیەکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی لەبار بۆ گەنج، دەبێتە شتێکی بێمانا و ورێنەی دەسەڵات لەمەڕ ئەو گۆڕانکارییانەی کە شۆڕش وەکو موژدەیەکی پێشوەخت بە خەڵکی دابوون، ئەنجامیش لە هەموو نێوەڕۆکێک بەتاڵ

کرایەوە. دڵنیام کە ناسوورەترین و تەندرووسترین نەوەی میللەتی ئێمە، ئەو نەوەیەیە کە جەنگ و بەعس و خەباتی شاخی نەناسیون.

ناوێنە: رەخنەیەک کە لە «ئەزموون و یاد» بگیرێت ئەوەیە زۆر گرنگی بە ڕووبەڕو بونەوەی کورد و کورد نەدات ئەو روبەڕوبونەوانەی لە نێوان شۆڕش گێرانی کورد و بەعسدا بووە ئاوڕی لێنەدراوەتەوە، ئەمە تاچەن بەڕاست ئەزانی؟ هۆکاری ئەوە چیە؟

پشکۆ ئەجمەدین: من لە «ئەزموون و یاد»دا هەرچییم نووسیوون و هەر چییەکم وێنە گرتوون، بە ئاگاییەوە کردوومن و هەوڵم داوە، ئەو کارانە بکەم و ئەو گێڕانەوانە بگێڕمەوە کە کەسانی دیکە لە من باشتری دەزانن و لە بەر هەر هۆیەک بێت پرکێشیی گێڕانەوەیان ناکەن. هیچ گێڕانەوەیەک هێندەی «ئەزموون و یاد» باسی لە فیکری بەعس و زوڵم و ستەمی بەعسی دەرهەق بە ئینسانی کورد و وڵاتەکەی نەکردووە. «ئەزموون و یاد»، بە گشتی، باس لە شەڕ و پێکدادان ناکات و ئەمەش بە ئەرکی خۆی نازانێت. کەسانێک هەن ئەو کارە بکەن. گرنگیدان بە ڕووداوەکانی شەڕی براکانیش، هەوڵدانێکە بۆ بەئەرشیفکردنی ئەو ئازارانەی ئەقڵی سیاسیی کورد بۆ تاکی کوردی بەرهەم هێناون. ئەمە، دەرکەکردنەوەیە لەسەر گرکانی دۆزەخێک کە کورد بۆ کوردی تاو دابوو. شەڕی ناوخۆ، جۆرێک بوو لە ئەنفالی خۆکرد و ناکرێت بە ئاسانی وێنەکانی بپێچینەوە و لە یادەوەریماندا بیانخەوێنین.

ناوێنە : ئۆتۆمبیلێکی لاندرۆڤەری مۆدیل کۆنی شەقوشڕ «مەسئولەکان لەپێشەوە پاڵیان لێداتەوەتەوە ئاگایان لە ئێمە نیە...خۆیان دەڵێن: مەسئولی کۆمەڵە، دەبێت لە هەموو شتێک و لە هەموو شوێنێکدا لە دواوەبن، لە مەرگ و شەهیدبووندا نەبێت!» «ڕاستە هەتا ئێستا هەروا بوون، بەڵام ئێستا و لەم سەفەرەدا وەها نین، لە پێشەوە و بێخەم لێدانیشتوون و ئێمەش وەک سەگ دەلەرزین! هە تا ئێستا ئۆتۆمبیل و شارو شتی وەها نەبووە، لێگەڕێ و ئارامت بێ، بزانە لەمە و دوا چۆن دە گۆڕێن» ئەمە قسەی ئەو دوو پێشمەرگەیە کە لەبەشی دواوەی ئەو ئۆتۆمبیلە دانیشتوون کە بەرەو سەرکردایەتی رێدەکەون بەگوتەی خۆت نوقلانە بۆ ئایندەتان لێ دەدەن «ئەزموون و یاد ل١٠٢». هەست ناکەیت کت و مت ئەو نوقلانەیە پێکاویەتی، ئێستا شۆڕش گێرانی کورد هەموویان خاوەنی کۆشک و فێلا و مەزرەعەی گەورە گەورەن و جیاواز لەمیللەتی رەش و ڕوت ئەژین و لە پێشی مۆنیکا و پاترۆل دائەنیشن و تۆز بەسەروکەلەی هەژاراندا ئەکەن. شۆڕشتان بۆ ئەمە کرد؟

پشکۆئەجمەدین: وەک خۆت دەڵێی نوقڵانەکەیان کتومت بە ڕاست گەڕا و بە زیادیشەوە هاتە دی.

درووشم و بانگەشەکانی «شۆڕش» شتێکیان پێ گوتین و ئەنجامیش لە پراکتیکدا شتێکی دیکەی لێ کەوتەوە. سەرکردایەتیی شۆڕشی «نوێی» کورد، نەک هەر بێوەفا، بگرە لەئاست مژدەکانی خۆیدا و لە بەرانبەر ئەو هەموو ماڵوێرانییەی دووچاری کورد هات. بە جۆرێک ناپاکیش دەرچوو.

بڵێی ئەمە خەسڵەتی هەموو شۆڕشێکی چەکداری بێت و ئێمە پێشتر درکمان نەکردبێت؟! من پێم وایە ئەم بارە ناهەموارەی کۆمەڵگەی کورد، پاش شکستی راپەڕین تێی کەوتووە، سەروکاری لەگەڵ بونیادی ئەقڵی سیاسی و فەرهەنگ و ستراکتۆرکتۆری حیزبی سیاسیی کوردیدا هەیە. ئەم دیاردە زێدەگرنگ و بەرچاوە، دەشێت مایەی لێکۆڵینەوە و تۆژینەوەی گەلەک وردتر بێت و لێرەدا بواری ڕیشاژۆکردنی نییە. من، زۆر ئاسوودەم و ڕۆحم هەمیشە ئارام و داساکاوە کە بێ بەرانبەر و پاداشت، ساڵانێک لە تەمەنی گەنجیی خۆمم بە میللەتەکەم بەخشیوە، خاوەنی کۆشک و ڤیللا نیم، لە سەرنێشەی حیزبان و گلە و گازندەی خەڵکیش بەدوورم.

ئاوێنە: دەوترێت «ئەزموون و یاد» هەندێک شتی لە بیرکردووە و هەندێک ڕووداوی تۆمار نەکردووە ئایا ئەمە بەئاسایی دەبینیت؟ ئایا ئەوە تۆمار نەکراوە لەبیرچوون بووە یان ئەنقەست؟ ئەوەی بۆمن هاتووە وەک نمونە داستانی شەهید بوونی ڕۆستەمی زێبا. «ئەم کەسە لە لاپەرە ٧١ی ئەزمون و یاد»دا ناوی هاتووە؟

پشکۆئەجمەدین: هەر نووسەرێک چەند بیرتیژ و لێهاتوو بێت. لە توانایدا نییە بێ هیچ یاداشتێکی پێشوەخت نووسراو و سەرچاوەیەک، وردینەی ئەو ڕووداوانەی لە شاخ ڕوویان دا، بنووسێتەوە و شرۆڤەیان بکات. هەر ڕیژیسیۆرێکی سینەماییش، هەر چەند کارامە و لێزان بێت، ناتوانێت سەرپاکی ئەو وێنانە تۆمار بکاتەوە کە لە ماوەی ٢٥ تا ٣٠ ساڵدا، لە کۆمەڵگە و وڵاتی ئێمەدا. ئێمە و بەعس نەخشاندمانن. منیش مرۆڤێکی ئاساییم و زۆرجاران هزر و بیرکردنەوەم بە هانامەوە نەهاتوون و لە گوازتنەوەی زۆر وێنەدا خیانەتیان لێ کردووم. من دەمەوێت تەنیا جەخت لەسەر یەک شت بکەمەوە، ئەویش ئەوەیە کە لە بەر خاتری هیچ کەسێک و هیچ شتێک، خۆم لە گێڕانەوەیی وێنەیەک نەپاراستووە و بە مەبەست هیچم بە ژێر لێوی قەڵەمەوە نەکردووە.

لە پێشەکیی «ئەزموون و یاد»دا نووسیومە و لێرەشدا دووپاتی دەکەمەوە کە ناوی زۆر کەسم لە یاد کردوون و ڕۆڵی زۆر تێکۆشەرم وەکو خۆیان دەرنەخاندوون... تکا لەو خۆشەویستانە دەکەم،

هاوکارییم بکەن و هەموو ئەو زانیارییانەم بۆ بنێرن کە من لە یادم کردوون، هەتا وەکو پاشکۆی بەرگی دووەم بڵاویان بکەمەوە.

ئاوێنە : ئەوەی کەوتە بەردەستی خوێنەران بەشی یەکەمی ئەزموون و یاد بووە خودی ئەزمون و یاد چەند بەشە و؟ بەشی دووەمی لە چ قۆناغێک دایە؟

پشکۆنەجمەدین: بە پێی پلانی من، ئەزموون و یاد، لە دوو بەرگدا تەواو دەبێت. بەرگی دووەم، ئێستا کاری لەسەر دەکەم و ئەگەر سەرقاڵیی ژیان مەودام بدا، لە چەند مانگێکدا تەواو دەبێت.

ئاوێنە: لەبەشی یەکەم نەکەوتینە قۆناغی دروست بوونی ئاڵای شۆرش. دڵنیام لەبەشی دووەمدا وردەکاری ئەو پارتە بەڕونی تۆمار دەکرێت، بەڵام من بەر لەوە ئەمەوێت هەندێک لەسەر ئاڵای شۆرش بزانم، زەرورەتی دروست بونی ئاڵا چی بوو؟

پشکۆنەجمەدین: زەرورەتی دروستبوونی «ئاڵای شۆرش»، خودی ئەو ناکۆکیی و ململانێیەی نێو دەروونی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو کە خەسڵەتەکانی خەباتی شاخ و ئەو فەزا سیاسییە بە زەبر لێوانلێوەی ئەوێ رۆژێ، بواری بەردەوامبوونی ئاشتییانەی پێ نەدان و مەودای پێکەوەژیانی تەندرووستیان بۆ نەرەخساندن، ئەنجام بە بنبەستێک گەیشتن کە جیابوونەوەیەکی نەخوازراویان بە سەردا سەپاندین. درووستبوونی ئاڵای شۆرش، زەروورەت نەبوو، بەڵام شێوازی بەڕێوەبردنی ململانێکان و چۆنییەتی مامەڵەکردنی خاوەن بڕیارەکان لەگەڵ کێشەکاندا، کردیانە ناچاری.

ئاوێنە: ئایا فکری عێراقچێتی و کوردستانی بون چ هۆکارێک بوو بۆ لەدایک بوونی ئاڵا؟ تۆئێستا گەر لەسەر عێراقچێتی پرسیارت ئاراستە بکرێت وەڵامت چیە؟ بەچاکی ئەزانی کورد لەچوارچێوەی عێراقی بون بمێنێتەوە یان نا؟

پشکۆنەجمەدین: من، دوو زاراوەی عێراقیبوون و کوردستانیبوونم لە عێراقچێتی و کوردستانچێتی پێ باشترن. ئەو کێشە و ململانێیەی نێو دەروونی کۆمەڵەی رەنجدەران کە لە نێوەراستی هەشتاکانی سەدەی پێشوودا قووڵکرانەوە و بە بنبەست و دووڕێیانی لێکدابڕان گەیەنران، هێندەی پەیوەندییان

بە فیکر و تێڕوانینە جیاوازەکانەوە بۆ بینینی شۆڕش و سیاسەت و پەیوەندییە ناوەکییەکانی ڕێکخراوەیی و فەزای دیموکراسی نێو خودی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە هەبوو. کەمتر سەروکاریان لە گەڵ فیکری عێراقیبوون و کوردستانیبووندا هەبوو. لەو ڕۆژگارەدا، هیچ لایەک لە نێو کۆمەڵەدا، فیکری ئێراقیبوونی نەبوو. ئەمە کێشەیەک بوو، بە ئانقەست خولقێنرابوو و پف درابوو. ئێمە پێمان وابوو، کۆمەڵە تەنیا دەتوانێت پارتی ڕەنجدەرانی کوردستانی ئێراق بێت و باسکردن لە پارتی سەرتاسەریی کوردستان، لە لۆژیک و واقیعی سیاسییەوە دوورە. ئەمە جگە لە موزایەدە و بە لاڕێدابردنی ململانێکان، شتێکی دیکە نەبوو.

ئێمە لەو قۆناغەدا، وای بۆ دەچووین کە کێشەی کورد لە کوردستانی ئێراقدا، لە چوارچێوەی ئێراقێکی دیموکراتدا چارەسەر دەکرێت. ئەو زەمانە، ئاسۆیەک بۆ ڕامالینی دەسەڵاتی بەعس لە کوردستاندا نەبوو، پێمان وا بوو، کورد بە تەنیا ناتوانێت بەعس لە کوردستاندا دەر بکات و دەسەڵاتی خۆی دابمەزرێنێت، بەڵکە تەنیا ڕێگا، هاوکاریکردنی هێزە چەپ و دیموکراتەکانی ئێراقە، بۆ ڕوخاندنی دەوڵەتی بەعس و دامەزراندنی دەوڵەتێکی دیموکراتیی شۆڕشگێڕ کە لە وێدا کورد بە مافی چارەنووسی خۆی بگات ، بە جیابوونەوە و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆشەوە. ئەمە ئێراقیبوون نییە. ئەمە شێوازێکە لە بیرکردنەوە و بەرنامەی سیاسیی گرووپێک و مافی ڕەوای خۆشیان بوو وەها بیر بکەنەوە. بەداخەوە، پرۆژەی کوردستانیبون ، نەک لە شاخەوە و لەو هەلومەرجە سەختەی ئەوێ ڕۆژێدا، بگرە پاش بیست ساڵان و لە هەلومەرجێکی تەواو جیاوازتردا و لە ڕوخاندنی دەوڵەتی بەعسدا، بە کردەوە شکستی هێنا. ئەو سەرکردە و کادرانەی کۆمەڵە کە ئاڵاهەڵگرانی کوردساتنیبوون و دەوڵەتی کوردی بوون، ساتێ زەمینەکە سازا و ڕۆژگاری ڕەخساو هاتە پێشێ، لە بەر بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان، لە عەرەبان عەرەبتر دەرچوون و کوردستانی دەساڵان لە ئێراق دابڕاویان بە ئێراقەوە گرێدایەوە.

ئێستا، ئیدی زەمەن شایەتیی ئەوە دەدات کە کێشەکانی شاخ، کێشەی ئێراق و کوردستان نەبوون. کۆمەڵە، وەک هەر ڕێکخراوێکی دیکەی سیاسی، مێژووەکەی پڕ بوو لە ناکۆکی فیکری و سیاسی و لە هەلومەرجێکدا، لە ئەنجامی باش ئیدارەنەکردنی ململانێکان و نەبینینەوەی ڕێگەچارەی درووست بۆ بەلاداخستنیان، بە ناچاری جیابوونەوە و دووکەرتبوونیان سەپاند. من وەکو کەسێک، هەمیشە لە دوخە تایبەتەکان و واقیعە گۆڕاوەکاندا، دید و بۆچۆنی خۆم درووست دەکەم و پێم وایە، هەر لە پاش ڕاپەڕینەوە، زەمینەیەکی ناوەکی و نێوچەیی و نێودەوڵەتی بۆ پراکتیزەکردنی ڕێبازی کوردستانیبوون

و کارکردن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی رەخسا، بەڵام سەرانی کورد لە ئاست ئەم ئەرکەدا خەمسارد و دەستوپێ سپی بوون و بێ مسەوگەرکردنی دەستخستنەوەی سەروەرییە لەدەستچووە نەتەوەییەکان، خەڵکیان بۆ سندوقی دەنگدانی بنیاتنانەوەیەی ئێراق راپێچ کرد کە کەس نازانێت پاشەرۆژەکەی چ دەبێت و بە کوێ دەگات!
ئێستا، ئیدی لەم هەلومەرج و رۆژگارەدا، ئێراقیبوون و ئەو ئاگێندا سیاسییەی کورد بۆ ئەو پانتاییە تاریکە دەناژووێ، زرپاریکە و بەرهەمێکی خوازراوی بۆ کورد لێ ناکەوێتەوە.

ناوێنە: بە بڕوای تۆ گەر ئاڵای شۆرش بمایە چ خزمەتێکی بە کورد دەکرد؟

پشکۆ نەجمەدین: رەگەز و کەرەسەکانی ئاڵای شۆرش، لەگەڵ خۆیاندا، هۆکارەکانی نەمانی «ئاڵا»یان هەڵگرتبوو. ئاڵا، بە پێی ئەو خەسڵەتە فیکرییە ناچوونیەک و ئەو دیدە ناڕۆشنەی کە بۆ ئایندە و چارەنووسی رەهەندە سیاسی و کۆمەلایەتییەکانی هەبوو، نەیدەتوانی درێژە بە ژیانی رێکخراوەیی خۆی بدات. رەنگە ئەمەش بۆچوونێکی رەها و گشتبڕ نەبێت. دەشێ کەسانی دیکە بە جۆرێکی دیکە بڵێن: پاشی راپەرین زەوینەیەکی لەبار بۆ گەشەکردن و خورتبوونی بزاڤی چەپ لە کوردستاندا خولقابوو. ئاڵا، دەیتوانی لەو دۆخ و هەلومەجەدا رۆڵێکی کاریگەر لە ژیانی فیکری و سیاسیی بزووتنەوەی چەپی کوردستاندا بگێرێت.

من، هەر پاشی راپەرین بە ساڵێک، دەستبەرداری ئاڵا و هەموو پێبەستێکی حیزبایەتی بووم و لە شێوازی تەقلیدیی کاری رێکخراوەیی حیزبی کوردی ناهومێد کەوتم، بەڵام ئەو سەرکردانەی کە ئاڵایان بەرێوە دەبرد، دەیانتوانی شێلگیرتر و بەرچاوروونتر بن، پلان و ئاگێندایەکی گونجاو لەگەڵ دۆخی پاش راپەرین، بۆ ئاڵا دابرێژن و پراکتیزەیان بکەن. ئاڵا، لە بری تێکلاوبوونی لەگەڵ حیزبی زەحمەتکێشان و پاشان گەرانەوەی بۆ نێو ریزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، دەکرا کار بۆ خورتکردنی بەرەی ئۆپۆزسیۆن لە کوردستاندا بکات. رەنگە تەنیا خزمەتێک کە «ئاڵا» بیتوانیبا بە بزووتنەوەی سیاسیی و کۆمەلایتیی کۆمەڵگەی کوردیی بگەیەنێت، ئەوە بوو کە هەوڵ بدات بۆ خولقاندنی هێزی سێیەم لە نێوان یەکێتی و پارتیدا، ئەمیش لە فۆرمی کوالیسیۆنێکی بەهێزی نێوان ئەو حیزبانەی کە ئێستا نە دەسەلاتدارن و نە ئۆلۆزیسیۆن!

ناوێنە: یەکێتی پاش دروستبوونی ئاڵا چ هەڵوێستێکی نواند؟ ئایا بەدروستبوونی ئاڵا مەیدانی کورد

کوژی فراوانتر بوو یان پێچەوانەکەی؟

پشکۆ نەجمەدین: نالاّ، لە سەرەتای دروستبوونیدا و هەتا کاتێکیش کە بە ئاشکرا . لە کۆبونەوەیەکدا لەگەڵ مامجەلال و مەکتەبی سیاسیی ئەوکاتی یەکێتیدا، بوونی خۆی ڕاگەیاند، جگە لە گرووپێکی فیکری و سیاسیی ئۆپۆزیسیۆنی ناو کۆمەڵەی ڕەنجدەران، شتێکی دیکە نەبوو. ئەم گرووپە نە ناوی «نالاّی شۆڕش» بوو و نە جارێ هیچ ناوێکی دیکەی هەبوو. بە پێی ڕێککەوتنی ئێمە لەگەڵ مامجەلال و ناوەندی کۆمەڵە، بڕیار بوو ئێمە لە ماوەی مانگێکدا کۆنفرانسێک ببەستین و ناوێک بۆ خۆمان دابنێین و هاوکاری (کۆمەڵە، بزووتنەوە و خەتی گشتی)، وەکو باڵی چوارەم لە ناو یەکێتیدا کار بکەین، یەکێتیی ڕیزەکان و چوارچێوەی یەکێتیی نیشتمانی و هێزی پێشمەرگە بپارێزین. نالاّی شۆڕش، ناوی گۆڤارەکەی ئێمە بوو کە تەنیا یەک ژمارەی لێ چاپ کراو و ئیدی هێزی یەکێتی پەلاماری دایین و دەستی بە سەر گۆڤار و چاپخانەکەدا گرت.

لۆژێکی خەباتی شاخ و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، ئازادیی ڕێکخستن و کاری ڕاگەیاندنی بە ئێمە ڕەوا نەبینی. ئەوان پەیمانی خۆیان شکاند و پەلاماریان دایین و ئێمەیان دەستگیر و زیندانی کرد.

ئەگەر کارەکان وەها پێش هاتبان کە ئێمە پلانڕێژمان کردبوون، فەزای شەڕی نێوخۆ و کوردکوشتن تەسکتر دەبوویەوە. کاری سەرەکیی ئێمە، دژایەتیکردنی شەڕی نێوخۆ و هەوڵدان بوو بۆ دانانی سنوورێک بۆ ئەو دۆزەخەی هێزە چەکدارەکانی بزووتنەوەی کوردی تێ کەوتبوون. ئەگەر ئێمە بۆ بڵاوکراوە نهێنییەکانی ئەو گرووپەی کە پاشتر بە «نالاّی شۆڕش» ناسرا، بگەڕێینەوە. دروستیی ئەم بۆچوونەمان پشتڕاست دەکەنەوە.

ناوێنە: سەرکردەکانی نالای شۆڕش بەشی زۆریان گەڕانەوە ناو «ی.ن.ک»، خوێندنەوەت بۆ ئەوە چیە؟ م. پشکۆ بۆ تائێستا نەگەڕاوەتەوە نێو یەکێتی و لە سیاسەتی حیزبایەتی بەدووره؟

پشکۆنەجمەدین: ئەم دیاردەیە بە ڕەوشی بزووتنەوەی سیاسیی کورد، لە مێژووی خۆیدا، نامۆ نییە. ئێمە چەندین نموونەی وەهامان، لە مێژووی پارتی دیموکراتی کوردستان، حیزبی شیوعیی عێراق و حیزبەکانی دیکەدا هەیە. لە بەشەکانی دیکەی کوردستانیشدا، دەتوانین نموونەی وەها ببینین.

من، بە گەیشتنم بە ئەوروپا، نەک هەر نەگەڕامەوە ناو یەکیتی، بگرە پێش گەڕانەوەی هاوڕێکانیشم، دەستبەرداری «ئاڵا» و هەر جۆرە پێبەستبوونێکی حیزبی و سیاسی بووم. من، پێم وابوو و ئێستاش هەر وای دەبینم کە فەزای ژیانی حیزبایەتی لە کوردستاندا، زۆر لەوە وێرانترە کە جێگای کەسێکی وەکو منی تێدا بێتەوە. چۆنییەتی دروستبوونی تەلاری ڕۆحیی من و ئەندێشە و فەزای ئیحساس و فەنتازیای من، بۆ کاری حیزبایەتیی دەست نادەن و ماڵەکانی نووسین و ئەدەب، بۆ من جوانترین و ئاسوودەترین ئەنوایەکن کە پشوویان تێدا بدەم و لە خۆم و لە دەروبەر ڕابمێنم. بیرکردنەوە و تێفکرین لە ژیان و کۆمەڵگە و مەسەلەکانی دەروبەریان، لەم فەوزایەی سیاسەت و کۆمەڵگەی کوردیان تێ کەوتووە، لە دەرەوەی شوورەکانی حیزب، فەزایەکی تەندرووستتر و ئاوەڵاتری هەیە. ئێستا خەمی من، خەمی حیزب نییە، بەڵکە خەمی ئینسانەکانی ناوەوە و دەرەوەی حیزبە. ئێمە، هەموو ئینسانە گوناهەکانی نێو دۆزەخی حیزب و سیاسەتی کوردی! تەوەری بیرکردنەوە و خەمە.



لە ڕاستەوە بۆ چەپ: شەهید یوسف، پشکۆ نەجمەدین، تەوێڵە 1974



لە ڕاستەوە بۆ چەپ: مامۆستا شاهۆ، پشکۆ نەجمەدین، مەلا بەختیار
حەمە ئاوات، گوندی هاوارە کۆن، 1978



لە ڕاستەوە بۆ چەپ: ئیبراهیم شێخ ساحێب، پشکۆ نەجمەدین، فەرهاد، گولان 1984



لە ڕاستەوە بۆ چەپ: تایەر عوسمان (سەرکەوت)، پشکۆ نەجمەدین، مەلا یاسین
هەڵەبجە 1984



لە ڕاستەوە بۆ چەپ: د.قادر، مامۆستا سەرکەوت، شەهید سەیفەدین
پشکۆ نەجمەدین، دانیشتو: لەتیف احمد، هەورامان 1980



لە ڕاستەوە بۆ چەپ: محمد حاجی سعید، شەهید فاتیح، شەهید حەیدەر، پشکۆ نەجمەدین
تایەر عـەبدالله، تـۆفیق رەحیم، فەرمیدون عبدالله، شێرزاد محمد، عومەر حەمە سـالح
هەڵەبجە 1975



لە ڕاستەوە بۆ چەپ: د. قادر حەمە شەریف، شەهید سەیفەدین
شەهید د. محمود احمد بەگ، پشکۆ نەجمەدین



لە ڕاستەوە بۆ چەپ: پشکۆ نەجمەدین، د.قادرحەمە شەریف



پشکۆ نەجمەدین



لە ڕاستەوە بۆ چەپ ریزی پێشەوە: محمود عبدالرحمان (شێخ علی)، د.هەژار مارف، د.قادر حەمە شەریف
ریزی پشتەوە: د.کەمال (حەسان)، چوارەم حەمە ئاوات، پێنجەم مامۆستا تایەر، شەشەم پشکۆ نەجمەدین





لە ڕاستەوە بۆ چەپ؛ شەهید بابا تایەر، هاوڕێ جەبار، ڕێکەوت عوسمان، شەهید ئازاد هەورامی، کەریم عوسمان
دلێر سەید مەجید، پشکۆ نەجمەدین، کانی تو 1985



لە ڕاستەوە بۆ چەپ؛ فەرەیدون عەبدولقادر، مەلا بەختیار، کاک ئازاد، مولازم عومەر



لەراستەوە: مولازم عومەر، کاك ئازاد، شێخ عەلی، سالار عەزیز و مامۆستا جەعفەر



لە ڕاستەوە: پشکۆ نەجمەدین، عەلی مامە حەمە



لە ڕاستەوە بۆ چەپ؛گۆران، سەلاح شێخ سدیق، سەلام، فوئاد مجید میسری، مام هادی
پشکۆ نەجمەدین، خاڵە بەکر، ئێران ـ زێوێ



پشکۆ نەجمەدین، ئۆردوگای هەڵەبجەییەکان ئێران (سونقور) هاوینی 1988



ئۆردوگای هەڵەبجەییەکان، ئێران (سونقور) هاوینی 1988



لە ڕاستەوە: مەلا بەختیار، نەوشیروان مستەفا، مامجەلال



لە راستەوە بۆ چەپ: مامۆستا کەمال، مامۆستا پشکۆ، شەهید کەریم پێنجوێنی
مامۆستا شاهۆ، لەتیفی حەمەی مەلا سابیر، ئاسۆ رەحیم

بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر:

١_ ژارک، کۆمەڵەشیعر، ١٩٩١ سوید.
٢_ گۆڤەندی دارستان، ئۆپەرێت و کورتەچیرۆک بۆ مێرمنداڵان، چاپی یەکەم ١٩٩٥ سوید، چاپی دووەم ٢٠٠٠ کوردستان.
٣_ گەڕان لەدوی سەرابی نیشتمان، کۆمەڵەشیعر ١٩٩٦ سوید.
٤_ لە سێبەری دیوی ناوەوەی ڕووداوەکاندا، ڕەخنە و لێکۆڵینەوە ١٩٩٨ کوردستان.
٥_ لەتێک غوربەت لە تەمەندا، کۆمەڵەشیعر، چاپی یەکەم و دووەم کوردستان ٢٠٠٠.
٦_ گێڕانەوەی یادەوەرییەکان، ساتیر، کورتەچیرۆک، پەخشان، ڕەخنە و گفتوگۆی ئەدەبی، ٢٠٠٢ سلێمانی.
٧_ بە تیرۆژێک لە نیگای تۆ، دیوانەشیعر، ٢٠٠٤ سلێمانی.
٨_ کورد لە دەروازەی هەزارەی سێدا، وتار و لێکۆڵینەوە، ٢٠٠٥ سلێمانی.
٩_ ئەزموون و یاد، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨ سلێمانی، چاپی ئەوروپا ٢٠٠٩ سوێد.
١٠_ لە سێبەری ئەدەب و ئاستانەی سیاسەتدا، دیمانە و لێکۆڵینەوە، ٢٠٠٩ سلێمانی
١١_ ژنێک لە دارگێلاس، شیعر، ٢٠٠٩ سلێمانی
١٢-ئەزموون و یاد، بەرگی یەکەم و دووەم، ٢٠١٠ سلێمانی

پێرست



٣٨.گێچەل لە بلەکێ ! ١٢٣
٣٩.مانگرتن لە خری نێوزەنگ ! ........................ ١٢٤

زیندان..
کەوڵکردنی کەرامەت لەبەرپێی گزگلەکاندا،
چاوانی خوێنتێزاوی جەلاد نیوەشەوان،
دەست و چاوبەستنی کەسێک،
دووکەرتبوونی دڵی شەوگار بە دەستڕێژێک،
هاوارێکی بێڤریاڕەس!



# Experience and Remenies